# زانست و تەکنەلۆجیای سەردەم

## هـــاوڕان لـــەگـــەڵ قـــورئـــان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ

**٣٨٠ ئیعجازی زانستی تازە لەقورئان و فەرموودەکان**

ئامادەکردنی: عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد








ناوی کتێب: زانست و تەکنەلۆجیای سەردەم هاوڕان لەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ

ئامادەکردنی: عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد

بابەت: ئیعجازی زانستی

نەخشاندنی بەرگ و نوسین: کتێبخانەی گەشە

نۆبەی چاپ: یەکەم، ٢٠٢١

چاپ و بڵاوکردنەوەی: کتێبخانەی گەشە

تیراژ: ١٠٠٠دانە

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارە سپاردنی (١٣٤٠)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

کتێبخانەی گەشە بۆ چاپ‌و بڵاو کردنەوە

سلێمانی – بازاڕی ئاوباریک بەرامبەر کاسۆ مۆڵ – دوکانی ٧١

٠٧٥٠١٢١٤٧٧٣ – ٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦



# زانست و تەکنەلۆجیای سەردەم

## هـــــــــــاوڕان لـــەگـەڵ قورئان و

## فـەرموودەکانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ

ئامادەکردنی:

عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد

٢٠٢١ زاینی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ٥٣﴾

سورة فصلت: ٥٤





# پێشەکی:

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم)، ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە موعجیزە زانستییەکانی قورئان و فەرموودەکان گەورەترین کاریگەریان هەیە بۆسەر دڵ و دەروونی خەڵکی. وێنەی ئەو موعجیزە زانستیانە وەك ئەوە وایە کە مرۆڤێك لە بیابانێکی وشك و بێ ئاودا ئاوی پێ نەبێ و ماوەیەك چاوەڕوان بکات و بگەڕێت بەدوای ئاودا بەڵام سەرەنجام ئاوی دەست نەکەوێت، لە گەرمای ئەو بیابانەدا خەریکە بکەوێتە پەلەقاژە و هیچ توانا و هێزێکی نەمێنێ و دەست بشوات لە ژیانی، بەڵام لەناکاودا کەسێك پەیدا دەبێ دۆلچەیەك ئاوی سارد و سازگاری پێشکەش دەکات، هەرکە ئەو کەسە ئاوەکە دەخواتەوە هەموو دەمارەکانی لاشەی پاراو دەبن و سەرلەنوێ ژیانی دەبوژێتەوە و ڕزگاری دەبێت لەو بارودۆخە.

سەختە موعجیزە زانستییەکانیش ئاوان ئاوا کار دەکەنە سەر دڵ و دەروونی خەڵکی لە گێژاوی گومان ڕزگاریان دەکەن، موعجیزە زانستیەکان بۆ بڕواداران زیاتر دەبنە هۆکاری پتەوبوون و دامەزرێنەرانی بیروباوەڕیان وە بۆ مولحید و بێ دینەکانیش ئەگەر لە بەڵگە زانستییەکان ڕانەکەن دەبنە هۆکاری ڕەواندنەوەی گومان و دوو دڵی ناو دڵەکانیان و هێنانیان بۆ ناو ئاینی پاکی ئیسلام.

ئەو موعجیزە زانستیانە سێ ڕاستی زۆر گەورە وەك ڕۆژی ڕووناك دەسەلمێنن: بوونی خوای گەورە دەسەلمێنن لەبەرچی و چۆن؟ وەڵامەکەی ئەوەیە ئەم قورئانە پێش زیاتر لە چواردە سەدە خوای گەورە دایبەزاندووە بۆسەر زەوی، بەڵام بابەتی زانستی وا باس دەکات کە وڵاتە بیانیەکانی ئەورووپا و ئەمریکا پاش دۆزینەوەی کارەبا و پەرەسەندنی زانست و تەکنەلۆژیای سەردەم و دروست کردنی سوپەر کۆمپیوتەر و مانگی دەستکرد و بەرەو پێش چوونی زانستی پزیشکی و دروستکردنی ئامێری تازە و دروستکردنی میکرۆسکۆپ.. جا ئەو جار گەیشتنە ئەو بوارە کە چەندین نهێنی



زانستی ئاشکرا بکەن کەچی کە تەماشای قورئان دەکەیت چواردە سەدە زیاتر پێش ئەوانە زۆر بە جوانی باسی ئەو زانستانەی کردووە کە ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورەیە، ئەو خوایەی کە ئەو قورئانەی دابەزاندووە ئاگادارە بە هەموو نهێنیەکانی ئەم بونەوەرە، لەبەرئەوەی ئەم بابەتە زانستیانە لە توانای هیچ کەسێکدا نیە لە چواردە سەدە زیاتر پێش ئێستا باسیان بکات و زانست و تەکنەلۆژیای سەردەمیش دەقاودەق بێت ڕاستی و دروستی ئەم قورئانە بە بەڵگەوە بسەلمێنێت و بە تەواوی هاوڕا بێت لەگەڵیدا. کەواتە: ئەو موعجیزە زانستیانە گەورەترین بەڵگەن لەبارەی بوونی خوای گەورە و بێ وێنە هەروەها ئەو موعجیزە زانستییانە ڕاستی پێغەمبەری ئیسلامیش (صلى الله عليه وسلم) وەك ڕۆژ ڕووناك دەسەلمێنن چۆن؟

وەڵامەکەی ئەوەیە ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەك وشە خوێندەواری نەبووە، ئەمە قورئان باسی دەکات. ئەی باشە چۆن باسی ئەم هەموو نهێنیە زانستیانەی لە فەرموودەکانی دا کردووە، کە زانست و تەکنەلۆژیای سەردەم تازە بە تازە وەك ڕۆژی ڕووناك فەرمایشتەکانی ئەو زاتە دەسەلمێنێت کە فەرموودەکانی لەگەڵ تازەترین لێکۆڵینەوەی زانستیدا هاوڕان. کەواتە ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە کە ئەو زاتە بە ڕاست پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) چونکە هیچ کەسێك ئەگەر گەورەترین زانای سەر ڕووی زەویش بێت ناتوانێ پێش زیاتر لە چواردە سەدە باس لەو بابەتە زانستیانە بکات. کەواتە: ئەوە بە بەڵگەوە ڕوون بۆوە کە پێغەمبەری ئیسلام بەڕاست پێغەمبەرە و خوای گەورە بە وەحی ئەم شتانەی پێ ڕاگەیاندووە تاوەکو ببنە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی. هەروەها موعجیزە زانستیەکان وەك ڕۆژی ڕووناك دەیسەلمێنن کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕاستترین ئاین و بەرنامەیە کە خوا پێی ڕازیە و، کۆتا بەرنامەی خوایە بۆ بەرەی مرۆڤایەتی چۆن؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە سەرچاوەی ئاینی ئیسلام واتە: هەر کەسێك کە بێتە ناو بازنەی ئیسلام پێویستە بڕوا بهێنێ بە خوای تاك و تەنیا، وە



شایەتی بدات کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوایە، هەروەك باسمان کرد بە بەڵگەی زانستی کە خاوەنی قورئان خوایە. بە بەڵگەی زانستی ئەوەشمان باس کرد کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆتا نێردراوی خوایە بۆ بەرەی مرۆڤایەتی جا لەبەرئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ڕازیم کە ئیسلام دین و بەرنامەی ئێوە بێت کەواتە: ئەوەش ڕوون بۆوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەو بەرنامە ڕاستەیە کە خوای گەورە پێی ڕازیە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز: ئەو موعجیزە زانستیانە بەلێشاو خەڵکی بێ باوەڕی لە سەرتاسەری دنیاوە هێناوەتە ناو بازنەی ئیسلام و بوونەتە مایەی هیدایەتیان، بۆ نمونە چەندەها پرۆفیسۆر و زانای گەورەی بیانی کە جێدەستیان دیارە لە ناوەندە زانستییە درەوشاوەکانی وڵاتەکانی ئەوروپا و ئەمریکا، تەنها بەیەك ئایەتی قورئان یان بە یەك موعجیزەی زانستی فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مسوڵمان بوون، وەك: پرۆفیسۆری ناوداری کەنەدی دکتۆر (کیپ مور)، وە دکتۆری ناوداری فەرەنسی (مۆریس بۆکای)، دکتۆری شارەزای پێست لە تایلەند پرۆفیسۆر (تاجاتان تاجاسۆن)، بەڕێوبەری مەرصەدی فەلەکی لە تۆکیۆی پایتەختی یابان (پرۆفیسۆر یوشادی کوزای) و پرۆفسیۆری بەریتانی شارەزا لە بواری کارەبا و ئەلکترۆنیات دکتۆر (ئارثەر ئەلیسۆن)، دکتۆر گاری میلەری ئەڵمانی.. هەزارانی تر لە خەڵکی بیانی.

تەنها لە کۆڕێك کە بانگخوازێکی ئەمریکی ڕێکیخستبوو لە وڵاتی ئەمریکا، دوای پیشاندانی چەند موعجیزەیەکی زانستی قورئانی پیرۆز بە داتاشۆکە شازدە هەزار کەس لە تۆڕەکە ئامادەبووە، پێنج هەزار کەس بەهۆی کاریگەری موعجیزە زانستیەکان مسوڵمان بوون. سوپاس بۆ خوای گەورە گەلی کوردی مسوڵمانیش گەلێکە وێڵە بەدوای زانستەکانی قورئان و فەرموودەکان بۆ ئەوەی بەرنامەی ژیانی لەسەر ئەساسی زانست و بەرچاو ڕۆشنی هەڵبژێرێت، گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە ئەوەی من دوای ئەوەی کە ساڵی دوو هەزار و حەوت پەرتووکی (ئاشکرابوونی موعجیزە زانستیەکانی قورئان و سوننەتم) نوسی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و



دلۆڤان خەڵکێکی زۆر پێشوازی لەم پەرتووکە کرد و لێی سودمەندبوون، بە ڕادەیەك کە ئەم پەرتووکە لەدوای یەك بەردەوام چاپ دەکرایەوە هەشت جار چاپکرا، دوازدە هەزار و هەشت سەد دانەی لێ چاپکرا! ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە کە گەلی کورد گەلێکی ڕۆشنبیر و تامەزرۆی ڕاستیە زانستیەکانە پەرتووکی ناوبراو بووە مایەی خۆشبەختی و دڵخۆشی بۆ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆشنبیر و مامۆستایانی زانکۆ و قوتابیانی زانکۆکانی کوردستان، کە چەندان جیرۆکم لە کەسانی باوەڕ پێکراوە و خواناسەوە گوێی لێ بووە بۆیان باسکردووم کە ئەم پەرتووکە کاریگەرییەکی زۆر گەورەی هەبووە.

جا بۆیە منیش بیرم لەوە کردەوە کە پەرتوکێکی تر لە بواری ئیعجازی قورئان و فەرموودە بنوسم کە زۆر ناوازە بێت و زۆرترین ئیعجازی زانستی تازە لەم پەرتووکەدا بخەمە بەر دیدەی خوێنەرانی ڕێزدار. بڕیاربوو ناوی بنێم: (درەوشانەوەی موعجیزەکانی قورئان و فەرموودەکان لە ڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆجیادا)، بەڵام دوایی بیرم لەوە کردەوە کە ناونیشانەکەی بگۆڕم و بیکەم بە: (زانست و تەکنەلۆجیای سەردەم هاوڕان لەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم)) کە بەڕاستی دەتوانم بڵێم یەکەمجارە پەرتوکێکی ئاوا ناوازە لە بواری ئیعجازی زانستی لە قورئان و فەرموودەکان بنوسرێت لە مێژووی کتێبخانەی کوردیدا، کە پێکهاتووە لە ژمارەیەکی زۆر موعجیزەی زانستی تازە کە ئەم موعجیزە زانستیانە زۆر کاریگەرن. ئەم پەرتووکە بە پشتیوانی خوای گەورە دەبێتە مایەی گەورەترین دڵخۆشی بۆ بڕواداران، بۆ مولحید و بێ دینەکانیش ئەگەر لە بەڵگە زانستیەکان ڕانەکەن ئەم پەرتووکە دەبێتە هۆی ڕەواندنەوەی گومان و دوو دڵی ناو دڵەکانیان و ڕزگاریان دەکات لە گێژاوی بێ باوەڕی و ڕێنماییان دەکات بەرەو بەرنامە ڕاستەکەی ئیسلام.

خوێنەری بەڕێز: هەرچەندە مەدحی ئەم پەرتووکە بکەم زیاتری پێویستە جا بۆئەوەی تۆی بەڕێز چیتر بە تامەزرۆیی چاوەڕوانی ئەم کتێبە ناوازەیە نەکەیت حەواڵەت دەکەم بۆلای کتێبەکە هیوادارم زۆر بە وردی بیخوێنیتەوە و لە دوعای خێر منیش بێ بەش نەکەیت داوا لە خوای گەورە و میهرەبان دەکەم کە ئەم پەرتووکە بکاتە مایەی قورس بوونی تای تەرازووی چاکەکانم لە ڕۆژی قیامەتدا. عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد.





## ١ کاریگەریی قورئانی پیرۆز بووە هۆی مسوڵمان بوونی دکتۆر گاری میللەر:

بە تەمابوو ڕەخنە لە قورئان بگرێت، بەڵام سەرەنجام موعجیزە زانستییەکانی قورئان بوونە هۆکاری مسوڵمانبوونی. لە سەرەتادا چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە لە ئەو قورئانەی پێی وایە کتێبێکی کۆنەو چواردە سەدە پێشتر نووسراوە، باس لە بیابان و شتی کۆن بکات، بەڵام زۆر سەری سوڕما کاتێ کەزانی بۆچوونەکانی پێشووی هەڵەن، بە تایبەت کە بۆی دەرکەوت قورئان لە چەند شتێکی ئەوتۆ دواوە لە هیچ کتێبێکیتری جیهاندا باسیان نییە.

واتە: یەکەم دەرەنجامی لێکۆڵینەوەی دکتۆر میللەر ڕاستکردنەوەی تێگەیشتنە هەڵەکانی خۆی بوو دەربارەی قورئان، کە ئەوەش ڕەهەندێکی گونجاو بوو تاکو بە تێڕوانینێکی قووڵتر و پشوویەکی درێژتر لە قورئان بکۆڵێتەوە، چونکە لە پێشدا چاوەڕێی ئەوەی دەکرد قورئان چەند ڕووداوێکی دڵتەزێن بگێڕێتەوە کە بەسەر پێغەمبەردا ﷺ هاتوون: وەك وەفاتی خەدیجەی خێزانی و وەفاتی منداڵەکانی، کەچی هیچ شتێکی لەو جۆرەی لە قورئاندا نەبینی.

تەنانەت ئەو شتەی زیاتر سەرسامی کرد ئەوە بوو سورەتێکی لە قورئاندا بینی بەناوی مەریەم کە بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە، بەڵکو زۆر زیاتر لە هی ئینجیلەکان و هەموو کتێبی دیانەکانیش لەبارەی مەریەم دایکی عیسا –درووودیان لەسەر بێت، دەدوێ و داکۆکی لێ دەکات، بەرامبەر بەوەش سەرنجیدا هیچ سورەتێك لە قورئاندا نییە بەناوی خەدیجە و عائیشەو فاتیمە -خوایان لێ ڕازی بێت–.

پاشان بۆی دەرکەوت کە قورئان بیست و پێنج جار بە ڕێزەوە ناوی عیسای – سەلامی خوای لەسەر بێت– هێناوە، کەچی تەنها پێنج جار ناوی پێغەمبەری پایەبەرزی ئیسلام موحەممەد ﷺ لە هەموو قورئاندا هاتووە. ئەم تێبینییانەی باسکران هانی پرۆفیسۆر دکتۆر میلەریان دا کە پتر لە قورئانی پیرۆز وردبێتەوە،

ئەوەش کۆمەڵێ سەرنجی گرنگ و ناوازەی ئەوتۆی پێبەخشی کە بڕیاری چارەنووسی خۆی بدات و ڕەوتی ژیانی بە ئاڕاستەیەکی تردا ببات.

**سەرنجە گرنگەکانی دکتۆر میلەر لە قورئان:**

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ (النساء: ٨٢). واتە: بۆچی لە قورئان ڕانامێنن؟ خۆ ئەگەر لەلایەن غەیری خواوە بهاتایە گەلێ جیاوازی و ناسازییان تێدا دەبینییەوە. دکتۆر میلەر بە وردی لەو ئایەتەدا ڕۆچوو، چونکە دەڵێت: یەکێ لە بنەما زانستییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕاستی ئەوەیە کە مرۆڤ لەناو بیردۆزە (falsification lest) و بریتییە لەوەی کە مرۆڤ لەناو بیردۆزەکاندا بەدوای هەڵەکاندا بگەڕێت، کاتێ هەڵەی تێدا نەدۆزییەوە ئەو کاتە ڕاستی ئەو بۆچوونانە دەردەکەوێت و دەسەلمێت، دکتۆر میلەر دەڵێت: سەیر لەوەدایە ئەم ئایەتە خۆی داوا لە خوێنەرانی دەکات کە بەدوای هەڵەدا بگەڕێن لە قورئاندا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان قسەی مرۆڤ نییە، چونکە هیچ مرۆڤێك ناتوانێ هێندە متمانەی بە خۆی بێت کە لافی لەو جۆرە لێبدات، لەولاشەوە لەسەر زەمینەی واقیعدا ماوەی ١٤٠٠ ساڵە ئەم تەحەددییە بەردەوامە، کەچی کەسێك نەیتوانیوە بە ڕێبازێکی زانستییانە پێچەوانەی ئەم ئایەتە بسەلمێنێت.

دووەم: هەڵوێستێکی دیکەی قورئان کە سەرنجی ئەو پرۆفیسۆرەی ڕاکێشا ئەوەیە: قورئان چەندین زانیاری بە پێغەمبەر ﷺ دەبەخشێت، پاشان پێی دەفەرموێت پێش هاتنی قورئان نە خۆت و نە قەومەکەت ئەم زانیارییانەتان لەلا نەبوو: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۚ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾ (آل عمران: ٤٤). واتە: ئەوەی وترا لە هەواڵە پەنهانەکانن بە سروش بۆت دەنێرین، وە تۆ لەلای ئەوان نەبوویت کە دەمەقاڵێیان دەکرد لەم ڕووەوە.



﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَاصْبِرْ ۖ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (هود: ٤٩) واتە: ئەمانەی باسكران لە هەواڵە گرنگە نادیارەكانە بە نیگا بۆمان ناردی نەتۆ و نە گەلەكەت نەتان دەزانین لە پێش ئەم نیگای ئێمە، كەواتە خۆڕاگربە بەڕاستی سەرەنجام بۆ لەخواترسانە.

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾ (یوسف: ١٠٢) واتە: ئەوەی كە باسكرا لە هەواڵە نەزانراو و پەنهانەكانە كە بە سروش بۆت دەنێرین ئەی محمد ﷺ، تۆ لای ئەوان براكانی یوسف نەبوویت كاتێ هەموو بڕیاری خۆیاندا بە نهێنی و پیلانیان داڕشت.

دكتۆر میلەر دەڵێت: ئەمە شێوازێكە لە هیچ كتێبێكی ئاینییدا نابینیت، مرۆڤ سەری لەوە سووڕ دەمێنێت كە خەڵكی مەككە و دوژمنانی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتانەیان دەبیست، بەڵام كەسیان وەڵامی نەدایەوە كە بڵێت: نەخێر ئەم زانیارییانە تازە نین زوتر زانیومانە، چونكە لە ڕاستیدا زانیاری نوێ بوون لەبەرئەوەی سەرچاوەكەیان وەحی خوای گەورە بوو نەك ژیری مرۆڤ.

سێیەم: خاڵێكیتری جێی سەرنجدانی دكتۆر میلەر لایەنی ئیعجازی زانستی بوو لە قورئانی پیرۆزدا، لەم ڕووەوە جەخت لەوە دەكاتەوە كە قورئان پەیوەست نییە بە كات و شوێنێكی دیاریكراو، بەڵكو بۆ هەموو كات و شوێنەكانە، هەروەك ئاماژە زانستییەكانیش ناگونجێ زادەی بیری مرۆڤ بن، نەخوازەڵا چواردە سەدە پێش ئێستا و لە بیاباندا، بۆ نموونە سەیری كرد ئەو بابەتی كە ئایەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٠) واتە: ئایا نەیاندی و نەیانزانیوە ئەوانەی بێبڕوابوون كە ئاسمانەكان و زەوی هەردووكیان پێكەوە لكابوون و یەك پارچەبوون، ئینجا لە یەكترمان جیاكردنەوە وە فەرهەممان هێنا، لە ئاو هەموو شتێكی زیندوو دەی ئایە ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟



هەمان بابەتی زانستی تەقینەوە مەزنەکەیە کە ساڵی ١٩٧٣ زایینی خەڵاتی نۆبڵی لەسەر وەرگیرا، ئەو کاتە زانست بۆی سەلما کە گەردوونی سەرەتا یەك پارچەی یەككگرتوو بووە، بەڵام لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی مەزن ئاسمان و گەلەئەستێرە و ئەستێرەو هەسارەکان دروست بوون.

دکتۆر میلەر کە سەرنجی ئەم ئایەتەی دا بۆی دەرکەوت (الرتق) بە شتی هەڵوەشاو دەوترێت، کەواتە ئەگەر قورئان گوفتاری خوای گەورە نەبێت ئەستەمە چواردە سەدە پێش ئێستا مرۆڤێك هەواڵی ڕاستییەکی لەو جۆرە بدات. هەر لەو ئایەتەدا ئیعجازێکیتری زانستی سەرنجی ڕاکێشا کە بریتییە لەوەی ئاو سەرچاوەی ژیانی هەموو زیندەوەرەکانە ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٠) دکتۆر میلەر دەڵێت: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، چونکە زانستی نوێ بەم دواییە سەلماندوویەتی کە خانەی زیندوو لە سایتۆپلازم دروست دەبێت کە ٨٠٪ی خانە پێکدەهێنێت سایتۆپلازمیش بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە ئاو پێکدێت، جا ئایا پیاوێکی نەخوێندەوار کە ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا ژیاوە لە کوێ هەموو ئەمانەی دەزانی ئەگەر پەیوەست نەبووبێت بە سرووشی خوای گەورەوە؟

چوارەم: پاشان لە وەڵامی ئەو دوژمنانەدا کە دەڵێن: شەیتانەکان یارمەتی موحەممەد ﷺ دەدەن. دکتۆر میلەر دەڵێت: سەیری قورئان بکە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ (الشعراء: ٢١٠–٢١٢) واتە: ئەی محمد ﷺ کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا. ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (النحل: ٩٨). واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خوا).



ئینجا دەڵێ: ئایا ئەمە شێوازی شەیتانە لە نووسینی کتێبێکدا؟ واتە: ئایا شەیتان هەرگیز دەچێت کتێبێك بنووسێت و پاشان بە خوێنەرەکەی بڵێت: کاتێ ئەم کتێبەم دەخوێنیتەوە پەنا بە خوا بگرە لە شەڕو خراپەی من، کەواتە ئەم قورئانە بە دڵنیایی تەنها خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی و تەنها خوا خاوەنی قورئانەو وتەی خۆیەتی.

پێنجەم: بەسەرهاتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو لەهەبی مامی یەکێکە لە موعجیزەکانی تری قورئان، کە کاریگەریی گرنگی لەسەر دکتۆر میلەر بەجێهێشتووە، چونکە هەرچی دوژمنایەتی لە توانای مرۆڤدا هەیە ئەبولەهەب نواندی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ و ئاینی ئیسلام، ئینجا هەتا لە دنیادا ما هەر بە کافری مایەوەو بە کافریش مردو موسڵمان نەبوو.

دکتۆر میلەر دەڵێت: دەساڵ پێش ئەوەی ئەبو لەهەب بمرێت لەسەر ئەو دوژمنایەتییە سەختەی دەربڕی بەرامبەر بە ئیسلام ئایەت هاتە خوارەوەو هەواڵی ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەبو لەهەب دەڕواتە دۆزەخەوە واتە: بە کافری دەمرێت و موسڵمان نابێت ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ﴾ (المسد: ١-٣).

ئەمەش هەلێکی باش بوو کە ئەبولەهەب دەیتوانی دەرفەتی لێوەربگرێت، تەنها بە ماوەی یەك خولەك لەو دە ساڵەدا ئیسلام هەڵبووەشێنێتەوە، واتە: دەیتوانی لەو ماوەیەدا ئەگەر بە درۆش بووایە بهاتایە لە پێش چاوی خەڵکیدا موسڵمان بوونی خۆی ڕابگەیاندایەو ئینجا بیوتایە: خەڵکینە ئێوە بەشایەت بن وا من موسڵمان بووم کەچی ئەبولەهەب تەنانەت بە درۆش ئەم هەنگاوەی نەنا کە لە بەرژەوەندی خۆی و زیانی ئیسلام بوو، بۆچی؟ چونکە هەر تەنها خوای گەورە هەواڵی چوونە دۆزەخی ئەبو لەهەبی لە قورئانەکەیدا ڕاگەیاندبوو، جا ئایا کێ دەتوانێت بە درۆی بخاتەوە؟ یان قسەی بەسەر بڕیاری قورئاندا زاڵ ببێت؟ بێگومان کەس ناتوانێت.

پاشان ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری خوا نەبووایە چۆن پرکێشی ئەوەی دەکرد بڕیارێکی لەو جۆرە دەربکات، لە کاتێکدا کە مامی دەتوانێ بە موسڵمانبوونێکی ڕووکەش و درۆینە لەپێش چاوی خەڵکیدا بە درۆی بخاتەوە؟ بەڵام لەبەرئەوەی بڕیارەکەی هی سرووشی خوای گەورەیە، نەك هی ئەو ئەوا بەوپەڕی بێباکی و متمانەبەخۆبوون بڕیارەکەی قورئانی ڕاگەیاند و ئەنجامی ئەبولەهەبیش هەر بەو جۆرە بوو کە قورئان فەرمووی. ئەمەش بەڵگەیەکی درەخشان و بەهێزی ترە لەسەر ئەوەی کە قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیەو موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خۆیەتی.

شەشەم: هەر لە جۆری ئەم موعجیزەیە دکتۆر میلەر نموونەیەکیتری دۆزییەوە کە تا ئێستا هەر بەردەوامە، ئەویش هەواڵدانی قورئانە بەوەی کە دوژمنترین کەس بەرامبەر بڕواداران لە پلەی یەکەمدا جوولەکەکانن، قورئان دەفەرموێت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ (المائدة: ٨٢) واتە: سوێند بێت دەبینیت ئەی محمد ﷺ خراپترین خەڵکی بۆ دوژمنایەتی لەگەڵ بڕواداراندا جولەکەو هاوبەش دانەرانن.

دکتۆر میلەر دەڵێت: ئەمەش موعجیزەیەکیتری غەیبی قورئانە کە تەحەدای داهاتوو دەکات، هەروەك لە هەمانکاتدا باشترین هەلە کە قورئان خۆی بۆ جوولەکەکانی ڕەخساندووە، واتە: دەتوانن لانی کەم بۆ چەند ساڵێك مامەڵەو سیاسەتیان لەگەڵ موسڵمانان بگۆڕن و ڕەفتاری باشیان لەگەڵدا بنوێنن. پاشان بڵێن ئەوەتا ئێمە دوژمنایەتیتان ناکەین و مامەڵەمان لەگەڵ ئێوەدا باشە، کەچی قورئانەکەتان ئێمە لە دوژمنی پلەیەك دادەنێت، خۆ وا ١٤٠٠ ساڵە ئەم ئایەتە تەحەدای جوولەکەکان دەکات و ئەوانیش هیچ هەنگاوێکی لەو جۆرەیان نەناوە، دیارە

نه ئێستا و نه لەمەولاش هەر ناتوانن هەنگاوی لەو جۆره بنێن، چونکه ئەمه بڕیاری خوای گەورەیه کە ئاگاداری هەموو غەیبێکەو بڕیاریش بالآدەستی هەموو بڕیارەکانه.

حەوتەم: سەرنجێکیتری دکتۆر میلەر له قورئانی پیرۆزدا ئەوەیه کە دەڵێ: ئەو ئایەتانەی کە لە دوای گرفتەکانی ڕێی بانگەوازی ئیسلام دەهاتنه خوارەوه بۆ پێغەمبەر ﷺ، مژدەی سەرکەوتنیان بە موسڵمانان دەدا، ئەو ئایەتانەش کە لە دوای سەرکەوتنەکانی پێغەمبەر ﷺو موسڵمانان دەهاتنه خوارێ، داوای ئەوەی لێ دەکردن کە لە خۆیان بایی نەبن و قوربانی و خۆبەختکاری زیاتر پێشکەش بکەن.

جا دکتۆر میلەر دەڵێ: ئەگەر قورئان سروشی خوای گەوره نەبووایه و هی کەسێك بووایه کە مێژووی ژیانی خۆی بنووسێت، دەچوو سەرکەوتنەکانی خۆی یەکجار بە گەوره له قەڵەم دەداو پاساوی جۆراوجۆریش بۆ شکستەکانی دەهێنایەوه، بەڵام قورئان لەم ڕێیەوه لەبەرئەوەی سروشی خوای گەورەیه زیاتر دەستووره گشتییەکانی پەیوەندی نێوان خواو بەندەکان ڕوون دەکاتەوه تا ئەوەی مێژووی قۆناغێك بگێڕێتەوه.

هەشتەم: هەر له بواری بەڵگەهێنانەوەی لەسەر ڕاستی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ، دکتۆر میلەر دەڵێ: گریمان لەناو ئەشکەوتەکەدا تۆ لەجێی پێغەمبەر ﷺ بوویتایه لەو دەمەدا کە ئەگەر کافران سەیری لای پێی خۆیان بکردایه ناو ئەشکەوتەکەیان لێ دەردەکەوت و ئێوەیان دەبینی، ئایا کاردانەوەی سروشتی تۆ لەسەر مەترسییەکانی ئەبوبەکر لەوه زیاتر دەبوو کە بڵێیت با هەوڵ بدەین دەرگایەکی پەنهان له پشتەوه بدۆزینەوه، یان بێدەنگ با کەس گوێی له قسەکانت نەبێت؟ کەچی پێغەمبەر ﷺ بەوپەڕی ئارامی و لەسەرخۆیی فەرمووی: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ (التوبة: ٤٠) واته: کاتێك ئەو دووانه پێغەمبەرو ئەبوبەکر له ئەشکەوتی (ثور) دا ئەو کاته به هاوەڵەکەی وت: خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانه.

موسڵمان بوونی دکتۆر میلەرو لێکۆڵینەوەکانی دکتۆر میلەر ساڵێکی خایاند، ئینجا دوای ئەوەی کە بەم ڕێگا زانستی و توێژینەوە بێلایەنانەی خۆی، هیچ دوو دڵییەکی بەرامبەر بە ڕاستی ئیسلام نەما، دڵی بۆ ئاینی ئیسلام کرایەوەو موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و ناوەکەشی گۆڕی بۆ (عەبدولئەحەد عومەر). دوای موسڵمان بوونی بۆ چەند ساڵێك لە عەرەبستانی سعودی وەك ئەندامێکی دەستەی وانەوتنەوە لە بەشی بیرکاری لە زانکۆی مەلیك فەهددا وانەی وتەوە.

ئینجا گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و بە تەواوی لێبڕا بۆ بانگەوازی ئیسلام و بانگهێشتی هاوڵاتیانی کەنەدا بۆ ئەم ئاینە پیرۆزە. دکتۆر دوای موسڵمان بوونی لەسەر چالاکییەکانی بەردەوام بوو، بەڵام بە پێچەوانەی چالاکییەکانی پێشووی، ئەوە بوو چەند مونازەرەیەکی لەگەڵ زانایانی نەسرانی ئەنجامدا کە خۆی پێشتر یەکێك بوو لەوان. شایانی باسە پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولئەحەد عومەر شارەزاییەکی باشی لە بواری بانگەوازی ئیسلامیدا هەیەو هەندێك لە بانگخوازان سوودیان لە شارەزایی ئەو وەرگرتووە، بۆ نموونە مامۆستا (ئەحمەد دیدات) خوا لێی خۆش بێت ساڵی ١٩٨٤ بانگهێشتی پرۆفیسۆر عەبدولئەحەدی کرد بۆ باشوری ئەفریقیا و لە سەنتەری جیهانی بانگەوازی ئیسلام لە شاری (دووربان)، پێکەوە کۆڕێکی هاوبەشیان گرت سەبارەت بە جیاوازی ڕاستەقینە لەنێوان موسڵمانان و مەسیحییەکاندا.

پرۆفیسۆر عەبدولئەحەد لە بابەتەکەی خۆیدا تیشکی خستەسەر ئەو فرت و فێڵانەی کە مونەسیرەکان لەگەڵ موسڵماناندا بەکاری دەهێن، بابەتەکانی ئەم کۆڕە هاوبەشە لە لایەن موحەممەد موختارەوە کراوە بە عەرەبی و دەزگای (المختار الإسلامي) لە قاهیرە ساڵی ١٩٩٥ چاپی کردووە. چالاکییەکانی دکتۆر لە خزمەتی ئیسلامدا زۆربەی لایەنە مۆدێرنەکانی بانگەوازی گرتەوە چەشنی پێشکەشکردنی بەرنامەکانی لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا و ئاراستەکردنی موحازەراتی گشتی و بە تایبەتی و نووسینی وتارو دانانی چەندین کتێب کە خزمەتی بانگەوازی ئیسلام دەکەن، وەك

(بەرپەرچدانەوەی مەسیحییەت لە گۆشەی ڕوانینی موسڵمانێکەوە)، (قورئانی سەرسوڕهێنەر)، (بناغەکانی باوەڕی موسڵمان)، (جیاوازی نێوان ئینجیل و قورئان)، (گفتوگۆ)، (پێنج جیاوازی لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەت)، (شیکردنەوەی موسڵمانێك بۆ مەسیحییەتی تەبشیری).

شایانی باسە هەندێ لە وتار و کتێبەکانی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکراونەتەوە، هەڵبژاردەیەکی خوای گەورە بۆ ناو ڕیزی پیاوچاکان هەروەکو دکتۆر میلەر سەبارەت بە سەرەتای ئایەتی (٨٢) و سورەتی (المائدة) باس لە دوژمنی پلەیەکی موسڵمانان کرد کە جوولەکەکانن، خۆیشی بەم لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنەی قورئان کە لە ڕێی بەکارهێنانی ویژدان و پێوەری زانستییەوە ڕاستی قورئانی بۆ سەلما و باوەڕی پێهێنا، نموونەیەکی بەرجەستەی داو باسی هەمان ئایەت و دوو ئایەتەکەی تری دوای ئەوە، کە لەو نەسرانیانە دەدوێن نزیکترین کەسن لەو موسڵمانانەوە بەوەی کە فیز و دەمار دەخەنە لاوەو چاویان ئەسرین هەڵدەڕێژێ کاتێ گوێیان لە قورئانی پیرۆز دەبێت، دەزانن سروشی هەق و ڕەوای خوای گەورەیە و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان وا باوەڕمان هێنا دە تۆش لای خۆت ناوی ئێمە بە شایەت تۆمار بکە لەسەر ئەم ئیمانە:

﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (المائدة: ٨٢-٨٤).




یەکەم: پرۆفیسۆر دکتۆر گاری میلەر کە ناوی خۆی گۆڕی و کردی بە پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولئەحەد عومەر، دوای موسڵمانبوونی و نرخ زانینی پلەوپایەی ئاینی

ئیسلام له وتارێكدا ئامۆژگاری موسڵمانان دەكات و دەڵێت: ئەی موسڵمانان ئەگەر بەهاو گرنگی و مەزنی ئاینەكەی خۆتان لەچاو ئاینەكانیتردا بزانن، ئەوا گەلێ سوپاسی خوای گەورە دەكەن لەسەر ئەوەی كە لە پشتی باوكانی موسڵمان ئێوەی بەدیهێناوە و لەباوەش دایكانی موسڵماندا ئێوەی گۆش كردووەو لەسەر ئەم ئاینە مەزنەش پەروەردەی كردوون، دڵنیابن جیاوازی واتاكانی: پێغەمبەرایەتی و سروش و زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی لای ئێوەو لای خەڵكانی تر هێندەی ماوەی نێوان زەوی و ئاسمانە.

دووەم: لە ئامۆژگارییەكیتریدا دەڵێت: دەبێ موسڵمانان هانی خەڵكانیتر بدەن كە بۆ خۆیان لە قورئان بكۆڵنەوە، چونكە قورئان هەموو شتێكی بە وردی باس كردووەو خۆیشی داوا دەكات كە خوێنەرانی لێی بكۆڵنەوە تاكو بە دڵنیایی بگەن بە هەقی ڕوون و بێگومان ئەوەش تایبەتمەندییەكی وەحی خوای گەورەیە.

***





## ٢ پەیوەندی نێوان هەورە قورسەکان و هەورە بروسکە ڕاستییەکی زانستییە:

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِی یُرِیكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفࣰا وَطَمَعࣰا وَیُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ﴾ (الرعد: ١٢) واتە: خوا ئەو زاتەیە بروسکەتان نیشان دەدات کە هۆی ترساندن و هیواو ئومێدتانە، هەروەها هەوری قورس بە ئاوی باران بەدیدەهێنێ.
با بزانین زانستی تازە چی دەڵێ: زانایان سەلماندوویانە کە هەورەکانی ئاسمان کێشیان بە ملیۆنان تەنە، واتە زۆر قورسن، چەند لێکۆڵینەوەیەك دەریانخستووە کە هەورە بروسکە پێویستی بە هەورە قورسەکانە کە بە هەورە کەڵەکەبووەکان ناودەبرێن، کەواتە ڕاستییە زانستییەکان دەڵێن: پەیوەندی لەنێوان هەورە قورسەکان یان کەڵەکەبووەکان و ڕوودانی هەورە بروسکەدا هەیە. ئەوەی کە مایەی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە کە قورئان پێش زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ باسی ئەم ڕاستیە زانستییەی کردووە هەروەك ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی بۆ کردووە بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە سوپاس بۆ خوای گەورە و میهرەبان.



## ٣ پێست دەبیستێت، ئاشکرابوونی ڕاستییەکی زانستی گەورە:

خوای پەروەردگار لە قورئانەکەیدا دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِیثِ كِتَـٰبࣰا مُّتَشَـٰبِهࣰا مَّثَانِیَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِینَ یَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِینُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَ ٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ یَهۡدِی بِهِۦ مَن یَشَاۤءُۚ وَمَن یُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ﴾ (الزمر: ٢٣) واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە، قورئانێکە کە ئایەتەکانی لەیەکچووی دووپاتکراوەن، ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن پێستیان تەزووی پیادێ بە بیستنی قورئان، پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی قورئانی خوا، ئەو قورئانە ڕێنموونی خوایە بەو

قورئانە ڕێنموونی هەر کەسێ دەکات کە بیەوێ هەرکەسیش خوا گومڕای بکات ئەوە ڕێنموونیکەرێك بۆ ئەو نییە.

گوێچکەکان تەنها هۆکار نین مرۆڤ پێی ببیستێت بەڵکو هۆکاری تریش هەیە کە ئەویش پێستە. ئایەتە قورئانییەکە باس لە ڕاستییەکی زانستی دەکات ئەویش کاریگەربوونی پێستە بەو دەنگەی بەری دەکەوێت ئەمەش لە ڕێگەی زانستی تازەوە سەلمێنراوە.

زانا کەنەدییەکان ڕایانگەیاندووە هەستکردن لە چینی پێستدا کاریگەری لەسەر چۆنیەتی بیستنی قسە لای مرۆڤ دەبێت، توێژینەوەیەکی زانستی نوێش ئاشکرای کردووە ئەو لەرەلەرە هەواییانەی نابیسترێن و لەگەڵ دەنگە ئاساییەکاندا دەبن، کاریگەرییان لەسەر بیستنی مرۆڤ دەبێت. ئەم توێژینەوەیە لەسەر دەنگە ئاساییەکان ئەنجامدراون بێگومان گەر لەسەر دەنگی قورئانی ئەنجام بدرایە ئەوا ئەنجامەکانی سەرسوڕهێنەرتر دەبوون. تیمی توێژینەوەکە دەڵێن: ئەوەی لە گۆڤاری سروشتی زانستیدا بڵاوکراوەتەوە تەنها کورتەیەکی توێژینەوەکە بووەو ئەنجامەکانی دەریخستووە کە دەنگ و وێنە تاکە هۆکار نین کاریگەریان لەسەر چۆنیەتی بیستنی مرۆڤ هەبێت، لە نوێترین توێژینەوەی زانستیدا زانایان سەلماندوویانە دەنگەکانی دەوروبەر کاریگەریان لەسەر پێست دەبێت، هەر ئەوەندەش نا بەڵکو زانیارییەکان بۆ مێشك دەگوێزرێنەوە، پسپۆڕان دەڵێن: ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەبێتە هۆی نوێکردنەوەو گەشەپێدان بە ڕێگەو هۆکاری نوێ بۆ باشترکردنی ئامێر بۆ ئەو کەسانەی کێشەی بیستنیان هەیە، لە ڕووی زانستییەوە زانراوە ئەو ئاماژە وێنەییانەی ئاڕاستەی ڕووخساری قسەکەر دەکرێت کاریگەری لەسەر چۆنیەتی بیستنی ئەو قسانە دەبێت کە کەسانی تر دەیکەن.

زانایان لەو توێژینەوەیەدا کە توێژەرانی زانکۆی کۆلۆمبیای بەریتانی لە شاری فرانکفۆرتی کەنەدی کردوویانە لەسەر چۆنیەتی کاریگەری لەرەلەرە دەنگییەکان لەسەر پێست و ئەگەری ئەوەی پێستیش کاریگەری لەسەر چۆنیەتی بیستنی

دەنگەکاندا دەبێت، لە ئەنجامدا لە ڕێگەی چەند تاقیکردنەوەیەکی دەنگی دیاریکراوەوە کە لەسەر کەسانی خۆبەخش ئەنجام درا، بۆیان ئاشکرا بوو مرۆڤ بەهۆی ئەو زانیارییانەی کە پێستیان هەستی پێدەکەن کاریگەریان تێبکرێت، لەگەڵ ئەو ئاماژە دەنگییانەی لە ڕێگەی گوێچکەکانەوە دێنە ژوورەوەو وەریدەگرن.

دکتۆر (برایان جیك) سەرۆکی تیمەکە دەڵێت: ئێستا سەرقاڵی گەشەپێدانی ئەو ئامێرانەین بۆ باشترکردنی توانای بیستنی ئەو کەسانەی کێشەی بیستیان هەیە چۆن سوود لەو توێژینەوەیە وەردەگرین؟ ئەم توێژینەوەیە ئەوە دەسەلمێنێت باشترین ڕێگە بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بەردەوام گوێ گرتنە لە قورئان هەتا کاریگەری لەسەر ئەندامانی جەستەمان دروست دەکات.

پێغەمبەریش ﷺ لە ڕێگەی گوێگرتنی لە جبریل (سەلامی خوای لەسەر بێ) قورئانی لەبەرکردووە، ئەمڕۆش خوای گەورە ئەو هەموو هۆکارەی بۆ فەراهەم هێناوین و پێی بەخشیووین وەك کۆمپیوتەر و سەتەلایت و تەسجیل.. لە ڕێگەی هەموو ئەوانەوە دەتوانین گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرین. هەروەها پێست تەنها بە دەنگ و زانیارییەکان کاریگەری نابێت بەڵکو ئەو زانیاریانە هەڵدەگرێت. لەبەرئەوە ئامۆژگاری بڕواداران دەکەین ڕۆژانە کاتێك بۆ گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز تەرخان بکەن کە گرنگترین سوودە تاقیکراوەکانیش:

**یەکەم:** چەسپ بوون و جێگیربوونی ئایەتەکان بەهۆی زۆر گوێگرتن لێیان واتە: گوێگرتن لە قورئانی پیرۆز ئاسانترین ڕێگەی بۆ لەبەرکردن و تێگەیشتن و وەڵامدانەوەی بانگەوازی خوای پەروەردگار خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ (الأنفال: ٢٤) واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خواو پێغەمبەر بدەنەوە کاتێك کە بانگتان بۆ لای ئەو ئاینەی کە زیندوتان دەکاتەوە، بشزانن بەڕاستی ویستی خوا دەبێتە بەربەست لەنێوان ئادەمی و دڵیدا واتە ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەیە بە سەر دڵی بەندەکانیدا وە بەڕاستی هەر لای ئەو کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا.

دووهم: چارەسەرکردن بەو ئایەتانە هەروەك ئەوەی پێست بە دەنگی قورئان کاریگەری تێدەکرێت بە هەمان شێوە دڵ و مێشك و چاو و گوێچکەکان و هەموو دەزگاکانی جەستە کاریگەرییان تێدەگرێت، هەروەها هەموو خانەیەك لە خانەکانی جەستە لەو خانانەش خانەکانی دەزگای بەرگری کە بەهۆیەوە جەستە بەرگری بۆنە خۆشییەکان پەیدات دەکات. خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن ئایەتەکە فەرمووی: پێست دەبیستێت زانستی تازەی سەردەمیش دەقاودەق ئەو ڕاستییە گەورەیەی سەلماند سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزە.



## با ڕۆڵی هەیە لە پێکهێنانی هەورەکاندا:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ (الحجر: ٢٢) واتە: بامان ناردووە بەهۆی پیتێنران بۆ دارو درەخت و ڕووەك ئینجا لە ئاسمانەوە بارانمان باراندووە ئێوەمان پێ تێراو کردووە لە کاتێکدا ئێوە نەتانتوانیوە ئەو ئاوە خەزن بکەن.

زانایان ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە با ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە پێکهێنانی هەورەکاندا، بایەکە هەڵمی ئاو و گەردی تەپوتۆز پاڵدەنێن و وەك پیتاندانی ناوك کاردەکات و هەر ناوکێك ملیۆنان دڵۆپیلەی لێ کۆدەبێتەوە بۆ ئەوەی دڵۆپە ئاوێك پێکبێنن، بەم شێوەیە با هەڵدەستێت بە پیتاندنی هەورەکان تا بارانیان لێوە ببارێت ئەمەش قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ پێش لێکۆڵینەوەی ئەو زانایانەی سەردەم باسی ئەم ڕاستیە گەورەیەی کردووە.






## ٥ بیرکردنەوەی دڵ ڕاستییەکی زانستییە:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ (الحج: ٤٦) واتە: ئایا ئەوانە بە زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێ بیری پێبکەنەوە لەو وێران بوونە یا گوێیان هەبێ گوێی پێ بگرن بۆ ڕاستی، لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان.

دڵ تەنها ترومپایەکی خوێن نییە بەڵکو زۆر لەوە زیاترە زانایانی سەردەمی تازە باس لە مێشکێك دەکەن کە لە دڵدایەو (٤٠٠٠٠) دەمارەخانە پێکدێت، واتە: وەك ئەوەی ناوم ناوە هۆش یان ئەقڵ لە ناوەندی دڵدا هەیە ئەوە کە هەڵدەستێت بە ئاڕاستەکردنی مێشك بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە کە قورئان پڕ لە زانست و پیرۆزەکەی، خوا چەندەها سەدە پێش ئەم زانایانەی سەردەم باسی ئەو ڕاستییە گەورەیەی کردووە، لە ئایەتە پیرۆزەکەدا ئەوە دووپاتدەکاتەوە و جەختیان لێدەکاتەوە کە دڵ بیر دەکاتەوەو دەزانێت و هۆشمەندە. خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن ڕاستیەکانی قورئان وەك ڕۆژی ڕووناك لە سەردەمی تازەدا ئاشکرا دەبن سوپاس بۆ خوای گەورە خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزە.

***





## کردنەوەی دەروازەیەك لە دەروازەکانی ئاسمان و دەرکەوتنی سێ موعجیزەی زانستی گەورە:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ۝ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ (الحجر: ١٥) واتە: ئەگەر بۆمان بکردنایەتەوە دەرگایەك لە ئاسمانەوەو ئەوان پیایدا بڕۆنە سەرەوە ئەوسا دەیانوت: بێگومان ئێمە چاومان بەستراوە بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە.

زانایان هەستان بە دۆزینەوەی نهێنییەکانی دەرچوون لە پشتێنەی کێشکردنی زەوی، بینیان کە زەوی بە بواری کارۆموگناتیسی و بواری هێزی کێشکردن دەورە دراوە، ئەم بوارانەش دەتوانێت کەشتییەکە لە ڕێڕەوی ئاسایی خۆی لابدات، لەبەرئەوە پێویستە لە شوێنێکی دیاریکراوەوە یا دەروازەی دیاریکراوەوە دەربچن بۆ ئەوەی کەشتییەکە سەرکەوتوو بێت. لێرەدا تێبینی دەکەین ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لەسەرکردنەوەی دەروازەیەك لە دەروازەکانی ئاسمان دەکات، هەروەها باس لە جووڵەی ئەوانە دەکات کە بەرز دەبنەوە لەو دەرگایەوە کە بریتییە لە هەڵکشان بەرزبوونەوە.

لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك لەسەر ئەم دوو موعجیزەیە بکەین کە تەنها لەم ئایەتەدا هاتووە بە دڵنیایی و بێ گومان ئەم قورئانە لەلایەن خوای خاوەنی ئەم جیهانە دابەزێنراوە بۆ پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ، ئەگینا پێغەمبەر ﷺ چۆن و بە چ شێوەیەك ئەوەی زانی؟ کە ئاسمانەکان دەرگای هەیەو دەکرێنەوە و دادەخرێن یان جووڵە لە ئاسماندا بریتییە لە جووڵەی هەڵکشان بەرزبوونەوە، کەواتە ئەو زاتەی کە موحەممەد پێغەمبەری فێرکردووە تەنها خوای بەدەسەڵات و بەدیهێنەری ئاسمانەکانە شتێك کە ئەو گەشتیارە ئاسمانیانەی بەرزبوونەتەوە بۆ سەر مانگ دەڵێن: یەکەم شت دوای بڕینی بەرگە هەوا کە دووچاریان بووە بریتی بووە لە تاریکییەکی بەهێز لەو کاتەدا مرۆڤ وا گومان دەبات کە چاوەکانی لەکار کەوتوون ئەوەندە تاریکاییەکی بەهێزە. تەنانەت ئەو پزیشکانەی سەرپەرشتیاری باری تەندروستی و سەلامەتی

گەشتیارە ئاسمانیەکانیان دەکرد، بینیان کاتێك مرۆڤ لە هێزی کێشکردنی زەوییەوە دووردەکەوێتەوە واتە: دەگاتە دەرەوەی ئەو هێزی کێشکردنە بە شێوەیەکی کاتی هەستەوەری دەمار بینینی لەکار دەکەوێت و، ناتوانێت هیچ شتێك ببینێت وەکو ئەوەی چاوەکانی داخرابن، ئەمەش بەهۆی نەبوونی هێزی کێشکردنەوە ڕوودەدات، کە سەرەنجام دەبێتە هۆی تێکچوونی سووڕی خوێن و زیندە کارلێکەکان لە جەستەی مرۆڤدا، پاك و بێگەردی بۆ خوای بەتواناو بە دەستەڵات و دانا و زانا.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەم ڕووداوەی زۆر بە وردی ڕوون کردۆتەوە سەبارەت بەم ڕووداوە کتوپڕە واتە: بەو کەسانەی دەڕۆنە دەرەوەی پشتێنەی هێزی کێشکردنی زەوی هەواڵمان پێدەدات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ۝١٤ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ﴾ (الحجر: ١٥) واتە: ئەگەر بۆمان بکردنایەتەوە دەرگایەك لە ئاسمانەوەو ئەوان پیایدا بڕۆنە سەرەوە ئەوسا دەیانوت: بێگومان ئێمە چاومان بەستراوە بەڵکو ئێمە کۆمەڵێکین جادوومان لێکراوە ئەم ئایەتە پیرۆزە سێ موعجیزەی زانستی گەورەی ئاشکرا کردووە:

یەکەم: ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ ئەگەر دەروازەیەکیان لە ئاسمانەوە بۆ بکەینەوە واتە: باس لە دەرچەکانی بەرگەهەوا دەکات.

دووەم: ﴿فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ﴾ تا پیایدا سەربکەون باس لە شێوازی بەرزبوونەوە هەڵکشان دەکات.

سێیەم: ﴿لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا﴾ دەڵێن: بێگومان چاوبەستمان لێکراوە، باس لەو تاریکییە دەکات کە لە دەرەوەی بەرگەی هەوادایە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەم ئایەتە پیرۆزە هەواڵ بە سەردەمی کەشناسی دەدات وەك سەردەمی تازەی ئەمڕۆ ئامێری ئەندازیاری زۆر پێشکەوتوو دروستکراوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەهۆیەوە بچێتە دەرەوەی پشتێنەی کێشکردنی زەوی، ئەمەش پێش ئەوەی ئەندازیارانی بواری کەشناسی بیدۆزنەوە قورئانیش پێش (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر باسی لێوەکردووە، موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە.



## دۆزینەوەی نهێنییەکانی سپی بوونی قژی مرۆڤ:

یەکێك لە دۆزینەوە زانستییە نوێکان باس لە هۆکارەکانی سەر سپی بوون دەکەن، بەڵام ئایا قورئانی پیرۆز باسی لەم ڕاستییە زانستییە کردووە؟

لە بەرواری ٢٠٠٩/٢/٢٣ دەزگا پسپۆڕی و گشتییەکان هەواڵی دۆزینەوەی چەند تیمێکی زانا ئەڵمانی و بەریتانییەکانی بواری فیزیایی زیندەییان بڵاوکردەوە، کە ئەو زانایانە گەشتنە ئەو ڕاستییەی زۆربوونی بەرهەمهێنانی شلەی (بیرۆکسیدی هایدرۆجین) یەکێکە لە هۆکارە دیارەکانی سەرسپی بوون، لەگەڵ بەرەوپێشچوونی تەمەندا هۆکارەکانی دیکەش پەیوەستن بە هۆکاری دەروونی و بۆماوەییەوە، ئەوەی سەرسوڕهێنە قورئانی پیرۆز لە سێ ئایەتدا باسی لە بابەتی سەرسپی بوون کردووە:

یەکەمیان: ئاماژە بۆ ڕوودانی کارلێکی کیمیایی دەکات کە دەبنە هۆی سەرسپی بوون:

دووەم: باس لە هۆکاری دەروونی دەکات وەك ترسێکی زۆر.

سێهەمیش: باس لە هۆکاری بۆماوەیی و بەرەوپێشچوونی تەمەن دەکات ئەمەش بە تەواوی وەك ئەوە وایە کە زانایان لە نوێترین دۆزینەوەی نهێنییەکانی سەرسپی بووندا پێی گەیشتوون، ماددەی پرۆکسیدی هایدرۆجین ($H_2O_2$) کە شلەیەکی ڕوونە لە ناو قورسترەو کار دەکاتە سەر پێست و دەیسوتێنێت، ئەم شلەیە ئەگەر گەرمی لە سنوری سەد پلەی سەدی بەرکەوت ئەوا بە تاو دەسوتێت، ئەم شلەیە قابیلی گڕگرتن و تەقینەوەیە و بەرەوپێش چوونی تەمەن زیاد دەکات و بەو شێوەیەش کارلێکی کیمیایی ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی سەرسپی بوون، چونکە لەش ناتوانێت ئەو برە زۆرو گەورانە بۆ پێکهاتووە بنەڕەتییەکانیان هەڵوەشێنێتەوە.

لە ئەنجامی ئەوەدا پیرۆکسیدی هایدرۆجینەکە هەڵدەستێت بە ئۆکساندنی بەشێك لە ماددەی (تیروسینان)، ئەویش هەڵناسێت بە بەرهەمهێنانی بۆیەی میلانینی مووەکان. جێی ئاماژەیە ماددەی میلانین سەرچاوەی پێکهێنانی ڕەنگی قژ و چاو و

پێستە، بەم جۆرە زیادبوونی ماددەی پرۆکسیدی هایدرۆجین لەگەڵ بەرەوپێشچوونی تەمەندا دەبێتە هۆی سەرسپی بوون، واتە: ئەم ئۆکساندنە دەبێتە هۆکاری ڕاستەوخۆ بۆ سپیبوونی موو وەك زانراوە ئۆکساندن و سوتان یان گڕگرتن هەمان ناوە بۆ ئەو کردارە پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەم ڕاستییە زانستییەی پێش (١٤٠٠) ساڵ بۆی باسکردووین، خوای گەورە لەسەر زمانی زەکەریا لە سورەتی (مەریەم)دا دەفەرموێت: ﴿كٓهيعٓصٓ ۝ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ۝ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ۝ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ (مريم: ١-٤) واتە: بە (کاف، ها، یا، عەین، صاد) دەخوێندرێتەوە ئەمەی دەخوێندرێتەوە بەسەرتدا باسی بەزەیی پەروەردگارتە بە بەندەی خۆی کە زەکەریایە، لە کاتێکدا پاڕایەوە لە پەروەردگاری بە پاڕانەوەیەکی نهێنی و پەنامەکی وتی: پەروەردگارم بەڕاستی من ئێسکم لاواز بووە لە بەر پیری مووی سەرم بریقە دەداتەوە پەروەردگارم هەرگیز لە پاڕانەوەم لێت بێهیوا نەبووم.

سەرنج بدە چۆن خوای گەورە باس لەوە دەکات کە سەر بە سوتاندن سپی دەبێت ﴿وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا﴾ نافەرمووێت: بە سوتاندنی موەکان سپی دەبێ، ئێمە بە ڕووکەش وا دەبینین کە گۆڕانی ڕەنگەکە لە قژەکاندایە بەڵام لە ڕاستیدا سوتان یان ئۆکساندنە کە لەناو لەشدایە، ئەوەش بوو کە دەیان زانا بە نوێترین ئامێر و بۆماوەیەکی درێژ لە لێکۆڵینەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامە. هەموو کەسێکی خاوەن ژیری و ویژدانی زیندوو جگە لە بەڕاست زانین و دانپیانان بە گەورەیی و دەسەڵاتی خوای گەورە شتی دیکە ناڵێن.

- یەکێکی تر لە موعجیزەکانی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە پەیوەندی بە لاوازبوونی ئێسکەکان لەگەڵ بەرەوپێش چوونی تەمەنەوە هەیە، لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئێسکەکان زۆر کاریگەریان لەسەر دەبێت لەگەڵ زیادبوونی تەمەن، لێکۆڵەرانی ئەم بوارە دەڵێن: لەگەڵ پیربووندا چڕی ئێسکەکان بەرەو کەمی دەچێت پاش ئەوە مرۆڤی بەتەمەن تووشی نەخۆشی پووچبوونی ئێسکەکان

(osteoporosis) دەبێت کە دەبێتە هۆی لاوازبوونیان، قورئانی پیرۆز بە ﴿وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ﴾ ئاماژەی پێکردووە ئەوە دەربڕینێکی زۆر وردەو پڕاوپڕی مانا زانستییەکەیە، چونکە ئێسکەکان زۆر لاواز دەبن بە جۆرێك لەژێر هەر پەستانێکدا دووچاری شکاندن دەبنەوە.

لێکۆڵەرەوان ئاماژە بەوە دەکەن ئەگەر کەسێك پارێزگاری لە وەرزش بە بەردەوامی بکات، ئەگەری تووشبوونی بەم حاڵەتە کەم دەکاتەوە، هەر بۆیە خوای گەورە فەرمانمان بە پاراستنی نوێژەکانمان پێدەکات، چونکە نوێژ وەرزشێکی دووبارەیە کە هەموو ئەندامەکانی لەش بەشداری تێدا دەکەن، ئەوەش دەبێتە هۆی چالاکی ماسولکەکان و پارێزگاری لە پتەوی ئێسکەکان، لەگەڵ زیادبوونی تەمەنیشدا هۆکارێکی تری پووچبوونی ئێسکەکەکان دابەزینی هۆرمۆنەکانی ڕەگەزە، لەگەڵ پیربووندا پەیوەندییەکی سەیر لەنێوان لاوازبوونی ئێسك و سپی بوونی قژدا هەیە، ئەویش ئەو لاوازییەی تووشی ئێسکەکان دەبێت بە بەرەوپێشچوونی تەمەن کار دەکەنە سەر ئەو خانانەی کە بەرپرسن لە ڕەنگکردنی قژ، قورئانی پیرۆزیش لە ئایەتێکدا هەردوو حاڵەتەکەی پێکەوە بەستووە: ﴿وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا﴾.

ئەوەش لەگەڵ لێکۆڵینەوە زانستییەکان کە سپیبوونی قژ و لاوازبوونی ئێسکەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، دەگونجێت لە ئاماژەیەکی تری قورئاندا باس لە حاڵەتی دەروونی و سپیبوونی مووی سەر دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكَيۡفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرۡتُمۡ يَوۡمٗا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا﴾ (المزمل: ١٧) واتە: چۆن خۆتان دەپارێزن لە ڕۆژێك کە منداڵ پیردەکات و سەری سپی دەبێت؟

هەموو دەزانین کە ئەو ڕۆژە چەند سامناکەو نازانین ئایا چارەنووسمان بۆ کوێمان دەبات؟ ئەمەش بێگومان حاڵەتی دەروونی ئاڵۆز دەکات، لێکۆڵینەوە زانستییەکان کە پسپۆڕان پێی هەستاون ڕایدەگەیەنن کە هۆکاری دەروونی ترس و تێکچوونی باری دەروونی دەبێتە هۆی تێکچوونی سیستەمی ئەنزیم و ڕژێنەکان و کاری خانەکان، کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر خێرا دەرکەوتنی سپیبوونی قژ.

له كۆتاييدا ئاماژه بەو ئايەتە پيرۆزەی قورئان دەكەين، كه ئەويش موعجيزەو ڕاستييەكی تری زانستييه دەربارەی هۆكارێكی ديكەی سەرسپی بوون كه گۆڕانكاری ڕەنگی قژ به بەرەوپێش چوونی تەمەن دەبەستێتەوه به لاوازبوونی خانەكانی لەشەوه، دوای ئەوەی كه بەهێز و چالاكبوون، خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾ (الروم: ٥٤) واته: خوا زاتێكه ئێوەی دروست كردووه له لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شيرەخۆر، پاشان دوای لاوازی بەهێزی كردوون بوون به لاو له دوای بەهێزكردنتان لاوازی و پيری بۆ دانان خوا هەرچی بوێت دروستی دەكات، وه هەر ئەوه زانای به دەسەڵات.

ڕاستيه زانستييەكەش دەڵێت: بەرەوپێشبوونی تەمەن دەبێته هۆی لاوازبوونی كرده زيندەييەكانی ناو خانەكان بەو جۆرەش دەركردنی ماددەی بۆيه كەم دەبێتەوه، قژ ورده ورده ڕەنگی بەرەو سپی بوون دەچێت، چونكه ئيتر خانەكان توانای بەرهەمهێنانی بۆيەی پێويست بۆ ڕەنگكردنی قژيان نەماوه، ئەم ئايەتەش موعجيزەيەكی تره له موعجيزەكانی خوای گەوره كه ئاماژەيه بۆ سووڕی ژيان و ئەوه دەخاته ڕوو كه توانای جەستەی مرۆڤ جێگير نييەو لەگەڵ بەرەوپێشچوونی تەمەندا دەگۆڕێت، ئەم ڕاستيەش زانايان تازه دۆزيويانەتەوه.

***

## ٨ ئێسك دەگۆڕێت بۆ بەرد یان ئاسن:

ئەگەر تەرمی مرۆڤێك یان هەر گیانداریك لە ناوچەیەکدا نێژرا کە توخمی سلیکای زۆر تێدابوو، ئەوا پەیکەری مردووەکە دەگۆڕێت بۆ بەرد بە تێپەڕبوونی کات، بەڵام ئەگەر پەیکەرە ئێسکیەکە لە ناوچەیەکدا بوو کە توخمی (بیریت) یان ئاسنی بیریتی (Ironpyrite) تێدابوو، کە بریتیە لە دووەم گۆگردیدی ئاسن (EeSz) ئەوا بە تێپەڕبوونی کات هەموو پەیکەرە ئێسکیەکە دەگۆڕێت بۆ ئاسن، بە هەموو سیفەتە جیاکەرەوەکانی ئاسنەوە، خوای گەورە ئاماژە بەو ڕاستیە زانستییە گەورەیە دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ۝٤٩ ۞قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ۝٥٠ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا﴾ (الإسراء: ٥١)

واتە: بێباوەڕەکان دەڵێن: ئێمە کە بووینە ئێسك و پروسك ئیتر کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ پێیان بڵێ ئەگەر ببینە بەرد یان ئاسن و یان هەر شتێکی تری لای ئێوە گەورە بێت، هەر خوای گەورە دەتوانێت بتانگێڕێتەوەو زیندوتان بکاتەوە وەك یەکەم جار کە دروستی کردوون، ئەوانیش سەر دەلەقێنن و دەڵێن کەی ئەوە دەبێت تۆش ئەی محمد پێیان بڵێ لەوانەیە ئەوە زۆر نزیك بێت، واتە: ئەگەر واشتان لێبێت خوا هەر زیندوتان دەکاتەوە ئەو ئایەتانە باس لە نکوڵی بێبڕواکان دەکات لە زیندووبوونەوەی پاش مردن. لە هەمان کاتدا ئاماژەیەکی زانستی زۆر گەورەی تێدایە کە لەم سەردەمەدا دۆزراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە پەیکەری ئێسکی مردوو دەگۆڕێت بۆ ئاسن یان بەرد کە ئەوەش لە ئێستادا نەك هەر ڕاستییەکی زانستییە، بەڵکو بناغەیە بۆ لقێکی گرنگ لە زانستەکان ناوی (زانستی بە بەردبووەکان) واتە: (palecontology)یە، بەوەش قورئانی پیرۆز پێش زانستی سەردەم دەکەوێت لەو زانستە گرنگەدا، دەی کێ موحەممەدی ﷺ نەخوێندەواری فێری ئەو زانستە کرد؟ بەڵێ خوای گەورە زاناو ئاگادار بە هەموو نهێنییەکان فێری کرد.



## ئیعجازێکی ژمارەیی لە مانەوەی هاوەڵانی ئەشکەوت:

هاوەڵانی ئەشکەوت (٣٠٩) ساڵ بە خەوتوویی مانەوە، جێگای سەرسووڕمان ئەوەیە کاتێك ژمارەی وشەکان لە سورەتی کەهف دەژمێرین لە وشەی (لَبِثُوٓاْ)ی یەکەم کە واتای تێدامانەوەیە لە سەرەتای چیرۆکەکە ﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا﴾ (الكهف: ١٢) هەتا وشەی (لَبِثُوٓاْ) دەبینین ژمارەی وشەکان بە تەواوی (٣٠٩) وشەیە بە هێندەی ژمارەی ساڵەکانی هاوەڵانی ئەشکەوت کە تیایدا مانەوە. جارێکی تر جێگای سەرسووڕمانە کە وشەی (مِاْئَةٍ ) واتە: سەد لە دەستەواژەی (ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ) واتە: سێ سەد ژمارەیەکی ڕێك (٣٠٠)ی تەواوە پرسیارەکە ئەوەیە ئەمە چی دەگەیەنێت کە ژمارەی وشەکان لە (لَبِثُوٓاْ) هەتا (لَبِثُوٓاْ) بە تەواوی یەکسانە بە ساڵەکانی مانەوەیان کە (٣٠٩) ساڵە؟

یان چی دەگەیەنێت کە وشەی ﴿ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ﴾ لە (٣٠٠)هەم وشە هاتووە کە لەگەڵ واتای وشەکە ڕێکە. ئەمە واتای ئەوەیە کە خوای گەورە ئەم سوورەتەی دابەزاندووە و ئەو موعجیزە ژمارەییە گەورەیەی تیادا داناوە تا بەڵگەیەك بێت لەسەر ڕاستییەکەی، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە لە قورئانەکەیدا فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دنیاوە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەو قورئانە ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

***



## پرۆفیسۆر (ئارسەر ئەلیسۆن) موسڵمانبوو کە گوێبیستی ئایەتێك بوو لە قورئان:

کاتێك پرۆفیسۆر (ئارسەر ئەلیسۆن)ی سەرۆکی بەشی ئەندازەی کارەباو ئەلیکترۆن لە زانکۆی لەندەن گەیشتە قاهیرە لە ساڵی ١٩٨٥، بە مەبەستی بەشداریکردن لە کارەکانی کۆنگرەی پزیشکی ئیسلامی نێودەوڵەتی، دەربارەی ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا، ئەوکات لەگەڵ خۆیدا ئەو توێژینەوەیەی خۆی هێنابوو کە تیایدا باسی چۆنیەتی چارەسەرکردنی گرفتە دەروونی و ڕۆحییەکانی کردبوو لەژێر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆزدا، لەگەڵ توێژینەوەیەکی تر سەبارەت بە خەوتن و مردن و پەیوەندی نێوانیان لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی (٤٢) لە سورەتی (الزمر) کە دەفەرموێت:

﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: خوای گەورە گیانی نەفسەکان دەکێشێت لە کاتی مردنیاندا ئەوەش کە نەمردووە لە کاتی خەوتنیدا ڕۆحی دەکێشرێت، ئەوکات ئەوەیان دەگرێت و گلی دەداتەوە کە مردنی بەسەردا هاتووەو ئەوی تریان کە خەوتووە دەگەڕێتەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو لە ئایندەدا، ئەوانە بەڵگەو نیشانەگەلێکن بۆ کەسانێك بیر بکەنەوە.

سەیرەکە لەوەدابوو کە ئەم زانایە ئەوکات هێشتا موسڵمان نەبووبوو بەڵکو تەنها ئەوەندە بوو کە ئیسلامی وەك ئاینێك بەلاوە پەسەند بوو، پاش ئەوەی توێژینەوەکەی پێشکەش کرد لە کۆنگرەکەدا دانیشت بۆ ئەوەی بەشداری لە کارەکانی کۆنگرەکەدا بکات و گوێ بگرێت لەو توێژینەوانەی تر، کە باس لە ئیعجازی زانستی لە قورئانی پیرۆزدا دەکەن تەواو سەرسام بوو زیاتر لەوە دڵنیا بوو کە ئەمەیە ئایینی ڕاست، هەموو ئەوانەی دەربارەی ئیسلام دەیبینێت بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم ئاینە ئاینی ئەقڵ و زانستە. کاتێك ئەو هەموو بەڵگە زۆرەی لە قورئان و فەرموودە بینی کە باس

له بوونەوەر و بەدیهێنراوەکان دەکات و دواتریش زانستی نوێ پشتگیری لێ دەکات و ڕاستییەکانی دەسەلمێنێت، ئەوکات بۆی دەرکەوت کە ناکرێ و مەحاڵە ئەمە لەلایەن مرۆڤەوە بێت، بۆیە دڵنیابوو لەوەی کە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ چواردە سەدە لەمەوپێش ڕایگەیاندووە دەیسەلمێنێت کە ئەوە بێگومان پێغەمبەر و نێردراوی خوایە.

بۆیە پرۆفیسۆر (ئارسەر ئەلیسۆن) دەستی کرد بە پرسیارکردن لەوانەی کە لەگەڵیدا دانیشتبوون، داوای ڕوونکردنەوەی زیاتری لێدەکردن سەبارەت بە هەموو ئەو وردەکاریانەی کە مەبەستی بوو بیزانێت لەبارەی ئیسلامەوە، وەك بیروباوەڕێك و پەیڕەو و پرۆگرامێك بۆ ژیانی دنیا، تا سەرەنجام هیچ ڕێگایەکی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت باوەڕهێنانی خۆی بە ئیسلام ئاشکرا بکات و بۆ هەموو ئامادەبووانی ڕابگەیەنێت.

بۆیە لە شەوی کۆتایی کۆنگرەکەو لەبەرچاوی کامێراکان و لەبەردەم پەیامنێرانی ئاژانسە هەواڵییە جیهانییەکانداو لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، پرۆفیسۆر (ئارسەر ئەلیسۆن) هەستایە سەرپێ و ڕایگەیاند بۆ هەمووان کە ئیسلام ئایینی ڕاستەو ئەو ئاینەیە کە لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا گونجاوە. دواتر بە دەنگێکی بەرز و بە ئیمانێکی دامەزراوەوە شەهادەی هەقی ڕاگەیاندو وتی: (أَشْهَدُ أن لا إِلهَ إلا الله وَأَشهَدُ أن مُحمداً رَسُول الله).

لەو کاتەدا دەنگی (الله أكبر)ی ئامادەبووان بەرزبوویەوەو فرمێسکی شادی لە چاوی هەندێك لە ئامادەبوواندا باری، لە ئاست گەورەیی و سام و هەیبەتی ئەم دیمەنە پڕ شکۆیەدا. پاشان پرۆفیسۆری بەریتانی ناوی نوێی خۆی بۆ ئامادەبووان ئاشکرا کرد کە بریتی بوو لە (عەبدوڵا ئەلیسۆن)، دواتر دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ ئیسلامدا و وتی: لە چوارچێوەی گرنگیدانم بە زانستی دەروونناسی و زانستی ئەودیوی دەروون، کاتێك سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندنی دەروونی و ڕۆحی بەریتانی بووم بۆ ماوەی چەندین ساڵ دەمویست ئاینەکان بناسم، دەستم کرد بە خوێندنیان وەك بیروباوەڕەکان کە یەکێك لەو بیروباوەڕانە بیروباوەڕی ئیسلامی بوو،



بینیم لە هەموویان گونجاوترە لەگەڵ ئەو فیترەتەی کە مرۆڤی لەسەر بەدیهێنراوە. وە لە هەموویان زیاتر گونجاوە لەگەڵ عەقڵ بەوەی کە دەڵێت: (خوایەکی تاك و تەنهای بە دەسەڵات و بەتوانا بەسەر بوونەوەردا هەیە)، هەروەها ئەو ڕاستییە زانستیانەی کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوون پێش لە چواردە سەدە ئێستا زانستی سەردەم دەیسەلمێنێت و پەسەندی دەکەن. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە سەرچاوەی ئەمە هەرگیز لەلایەن مرۆڤەوە نییەو پێغەمبەری ئیسلامیش ﷺ بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوایە.

دواتر پرۆفیسۆر عەبدولا ئەلیسۆن بەشێك لەو توێژینەوەیەی خستەڕوو کە لە کۆنگرەکەدا بەشداری پێکرد بوو دەربارەی حاڵەتی مردن و خەوتن لە چوارچێوەی ئایەتی (٤٢)ی سوورەتی (الزمر)، پرۆفیسۆر ئەلیسۆن ئەوەی سەلماند کە گیانکێشان لەم ئایەتەدا بە واتای مردن و بە واتای خەوتنیش هاتووە، مردن گیانکێشانێکی یەکجاری و نەگەڕاوەیەو ئەو گیانە جارێکی تر لە دنیادا ناگەڕێتەوە بۆ ناو ئەو لاشەیە، لە کاتێکدا خەوتن گیانکێشانێکی کاتییەو گیانەکە دەگەڕێتەوە ناو لەشی مرۆڤە خەوتووەکە، کە ئەم ڕاستییەش سەلمێنراوە لە ڕێگەی خوێندنی پاراسایکۆلۆجی و پشکنینە سەر قەرەوێڵەییەکان، بەهۆی وێنەی مێشك و وێنەی دڵا بێجگە لە وەستانی هەناسەدانی ئەو کەسە کە وادەکات پزیشکەکان مردنی کەسەکە ڕابگەیەنن یان نەمردن و لەهۆشخۆچوونی ئەو کەسە بەهۆی بوورانەوە یان خەوتنییەوە، بەو پێیە زانست سەلماندوویەتی کە مردن و خەوتن دوو دیاردەی هاوشێوەو لەیەکچوون ڕۆح دەردەچێت و دەگەڕێتەوە لە حاڵەتی خەوتندا، لەکاتێکدا ئەو ڕۆحە کە دەرچوو لە حاڵەتی مردندا ئەوا جارێکی تر لە دنیادا ناگەڕێتەوە بۆ ناو لەشی مردوو.

پاشان زانای بەریتانی موسڵمان پرۆفیسۆر ئەلیسۆن ئەوەی خستەڕوو کە بەڵگە زانستییەکانی ئیسلام چاکترین و گونجاوترین هۆکارن بۆ بانگەوازی ئیسلامی، بە تایبەت بەرامبەر بەو کەسانەی پشت بە بەڵگە زانستی و عەقڵییەکان دەبەستنەوە بەڵگەی پێ دەهێننەوە، بۆیە پرۆفیسۆر عەبدوڵلا ئەلیسۆن ئەوەی بۆ ئامادەبووان

ڕاگەیاند کە لە داهاتوودا هەڵدەستێت بە دامەزراندنی پەیمانگایەکی ئیسلامی بۆ خوێندنی زانستە دەروونییەکان لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا، لەبەر ڕۆشنایی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، سەرەڕای گرنگیدان بە خوێندنی ئیعجازی پزیشکی لە ئیسلامدا بە مەبەستی گەیاندنی ئەم ڕاستیانە بە جیهانی ڕۆژئاوا کە هیچ شتێك دەربارەی ئیسلام نازانن. هەروەها بەڵێنی دامەزراندنی کتێبخانەیەکی ئیسلامی گەورەی دا بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی وەك ئاسانکاری و هاوکارییەك بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت توێژینەوەی زانستی ئەنجام بدەن لەبەر ڕۆشنایی ئیسلام.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن موعجیزەکانی قورئانەکەی خوای گەورە وەك ڕۆژی ڕووناك ئاشکرا دەبن لە سەردەمی تازەی زانستدا ئەوەش سەلمێنەری ئەوەیە کە ئەم قورئانە لەلایەن خواوە هاتووە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی.

***



## ١١ خانەکانی پێست هەڵگری بیرەوەرین:

زانایان ئاشکرایان کرد خانەکانی پێست بۆ ماوەیەکی درێژ بیرەوەری هەڵدەگرن وەك ڕووداوەکان و ئەو دەنگانەی لە دەوروبەرمانن دەتوانرێت ئەو بیرەوەرییانە لە دواییدا بهێنرێنەوە، پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ئاماژەی بەم ڕاستییە کردووە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖۚ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ (فصلت: ٢١) واتە: تاوانبارەکان گلەییان لە پێستی خۆیان کردو وتیان بۆچی شایەتیتان دژی ئێمەدا؟ ئەوانیش وتیان: خوای گەورە ئێمەی هێناوەتە قسە کە هەموو شتێکی تری هێناوەتە قسە هەر ئەو زاتە یەکەمجار ئێوەی دروست کردو بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە داوا لە خوای پەروەردگار دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە بکاتە ڕووناکی بۆ بڕواداران و بەهانەبڕێکیش بێت بۆ هەموو ئەو مولحیدانەی کە ئەم قورئانە ڕەت دەکەنەوە.



## ١٢ قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤ و ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی زانستی گەورە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ۝٧ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ۝٨﴾ (السجده: ٧ – ٨). واتە: (ئێمە مرۆڤمان لە پوختەیەکەوە دروست کردووە کە سەرچاوەی سەرەکی یەکەم جاری لە گڵەوەبووە)، هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ۝٧ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ

﴿٨﴾ (السجدە: ٧ – ٨). واتە: (ئەو پەروەردگارە هەموو شتێکی بە ووردەکاری تەواوەوە دروست کردووە و مرۆڤیشی یەکەم جار لە سەرەتاوە لە گڵ دروستکرد).

زانای کۆرپەلەزانی ئەمریکی (مارشاڵ جونسون) لە یەکێك لە کۆنگرە زانستییەکاندا وتی: زانایانی کیمیا لەم بابەتەیان کۆڵیەوە و بۆیان دەرکەوت کە گڵ نزیکترین ماددەیە لە پێکهێنانی لەشی مرۆڤ و گونجاوترین ماددەشە بۆ پەیدابوونی ژیان لێیەوە، پاشانیش نەوەکانی لە پوختەیەکی ئاوێکی کەمەوە دروست دەکات کە مەبەستی ئاوی پیاو و ئافرەتە، زانستی نوێ سەلماندوویەتی کە لەناو خانەکانی زاوزێی مرۆڤدا کە بریتین لە تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەت کرۆمۆسۆم هەیە کە هەڵگری هەموو سیفاتە بۆماوەییەکانن و لە کۆرپەلەیەکدا دروستی دەکەن. واتە دەتوانین بڵێین کە ئەو هێلکە پیتێنراوەی لەو دوانەوە دروست دەبێت پوختەیەکی مرۆڤ و هەموو سیفاتەکانی تێدایە.

ئەو هێلکە پیتێنراوە (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێدایە، لە مرۆڤێکی ئاسایی دا ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی هەموو خانەکانی لەش بریتییە لە (٤٦)، کە بە نیوەیی لەدایك و باوکەوە وەریدەگرێت، هەموو سپێرمێکی پیاو و هێلکەیەکی ئافرەت تەنها (٢٣) کرۆمۆسۆم هەڵدەگرن و یەکگرتنی ئەو دووانە ژمارەی ئاسایی کرۆمۆسۆمەکانی لەش دروست دەبێت، ئەگەر کرۆمۆسۆمێك جیابکەینەوە و بەهۆی وردبینی ئەلیکترۆنیەوە سەیری بکەین دەبینین شێوەیەکی لوول پێچی هەیە، ئەگەر ئەو شێوە لوولپێچیە بکەینەوە، بە شێوەیەکی درێژ دەیبینین کە وەکو پەیژە وایە کە هەر پلیکانەیەکی ئەم پەیژەیە هەڵگری سیفەتێکی بۆماوەیی تایبەتیە.

ئەو خاڵەی کە بەلای روومەتەوەیە و لەدایك و باوکتەوە بۆت ماوەتەوە، بزانە کە بەهۆی ئەو کرۆمۆسۆمانەوە بۆت ماوەتەوە، لێرەدا گەیشتینە ئەو راستیەی کە مرۆڤ لە پوختەیەکی ئەو ئاوە دروست دەبێت کە پراوپڕی ئەو فەرموودە پیرۆزانەیە کە باسکران.

کێ باوەڕی دەکرد و بە خەیاڵیدا دەهات لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کە نوتفەیەك ئەم هەموو نهێنیانەی تێدایە. بەڵام دەبینین قورئانی پیرۆز لەو



کاتەدا ئەو زانیاریانەی وەکو ڕاستی یەکی بێگومان باسکردووە و تەحەددای هەموو مرۆڤەکانیشی پێکردووە، بەڕاستی ئەم قورئانە پیرۆزە موعجیزەیەکی گەورەیە. سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و دانا و زانا و کاربەجێ خاوەنی ئەم پەیامە پیرۆزە.

##  نێر و مێی کۆرپەلە بەهۆی تۆوی پیاوەوە دیاری دەکرێت:

ئەم ڕاستییە زانستییە زۆر تازەیە و زانستی کۆرپەلەزانی بۆی دەرکەوتووە کە بینراوە لە مرۆڤدا دوو جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی هەیە، کرۆمۆسۆمەکان بریتین لەو تەنۆلکانەی کە هەموو سیفاتەکانی بۆماوەیی مرۆڤیان تێدایە و لە هەموو خانەکانی لاشەدا هەن.

لەناو ناوکی خانەکەدا و دوو جۆریان هەیە کرۆمۆسۆمی لاشەیی و کرۆمۆسۆمی جنسی، لەکاتی دروستبوون و جیابوونەوەی خانەکانی زاوزێ دا کە بریتین لە تۆو لە گوندا لە پیاو و هێلکۆکەکان لە هێلکەدانی ئافرەتدا بینراوە کە خانەکانی زاوزێی پیاو کە لە گوندا لە پیاودا دابەش دەبن و جیادەبنەوە و پاشان تۆو و سپێرم دروست دەکەن، دوو جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی تێدایە (X,Y) واتە: لە گوندا دوو جۆر تۆو سپێرم دروست دەبێت. جۆرێکیان کرۆمۆسۆمی (X)ی تێدایە و جۆرەکەی تریان کرۆمۆسۆمی (Y)ی تێدایە، بەڵام لە ئافرەتدا تەنها یەك جۆر کرۆمۆسۆمی جنسی هەیە، کە ئەویش تەنها لە جۆری (X)ی هەیە، واتە: ئە هێلکۆکانەی لەناو هێلکەنانەکەدا دروست دەبن تەنها لە جۆری (X) کرۆمۆسۆمی جنسیان هەیە وە کاتێك سپێرمێك کە هەڵگری کرۆمۆسۆمی (Y) بێت لەگەڵ هێلکەیەکدا کە تەنها هەڵگری کرۆمۆسۆمی (X)ن، یەکبگرێت ئەوا هێلکەی پیتێنراوە و پاشانیش کۆرپەلە کە نێر دەردەچێت (XY) لە هەمان کاتدا ئەگەر سپێرمێك کە کرۆمۆسۆمی (X)ی هەڵگرتووە لەگەڵ هێلکەدا کە هەڵگری (X) یەك بگرێت ئەوا کۆرپەلە مێ ینە دەردەچێت (XX)،

ئەم ڕاستیە زانستیە لە ئایەتێكی قورئاندا هاتووە كە دەفەرمووێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ۝ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ۝﴾ (النجم: ٤٥ – ٤٦). (تمنى بمعنى تخرج) واتە: (پەروەردگار نێر و مێ ی مرۆڤ دیاری دەكات لە مەنی واتە: (تۆوی پیاو لە كاتێكدا كە دەردەچێت لە پیاوەوە)).

ئالێرەدا زیاتر بۆمان دەردەكەوێت كە قورئان و زانستی نوێ هەمیشە یەكدەگرنەوە و هاوئاهەنگی یەكترین هەروەها لە ئایەتێكی تریش دا دەفەرمووێت: ﴿مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ۝﴾ (عبس: ١٩). واتە: (پەروەردگار مرۆڤی

لە نوتفەوە دروست كردووە و ئەندازەی هەموو شتێكی بۆ دیاری كردووە)، هەر لە دیاری كردنی جنسی كۆرپەلەكە پاشان ئەندازە بۆ دانان و دیاری كردنی ڕەنگی قژ، ڕەنگی پێست، درێژی باڵای، جۆری خوێن، زیرەكی، هەموو سیفاتەكانی تریش، هەر لە تۆوی پیاو و هێلكەی ئافرەتەكەوە كە ئەو نوتفەیە و پاشانیش كۆرپەلەكە دروست دەكەن بۆ منداڵەكە دەگوێزرێتەوە بەهۆی كرۆمۆسۆمەكانەوە.

ئەم كرۆمۆسۆمانە و جیناتەكانی سەریان بەهۆی ترشەلۆكە ناوكی یەكانەوە (DNA) كە شیفرەی دروستكردنی ئەو سیفاتانەیان تێدایە لە دواڕۆژدا ئەو سیفاتانە بۆ منداڵەكە دروست دەكەن، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایە كە بەدیهێنەر و ڕاگری ئەم ووردەكاری یەیە لە دروستبوونی مرۆڤدا ئەم ڕاستیە زانستیە لە قورئانی پیرۆزدا پێش (١٤٠٠) ساڵ لەوەوپێش هاتووە، زانست نەیزانیوە لەو سەدەیەی تازەدا نەبێ بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە ئەم قورئانە.

***

## ١٤ ئەندازەدانان بۆ نوتفەی مرۆڤ:

خوای گەورە لە قورئانەکەی دا دەفەرمووێ: ﴿قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ ۝ مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ۝ مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ۝﴾ (عبس: ١٧ – ١٩). واتە: (تیاچوون بۆ مرۆڤ بێت کە ئەوەندە بێباوەڕی دەکات، ئەی باشە بۆ سەیر ناکات کە لەچییەوە دروست بووە، ئەو سەرەتا لە تنۆکێك ئاوەوە دروستمان کرد، کە یەکسەر ئەندازەمان بۆ دانا).

واتە: خوای پەروەردگار مرۆڤی لە نوتفەوە دروست کردووە و ئەندازەی هەموو شتێکی بۆ دیاری کردووە کۆرپەلەی مرۆڤ لە ئەنجامی یەکگرتنی خانەکانی زاوزێی پیاو و ئافرەتەوە کە بریتین لە یەك سپێرم و یەك هێلکۆکە دروست دەبێت، کە یەکی تەنها نیوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی خانەکانی مرۆڤیان تێدایە، واتە (٢٣) کرۆمۆسۆم ئەم قۆناغە بریتییە لە سەرەتای ڕاستەقینەی پەیدابوونی مرۆڤ، چونکە لە ئەنجامی یەکگرتنی (٢٣) کرۆمۆسۆمی تۆوی پیاو و (٢٣) کرۆمۆسۆمی هێلکەی ئافرەت ژمارەی تەواوی کرۆمۆسۆمەکانی لەشی مرۆڤ دروست دەبێت، کە بریتی یە لە (٤٦) کرۆمۆسۆم و هەموو هەنگاوەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لەداهاتوودا لەسەر ئەم بناغە ڕاستە سەرچاوە دەگرێت.

کەواتە: ئەم کردارە بریتییە لە هەنگاوی یەکەم بۆ پەیدابوونی زیندەوەرێکی نوێ و ناوازە، کۆرپەلەزانان بۆمان باس دەکەن کە دوای چەند سەعاتێکی کەم لە دروست بوونی خانەی یەکەمی کۆرپەلە کردارێکی تر دەست پێدەکات، کە سەرەنجامەکەی بریتیە لە ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی سیفەتی داهاتووی کۆرپەلەکە، کە بریتییە لە دەرکەوتنی سیفەتە بەهێز و زاڵەکان (Dominant characters).

دەرنەکەوتن یان شاردنەوەی سیفتە لاواز و بەزیوەکان، کەواتە لێرەدا ئەندازە بۆ سیفەتەکانی کۆرپەلە دیاری دەکرێت، کە ئەمانەش هەر لە دیاری کردنی ڕەگەزی کۆرپەلەکەوە دەست پێ دەکات پاشان ئەندازە بۆدانان و دیاری کردنی ڕەنگی قژ،

ڕەنگی پێست، درێژی باڵای، جۆری خوێن، زیرەکی، هەموو سیفەتەکانی دیکەش هەر لە تۆوی پیاو و هێلکەی ئافرەتەکەوە کە ئەو نوتفەیە و پاشانیش کۆرپەلەکە دروست دەکەن بۆ منداڵەکە دەگوێزرێتەوە بەهۆی کرۆمۆسۆمەکانەوە، کە وەك باسمان کرد ئەم کرۆمۆسۆمانە و جینەکانی سەریان بەهۆی ترشەلۆکە ناوکییەکانەوە (DNA) کە شیفرەی دروست کردنی ئەو سیفەتانەیان تێدایە لە دوا ڕۆژدا (ئەم سیفەتە بۆ منداڵەکە دروست دەکەن)، کەواتە هەر لەگەڵ دروست بوونی نوتفەدا کە بناغەی یەکەمی مرۆڤە ئەندازەی سیفەتەکانی بۆ دادەنرێت.



## ڕێکبوونەوە و شێوە پێدانی کۆرپەلە و ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی زانستی گەورە لەوبارەوە:

لە چەند فەرموودەیەکی قورئان و سوننەتدا (ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە کۆرپەلە لە سکی دایکی دا لەشی ڕێك دەبێتەوە و شێوەکەی دەگۆڕێت بۆ شێوەی مرۆڤ وەك لەم ئایەتانەدا هاتووە:

﴿أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾﴾ القيامة: ٣٧ – ٣٨. واتە: (ئایا کاتی خۆی ئادەمیزاد نوتفەیەك نەبووە لە بەشێکی مەنیەوە کە دەڕژێنرایە شوێنی خۆی).

واتە: (ئایا ئەو لەسەرەتاوە کە دروستمان کرد بەشێکی تنۆکێك ئاو نەبووە؟ پاشان بوو بە خۆهەڵواسێنەر ﴿علقه﴾ کە دوایی دروستمان کرد و ئینجا ئەندازەمان بۆ دانا و ڕێکمان کردەوە، وە هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾﴾الأعلى: ١ – ٢). واتە: (خوای پەروەردگاری پایەبەرزی خۆت یادبکە و بەرز ڕابگرە، ئەو خوایەی کە زیندەوەرەکان دروست دەکات و پاشان ڕێکیان دەکاتەوە و لەشیان ڕێکوپێك دەکات هەر زیندەوەرە و بەشێوەی).



هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ۝﴾الإنفطار: ٧). واتە: (ئەو پەروەردگارەیە کە دروستی کردوویت و ڕێکوپێکی کردوویت و لەشتی ڕێك کردەوە).

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝﴾آل عمران: ٦). واتە: (هەر پەروەردگارە کە وێنەتان دەکێشێت لە منداڵدانەکان دا بەو شێوەیەی کە ویستی لێ بێت).

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەریشدا هاتووە: (إذا مرَّ بالنطفة اثنتان و أربعون ليلة، بعث الله إليها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها و جلدها ولحمها وعِظامها) (أخرجهُ مسلم و الطبراني و أبوداود). واتە: (کاتێك کە نوتفە دەگاتە (٤٢) ڕۆژ پەروەردگار فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت بۆئەوەی شێوەی مرۆڤی پێ بدات و بیستن و بینین و پێست و گۆشت و ئێسکی بۆ دروست دەکات).

لەم ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی سەرەوەدا ئاماژەیەکی سەرسوڕهێنەر هەیە کە دەڵێت مرۆڤ لەناو سکی دایکی دا شێوەی مرۆڤی پێ دەدرێت، واتە: دەبێت پێشتر ئەو شێوەیەی نەبێت؟ و دوایی پێ ی ببەخشرێت؟ لێرەدا باسی چەند ڕووداوێك کراوە کە لەکاتی گەشەکردنی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا ڕوودەدەن ئەویش پاش ئەوەی کە کۆرپەلەکە لە دروست بووندایە، ڕێك دەکرێتەوە وێنەی مرۆڤی پێ دەبەخشرێت کۆی ماناکانی ﴿سوى﴾ لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی دا بریتین لە:

یەکەم: بە مانای ئەوەی کە شتێك ڕێك و ڕەوان ببێت.

دووەم: هەروەها بە مانای ئەوە دێت کە شتێك ڕێك بێت بێ بەرزی و نزمی.

سێیەم: واتە: شتێك ڕێك و پێك بکرێت وەکو چۆن دانایی و حیکمەت وا دەخوازێت قۆناغی ڕێکبوونەوە لە بۆچوونی قورئانیدا هەردوو قۆناغی کردنی گۆشتپارەی کۆرپەلەکە بە ئێسك و داپۆشینی ئەم ئێسکانە بە ماسولکە دەگرێتەوە، ئەویش لەبەرئەوەی ئەم کردارانە بریتین لە جۆرێك لە تەصویر و وێنەدان بە کۆرپەلەکە بە مانایەکی تر ڕێکبوونەوەی ئەندامەکانە کە خۆی لەخۆیدا خاڵی نیە لە کرداری

دروستبوون، ڕێکبوونی ئەندامەکانی و وەرگرتنی وێنەی مرۆیی تەنها لە هەفتەی هەشتەمدا دەبێت واتە: لە کۆتایی ماوەی ڕێکبوون ئەگەر بچینە سەر باسکردنی ماناکانی ﴿سوی﴾ و ڕوون کردنەوەیان لە ڕووی زانستیەکانی کۆرپەلەزانیەوە:

یەکەم: سەبارەت بە مانای یەکەم بە واتای ئەوەی شتێك ڕێك و ڕەوان ببێت، بەکارهێنانی ئەم وشەیە لەم ئایەتەدا مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش لەبەرئەوەیە کە ئەوە دەگەیەنێت کۆرپەلە پێش ئەم قۆناغە لەشی ڕێك نەبووە، واتە: چەماوە بووە و لێرەوە ڕێك دەبێتەوە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیعجازێکی هەواڵدانە، ئەم قۆناغی ڕێك بوونەوەیە هەردوو دیاردەی دروست بوونی ئێسك و داپۆشینیان بە ماسولکە دەگرێتەوە، کە لەگەڵ دروستبوونی ئێسکدا لەشی کۆرپەلەکە ڕەق و بەهێز دەبێت و ئیتر شێوە چەماوەییەکەی کە پێشتر لە قۆناغی گۆشتپارەدا لە شێوەی پیتی (C)ی ئینگلیزی دابووە لە دەست دەدات و ڕێك دەبێتەوە.

دووەم: ئەوەی کە شتێك ڕووەکەی ڕێك ببێت، بێ بەرزی و نزمی کە وەك باسمان کرد، لەم کاتەدا بەهێواشی بەرزی و نزمی و ئاوساوی و چاڵایی لەشی کۆرپەلەکە نامێنێت بەهۆی ڕەقبوونی ئەندامەکان و دروست بوونی ئێسك و داپۆشینیان بە ماسولکە، ئیتر بەهۆی ئەمانەوە ڕووی لەشی کۆرپەلە تەواو ڕێك دەبێتەوە.

سێیەم: واتە: شتێك ڕێك و پێك بکرێت وەکو چۆن دانایی و حیکمەت وادەخوازێت بە واتای ئەوەی کە مرۆڤەکە بخرێتە سەر شێوەی تەواو ڕێك و کامڵی مرۆڤانە، بینراوە کە لە کۆتایی هەفتەی هەشتەمدا کۆرپەلەکە دەبێتە بارستەیەکی مرۆیی تەواو و کامڵ، (دکتۆر لارس هامبێرگەر) دەڵێت: دوای هەشت هەفتە درێژی کۆرپەلەکە تەنها چوار سانتیمەتر دەبێت، بەڵام لەناو ئەم لەشە بچووکەیدا هەموو ئەندامەکان لە شوێنی خۆیاندان و هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بوونیان هەبێت لە مرۆڤێکی کامڵدا دروست بوون.



له کتێبی مامانی، دکتۆر (لارس هامبێرگەر) باسکراوە لاپەڕە (٩١)، لەم قۆناغەدا کلکی کۆرپەلەکە نامێنێت و گوێی دەرەوەی شکڵی خۆی وەردەگرێت، له ئەنجامی کامڵبوونی پێچەکانی گوێی ناوەوە و گوێی ناوەوە بە تەواوەتی دروست دەبێت. چاوەکانیش بەهۆی پەیدابوونی پێڵووەکانەوە وێنەی ئاسایی خۆیان له ڕووخساردا وەردەگرن، پەنجەکانی دەست و پێ بە ئاشکرا پەیدا دەبن و لوت دەردەکەوێت، لێرەوە وێنەی کۆرپەلەکە له وێنەی مرۆییەوە نزیك دەبێتەوە و، بە شێوەیەك ڕێکدەبێتەوە کە مرۆڤی لێ جیابکرێتەوە ئەویش بەهۆی جیاوازبوونی ئەندامەکانیەوە، بەمەش مانای سێیەمی ڕێکبوون و وشەی ﴿سوی﴾ی ئایەتە پیرۆزەکە دەردەکەوێت، هەروەها ڕاستی زاراوەی ﴿فصورها﴾ واته: وەرگرتنی وێنەی مرۆڤ کە له فەرموودەکەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت.

وشەی ﴿فَسَوَّىٰكَ﴾ له ئایەتەکەدا بە مانای ڕێککردنەوە و ڕاستکردنەوەی شتێك دێت بۆ ئەوەی ئامادەبێت بۆ بەجێ هێنانی ئەرکەکانی، وشەی ﴿فَعَدَلَكَ﴾ بە مانای گۆڕینی شێوە و پێکهاتەی بۆ پێکهێنانی شتێکی دیاری کراو دێت، کرداری ڕێکبوونەوە (تسویە) وەك پێشتر باسکرا له کاتی قۆناغی دروست بوونی ئێسك و له کۆتاییەکەیدا دەبێت. بەکارهێنانی پیتی (فَ) پێش وشەی ﴿ عَدَلَكَ﴾ مانای بەدوای یەکدا هاتنی ڕاستەوخۆی ئەم کردارانە دەگەیەنێت واته: مانای ئایەتی: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾﴾ بەم شێوەیەی لێ دێت ئەو خوایە کە دروستی کردیت و ڕێکی کردیت و لەدوای ڕێکبوونەوەی لەش شێوەشتی ڕێك کردەوە، ئەم مانایە ئایەتەکەی دوای بە تەواوەتی ڕوونی دەکاتەوە، ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾﴾ واته: (شێوەشت له سەر چ وێنەیەك بیەوێت ئاوای لێ دەکات و دایدەمەزرێنێت).

زانایانی کۆرپەلەزانی بۆمان باس دەکەن کە له قۆناغی (النشاة)دا پێوانەکانی لەش دەگۆڕێن و شێوەی دەم و چاو سیمای مرۆڤی بۆ دروست دەبێت، بۆ نموونە گوێکان

له ملەوە دەجولێن بۆ ئەملاولای سەرلوت لە دەم جیادەبێتەوە و لێوی سەرەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت و، چاوەکان دێنە پێشەوەی دەم و چاو و پەلەکانی خوارەوەی درێژتر دەبن. بە بەراورد بە لەشی کۆرپەلەکە ئەم کردارانە بە ڕێکبوونەوەی شێوە (تعدیل) ناودەبرێت یان (تقویم). هەروەها وشەی ﴿صورة﴾ کە لە ئایەتی دووەمدا هاتووە مانای شکڵ و شێوە دەگەیەنێت.

کەواتە: بە کورتی ئایەتەکان ئەمە دەگەیەنن دوای دەستپێکردنی کرداری ڕێکبوونەوە ڕاستەوخۆ گۆڕانکاری بەسەر کۆرپەلەکەدا دێت و پێوانە ئاساییەکانی مرۆڤ وەردەگرێت و ڕێك دەبێتەوە (التعدیل أو التقویم). هەروەها وەرگرتنی شکڵ و شێوەی مرۆڤ و وێنەی کەسێکی ڕوودەدات، ئەم کرداری ڕێکبوونەوە و شێوە وەرگرتنە تا کاتی لەدایك بوون و تەنانەت دوای لەدایك بوونی کۆرپەلەکەش هەر بەردەوام دەبێت.

وشەی (عدل) مانای ڕێك بوونەوە و گونجاوی و هاوسەنگی لە نێوان چەند شتێکدا دەگرێتەوە، لە تەفسیری نەسەفی دا دەربارەی (فعدلك) هاتووە واتە: ڕێکی کردیتەوە و دروستی کرد بەبێ جیاوازی لە بەشەکانی دا، دەستێکی درێژ نەکریت و دەستەکەی تر کورت. یان چاوێك فراوانتربێت لەوەی تر، کەواتە: قۆناغی (التعدیل) بریتیە لە حاڵەتێکی گونجاوی و هاوسەنگی بۆ هەموو ئەندامەکانی لەش، بە شێوەیەك کە هەموو ئەندامێك گونجاوبێت لەگەڵ پاشماوە و بەشەکانی تری لەشدا. پرۆسەی تەعدیل زۆر بە وردی دەبینرێت لە پاش قۆناغی تەسویە کە لێرەدا ئەندامەکان ناهاوسەنگن، بۆ نموونە قەبارەی سەر زۆر گەورەتر دەبێت لە چاو قەبارەی لەشدا، کە لەم قۆناغی تەعدیلەدا پێوانەکانی لەش دەگۆڕێن بە شێوەیەك کە هەردوو پەلی خوارەوە درێژتر دەبن لە چاو لەشدا و گەشەی سەر خاودەبێتەوە لەچاو گەشەی لەشدا.

لێرەوە قەبارەی سەر و پەلەکان هاوسەنگی خۆیان وەردەگرن پێوانەکانی لەشی کۆرپەلەکە گونجاو دەبێت بەپێی شێوە و وێنەی مرۆیی، بەوەش مانای هاوسەنگی و گونجاوی کە لە وشەی (عدل)دا دێتە دی.

بەڕاستی موعجیزەی یەکجار گەورەن، ئەم ئایەتانە کە تاوەکو سەدەی هەژدەیەمی زاینیش زانایان و کۆرپەلەزانا وایان دەزانی کە کۆرپەلەکە بە کامڵی و بەشێوەی مرۆڤ بە تەواوەتی هەیە لەسەرەتاوە و لە منداڵداندا تەنها لە قەبارەدا زیاد دەکات، بەڵام قورئان بە پێچەوانەی ئەمەوە پێش (١٤٠٠) ساڵ باسی ئەو ڕاستیە زانستیانەی کردووە و ئاشکرای کردووە زانستی کۆرپەلەزانی تازەش ئەم زانیاریانەی قورئانی پیرۆزی دەقاودەق پشت ڕاست کردۆتەوە و شایەتی بۆ ڕاستیەکانی داوە.

##  نهێنیەکانی تەمەنی چل ساڵی و دەرکەوتنی ڕاستییەکی پزیشکی تازە:

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموویت: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَـٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ (الاحقاف: ١٥).

واتە: (ئێمە فەرمانمان بە ئادەمیزاد داوە کە چاکەکار و چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا دایکی بە ئازارەوە هەڵی گرتووە و بەدەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی سك پڕبوون و لەشیر بڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندووە، هەتا کاتێك مرۆڤ دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی چل ساڵی، ئەوسا هەق وایە ئەم نزایە بکاتە یەکێك لە وێردەکانی سەر زاری و بڵێت: پەروەردگار کۆمەکیم بکە و یارمەتیم بدە تا شوکرانە بژێر و سوپاسگوزاری ئەو ناز و نیعمەتانەبم کە بە من و دایك و باوکمت بەخشیوە، هەروەها یارمەتیم بدە لەو جۆرە کار و کردەوە چاکانە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازیت دوا کاریشم چاکە بروێنێت لەناو نەوەکانمدا لەبەر قازانجی خۆم چاکەی

هەر کەسیش بەشی دایك و باوکی تێدایە بەڕاستی من گەڕاومەتەوە بۆلای تۆ تا لە گوناهەکانم خۆش ببیت و من لە موسڵمانانی گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارم).

خوێنەری بەڕێز: جا با بزانین زانستی تازەی سەردەم لە بارەی ئەو ڕاستییە گەورەیە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی پێ داوە چی دەڵێت؟ دۆزینەوە نوێیە زانستییەکان جەخت دەکەنەوە کە مۆخی مرۆڤ تا ئەو کاتەی تەمەنی دەگاتە کۆتایی چل ساڵی گەشەی تەواو ناکات، ئەم تەمەنەش قورئانە پیرۆزەکەی خوای گەورە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر دیاریکردووە ئاشکرایە کە سرووش (وەحی) لە تەمەنی چل ساڵیدا بۆ سەردڵی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) هاتۆتە خوارەوە، بێگومان حیکمەتێك لەم تەمەندا هەیە ڕەنگە لایەنەکانی حیکمەتەکەمان بۆ دەربکەوێت لەوەی کە گەشەی مرۆڤ و کامڵبوونی ژیری مرۆڤ ڕوونادات تەنها لە کۆتایی چلەکانی تەمەنی مرۆڤدا نەبێت، خوای گەورە ئایەتە پیرۆزەکە تەمەنی چل ساڵی بۆ کامڵ بوونی جەستەیی و ژیری یان بەهێزی یان ترۆپکی مرۆڤ دیاریکردووە، ڕاستییەکی زانستی جەخت لە ڕاستی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دەکاتەوە؟

بێگومان ئەم ڕاستیە لە ئێستادا ڕاستی و دروستی سەلمێنراوە و بەڵگەیەکە بۆ ئەو کەسانەی بە گومانەوە دەڕوانن بۆ قورئانی پیرۆز هەروەها هۆکارێکە بۆ زیادبوونی باوەڕی باوەڕداران و یەقین بە خوای گەورە، توێژینەوەیەکی زۆر نوێ هەیە جەخت دەکاتەوە کە گەشەی مۆخ تا کۆتایی تەمەنی چل ساڵی مرۆڤ بەردەوام دەبێت، ئەمەش بە تەواوی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا دەقاودەق یەك دەگرێتەوە و هاوڕێکە، ڕۆژنامەی تەلەگراف بابەتێکی بەناونیشانی ( Branonly fully matures in middle age) واتە: گەشەی مۆخ تا نیوەی تەمەنی مرۆڤ بەردەوام دەبێت، ئەم لێکۆڵینەوە تازەیە ئاشکرای دەکات کە مۆخی مرۆڤ تا کۆتایی تەمەنی چل ساڵی لە گەشە ناوەستێت، زانایان لەم دۆزینەوەیەدا ئامێری ڕووماڵکردنی لەرەی موگناتیسی ئەرکی (Fmri)یان بەکارهێناوە، کە ئامێرێکی زۆر پێشکەوتووە بە شێوەیەکی چڕوپڕ

چالاکی و گۆڕانکاری ناوچەکانی مۆخ دیاری دەکات، پێش هاتنی سەدەی بیست و یەك تەنانەت یەك زانیاریان دەربارەی ئەوەنەبووە کە گەشەی مۆخی مرۆڤ تەواو نابێت تا تەمەنی مرۆڤ دەگاتە کۆتای چلەکان، ئەم لێکۆڵینەوە نوێیە جەخت دەکاتەوە کە ئەو ناوچەیەی مۆخ گەشەی تێدا دەکات بریتیە لە ناوچەی پێشە سەر یان ئەوەی زانایان پێی دەڵێن: (Prefrontal cortex) سەرەوە و پێشەوەی مۆخ، ئەم ناوچە گرنگە بۆ بڕیاردان گرنگە کارلێکردن و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی، گرنگی کەسایەتی وەکو پلاندانان هەڵسوکەوت تێگەیشتن لە کەسانی تر، هەروەها ئەو بەشەیە کە مرۆڤ لە دروستکراوەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

پرۆفیسۆر خاتوو (saran jayne blake more) دەڵێت: لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵدا ئێمە بڕوامان وابوو کە گەشەی مۆخ لەسەرەتای تەمەندا دەوەستێت. ئەم خاتوونە پرۆفیسۆرە دەڵێت: تاقیکردنەوەکانی ڕووماڵکردنی لەرەی موگناتیس ئەرکی لەسەر مۆخ دەریانخستووە کە گەشەی مۆخ لە ماوەی سییەکانی تەمەنەوە تا کۆتایی چل ساڵی تەمەنی مرۆڤ بەردەوام دەبێت، گرنگترین ناوچە و زۆرترین بەردەوامی لە گەشەدا بریتیە لە ناوچەی پێشەسەر ئەمەش بەشێکە لە سەرەوە و پێشەوەی مێشك، بریتیە لەو ناوچەیەی مرۆڤ لە دروستکراوەکانی دیکە جیادەکاتەوە، وێنەیەك گیراوە بە ئامێری (Famir) بۆ مۆخ چالاکیەکان بە ڕەنگی سور دەردەکەون لە ناوچەی پێشەسەر، ئەم ناوچەیە لە بەشی سەرەوەی سەری مرۆڤدایە ڕۆڵێکی گرنگ و بەرز و دیاری هەیە کە بریتیە لە پرسیاریەتی کەسایەتی مرۆڤ، خوای گەورە جەخت دەکاتەوە لەسەر گرنگی پێشەسەر، خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەر هود (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ﴿إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾﴾ (هود: ٥٦). واتە: (من پشتم بە خوا بەستووە کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە هیچ گیانلەبەرێك نیە جڵەوی بەدەست خوای گەورەوە نەبێت بێگومان پەروەردگارم لەسەر بەرنامە و ڕێبازێکی ڕاست و دروستە).

هەروەها پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) لە دووعاكانیدا دەیفەرموو: (ناصیتی بیدك)، باشە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆن زانی ئاوا بە گرنگی باسی ناوچەی پێشەسەر بكات ئایە پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) چۆن ئەوەی زانی مرۆڤ تا تەمەنی چل ساڵی پێ ناگات؟ وەڵامەكەی ئەوەیە خوای گەورە و ئاگادار بە هەموو نهێنیەكان ئەوەی بە وەحی ڕاگەیاندووە بە پێغەمبەرە خۆشەویستەكەی تاكو ببێتە گەورەترین موعجیزە لەسەر ڕاستی پەیامەكەی چونكە ئەم ڕاستیە زانستیە زانایانی ڕۆژئاوا ئەمەیان نەدۆزیوەتەوە و ئاشكرایان نەكردووە تا كۆتایی ساڵی (٢٠١٠)ی زاینی جا ئەوجار ئەو ڕاستیە گەورەیان ئاشكراكرد كەچی قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش باسی ئەو ڕاستیە گەورەیە پزیشكیەی كردووە، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە وە درود بۆ گیانی پاكی پێغەمبەرە ئازیزەكەی ئیسلام (صلی الله علیه وسلم).

##  پرۆفیسۆر مارشاڵ جونسن داندەنێ بە ڕاستیەكانی قورئان:

پرۆفیسۆر (مارشال جۆنسۆن) سەرۆكی بەشی توێكاری و بەڕێوبەری پەیمانگای دانیالە لە زانكۆی تۆماس جیفرسۆن) لە فلادلفیای ولایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا، دكتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: لە كۆنگرەی هەشتەمی پزیشكی لە سعودیە ئەم پرۆفیسۆرەمان بینی، پێش بەستنی كۆنگرەكە لیژنەیەكیان بۆ تایبەت كردین بە مەبەستی لێكۆڵینەوە لە بابەتی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، یەكەم كەس كە چاومان پێكەوت پرۆفیسۆر (مارشاڵ جۆنسن) بوو، ئەم پرۆفیسۆرە دەستی بە پرسیاركردن كردو، وتی: بابەتی ئەم لیژنەیەمان چیە؟ ئێمەش وەڵامماندایەوە كە بابەتەكەمان بریتیە لە لێكۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان زانیاریەكانی قورئان و سوننەت پێش (١٤٠٠) ساڵ لەگەڵ زانستە نوێیەكانی ئەمڕۆدا، ئینجا وتی: باش وەكو چی؟



وتمان: بۆ نموونە زانست دەڵێت: مرۆڤ قۆناغ بە قۆناغ لە سکی دایکیدا دروست دەبێت قورئانی پیرۆزیش پێش (١٤٠٠) ساڵ هەمان ئەو قۆناغانەی باسکردووە، لەو کاتەدا پرۆفیسۆر دانیشتبوو بەڵام هەر کە ئەمەی بیست هەستایە سەر پێ و بە توندی سێ جار وتی: شتی وانابێت..

ئێمەش پێمان وت: دانیشە دکتۆر وتی: نا دانانیشم ئەمە چ قسەیەکە کە ئێوە دەیکەن؟

لە ڕاستیدا ئێمە دەمانزانی بۆچی بەو جۆرە هەڵوێستی وەرگرت چونکە ئەو یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئەمریکا، باش دەزانێت لەدوای داهێنانی ووردبین لە سەدەی شازدەدا تێکڕای پزیشکەکان بە درێژایی سەدەی حەڤدە بڕوایان وابوو مرۆڤ بە تەواوی لە سپێرم تۆوی پیاو واتە: لە نوتفەی پیاودا دروست دەبێت ئەم بۆچوونەش هەتا سەدەی هەژدە بەردەوام بوو، بەڵام هەر کە هێلکەی ئافرەت لە سەدەی هەژدەهەمدا دۆزرایەوە هەموو زاناکان بۆچوونیان گۆڕی و وتیان: مرۆڤ بە تەواوی لە هێلکەی ئافرەتدا دروست دەبێت، چونکە هێلکە لە گیانداری مەنەوی گەورەترە بەوەش ڕۆڵی پیاویان فەرامۆش کرد هەر وەك چۆن لە سەدەی حەڤدەدا ڕۆڵی ئافرەت فەرامۆش کرابوو، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم زاناکان نەیانتوانی دەرك بەو ڕاستیەبکەن کە مرۆڤ قۆناغ بە قۆناغ گەشە دەکات.

لەبەرئەوە کاتێك کە بە پرۆفیسۆر (مارشاڵ جونسن) وترا ئەمە لە قورئانی پیرۆزدا (١٤٠٠) ساڵ باسکراوە هەستا و هاواری کرد و پێی بابەتێکی سەرسوڕهێنەر بوو، دەڵێ: ئێمەیش چووین بەرەو پیری و قورئانی پیرۆزمان پێشکەش کرد پێمان وت: فەرموو بیخوێنەرەوە ئەم ئایەتەمان بۆ خوێندەوە: ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾ (نوح: ١٤).
واتە: (ئەوە چیتانە لە شکۆ و گەورەیی خوا ناترسن؟ لە کاتێکدا ئێوەی قۆناغ بە قۆناغ دروست کردووە) بە زمانی ئینگلیزی ماناکەی خوێندەوە. پاشان ئەم ئایەتەمان بۆ خوێندەوە ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾الزمر:

٦). واته: (له سکی دایکتان دروستتان دەکات چەند قۆناغێك له سێ تاریکیدا)، ئینجا پرۆفیسۆر (مارشاڵ) دانیشتەوه و وتی: (بێگومان بۆئەمه دەتوانرێت سێ لێکدانەوه بکرێت، یەکەم ئەوەیه ڕێکەوت بێت ئێمەش زیاتر له ٥٢ دەقی ئایەتی قورئانمان خستە بەردەستی وتمان: ئایه دەبێت هەموو ئەم دەقانه ڕێکەوت بن؟ پاشان قورئانی پیرۆز بۆ هەموو قۆناغێك ناوێکی داناوه، نوتفەکه واتای تنۆکێکه، دوای ئەوه (علقه) خوێنی بەستووی هەڵواسراو، دوای ئەوه (مضغة) گۆشتپاره یان شتی جوراو، دوای ئەو (عظام) ئێسقان، دوای ئەو (کساء باللحم) داپۆشین به گۆشت..

ئایه دەگونجێت ناوهێنانی هەموو ئەو قۆناغانه ڕێکەوت بن؟ وتی: نەخێر، وتمان: ئەی چی ماوه؟

وتی: دووەم ئەوەیه دەتوانرێت بوترێت موحەممەد مایکرۆسۆبی گەورەی لابووبێت وتمان: تۆ دەزانیت زانینی درێژه و وردەکاریەکانی ئەو قۆناغه که قورئان باسی لێوه کردوون بەهۆی میکرۆسکۆبی زۆر گەورەوه نەبێت ناتوانرێت بزانرێت، بێگومان کەسێکیش ئەو میکرۆسکۆبه گەورانەی لەلابووبێت پێویسته تەکنەلۆژیایەکی زۆر زۆر بەرزی لابووبێت به جۆرێك ڕەنگی دابێتەوه لەسەر خواردن و خواردنەوه و جەنگ و ئاشتیەکەی، هەروەها دەبێت له نەوەی پێش خۆی وەری گرتبێت و بۆ نەوەی دوا خۆشی بەجێ هێشتبێت، دوای ئەوه پرۆفیسۆر دەستی کرده پێکەنین، وتی: له یەکێك له پێشانگاکاندا یەکەمین (میکرۆسکۆب)م بینی که بۆ یەکەمجار له جیهاندا داهێنرابوو تەنها له دەجار زیاتر توانای گەورەکردنی نەبوو تەنانەت نەیدەتوانی وێنەکەش به ڕوونی نیشان بدات، وتی: نا هەرگیز موحەممەد دەزگاو میکرۆسکۆبی لەلانەبووه، کەواته هیچ نەماوه ئەوه نەبێت که بڵێین ئەو لەلایەن خواوه نێردراوه.

له دواییدا خۆی دەستی کرد به نووسینی لێکۆڵینەوەکانی ئیعجازی زانستی له بواری قۆناغەکانی کۆرپەلەدا، توێژینەوەکانی چڕکردەوه له کاتێکدا پرۆفیسۆر دکتۆر (کیث مور) و پزیشکەکانی تر باسەکانیان لەسەر ڕووی دەرەوەی کۆرپەله بوو، بەڵام ئەو پێشکەشکردنی لێکۆڵینەوەکانی لەسەر وەسفه وردەکانی قورئانی پیرۆز بۆ شێوەی



دەرەوەی کۆرپەلە و پێکهاتەکانی ناوەوە بوو. یەکێك لەو قسانەی پرۆفیسۆر (مارشاڵ جونسن) کردی وتی: لە ڕاستیدا جگە لەوەی قورئان ڕاڤەی قۆناغە دەرەکیەکانی کردووە، جەختی لەسەر ئەو قۆناغانەش کردۆتەوە کە لەکاتی دروستبوونی گەشەکردنی دا بەسەر ناوەوەی کۆرپەلەدا دێن، ئەمەش جەخت کردنەوەیە لەسەر ئەو ڕووداوە سەرەکیانەی زاناکانی ئەمڕۆ شارەزای بوون.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: باسی (مضغة) بوو کە پرۆفیسۆر (مارشاڵ جۆنسن) پێشکەشی دەکرد و قسەی لە بارەوە دەکرد و بە بەڵگە دەیهێنایەوە، زاراوەی (مضغة) شێوەی دەرەکی کۆرپەلەکەمان دەداتێ، چونکە چەماوەیە و لە کۆتایی ئەو چەماوەیەدا شوێنەواری جێگا ددان دیارە تا شێوەی (مضغة)کە بە واتای شتی جوراو دێت ببەخشێت بە هەمان شێوە هەڵئاوسان و چاڵ و چۆڵی ڕوویەکی خوراو و خێچ شوێنەواری جووینیان پێ بەخشیوە کە لەو کاتەدا (مضغة)کە درێژیەکەی تەنها (١سم)ە، ئەگەر بمانەوێت برگەیەك لە (مضغة) وەربگرین و بەشەکانی ناوەوەی ڕاڤەبکەین دەبینین زۆرینەی ئەندامەکان دروست بوون، خۆ ئەگەر بمانەوێت وەسفی (مضغة) بکەین ئەمانە وتەی پرۆفیسۆر (مارشاڵ جۆنسۆن)ن دەبێت چی بڵێین؟

ئایە بڵێین (مضغة)ی دروست کراو؟ بەڵام ئەمە تەنها بەسەر ئەو بەشەدا دەچەسپێت کە دروست بووە یان بڵێین (غير مخلقه) دروست نەکراو؟ دیارە ئەمەش ئەو بەشە دەگەیەنێت کە هێشتا درووست نەکراوە، وتی: پێویستە لەسەرمان کە وەسفی (مضغة) بۆ پێکهاتە ناوەکیەکانی بەو شێوەیە وەسف بکەین کە قورئانی پیرۆز وەسفی کردووە وەك قورئان فەرموویەتی دەڵێین: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ

مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾ (الحج: ٥). پاشان پرۆفیسۆر (مارشاڵ جۆنسۆن) کورتەی توێژینەکەی هێناو وتی: من وەکو زانایەکی گەردوونی دەتوانم مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا وەك خۆیان بکەم و بیانبینم، دەتوانم لە زانستی کۆرپەلەزانی و گەشەکردنی زیندەوەرزانی تێبگەم، دەتوانم لەو وشانەی قورئانی پیرۆزیش تێبگەم کە بۆم وەرگێڕران، هەروەك پێشتر نموونەکانم بۆ هێنانەوە ئەگەر وای دابنێین من خۆم خستە ئەو کاتەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)ی تیادا ژیاوە بەو زانیاریانەی قورئان وەسفی شتەکانم کرد بێگومان دەتوانم وەسفی شتەکان وەك خۆی بکەم، من شتێك نابینم هۆکارێك نابینم بەڵگەیەك نابینم لەسەر ئەوەی بیروبۆچوونەکانی ئەم تاکە موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم) هەڵبوەشێنێتەوە کە بێگومان ئەو زانیاریە گشتگیریانەی لە جێگایەکەوە وەرگرتبێت، لەبەرئەوە هیچ دژایەتیەك نابینم دژایەتی چەمکی نیگای خوایی بکات.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: ئەمە ئەو پرۆفیسۆرە (مارشاڵ جۆنسۆن)ە کەسەرەتا بە بەرپەرچدانەوەی وتەکانمان دەستی پێکرد، بەڵام بەو جۆرە کۆتایی پێ هات کە توێژینەوەکانی لە بواری ئیعجازدا لە چەندین کۆنگرەدا پێکەشکەش بکات، کاتێك پرسیاریشی لە بارەی ئەو دیاردەیەوە لێکرا دەربارەی دەرخستنە زانستیەکان و ڕاستیەتیان لەوەی لە قورئان و سوننەت دا هاتووە بەم جۆرە وەڵامی دایەوە بەڵێ بێگومان ئەمە نیگای خوایە هیچ ڕێگایەك لەبەردەم مرۆڤایەتیدا نەماوە بیانووی مابێت بۆ باوەڕهێنان. بەڵێ خوێنەری بەڕێز ئەمە وتەی زانایەکی ناوداری بیانیە کە دان دەنێ بەڕاستی و دروستی پەیامە بەرزەکەی ئیسلام و ڕاستی و دروستی موعجیزە زانستیەکانی قورئان و سوننەت.



## ١٨ كە گوێ بیستی ئایەتێك بوو لە قورئانی پیرۆز دكتۆری فەڕەنسی (مۆریس بوكای) موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند

لەو كاتەدا دەسەڵاتی سەرۆكایەتی فەڕەنسا درا بە سەرۆكی كۆچكردووی فەڕەنسی (فرانسوا میتران) لە ساڵی (١٩٨١)، لە كۆتایی هەشتاكاندا فەڕەنسا داوای لە میسر كرد بۆ میوانداری كردنی لاشەی مۆمیاكراوی فیرعەون بۆ توێژینەوە و لێكۆڵینەوەی شوێنەواری و ئەسەری، لەپاش ڕەزامەندی وەرگرتن جەستەی بەناوبانگترین ستەمكار گوێزرایەوە بۆ فەڕەنسا لەلای پەیژەی فڕۆكەكەوە سەرۆكی فەڕەنسی و وەزیرەكانی و گەورە پیاوانی فەڕەنسی ئامادەی پێشوازی كردنی بوون، پاش كۆتایی هاتنی ڕێ و ڕەسمی پێشوازی شاهانە لەلاشەی فیرعەونی ستەمكار لەسەر زەوی فەڕەنسا لاشە مۆمیاكراوەكەی فیرعەون گوێزرایەوە لە كەژاوەیەكدا كە كەمتر نەبوو لە پێشوازیەكەی، پاشان گوێزرایەوە بۆ بەشێكی تایبەت لە ناوەندی توێژینەوەی شوێنەواری فەڕەنسی، بۆ دەستپێكردنی توێژینەوەكان كە لەلایەن زانایانی شوێنەواری فەڕەنسی و دكتۆری نەشتەرگەری و توێكارییەو بەرێوەدەچوو، ئەمەش بۆ لێكۆڵینەوە و دەرخستنی نێهێیەكانی ئەم لاشە مۆمیاكراوە. سەرۆكی نەشتەرگەرەكان و لێپرسراوی یەكەم لە لێكۆڵینەوە كردنەكە پرۆفیسۆر دكتۆر (مۆریس بوكای) بوو.

توێژەرەوەكان گرنگیان دەدا بە پاك كردنەوە و ڕێكخستنەوەی ماددەی مۆمیاكە، بەڵام گرنگیدانی دكتۆر (مۆریس) بریتی بوو لە هەنگاونان بۆ دەرخستنی چۆنیەتی مردنی ئەم پاشا ستەمكارە، لە كاتژمێرە درەنگەكانی شەو ئەنجامە كۆتاییەكان دەركەوتن كە پاشماوەی خوێ ی قەتیسماو لە لاشەكەدا دەبینرا، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مردنەكەی بەهۆی خنكانەوە بووە لە دەریادا، هەروەها هێنانە دەرەوەی لاشەكە پاش خنكانی بەخێرایی و هەروەها بە خێرایی لاشەكە بۆنخۆش مۆمیاكراوەكە بۆمانەوەی جەستەكە، بەڵام پرسیارێكی سەرسوڕهێنەر بەردەوام

پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس بوکای) سەرسام کردبوو: ئەویش چۆن ئەم لاشەیە بە شێوەیەکی زۆر جوان ماوەتەوە؟ لەچاو لاشەی مۆمیاکراوەکانی ترەوە لە کاتێکدا ئەم لاشەیە لەنێو ئاوی دەریادا هێنراوەتە دەرەوە؟

پرۆفیسۆر (مۆریس) راپۆرتی کۆتایی ئامادەکرد سەبارەت بە دۆزینەوەیەکی تازە لەسەر لاشەی فیرعەون کە ئەوەیە: لەناو ئاودا خنکاوە و پاشان دەرهێنراوە و مۆمیا کراوە ڕاستەوخۆ دوای خنکانی لە ئاوەکەدا.

یەکێك لە هاوکارانی بەگوێی دا چرپاند و پێی وت: پەلەمەکە لەبەرئەوەی موسڵمانان دواون سەبارەت بە نقوومبوونی ئەم مۆمیایە. بەڵام پرۆفیسۆر (مۆریس بوکای) بە توندی نکۆڵی ئەم هەواڵەی کرد و بە دووری زانی و وتی: نموونەی ئەم دۆزینەوەیە ناتوانرێت بزانرێت تەنها بە بەرەو پێشچوونی زانیاری سەردەم و ئامێری ئەلکترۆنی وردی سەردەم نەبێت، یەکێك لە هاوکارانی پێی وت: کە ئەو قورئانەی موسڵمانان باوەڕیان پێی هەیە چیرۆکی خنکان و پاراستنی لاشەکەی دوای خنکانی دەگێڕێتەوە ئەوەندەی تر سەری سوڕما و ئەم پرسیارەی لەلا دروستبوو: ئەمە چۆن دەبێت، لە کاتێکدا ئەم مۆمیایە نەدۆزراوەتەوە تا ساڵی (١٨٩٨)ز؟، لە کاتێکدا قورئانەکەیان پتر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش هاتووە؟ ئەمە چۆن ژیری قبووڵی دەکات؟

لە کاتێکدا نەك عەرەب بەڵکو مرۆڤایەتی بە گشتیش هیچ زانیاریەکیان نەبووە سەبارەت بە مۆمیاکردنی لاشەی فیرعەونەکان، تەنها پێش چەند دەیان ساڵێك لەمەوپێش نەبێت. پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس بوکای) ئەو شەوە مایەوە بە بیرکردنەوە و تێڕامان زۆر بە ووردی لە لاشەی فیرعەون و ئەو قسانەی کە هاوڕێکەی سەبارەت بە قورئانی موسڵمانان بۆی کرد، سەبارەت بە ڕزگاربوونی لاشەکە، پاش خنکان لە دەریاکەدا لە کاتێکدا پەرتووکە موقەددەسەکەیان (ئینجیل) باس لە خنکانی فیرعەون دەکات، لە کاتێکدا کە بەرەنگاری (موسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بوویەوە، بەبێ باسکردنی چارەنووسی لاشەی فیرعەون.

بۆیه دکتۆر (مۆریس بوکای) له دڵی خۆیدا وتی: ئایه دەگونجێ و ژیرم قبوڵی دەکات که ئەم لاشەیەی له بەردەممدایه ئەو فیرعەونه بێت که بەرەنگاری (موسا)ی کردووه؟ ئایه ژیری دان بەوەدا دەنێت که (محمد)ی پێغەمبەریان ئەمەی زانیوه له پێش هەزارەها ساڵ زیاتر؟

ئەو شەوه پرۆفیسۆر (مۆریس بوکای) نەیتوانی بخەوێ و داوای کرد که تەوراتی بۆ بێنن و کردیەوه و ئەم چەند دێڕەی خوێندەوه که دەڵێ (فرجع الماء وغطى مركبات وفرسان جميع جيش فرعون الذي دخل وراءهم في البحر ولم يبقى منهم ولا واحد). واته: ئاوەکه گەڕایەوه و هەموو کەشتی و سوپا و سەبازەکانی فیرعەون که چوونه ناوەوه لەدوای فیرعەون بۆ ناو ئاوەکه هیچیان نەمان تەنانەت یەك دانەشیان.

پاشان دکتۆر (مۆریس بوکای) تێڕاما و هەروەها له ئینجیلیش دا باس له ڕزگاربوونی ئەم لاشەیه و هاتنه دەرەوەی نەکراوه، لەدوای تەواوبوونی توێژینەوەکه لەسەر لاشەی فیرعەون، له فەرەنساوه گوێزرایەوه بۆ میسر، بەڵام پرۆفیسۆر (مۆریس بوکای) دڵخۆش نەبوو بۆ بڕیارەکه و سەرخۆنەکەوتەوه لەدوای ڕاچڵەکانی بەو هەواڵەی که قورئانی موسڵمانان سەبارەت به ڕزگاربوونی لاشەی فیرعەون داویەتی، ئەوەبوو کەلوپەلی پێچایەوه و بڕیاری دا به سەفەرکردن بۆ وڵاتی موسڵمانان بەمەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ کۆمەڵێك له زاناکانی موسڵمانان له بواری توێکاریدا، یەکەم چاوپێکەوتن لەگەڵیاندا سازدا، سەبارەت به دۆزینەوەی و ڕزگاربوونی لاشەی فیرعەون دوای خنکانی له ئاوەکەدا، یەکێك له زانا موسڵمانەکان هەستا و قورئانێکی بۆ کردەوه و ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾ (یونس: ٩٢). واته: (ئەمڕۆ ئیتر لاشەی مردووی تۆ ڕزگار دەکەین له دەریاکه و له خواردنی ماسی تا ببێته موعجیزه و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی له ئایەت و موعجیزەکانی ئێمه غافڵ و بێ ئاگان).

لەڕاستیدا ئەم ئایەتە زۆر توند کاری تێکرد و ناخی ڕاچڵەکاند بە جۆرێك کە لە بەرامبەر ئامادەبوان بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: ئەوە هاتمە ناو ئیسلامەوە و باوەڕم بەم قورئانە هێنا.

لە پاشان پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس) گەڕایەوە بۆ فەرەنسا بەڵام بە سەروسیمایەکی جیاواز لەوەی کە پێوەی ڕۆیشتبوو، پاشان بۆ ماوەی دە ساڵ سەرقاڵ بوو بە دیراسەکردنی سنوری گونجاندن و لێکچوونی ڕاستییە زانستییەکان و دۆزینەوە تازەکان لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، بەرهەمی ئەم ساڵانەی کە پرۆفیسۆری ناوداری فەرەنسی (مۆریس بوکای) سەرقاڵی دیراسەکردن بوو، بریتی بوو لە دانانی پەرتوکێك سەبارەت بە قورئانی پیرۆز کە بووە هۆی ڕاچڵەکاندنێکی بەهێز، کە پەرتووکەکە لە ژێر ناونیشانی (قورئان و تەورات و ئینجیل و زانست)، توێژینەوە لە کتێبە پیرۆزەکان لە ژێر ڕووناکی زانستە تازە و نوێکاندا بوو لە یەکەم چاپی دا لە هەموو کتێبخانەکان فرۆشراو تەواو بوو، لە پاشان چاپی تری لێ کرایەوە بە سەدان هەزار دانە و دواتر گۆڕدرایە سەر زمانەکانی (عەرەبی، تورکی، ئینگلیزی، ئەندەلووسی، فارسی، سربی، کرواتی، ئاردیی، کەجوڕاتی، ئەڵمانی).

پاشان بە هەموو کتێبخانەکانی ڕۆهەڵات و ڕۆژئاوادا بڵاوبوویەوە، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە هەندێك لە زانایانی ڕۆژئاوا دەستیان دایە نووسین بۆ بەرپەرچ دانەوەی کتێبەکەی پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس بوکای)، بەڵام لە کۆتاییدا کە بە تەواوی لە کتێبەکەی دکتۆر (مۆریس) ڕۆچوون، تەسلیم بوون و باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون، ڕزگاربوونی فیرعەون بە لاشە و مانەوەی تا ئەمڕۆ یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی قورئان، چونکە هەروەك قورئان فەرموویەتی: زانستی پزیشکی تازەش دەقاودەق ئەوەی بە بەڵگەوە سەلماندووە، دکتۆر (مۆریس بوکای) ئاشکرایکرد.




لە کتێبی (قورئان و زانستی سەردەمدا) نهێنی لەیەکچوونی قورئانی پیرۆز سەبارەت بە چارەنووسی فیرعەونی سەردەمی (موسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەدوای خنکانی لە ئاوی دەریاکەدا لەگەڵ ڕاستیەتی مانەوەی جەستەکەی تا

ڕۆژی ئەمڕۆمان، ئەویش بۆبوونی بەڵگەیەكی ئاشكرا بۆ هەموو خەڵكی هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾ (یونس: ٩٢). پرۆفیسۆر (مۆریس) دەڵێت: گێڕانەوەی تەورات سەبارەت بە هاتنە دەرەوەی جوولەكەكان لەگەڵ (موسا) پێغەمبەر لە میسر، ڕاستیەكی حاشا هەڵنەگرە دەربارەی ئەوەی دەڵێت: مینفیتاح جێنشینی ڕەمسیسی دووەم بریتیە لە فیرعەونی میسر لە سەردەمی (موسا) پێغەمبەردا، و توێژینەوە پزیشیكیەكانیش لەسەر مۆمیای (مینفیتاح) كۆمەڵێك بەڵگەی زۆر بەسوودیان بۆ ڕوون كردووینەتەو سەبارەت بە هۆكارەكانی كۆچی دوایی ئەم فیرعەونە.

تەورات یادمان دەخاتەوە كە ئەم لاشەیە دەریا لووشی داوە، بەڵام هیچ ڕوونكردنەوەیەكی تری نەداوە سەبارەت بە فیرعەونی ستەمكار لەدوای كەوتنە ناو ئاوەكەوە، پاش ماوەیەك دەرهێنراوەتەوە لە ئاوەكە هەروەك چۆن ئایەتەكە ئاماژەی پێدا، توێژینەوە پزیشكیەكان دەریانخست كە ئەم لاشەیە ماوەیەكی زۆر لەناو ئاودا نەماوەتەوە و هیچ نیشانەیەك دەرنەكەوتووە لەسەر خراپ بوونی تەواوەتی بەهۆی مانەوەی ماوەیەكی زۆر لە ئاودا.

پرۆفیسۆر دكتۆر (مۆریس بوكای) دەڵێت: ئەنجامە پزیشكیە ڕاستەقینەكان دەركەوتن بۆ پاڵپشتكردنی گریمانەكەی سەرەوە، ئەوەبوو لە ساڵی (١٩٧٥)دا لە قاهیرە پارچەیەكی بچووك لە شانەی ماسولكەی لاشەكە لێكرایەوە بۆ توێژینەوە كە بە سەرپەرشتی پرۆفیسۆر (michfidurigon) بوو. توێژینەوە ووردبینییەكە مانەوە و پاراستنی هەموو پێكهاتە توێكاریە بچووكەكانی ماسولكەكەی دەرخست ئەم ڕاستیە ئاماژەدان بوو بەوەی كە نموونەی ئەم جۆرە پاراستنە ناگونجێت، ئەگەر لاشەكە مابێتەوە لەناو ئاوەكەدا و هەروەها مانەوەی لە دەرەوەی ئاویش بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ پێش ئەوەی كاری مۆمیاكردنی بۆ كرابێت و لەوە زیاتر كارمان كردووە و گرنگیمان داوە بە لێكۆڵینەوە سەبارەت بە هۆكارەكانی مردنی فیرعەون،

چەند توێژینەوەیەکی پزیشکی ڕێ پێدراو بۆ مۆمیاکە کرا بە یارمەتی (cecaldi) کە بەڕێوبەری تاقیگەی ناسنامەی یاسایی بە (مختبر الهوية الفضائية) لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا و، پرۆفیسۆر (durigon) ڕێگای پێ داین بە بەدواداچوون بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی هۆکارێك بۆ مردنێکی زۆر خێرا، بۆی ئەویش بەهۆی چەند پیاکێشانێك و برینداریی ئێسکی مۆخی بووە کە بووە هۆی بۆشایی یەکی گەورە لە بەشی لاتەنیشت و دواوەی مێشك، هەموو ئەم لێکۆڵینەوانە ڕوونی دەکەنەوە و یەك دەنگن لەگەڵ چیرۆکەکانی کتێبە پیرۆزەکان، کە ئاماژە دەکەن بۆ مردنی فیرعەون کاتێك کە شەپۆلی ئاوەکە دایەوە بەسەریدا.

پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس بوکای) ڕووە ئیعجازیە زانستیەکەی ئەم باسە ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێت: لەو سەردەمەی کە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە بۆ خەڵکی لە ڕێگەی (محمد صلی اللە علیە وسلم) لاشەی هەموو ئەو فیرعەونانەی کەوا خەڵکی گومانیان هەبوو لە سەردەمی تازەدا کە ئایە ڕاستە یان هەڵە کەوا پەیوەندی یان هەبێت بە چوونە دەرەوەی (موسا) و نەتەوەکەی هەموویان نێژرابوون لە (وادي الملوك) دۆڵی پاشاکان لە (طیبة)، لەبەری ئەوبەری کەناری ڕووباری نیل لەبەردەم شاری (الأقصر)ی ئێستا لە سەردەمی پێغەمبەر (محمد) (صلی اللە علیە وسلم)دا هەموو شتێك نادیاربوو سەبارەت بەم باسە و هەموو ئەم لاشانە ئاشکرا نەکرابوون تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم نەبێت.

لەبەرئەوە لاشەی فیرعەونی سەردەمی (موسا) کە تا ئێستاش ماوەتەوە، وەکو بەڵگەیەك بەبەرچاوەوە کە شایەتیەکی بەرجەستەیە لەلاشەیەکی مۆمیاکراودا بۆ کەسێك کە (موسا) (سەلامی خوای لێبێت) ناسیوە و، دژی داواکاریەکانی وەستاوەتەوە و دەری کردووە و ڕاوی ناوە و لەکاتی ڕاونانەکەدا مردووە و خوای گەورە لاشەکەی پاراستووە لە لەناوچوونی تەواوەتی تاوەکو ببێتە بەڵگە و موعجیزەیەکی گەورە بۆ خەڵکی هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە و ئەم زانیاریە مێژوویی یە سەبارەت بە چارەنووسی لاشەی فیرعەون لە ژێری هیچ کەسێکدا

نەبووە نە لەکاتی دابەزینی قورئان دا و نە لەدوای دابەزینی بە چەند سەدان ساڵێکی زۆر، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا ئەوە ڕوونکراوەتەوە پتر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر، بەڕاستی ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورەیە کە ئاگادارە بە هەموو وردەکاریەکانی ژیانی مرۆڤ و کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی.



## ١٩ فیرعەونی (ذي الأوتاد) و ئیعجازێکی زانستی نوێ:

قورئان باسی فیرعەون دەکات بە سیفەتێکی کە، ئەویش فیرعەونی (ذي الأوتاد)ەو دەفەرموێت: ﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِی ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ (الفجر: ١٠) ئاخۆ مەبەست چی بێت لە (ذي الأوتاد)؟ لە تەفسیرەکاندا هاتووە کە مەبەست لە فیرعەونی خاوەن بینای مەحکەم و دەسەڵاتی چەسپاوە، تۆ بڵێی فیرعەونی زەمانی (موسا) ناوی (ذو الأوتاد) بوو بێ؟ بەڵێ ئەوەش ئەو دۆزینەوەیەیە کە دکتۆر (علی فەهمی) لە پەرتووکەکەیدا (الهة مصر العربية) باسی دەکات و دەڵێ: دوا پاشای خێزانی یەکەمم کە لە لیستی (مانیتۆ)دا ناوی هاتووە ناوی (بیینجیس) بووە، ئەو وشەیە لە سێ بەش پێکهاتووە لە زمانی میسری کۆندا (بی، ان، خیو) کە ماناکەی (بی، ان) واتە (ذوال) وە (خیو)ش واتە: (اوتاد) وە (س)ەکەش زیادکردنی یۆنانییەکانە بۆ ناوەکان، کەواتە: (ذو الأوتاد) وەرگێڕانی ناوی فیرعەونەکەیە کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایین کە بەڕاستی موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە وەك موعجیزەکانی تری قورئان.

❊❊❊



## ٢٠ دۆزینەوەی بوردییەی ئەیبور و ئاشكرا بوونی ڕاستییەكی مێژوویی گەورە:

خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانستە ناوازەكەیدا باسی ئەو بەڵایانە دەكات كە تووشی بەنی ئیسرائیل بوون لە زەمانی (موسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت)، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ۝١٣٢ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ۝١٣٣ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ۝١٣٤ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ۝١٣٥ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنْهَا غَٰفِلِينَ﴾ (الأعراف: ١٣٢–١٣٦).

جا ئەمانەی قورئان لەو مەسەلەیەدا باسیكرد هەندێكی لە تەورات و ئینجیل دا هاتووە، بۆ نموونە باسی تۆفانەكە تەنها لە قورئاندا هاتووە، هەروەها غەرقبوونی فیرعەون و تیاچوونی و دەرهێنانەوەی بەو شێوەیەی لە قورئاندایە لای ئەوان باسی نەهاتووە، دیارە تەنها قورئانە كە پارێزراوە لە خواوەو پەڕاوەكانی تر هەمووی دەستكاری كراون و بەردەوامیش دەستكاری دەكرێن. بۆ نموونە ئینجیلەكان چەند جۆرن و جیاوازی زۆر لەنێوانیاندایە، هەروەها هەتا چەند سەدە دوای پێغەمبەر ﷺ تەورات و ئینجیل وەرنەگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی و تەنها زانایانی گاورو جولەكە دەیانزانی، زۆر لەو زانستیە مێژووییانەی قورئان باسی كردوون پاش هەندێ دۆزینەوەی ئاسەواری مێژوویی كە هەزاران ساڵ لەمەوبەر بە زمانی (هیرۆگلێفی) تۆمار كراون دەبنە بەڵگەی ڕاستی قورئان بۆ خەڵكی.

لە سەرەتای سەدەی هەژدەی زایینیدا بوردییەكی كۆن دۆزرایەوە كە حەڤدە لاپەڕەیە لە ناوچەی (منفیس) لە نزیك ئەهرامەكانی (سقارە) لە میصر، مۆزەخانەی

نیشتمانی (لیدن) له هۆڵەندا ئەو بوردییەی کڕییەوه له ساڵی (١٨٢٨ز) دا که باسی سەردەمی فیرعەون دەکات به زمانی (هیرۆگلیفی) نووسراوەتەوه، ژمارەکەش له مۆزەخانەکەدا (٣٤٤)ەو به بوردییەی ئەیبور ناسراوه له ساڵی (١٩٠٨) زایینی زانایەك توانی زمانی (هیرۆگلیفی) بخوێنێتەوه، بەو جۆرەش زانایان توانیان لەو حەڤدە لاپەڕەیه تێبگەن که باسی سەردەمی فیرعەون و بەڵاو موسیبەتەکان دەکەن بەو شێوەیە:

١- وشکەساڵی له لاپەڕەی (٢، ٣، ٤، ٥، ٨، ١١) باسی وشکەساڵی و وێرانی وڵات کراوه.

٢- خوێن له لاپەڕەی (١٠، ٢، ٦، ٧) دا باسی ئەوه دەکات که ئاوی نیل بووه به خوێن، هەروەها دەڵێ موسیبەت له هەموو لایەکەوەو خوێنیش له هەموو زەوی میسردایە، هەموو ئاوی ڕووبارەکه بووه به خوێن، خەڵکی وازیان هێناوه له ئاوخواردنەوەو تینویەتی بڵاوبۆتەوه. هەروەها له لاپەڕه (١٣) دا دێڕی (١٠) دەڵێت: ئەوه ڕووبارەکەمانە، ئەوه ئاوی خواردنەوەکەمانە ئەوه سەرچاوەی بەختەوەریمانە نازانین چی بکەین ئەوەش بەڕاستی بەڵایەکه لەوه ناچێ هیچ گەلێکی تری پێ تاقیکرابێتەوه.

قورئان ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرموێ: بەخوێن تاقیمان کردنەوه، بەڵام ئەگەر سەیری ئەم نووسینانه بکەیت تێدەگەیت چ کارەساتێك بووه، چ غەزەبێك بووه خوا لێیگرتوون؟ ئاوی ڕووباری نیل سوور بێ به خوێن، ئاوی بەرمیل و دۆلکەو پەرداخ و مەرکانه و گشت شتەکان لەپڕ ببن بەخوێن، بەڕاستی ئەوه هەر له دەست خوا دێت کەچی وەره بەو موعجیزه گەورەیه بەربڵاوه له وێنه نەبووەش نەگەڕێنەوه.

٣- کەمی بەرووبووم: دیاره که ئاو نەما بەروبوومی چی؟ که بەرەکەتی خوایی نەما بەروبووم له کوێ دەمێنێ؟ له لاپەڕەی (شەش) دێڕی یەك دەڵێ: درەختەکان بەروبوومیان نەما، له لاپەڕه (٦) دێڕی یەك دەڵێ: هیچ نییه لێره نه بەروبووم و نه

گژوگیا هیچ نییه لێره هەر برسیەتی هەیە، له لاپەڕه (٣) دێڕی (١٠)و له لاپەڕه (٦)دا دەڵێ: میسر گریا سەرچاوەی ژیان نەما، کۆشکەکان گەنم و جۆو باڵندەو ماسی تیا نەما. له لاپەڕه (٥) دێڕی (٥) دەڵێ: تەنانەت مەڕو ماڵاتمان گریا، هەروەها له لاپەڕه (٢) دێڕی (٩) و لاپەڕه (٣) دا دەڵێ: ئەوە مەڕو ماڵاتە وازی لێهێنراوەو کەس نییه بیلەوەڕێنێ.

٤- مردنی فیرعەون و غەرق بوونی: له لاپەڕه حەوت دێڕی (١) و لاپەڕه (٢) دا دەڵێ: ئەوە فیرعەونە نەما له بارو زروفێکدا که لەوەپێش شتی وا ڕوووینەداوە. له پەڕاوی (اثار مصر القديم) ج١ دا که (جێمس بیکی) نووسیوویەتی دەڵێ: له دۆزینەوه سەیرەکانی زانای شوێنەوارناس (بتوی) له کاتی گەڕانیدا له ساڵی (١٩٠٥-١٩٠٦)دا له گردی (الرطابة) سوراحییەکی خەزەفی شینی دۆزییەوە، که (نۆزده) بۆق به دەوریدایەو چەند بۆقێکیش پیایدا سەردەکەون و ژمارەیەکی زۆریش له سەردەمەکەین، ئەوەش له پەڕاوی (فیرعەونی موسا کێیە)دا باسکراوه، لاپەڕه (٩١٢) که لەلایەن دکتۆر ڕوشدی بەدراوییەوه نوسراوه.



## ٢١ قورئان باسی هامان دەکات شوێنەوارناسانیش نهێنییەکی گەورەیان ئاشکرا کرد:

قورئان باسی کەسێك دەکات که فیرعەون کاری بیناکردنی پێسپاردووەو ناوی دەبات به (هامان)، ئەوەش بەڕاستی یەکێکیتره له موعجیزه ناوازەکانی قورئان، چونکه ناوی (هامان) که له زەمانی فیرعەوندا بێت له تەورات و ئینجیلدا نەهاتووە، دکتۆر (مۆریس بۆکای) دەڵێت: چووم بۆ لای زانایەکی فەرەنسی شارەزا له بواری مێژووی میسردا ناوی (هامانم) بۆ نووسی و وتم: ئەمه له سەدەی حەوتی زاینیدا باسی هاتووه تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: ئەستەمه شتی وا ببێت، چونکه ئەم ناوه ناوێکی



هیرۆگلیفییەو کەسیش تا ئەم دواییە لەم زمانە تێنەگەیشتووە، لەم سەدانەی دواییدا کە ئەو زمانە دۆزرایەوەو ئاسەواری فیرعەونەکانیان خوێندەوە بینییان کە کەسێك بە ناوی (هامان) بەرپرسی بیناکردن بووە لە زەمانی فیرعەوندا. وتی: برۆ سەیری (معجم اسماء الاشخاص في الامبراطورية الجديدة) بکە کە ناوی پاشاکانی میسرو کەسایەتییەکانی کۆنی تیایە. دکتۆر دەڵێت: کە گەڕام ئەوەی سەیر بوو ئەو ناوەم دۆزییەوە، هەروەها بینیم بە زمانی ئەڵمانی باس لە کاری ئەو هامانە دەکات کە پلەوپایەی هەبووەو سەرۆکی کرێکارە بەرد هەڵکەنەکان بووە، کە ئەوەش موعجیزەیەکی گەورەی قورئان دەردەخات قورئان دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ (القصص: ٣٨) واتە: فیرعەونی ستەمکار وتی: ئەی گەورە ئەشرافەکان وا نازانم جگە لە خۆم هیچ پەرستراوێکی ترتان هەبێ، جا بۆ زیاتر دڵنیابوون ئەی هامان بە کورەی ئاگر لەو خشتە کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە، بە گاڵتەوە وتی: بەڵکو سەیری خواکەی موسا بکەم و بیبینم و بەڕاستی وا دەزانم ئەو (موسا) لە درۆزنانە، ئا بەو شێوەیە ئەو فیرعەونە ستەمکارە بڕوای نەهێنا بە خوای تاك و تەنها و شوێن موسا پێغەمبەر (علیه السلام) نەکەوت، سەرەڕای بینینی چەندین موعجیزە لەسەر پێغەمبەرایەتی (موسا) تا لە دواییدا خوای گەورە فیرعەون و دارو دەستەکەی لە ڕووباری نیلدا ژێر ئاو خست و کردی بە پەند.

***



## پرۆفیسۆر (تاجاتان تاجاسۆن) موسڵمان بوو بەهۆی موعجیزەی ئایەتێکی قورئانی پیرۆز:

بە دەیەها زانای جیهانی موسڵمان دەبن، وەك پرۆفیسۆر (تاجاتان تاجاسۆن) عەمیدی کۆلیژی پزیشکی زانکۆی (شاینج مای) لە تایلاند کە دەڵێت: من بڕوام هەیە کە هەرچی لە قورئاندا باسکراوە دەتوانرێ بە وەسائیلی زانستی ڕاستی بسەلمێندرێ، وە من بڕوام هەیە کە (موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلام) کە نەخوێندەوار بووە، ئەو زانیارییانەی لە ڕێگای وەحییەوە لە خوایەکی زانا بە هەموو شتێکەوە وەرگرتووە، من دەزانم کاتی ئەوە هاتووە کە بڵێم: (**اشهد ان لا إله إلا الله واشهد ان محمداً رسول الله**).

بەمشێوەیە ناوبراو لە کۆنفرانسی پزیشکی هەشتەمدا لە سعودیە موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، لە ماوەی سەردانێکیدا بۆ وڵاتی سعودیە پرۆفیسۆر (تاجاتان تاجاسۆن) سەرۆکی پێشووی بەشی توێکاری و کۆرپەلەزانی و ڕاگری ئێستای کۆلیژی پزیشکی لە زانکۆی (chanemi) لە تایلەند، هەندێك ئایەت و فەرموودەی تایبەت بە بواری کارەکەی خۆی پیشاندرا، پرسیار لە پرۆفیسۆر (تاجاتان) کرا ئایا ئاگاداری کارەکانی پرۆفیسۆر (کیث مور)ی زانای کەنەدیت؟

وەڵامی دایەوە کە پرۆفیسۆر (کیث مور) دەناسێت کە پیاوێکی زۆر دیاری بواری کۆرپەلەزانییە، پاشان پرۆفیسۆر (تاجاسان) بابەتێکی پرۆفیسۆر (کیث مور)ی خوێندەوە کە تیایدا نووسیبووی بە بۆچوونی ئەو ڕاستییە زانستییەکانی قورئان و زانستی نوێ چوونیەکن. (تاجاسان) سەرسام بوو بەوەی کە بابەتەکەی (کیث مور)ی خوێندەوەو ویستی کە زیاتر بزانێت، پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی بۆ خوێندرایەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء: ٥٦) تاجاسان زانی کە ئەو ئایەتە پیرۆزە ئاماژەیە بۆ ڕاستییەکی زانستی پێست کە لەو دواییانەدا زانستی نوێ دەریخستووە چونکە پێست کۆتایی هەستەوەرەکانی تێدایەو ئەگەر سوتاوییەکی قوڵی پێست ڕوویدات، واتە:

ئەگەر پێست بە تەواوی بسوتێ ئەوا هەست بە ئازار ناکات هەرچەندە بە سوتاندن ئازار بدرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: کە ئەو بێباوەڕانەی لە دۆزەخدان سات لە دوای سات پێستیان بۆ نوێ دەکرێتەوە تاوەکو بە بەردەوامی هەست بە ئازار بکەن بەهۆی گۆڕین و نوێکردنەوەی پێستیانەوە. واتە: نوێکردنەوەی هەستەوەرەکانیان کە لەناو پێستیاندایە.

پرۆفیسۆر تاجاسان هاوڕابوو لەگەڵ ئەوەی کە ناکرێت و ناگونجێت ئەو هەواڵە زانستییە لە هیچ سەرچاوەیەکی مرۆییەوە هاتبێ و وەرگیرا بێت و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی قورئان پێش چواردە سەدە ئەو جۆرە زانستەش ئەو کاتە نەزانراوە، پرۆفیسۆر پرسی کرد (الله) کێیە؟ پێیان وت: (الله) بەدیهێنەرەو زانست و دانایی و کاربەجێی و تەواوی و بەزەیی و تەنها سەرچاوەیان ئەوە. ئەو پرۆفیسۆرە گەڕایەوە بۆ تایلاند و زنجیرەیەك وتاری دەربارەی ئەو شتانە کە فێریان بوو بوو پێشکەش کرد، ڕاستەوخۆ لە ئەنجامی کاریگەری ئەو وتارانەوە (پێنج) لە خوێندکارەکانی موسڵمان بوون.

ماوەیەك دوای ئەوە پرۆفیسۆر (تاجاسان) گەڕایەوە سعودیە بۆ ئامادەبوون لە کۆنفرانسێك لە شاری (ڕیاز)، لەوێ وتەیەکی پێشکەش بە ئامادەبووان کردو وتی: لێکۆڵینەوەکانی وایان لێکردووە کە باوەڕ بهێنێت بەوەی هەرچی لە قورئاندا هاتووە ڕاستییە، ئەو ڕاستییانەی کە پێش (١٤٠٠) ساڵ باسیان لێوە کراوە ئێستا زانستی نوێ ڕاستییەکانیان دەسەلمێنێت. (موحەممەد)یش ﷺ خوێندنەوەو نوسینی نەزانیوە کەواتە دەبێت ڕاستییەکان لەلایەن پەروەردگارەوە هاتبن، ئینجا وتی: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئاشکرای بکەم و بڵێم (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)، ئەو باوەڕهێنانە کتوپڕو کاریگەرەی لەپێش کامێرا هەمووانی سەرسام کردو بوویە هۆی خۆشی و هاواری (الله اکبر)ی ئامادەبووان، پاشان کۆتایی قسەکانی بەوە هێنا کە لەو کۆنفراسەدا زانیاری زۆری وەرگرتووە و چەندین هاوڕێی نوێی ناسیوە، بەڵام بەنرخترین شتێك کە ئەنجامی دابێت موسڵمانبوونەکەیەتی.



## شەپۆلی ئاو وەك هەورەكان:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ﴾ (لقمان: ٣٢) واتە: هەر كاتێك شەپۆلێكی وەك هەورەكان دایانپۆشێت بە دڵسۆزی لە خوا داوا دەكەن، زۆرینەی تەفسیر زانەكان دەڵێن ﴿مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ﴾ أي (يظللهم كالغمام أي مثل العظلة) واتە: شەپۆلێك وەكو كۆمەڵە هەور دەبێتە چەتر بۆیان، وشەی (موج) تاكە بەڵام (ظلل) كۆیە، واتە: یەك شەپۆل شێوەی چەند هەورێك دەبەخشێت، ناوی زانستی ئەم شەپۆلانە (Pluneine breakers) لە ناوچەكانی (هاواوی) و (باشوری كالیفۆرنیا)دا هەن. ئایا پێغەمبەر ﷺ ئەم شەپۆلانەی لە كوێ بینی؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە خوای زاناو شارەزا ئاگاداری كردۆتەوە تا ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامەكەی لە كاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لە ژینگەیەكی بیاباناوی دوور لە دەریا ژیاوەو هەرگیزیش بە دەریادا نەڕۆیشتووە.



## گەمارۆی شەپۆل بەهۆی گەردەلوول:

قورئان دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ (یونس: ٢٢) واتە: كاتێك ئێوە لە كەشتیدا دەبن شنەبایەكی خۆش هەڵدەكات و پێی دڵخۆش دەبن، بەڵام دواتر بای گەردەلول شەپۆل لە هەموو لایەكەوە بۆیان دێت. ئەوەی لای زۆربەی خەڵكی ئاشكرایە شەپۆل هەمیشە بە ئاڕاستەیەكدا دەڕوات و بە زۆری بەرەو كەنارەكانی دەریا دێن، بەڵام دەبینین ئەم ئایەتە قورئانییە باسی جۆرە شەپۆلێكی نامۆ دەكات كە بەیەك ئاڕاستە ناڕوات، بەڵكو لە هەرچوار لاوە شەپۆل بۆ كەشتییەكە دێت هۆكاری ئەمەش هەر ئایەتە قورئانییەكە دیاری كردووە كە بەهۆی بای گەردەلوولەوە ئەو جۆرە شەپۆلە دروست دەبێت، دیارە هۆكارەكەی قورئان باسی كردووە ڕاستییەكی زانستییە، چونكە كاتێك بای

گەردەلولاوی لە شوێنی کەشتییەکە دەدات ئاستی ئاوی ئەو شوێنە نزم دەبێتەوەو ئاوی هەر چواردەوری بەرز دەبنەوە، بەڵام کە کاریگەری گەردەلولەکە نەما ئاو لە هەموو لایەکەوە دەیەوێت ئەو شوێنە چاڵایەی ئاوەکە پڕ بکەنەوە بۆیە شەپۆلی بەهێز لە هەموو لایەکەوە دێن بەرەو کەشتییەکە بەمەش خەڵکی ناو کەشتییەکە ترسێکی زۆریان لێدەنیشێت و وا دەزانن لەناودەچن، وەك ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ﴾ واتە: دڵنیا دەبن بە شەپۆل هەر چواردەوریان گیراوە بۆیە دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ واتە: بە دڵسۆزییەوە دەپاڕێنەوەو دەڵێن خوایە ئەگەر لەمە ڕزگارمان بکەیت دەبینە کەسێکی سوپاسگوزار.

ئەم وەسفە وردەی قورئان کە پێش چواردە سەدە هێناویەتی و ئەمڕۆ بە وێنەو ڤیدیۆ دەبیندرێ، بەڵگەی ئەوەیە ئەم وتانە هی زاتێکە ئاگادارە بە هەموو نهێنییەکانی زەریاو دەریاکان، ئەگینا پێغەمبەرێك کە هەرگیز بە دەریادا نەڕۆشتبێت و هەرگیز ئەو شەپۆلانەی گەمارۆی کەشتی نەبینیبێت، بەبێ وەحی خوایی ناتوانێت زانیاری لەو جۆرە بدرکێنێت، بە تایبەتی کە ئەم شەپۆلانە زۆر دەگمەنن ئەوانەش کە بەردەوام بە دەریادا دەڕۆن ڕێیان لێی ناکەوێت، بەڕاستی زانست و تەکنەلۆجیا هەتا بەرەو پێش بڕوات زیاتر گەورەیی و ناوازەیی قورئان بۆ هەموو جیهان ئاشکرا دەبێت.



## ٢٥ موعجیزەی چرای دەریایی و تاریکایی دەریاکان:

جۆرێك لە زیندەوەری دەریایی لاشەی وەك چرای داگیرساو دیارن تا لە تاریکایی قوڵایی ئۆقیانوسەکاندا پێی بڕوات پێی دەوترێت چرای دەریا، مرۆڤ تا سەدەی بیست ئاگاداری تاریکاییەکانی ناو دەریا قوڵەکان نەبووە، چونکە دابەزینی مرۆڤ هەتا ژێر دەریایی (غواصة) دروست نەکرا لە ٣٠ مەتر زیاتر نەبووە، لە کاتێکدا ئەم تاریکایانە لە قوڵایی سەدان مەترەوە دەستپێدەکات و ئەمڕۆ بەهۆی زانستی تازەی پێشکەوتوو

وێنەی دەگیرێت، ئەمە لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز باسی لە تاریکاییەکانی ناو دەریا و زەریا قوڵەکان کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ﴾ واتە: دڵی بێباوەڕ تاریکایی دایپۆشیوە وەك تاریکاییەکانی دەریا قوڵەکان، بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە ئاخۆ دەبێ مولحیدەکان دوای دەرکەوتنی ئەم موعجیزە زانستیانەی قورئان کە وەك ڕۆژی ڕووناك ڕاستی ئەم پەیامە دەردەخەن چاوەڕێی چیتر بکەن؟ تا کەی لە بیابانی سەرگەردانی دا بسوڕێنەوە؟



## پرۆفیسۆر (یوشیهیدی کۆزای) بە موعجیزەی ئایەتێك موسڵمان بوو:

ئەم زانایە بە زمانی ژاپۆنی دەدوێت، ئەم پرۆفیسۆرە بەڕێوەبەری پێگەی گەردووناسی (مرصد)ی تۆکیۆی پایتەختی یابانە. دکتۆر (عەبدولمەجید زندانی) دەڵێت: چەند ئایەتێکی قورئانمان پیشانی ئەو زانایەدا کە پەیوەست بوون بە وەسفی ئاسمان و سەرەتای دروستبوونی پەیوەندی زەوی بە ئاسمانەوە، کاتێك واتای ئایەتەکانی خوێندەوە پرسیاری کرد کەی قورئانی پیرۆز دابەزیوە؟ وەڵاممان دایەوە کە ماوەی (١٤٠٠) ساڵە دابەزیوە، پاشان چەندین پرسیارمان لە بارەی ڕاستییە گەردوونییەکانەوە لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوەو لەگەڵ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێکدا دەقێکی قورئانییمان لەسەر ئەو ڕاستییانە نیشاندەدا، هەتا سەرسامی خۆی دەربڕی و وتی: بەڕاستی قورئانی پیرۆز لە بەرزترین خاڵی ئەم بوونەوەرە وەسفی گەردوون دەکات، چونکە ئەو هەموو شتەکان لە بەردەمیدا دیارن ئەوەی ئەم قورئانەی ناردووە هەموو شتەکان لە گەردووندا دەبینێت و شتێك نییە لەلای ئەو شاراوە بێت.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: پرسیارمان لێکرد لەو ماوە زەمەنییەی کە بەسەر ئاسماندا ڕۆشتووەو ئەو دەمەی لە وێنەیەکی تردا بووە وەڵامی دایەوەو وتی: بەڵگەکان ئێجگار زۆر بوون ئێستا وای لێهاتووە بوونەتە شتی بینراو، ئەمڕۆ ئەستێرەکان ئاسمان دەبینین لەو دوکەڵانەوە دروست دەبن کە بنەڕەتی گەردوونن، ئەستێرە درەوشاوەکان پێشتر دوکەڵ بوون نەك هەر ئەستێرەکان بەڵکو گەردوون هەمووی دوکەڵ بووە.

دەڵێت ئەم ئایەتەمان نیشانی پرۆفیسۆر (کۆزای) دا کە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ (فصلت: ١١). واتە لە پاشان پەروەردگار ڕووی کردە ئاسمان لە کاتێکدا کە دووکەڵ بوو، ئینجا بە ئاسمان و بە زەوی فەرموو وەرن بە ویستی خۆتان یا بە ناچاریی بێنە ژێر فەرمانم هەردووکیان وتیان: بە ویست خۆمان هاتین، هەندێك لە زاناکان کە باس لەم دووکەڵە دەکەن زاراوەی تەم (ضباب) بەکاردێنن، پرۆفیسۆر (یوشیهیدی کۆزای) ڕوونیکردەوە کە زاراوەی تەم (ضباب) لەگەڵ وەسفی سەرەتای گەردووندا ناگونجێت، چونکە تەم ساردە بەڵام دووکەڵ بەشێك لە گەرمی تێدایە، هەروەها دووکەڵ بریتییە لە گاز کە ماددەی ڕەق و تاریکی تێدایە.

بێگومان سەرەتای دروستبوونی ئەستێرەکانیش گازبوون کە ماددە ڕەقەکان تیایدا هەڵواسرابوون، لەگەڵ ئەوەشدا تاریك و گەرم بوون، وتی: ئەوەش لەگەڵ زاراوەی تەمدا ناگونجێت بەڵکو وردترین وەسف ئەوەیە کە بڵێین دووکەڵ بووە، بەو جۆرە درێژەی بە لێکدانەوەی ئەو ئایەتانە دەدا کە نیشانی دەدران.

دکتۆر (عەبدولمەجید) دەڵێت: لە کۆتاییدا پرسیارمان لێکرد ڕات چییە لە بەرامبەر ئەم دیاردەیە کە بۆ خۆت بینیت؟ پێشکەوتنەکانی زانست و نهێنییەکانی گەردوون دەردەخەن کە زۆرێك لەو نهێنیانە لە قورئان و سوننەتدا باسکراون ئایا گومانت هەیە قورئان لە سەرچاوەیەکی مرۆییەوە بۆ موحەممەد ﷺ هاتبێت؟ لە وەڵامدا وتی: نەخێر هەروەك بینیمان ناگونجێت ئەمە لە سەرچاوەی مرۆییەوە هاتبێت، هەروەها

وتی: ئێمە وەك زاناكان هەمیشە لەسەر بەشێكی بچووك لێكۆڵینەوەكانمان چڕ دەكەینەوە، بەڵام ئەو كەسەی قورئان دەخوێنێتەوە وێنەیەكی فراوانتری گەردوون دەبینێت، وتی: لەمەوە فێری بەرنامەیەكی نوێ بووم بۆ لێكۆڵینەوە لە گەردوون كە پێویستە بە ڕوانینێكی گشتگیرانە بۆی بڕوانین نەك لە خاڵێكی تەسكی دیاریكراوەوە، هەروەها وتی: بێگومان كار بۆ بنیاتنانی ئەو بەرنامەیە دەكەم كە بەهۆی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزەوە فێربووم، لەبەرئەوەی ئەو ئایەتانەی پەیوەستن بە گەردوونەوەدا هاتووی منیان ڕۆشنكردەوە واتە: لەمەودوا بەو ڕوانینە گەشتگیریانەوە لێكۆڵینەوەكانم بەرنامەڕێژ دەكەم كە لە پەرتووكی خواوە سوودمەندبووم لێیان.

خوێنەری بەڕێز: ئا ئەوانە زاناو پرۆفیسۆرە ڕۆشنبیرەكانی وڵاتە بیانییەكانن كە موسڵمان دەبن بە بینینی ئەو موعجیزە زانستییە درەوشاوانەی قورئانی پیرۆز، چونكە تا زانست بەرەوپێش بڕوات زیاتر زانستی سەرنجڕاكێش و هەمەجۆر دەربارەی ئەم بەرنامە پاكە دەردەكەون.



## پرۆفیسۆر (های) دانی نا بە گەورەیی و ناوازەیی قورئان:

پرۆفیسۆر (ولیام دەبلیبوهای) یەكێكە لە ناودارترین زاناكانی دەریایی ئەمریكا، مامۆستای جیۆلۆجیایە لە زانكۆی (كۆلۆرادۆبولدا) لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، پرسیاری لێكرا دەربارەی زۆر لە دیاردە دەریاییەكانەوە كە پەیوەندییان بە ڕووی دەریاو سنووری جیاكەرەوەی دەریای رووكەشی و دەریای قوڵ، هەروەها ئەو پرسیارانەش كە پەیوەندییان بە قوڵی و جیولۆجیای دەریاكانەوە هەبوو، پاشان پرسیاری بەربەستی ئاوی نێوان دەریا جیاوازەكان و بەربەستن ئاوی نێوان دەریاو ڕووبارەكان لێكرا، ئەویش بە درێژی وەڵامی دەدایەوە هێڵەكان بەربەستی نێوان بارستە دەریاییەكان دەنوێنن، هەموو بەربەستێك دوو دەریای جیاواز لە گەرمی سوێری چڕی زیندەوەرانی ئاوی و توانای توانەوەی ئۆكسجین لە یەك جیادەكاتەوە.

ئەوەش یەکەمجار لە ساڵی (١٩٤٢) دا زانرا، پاش ئەوەی زاناکان بۆ لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندییەکانی دەریاکان بە سەدان وێستگەی ئاوییان لە دەریاکاندا دانا، کە سنوری جیاکەرەوەی نێوان زەریای سپی ناوەڕاست و ئۆقیانووسی ئەتڵەسی ڕوون دەکاتەوە. ناوچەی (جبل طارق) لەو ناوچەیەدا دەبیندرێ چۆن سنوری جیاکەرەوە دروست بووە کە بەڕەنگی جیاواز لەنێوان دوو بارستە ئاوییەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بێگومان ئەوانە شتێك نین کە بە چاوی ئاسایی ببیندرێت، بەڵام ئەمڕۆ بوونەتە ڕاستییەکی ئاشکرا بە هۆی پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەی مانگە دەستکردەکان و زانستی هەستکردن لە دوورەوە ئەو مانگە دەستکردانە توانیان وێنەی ناوچە دەریاییەکان و سنوری ئاوی نێوان بارستە جیاوازەکان بگرن، کە بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە بە پشتبەستن بە تایبەتمەندییەتی گەرمی گیراوە، کە تیایدا دەریاکان بە ڕەنگێکی جیاواز دەرکەوتوون، هەندێکیان بە ڕەنگی شینی کراوە هەندێکیان بە ڕەنگی شینی تۆخ، هەندێکی بە ڕەنگی زەرد و هەندێکی بە ڕەنگی مەیلەو سەوز دەبینرێت، ئەو ڕەنگە جیاوازانە هۆکارەکەی جیاوازییە لە پلەی گەرمی ڕووی دەریاکاندا، بەڵام ئەگەر لەسەر ڕووی دەریادا بوەستێت جگە لە ئاوێکی شین هیچی تر نابینیت.

ئەوانە بەربەستێکن بە لێکۆڵینەوەو تەکنیکی نوێ نەبێت نابینرێن، ئەوانە قورئانیان تەفسیر کردو دوو بۆچوونی جیاوازیان هەبووە، زۆربەیان لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ۝١٩ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ﴾ (الرحمن: ١٩—٢٠) وتوویانە: (مرج) واتە: تێکەڵ بوون، وەك لە زمانەوانیدا هاتووە: ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ﴾ واتە: دوو دەریا بەیەك دەگەن و تێکەڵ دەبن، ﴿بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ﴾ واتە: بەربەستێك لەنێوانیاندایە ﴿لَّا يَبۡغِيَانِ﴾ واتە: هیچیان سەرکەشی بۆ سەر ئەوی تریان ناکات، لە ڕای دووەمیاندا وتوویانە چۆن لە نێوان دەریاکاندا بەربەست هەیە؟ چۆن وەسفی کردوون بەوەی زاڵ نابن بەسەر یەکدا؟ دەڵێن (موج) واتای تێکەڵبوونە، ئەی چۆن تێکەڵاو دەبن و بەربەست لەنێوانیاندایە؟ لە کاتێکدا خوای پەروەردگار هەواڵی داوە هیچ کامیان بەسەر ئەوی تریاندا سەرکەشی ناکات و تایبەتمەندییەکانی خۆی بەسەر ئەوی تریاندا

زاڵ ناکات، لەبەرئەوە وتیان کەواتە: دوو دەریاکە تێکەڵاو نابن بۆیە بەدوای واتایەکی تردا گەڕان بۆ وشەی (مرج)، بەڵام زۆرینەی موفەسیرەکان بەرپەرچی ئەو بۆچوونەیان دایەوە بەوەی کە بەڵگەکەیان دروست نییە، هەتا زانست سەلماندی و وردەکارییەکانی دەرخست.

بەڵێ دەریاکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان تێکەڵاو دەبن، ئاوی دەریای سپی دەچێتە ناو ئاوی ئۆقیانوسی ئەتڵەسییەوە، بە پێچەوانەوە ئاوی ئۆقیانووس دەچێتە ئاوی دەریای ناوەڕاستەوە لە نێوانیاندا بەربەستێکی ئاویی گۆشەلار هەیە، لەو بەربەستەدا ئاوی هەریەك لە دەریاکان دەگوازرێتەوە بۆ ئەو دەریایەی دراوسێی، بەڵام لە کاتی گواستنەوەکەدا تایبەتمەندییەکانی لە دەست دەدات و لەگەڵ دەریاکەی دراوسێی ئاوێتە دەبێت، واتە: هەرکاتێك ئاوی دەریای سپی بچێتە ئاوی ئۆقیانووسەکەوە سیفەتی ئۆقیانووسەکە وەردەگرێت. هەر کاتێك ئاوی ئۆقیانووسەکە بچێتە دەریای سپییەوە وردە وردە لەو بەربەستەدا سیفاتەکانی دەریای سپی وەردەگرێت، بەوەش هیچیان بەسەر ئەوەی تریاندا زاڵ نابێت ﴿لَّا يَبۡغِيَانِ﴾.

خوێنەری بەڕێز: سەرنج بدە چۆن دۆزینەوە تازەکان دەقاودەق هاوڕان لەگەڵ قورئانی پیرۆز، ئەو پرسیارە ئاڕاستەی پرۆفیسۆر (های) کرا ڕات بەرامبەر ئەو دیاردەیە چییە؟ دەقانێك لەپێش (١٤٠٠) ساڵدا دابەزیون وەصفی وردەکارییەکانی دروست و بوون و پێکهاتن دەکەن، کە لەو کاتەدا ئەستەم بووە مرۆڤایەتی ئەو زانیارییانە بزانن تا زانستی تازەی ئەمرۆ هات و وردەکارییەکانی ڕوون کردەوە، ڕات لە بەرامبەر ئەمەدا چییە؟ پرۆفیسۆر (های) لە وەڵامدا وتی: بەڕاستی من زۆر کاریگەر بووم بەم جۆرە زانیارییانە کە لە قورئانی پیرۆزدا بوونیان هەیە، ئەوپەڕی جێگای سەرسامییە کە ئەم جۆرە زانیارییانە لە قورئاندا هەن، پرۆفیسۆر (های) وتی: بڕوام وایە ئەم زانیاریانە لە خواوە هاتوون، خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن زانا ناودارە بیانییەکان داندەنێن بە گەورەیی و ناوازەیی قورئانی پیرۆز سوپاسی بێپایان بۆ خوای گەورە.



## شایەتیدانی پرۆفیسۆر (شرۆیدەر) بۆ ئیعجازە زانستییەکانی قورئان:

دکتۆر (عەبدولمەجید زندانی) دەڵێت: لە کۆڕبەندێکی دەریازانەکان لە زانکۆی (مەلیك عەبدولعەزیز) لە (جیدە)، چاوم کەوت بە پرۆفیسۆر (شرۆیدەر) کە یەکێکە لە دەریازانەکانی (ئەڵمانیا)، داوای لێکردم وتارێك لەسەر دیاردە دەریاییەکان لەنێوان دەرخستنە زانستییەکان و ئایەتە قورئانیەکاندا پێشکەش بکەم، پاش ئەوەی وتارەکەم خوێندەوە لە ڕۆژی دووەمدا (پرۆفیسۆر شرۆیدەر) لەسەر وتارەکە لێدوانی دا لەو وتانە، شرۆیدەر وتی: خۆشحاڵم لەسەر وتارەکەی دکتۆر (عەبدولمەجید) کە دوێنێ پێشکەشی کردین چەند قسەیەك دەکەم من ئەم موحازەرەیە بەرز دەنرخێنم لە چوارچێوەی کۆبوونەوەیەکی زانستیدا.

پاشان (پرۆفیسۆر شرۆیدەر) وتی: کاتێك خۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و ئەو ڕاستییانەی بیست کە (١٤٠٠) ساڵ لەو پەرتووکە پیرۆزەدا باسکراوە سەرسام بوو، بۆیە لەسەر ئەوە وتی: لە زۆرێك لە ئاینەکاندا ڕابەرانیان وا گومان دەبەن کە زانست دەتوانێت شت لە ئاین وەربگرێت، بە ڕاستی دکتۆر زندانی ئەو ڕاستیانەی پیشاندام کە هەرچی قورئان فەرموویەتی زانست پشتگیری دەکات، ئەوەی قورئانی پیرۆز سەدان ساڵە فەرموویەتی ڕاستەقینەیە کە زاناکانی ئەمڕۆ دەریدەخەن، بەڕای من ئەوەی لەم کۆڕبەندەدا گرنگە ئەوەیە کە زاناکانی هەموو جیهان لەم شتە ئاگادار بکرێنەوە. من زۆر دڵنیام کاتێك ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتەکانی خۆمان زیاتر بیر لە پەیوەندی نێوان ئاین و زانستی دەریا دەکەینەوە، چونکە ئەوە ڕاست نییە کە زانست لەلایەك بێت و ئاینیش لەلاکەی تر بێت.

ئەوە ڕوون بۆوە کە ئەوەی زاناکانی ئەمڕۆ دەریدەخەن (١٤٠٠) ساڵە لە قورئاندا باسکراوە، بۆیە لێرەدا بۆمان هەیە پرسیار بکەین کێ ئەم زانیارییانەی فێری (موحەممەد ﷺ) کرد، کێ وەحی بەمانە بۆ کرد؟ بێگومان ئەمە ئەو بەڵگە ئاشکرایەیە

که قورئانی پیرۆز یان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ باسی کردووەو زاناکانی ئەم سەردەمەمان لە بوارە جیاجیاکانی گەردوون و دەریاو جیۆلۆجیاو بەشەکانی تردا لێی تێدەگەن. پرۆفیسۆر (شرۆیدەر) پاش ئەوەی ئەو شتانەی بیست بە هەموو متمانەیەکەوە لەو بارەوە وتی: زانست لەلایەك نییەو ئاین لە لاکەی تر، بەڵکو هەردووکیان لە یەك ئاڕاستەدا دەڕۆن ئەوان هەمان شت بە زمانێکی جیاواز دەڵێن بە زمانێکی زۆر زانستی و بە زمانی ئایەتەکانی قورئان.

##  دۆزینەوەی گرووپە بەریتانییەکە (چالینجەر) ڕاستییەکی گەورەی قورئانی دەرخست:

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ۝ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ (الرحمن: ١٩–٢٠) واتە: دەریایەك لەگەڵ دەریایەکی تردا کە ئەگەنە یەك ئاو یان تێکەڵ نابێت لەگەڵ یەکتردا پەردەیەك لەنێوانیاندا هەیە. لە ساڵی (١٨٧٣)دا ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە لەلایەن گروپێك بەناوی (چالینجەر) کە بەریتانی بوون دەستی پێکردووە، لە ساڵی ١٩٣٣ ئەمریکییەکان سەدان وێستگەی دەریاییان داناوە بۆ (مسح البحار). لە ساڵی ١٩٤٢ دا وەك ڕاستییەك دەرکەوت دەریاکان بریتین لە ناوچە، هەر ناوچەیەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، پلەی گەرمییەکەی جیاوازی لە دەوروبەری سوێرییەکەی جیاوازە لە دەوروبەری ئەو زیندەوەرانەی کە تیایدا دەژین جیاوازن لە دەوروبەر.

﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾ دیوارێکی نەبینراو لەو دەریایەدا هەیە نایەڵێ دوو دەریاکە تێکەڵ ببن، بۆ نموونە (جبل طارق) بەشی لا ڕاستی دەریای ناوەڕاستە، لای چەپیش دەریای ناوەڕاستە کە ئاوەکە دێت دەگوێزرێتەوە بەسەر ئەو گردەدا (جبرالتەرهڵ)، دێتە خوارەوە لەو لاوە دەڕوات دێتە ناو زەریای ئەتڵەسییەوە بەبێ ئەوەی ئاوەکە تێکەڵ ببێت، لەبەرئەوەی ئەو پەردەیە هەیە کە ئایەتەکەی قورئان فەرمووی: نزیکەی

(٤٠٠) مەتر لە قوڵایی دەریادایە ئایا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشتۆتە ئەودیو؟ چۆتە (٤٠٠) مەتر قوڵاییەوە تا بۆ خەڵکی باس بکات، ئەو ئاوەی تر لای چەپ ئەوە زەریای ئەتڵەسییە ئەڕوات بەرەو دەریای ناوەڕاست بەبێ تێکەڵ بوون، بە ڕاستی ئەو کەسانە کە دوورن لە پەیامی قورئان ئەگەر لە بەڵگە زانستییەکان ڕانەکەن ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیان بەسە بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیا بن کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای زاناو کاربەجێیە.



## ٣٠ به دۆزینەوەی چەند شەپۆلێکی قوڵ لە ئۆقیانووسی ئارام موعجیزەیەکی گەورەی قورئان ئاشکرا بوو:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾ (النور: ٤٠) خوای پەروەردگار تاریکاییەکانی سەر دڵی بێباوەڕ بە تاریکاییەکانی قوڵایی زەریاکان دەچوێنێت، کە چەند شەپۆلێکی قوڵ دایانپۆشیوە. ئینجا چینێکی تری شەپۆل لەسەر ئەو شەپۆلانەوە هەیە، لەسەرو ئەم شەپۆلانەشەوە هەورێکی چڕ بەری ڕۆژی لێگرتووە، بەو جۆرە ئەو کەسە لەناو چەند تاریکییەکی دوایەکدا دەژی، لە ئایەتە پیرۆزەکە ڕاستییەکی زانستی هەیە کە تا کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) نەدۆزرابۆوە، ئەوەش لە ڕێگەی دۆزینەوەی چەند شەپۆلێکی نوێ لە قوڵایی ئۆقیانووسی (ئارام)دا کە جیاوازن لەو شەپۆلانەی کە لەسەر ڕووی ئاوی ئۆقیانووسەکە هەن.

واتە: لە ئاوە قووڵەکاندا شەپۆلێکی قووڵ و یەکێکی ڕووکەش هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە ئایەتە پیرۆزە بە وتەی (موج من فوقه موج) ئاماژەی پێداوە، دۆزینەوە نوێیە زانستییەکە دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئانی پیرۆز. ڕۆژنامەی ( Daily Telegraph) لە ڕۆژی ٢٠٠٧/١٢/١٣دا وتارێکی بڵاوکردەوە لەژێر ناوی ( Deep



زاناکان شەپۆلی (ocean waves discovered by Scientists ئۆقیانووسی قووڵ دەدۆزنەوە) لەو هەواڵەدا هاتووە کە دۆزینەوەی ئەو شەپۆلە قوڵانە لە ئۆقیانووسدا بووە هۆی سەرسامبوونی زاناکان، چونکە چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد کە شەپۆلێکی لەو جۆرە لە قوڵایی ئۆقیانووسدا ببینن، زانا بەریتانییەکان چەند شەپۆلێکیان لە قوڵایی ئۆقیانووسی (ئارام)دا دۆزیووەتەوە، ئەوان دەیانزانی کە دەتوانرێت ئەو جۆرە شەپۆلانە لە نزیك یاخود لەسەر ڕووی ئۆقیانووسەکان ببینرێن، بەڵام بەوە سەرسام بوون کە ئەو جۆرە شەپۆلانەیان لە قوڵایی ئۆقیانووسدا دۆزییەوە.

یەکێك لە بەشدارانی توێژینەوەکە پرۆفیسۆر (Karen Heywood) لە زانکۆی (UEA) دەڵێت: ئێمە هەموو سەرسام و دڵخۆش بووین هەروەك لە وێنەی مانگە دەستکردەکانەوە، دیارە بینینی شەپۆلێکی لەو جۆرە لە قوڵایی (٥٠) مەترەوە بۆ ئێمە شتێکی چاوەڕوان کراو بوو، بەڵام بەڕاستی ئەوە هەژاندینی دۆزینەوەی ئەو ئەو شەپۆلانە بوو لە قوڵایی (١٥٠٠) مەتردا، ئەمەش ئەگەری ئەوە وە پێشدێنێت کە شەپۆلی تر لە قوڵایی زیاتردا بدۆزرێنەوە، دکتۆر (Matthews Adrian) سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەو یەکێك لە زاناکانی زانکۆی ناوبراو دەڵێت: هەموومان وامان گومان دەبرد کە لەژێر قوڵایی (٢٠٠) مەترەوە ناتوانرێت هیچ جۆرە شەپۆلێك ببینرێت، زاناکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەم شەپۆلانە لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧)دا دۆزرانەوە.

خوێنەری بەڕێز: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ﴾ (النور: ٤٠) ئاشکرایە ئایەتە پیرۆزەکە زۆر بە وردی و تەواوی لە شەپۆلی قوڵایی زەریاکان دەدوێت، ئەمەش گەورەیی قورئان ئاشکرا بوو، لێرەدا ئەی بێباوەڕان چۆن ئەم جۆرە شەپۆلانە لە کتێبێکدا کە پێش چواردە سەدە دابەزیوە باسکراوە؟ ئایا ئەم ڕاستییە ئەوکات زانرابوو؟ خۆ زانا

خۆرئاواییەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە بۆ یەکەمجار ئەو شەپۆلانەیان لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧)ی زاینیدا بینیوە.

کەواتە کێ ئەو ڕاستییەی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند؟ وەك چۆن قورئان باسی شەپۆلەکان دەکات، زاناکان ئەوە دەدۆزنەوە خوای پەروەردگار باسی (بحر لجی) واتە قوڵ دەکات، زاناکان دەڵێن قوڵایی ئۆقیانووس. (الله أكبر) لە گەورەیی و ناوازەیی ئەم قورئانە، بەڕاستی ئەو موعجیزە زانستییە شایەنی ئەوەیە کە ببێتە مایەی گەورەترین خۆشحاڵی بۆ بڕواداران وە بێباوەڕانیش ئەگەر فێڵ لە خۆیان لە خەڵکیش نەکەن تەنها ئەوەیان بەسە بۆ ڕەوینەوەی تێکڕای گومانەکانیان، دەبوو کە چاویان بەو ڕاستییە گەورەیە دەکەوت بە هەموو قەناعەتێکەوە هاتبانە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام، بەڕاستی هەر کەسێك کە لافی پێشکەوتن و زانیاری لێدەدات ئەوە تەنها بە شوێنکەوتنی ئاینی ئیسلام دەگات، بەو پایەیە بەڕاستی زۆر حەیفە مرۆڤەکان خۆیان بێبەش بکەن لە خێرو بەرەکەتی ئەم ئیسلامە.



## ٣١ دۆزینەوەکەی پرۆفیسۆر (جمیس ڤان ئەلف) ڕاستییەکی گەورەی ئاشکرا کرد:

زانایان توانییان قەڵغانێکی نەبینراو بدۆزنەوە لە (١١٥٨٤) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە، گۆی زەوی دەپارێزێت لەو ئەلکترۆنە زۆر خێراو مەترسیدارانەی کە لەفەزادا دەڕۆن بە خێراییەك نزیك بە خێرایی ڕووناکی. ئەو قەڵغانەی ئێستا مەبەستەو تازە دۆزراوەتەوە خەیاڵی زانستی نیە، لێکۆڵینەوی لەسەر بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری (nature)ی زانستیدا، گرنگی ئەو دۆزینەوەیە لەوەدایە کە یارمەتی پسپۆڕان بدات بۆ تێگەیشتنی زیاتری دایناميکییە ئاڵۆزەکانی پشتێنەی (ڤان ئەلن) تیشکاوەر ئەو پشتێنە تیشکاوەرە، بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٩٥٨) دا دیاریکرا لەلایەن پرۆفیسۆر

(جیمس ڤان ئەلن) و تیمەکەی لە زانکۆی ویلایەتی (ئایوا)، زاناکان ئەوەیان دیاریکرد کە پشتێنەی تیشکاوەری بە دەوری زەویدا هەیە کە دابەش دەبێت بۆ ناوەکی و دەرەکی، بەبەرزی نزیکەی (٤٠) هەزار کیلۆمەتر لەسەر ڕووی زەوییەوەیە پشتێنە ناوەکییەکەیان نزیکترە لە زەوییەوەو، دەکەوێتە بەرزایی (١٠٠٠ تا ٧٠٠٠) کیلۆمەتر لەسەر ڕووی زەوییەوە.

بەشی زۆری لە پرۆتۆن پێکدێت کە تێکڕای وزەکانیان دەگاتە (٣٠) ملیۆن (ev)، بەڵام پشتێنە دەرەکییەکە دەکەوێتە بەرزی (١٠ هەزار تا ٤٠ هەزار) کیلۆمەتر لەسەر ڕووی زەوییەوە، بەشی زۆری پێکدێت لە ئەلەکترۆن کە تێکڕای وزەکانیان دەگاتە یەك ملیۆن (ev).

لە ساڵی (٢٠١٣) زانا (بیکەر) و تیمێك لە زاناکان لە لێکۆڵینەوەکانیان ئەو داتایانەیان بەکارهێنا کە ئاژانسی ناسا بەدەستیهێناون کە ساڵی (٢٠١٢) دابووی بەو تیمە، داتاکانیش دەربارەی پشتێنەی سێیەم بوو، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو پشتێنەی ناوەکی و دەرەکی بۆ پشتێنەی (ڤان ئەلن)، زاناکان لەمیانەی توێژینەوەکانیان چینێکیان دۆزیوەتەوە کە بڕوا ناکرێت ئەو چینە دەکەوێتە لێواری ناوەوەی پشتێنە دەرەکییەکەو لە دووری (١١٥٨٤) کیلۆمەتر لەسەر ڕووی زەوییەوە چین چینە، هەروەك دیوارێکی شوشەیی یان قەڵغانێکی پارێزەر کە ڕێگری دەکات لەو ئەلکترۆنە زۆر خێرایانەی دەیانەوێت بکەونە نێو بەرگە هەوای زەوی، توێژینەوەکانی دەربارەی ئەو بابەتە لە ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٤/١١/٢٧ی گۆڤاری زانستی (nature) دا بڵاوکراوەتەوە ئەو توێژینەوانە بیرۆکەیەکی باشتر دەدەن بە زاناکان دەربارەی کاری فیزیایی پلازما.

هەروەها زانیاری وردیش دەدات بەو ئەندازیارانەی بەرپرسن لە دانانی مانگە دەستکردەکان لە شوێنی یان خولگەی سەلامەتی خۆیاندا بە دەوری گۆی زەوی، بەڵێ بۆ پاراستن و بەردەوام بوونی ژیان لەسەر زەوی (خوای پەروەردگار) چەندین بەرگ و

قەڵغانی پارێزەری بە دەوریاندا دروستکردووە، وەك بەرگە هەوای زەوی بواری موگناتیسی زەوی چینی ئۆزۆن ئەم قەڵغانە تازە دۆزراوانەش چووە سەر.

خوای گەورە لە ئاماژەیەکی زانستیدا ئەو ڕاستییەشی لە قورئانە پیرۆزەکەیدا باسکردووە، دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٢) واتە: وە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی سەرێکی پارێزراو، بەڵام ئەوانە سەبارەت بە ئایەتەکانی پشتتێکەرو ڕوو وەرگێڕ بوون. بەڕاستی دەبوو بەرەی مرۆڤایەتی بە تایبەتی ئەوانەی کە ئاشنا نین و دوورن لە پەیامی پیرۆزی ئیسلام، دوای بینینی ئەو بەڵگە زانستییانەی قورئان واز لە بەرنامە دەستکردەکانی دەستی مرۆڤ بێنن و ڕوو بکەنە ئەم بەرنامە پاك و پیرۆزەی خوای گەورە، چونکە بەرنامە دەستکردەکانی دەستی مرۆڤ جگە لە بەدبەختی و چارەڕەشی هیچیان لە هەگبەدا نییە بۆ مرۆڤەکان.




## دیاری کردنی ڕێژەی ئاو و وشکانی موعجیزەیەکی زانستی گەورەی قورئانی ئاشکراکرد:

ژیان بە ئاوەوە بەندە و نزیکەی (٧٣٪)ی ڕووی زەوی ئاوە و باقیەکەی تریشی وشکانییە، جا ئەگەر سەیری وشەی (البحر) بکەین لە قورئاندا دەبینین کە (٣٣) جار دووبارە بۆتەوە، وشەی (البر)یش (١٢) جار دووبارە بۆتەوە، ئەگەر کۆیان بکەینەوە (٤٥) جار دەکات جا ئەگەر (٣٣) دابەش بکەین بەسەر (٤٥)دا دەکاتە (٧٣٪). ئەگەر (١٢) دابەش بکەین بەسەر (٤٥)دا دەکاتە ٢٧٪، ئەم ڕێژەیەش وەك ڕێژەی ئاو و وشکانییە لەسەر زەوی دا کە ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەی قورئانە، کە لە زیاتر لە شەش هەزار ئایەتدا و لە پەڕاوێکی شەش سەد لاپەڕەییدا ئەوەندە بە حیکمەت وشەی (البر) و (البحر) بەپێی پێویست دووبارە بکاتەوە، بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کە بەدبەختانی دوور لە دین ئەم هەموو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە دەبینن، کەچی ئیمان ناهێنن بەرەو هەڵدێری گومرایی هەڵدەخلیسکێن و ڕێگای ڕاست ناگرنەبەر.



## ژماره (١١٤) و گەردیلە لە زانستی نوێ دا:

دروست کردنی توخمی ژمارە (١١٤) لە زانستی نوێدا کۆتایی قۆناغێکی قورسی لەگەڵ داهێنانێکی مەزن لە جیهانی یۆرانیۆمدا پێکهێنا، لە کاتێکدا لێکۆڵەرەوەکان لە ژمارەی ئەفسوناوی (١١٤) نزیك بوونەوە خۆیان لە کەناری دوورگەیی ئارام گرتن بینیەوە، کە کۆمەڵێك لە توخمی دروستکراوی قورستر بە بەردەوامی و تەمەنێکی درێژ خۆی دەبینیەوە، چونکە دەرەنجامی تیۆری دەیسەلمێنێت کە ژمارەیەکی دیاریکراوی ئەفسوناوی لە پرۆتۆنات و نیوترۆنات دەبنە ناوکێکی زۆر پەیوەست بە شێوەیەکی تایبەت، توانیان لەم سەردەمەدا توخمی (١١٤) دروست بکەن کەوا (١٧٤) نیوترۆنی لەخۆگرتووە، بەرهەمهێنانی کۆمەڵەی وزە لە هاوشێوەی توخمی (١١٤). خوێنەری بەرێز بڕوانە لە پەیوەستی قورئانی پیرۆز چۆن سورەتەکان جێگیربوون لەسەر ژمارەی (١١٤) بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە ئەم قورئانە پیرۆزە.



## بەڵگەیەکی بەهێز دەربارەی تاك و تەنهایی خوای گەورە:

خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانست و زانیارییەکەی دا دەفەرموێت: ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ﴾ محمد: ١٩.

واتە: (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەی مرۆڤ بزانە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی هەق نییە مافی پەرستنی هەبێت، دەسا تۆش لەسەر ئەو بیروباوەڕە جێگیربە و هەرگیز نەگۆڕێیت، بۆ خۆت و ئیمانداران لە ژنان و پیاوان داوایی لێبوردنی گوناح بکە، خوا خۆی دەزانێت ئێوە چۆن هەڵدەسوڕێن و ئەحەوێنەوە و بەڕۆژ و بە شەو چی دەکەن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (هەر کەسێکی موسڵمان کۆتا وشەی (لا اله الا الله) بێت دەچێتە بەهەشت بێگومان دەبێت بپرسین

ئاخۆ بەڵگەی بەهێزی خوا لەم دەستەواژە پیرۆزەدا چی بێت؟ دەستەواژەی (لا اله الا الله) کە لە هەرسێ پیتی هەمان (ئەلف، لام، هاء) تەواوکەری یەکدی پێك هاتووە، هەروەها ناوی پیرۆزی (خوا) لە هەرسێ پیتی هەمان جۆر پێکهاتووە: (ئەلف، لام، هاء)، واتە پێکهێنەری هەردوو دەستەواژەکە (لا اله الا الله) و (الله) هەرسێ پیتی (ئەلف، لام، هاء)ی هاوبەشی یەکدی پێکهاتووە. ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ﴾ محمد: ١٩. ئەم ئایەتە ژمارەکەی لە سورەتی (محمد)دا (١٩)یە، هەروەها لە (١٩) وشەش پێکهاتووە یاساکە: وشەکانی دەستەواژەی (لا اله الا الله) خاڵبەندی دەکەین و کۆیان دەکەینەوە:

لا اله الا الله = ١٢ پیت.

٢ + ٣ + ٣ + ٤ = ٤٣٣٢.

دەبینین کۆی ژمارەی پیتەکانی دەستەواژەی (لا اله الا الله) یەکسانە بە (٤٣٣٢)، هەروەها پیتەکانی دەستەواژەکە لە (١٢) پیت پێکهاتووە:

(لا اله الا الله)

١٩ × ١٩ × ١٢ = ٤٣٣٢

ژمارەی ئایەتەکە ژمارەی وشەکانی ئایەتەکە پیتەکانی (لا اله الا الله) پەیوەندی نێوان (الله) و (لا اله الا الله).

لێرەدا پەیوەندی نێوان پیتەکانی هەردوو دەستەواژەی (الله) و (لا اله الا الله) کە لە هەرسێ پیتی هاوبەشی (ئەلف، لام، هاء) پێکهاتووە دەخەینە بەرچاو سەرەتا ژمارەی پیتە دووبارەکانی ناو دەستەواژەی (لا اله الا الله) دیاری دەکەین:

پیتی (ئەلف) لە (لا اله الا الله)دا/ ٥ جار دووبارە بۆتەوە.

پیتی (لام) لە (لا اله الا الله)دا / ٥ جار دووبارە بۆتەوە.

پیتی (هاء) لە (لا اله الا الله)دا / ٢ جار دووبارە بۆتەوە.

کۆی گشتی پیتەکان = ١٢

دەبینین کە دەستەواژەی (لا اله الا الله) لەسەر سێ پیتی (ئەلف، لام، هاء) پێکهاتووە: الله

٢٥٥٥ = ٢ ٥ ٥ ٥

لێرەدا: ژمارەی پیتە دووبارەکانی دەستەواژەی (لا اله الا الله)مان لەژێر ناوی (الله)دا نوسیووە کە یەکسانە بە (٢٥٥٥) واتە ٧ × ٣٦٥ = ٢٥٥٥ دەبێت بپرسین ئایە گرنگی ئەم دوو ژمارە (٧) و (٣٦٥) لەم باسەدا چیە؟ ژمارە /٧/ ژمارەی ڕۆژەکانی هەفتەیە و ژمارە ٣٦٥ ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکە تەنها ژمارەیەك دەمێنێ کە (١٢)یە، بێگومان کە ژمارەی مانگەکانی ساڵە ئەگەر سەیری دیاردەی شەو و ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ و ئەرز و ئاسمان بکەین، دەبێت تەنها بیر لەیەك بەدیهێنی تاك و تەنیا بکەینەوە ئەو بەدیهێنەی کە هەموویانی بە ئەندازە و پێوەر بەدیهێنا، هەر ئەو بەدیهێنەیە کە ئەم قورئانە بەرز و پیرۆزەی ناردووە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بێگومان ئەو بەدیهێنەش زاتی پیرۆزی خوای گەورەیە.



## ٣٥ موعجیزەی ئایەتێك لەبارەی مەککە و حەجەوە:

بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ﴾ (آل عمران: ٩٦). واتە: بەڕاستی یەکەم خانە و ماڵ و مەنزڵگەیەك کە بۆ خەڵکی دانرا لەسەر زەوی بۆ خواپەرستن، ئەوەیە لە مەککەدایە کە پیرۆزە و هیدایەت و ڕێنمونی بەخشە بۆ هەموو خەڵکی جیهان (٩٦) ئەم ئایەتە یەك تابلۆی لەسەرە لەسەر ئەم ئایەتە ٢ خاڵ هەیە:

یەکەم: ئایەتەکە باسی یەکەم ماڵ دەکات کە بۆ خەڵك بنیات نراوە کە ئەو ماڵە دەکەوێتە شاری (بكة)وە، واتە: شاری (مكة) ئەوەش بە دەربڕینی دەستەواژەی ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ﴾ ئەو ماڵە پیرۆزەش ئایەتی دەستەواژەی (أول بيت) لە سورەتەکەی دا = ٩٦، هەروەها زنجیرەی یەکەم سورەتی مەککی قورئان (أول

سورة مكية) له (مصحف)دا = ٩٦ كه ئەويش سورەتی (العلق)ە، كه نیوەی دووەمی ئایەتەكانی پەیوەندیان به نوێژ و خواپەرستی پێغەمبەرەوە هەیه (صلى الله عليه وسلم) له كەعبەدا و له شاری مەككەی پیرۆزدا.

دووەم: له ئایەتەكەدا (مسجد الحرام) بەم جۆرە پێناسەكراوە كه بریتییه له دەربڕینی ﴿لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا﴾ = ١٠٦٣، ڕای بەهێزی زانایانی ئیسلام لەبارەی فەرزبوونی حەجەوە ئەوەیه كه له ساڵی نۆهەمی كۆچیدا حەج فەرزكرا لەسەر موسڵمانان، ئەو ساڵانەی كه هەموو ڕۆژەكانیان یان بەشێك له ڕۆژەكانیان دەكەونه سەردەمی وەحی و هاتنه خوارەوەی قورئانەوە و حەجیشیان تیادا فەرز بووە تەنها بریتین له سێ ساڵ كه ئەمانەن:

(٩، ١٠، ١١)ی كۆچی كۆی ژمارەی ڕۆژەكانی هەرسێ ساڵی (٩، ١٠، ١١)ی كۆچی ٣٥٤ + ٣٥٥+ ٣٥٤ = ١٠٦٣ كه ئەمە بریتیه له دەستەواژەی:

﴿لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا﴾ هەموو سێ ساڵێكی یەك لەدوای یەكی كۆچی یەكێكیان ژمارەی ڕۆژەكانی ٣٥٥ ڕۆژ دەبێت.

## ٣٦ گرنگی ژمارە (١٧) له قورئانی پیرۆزدا:

یەكەم ئایەتی (١٧) له قورئانی پیرۆزدا ئایەتی (١٧) سورەتی (البقرة)یه كه دەفەرمووێت: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَـٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ﴾ البقرة: ١٧ .

نهێنی ئەم ئایەته پیرۆزە:

یەكەم ئایەتی ژمارە (١٧)یه له قورئانی پیرۆزدا هەروەها له (١٧) وشه پێكهاتووە.

كۆتا ئایەت له قورئانی پیرۆز كه باسی نوێژ دەكات ئایەتی (١٧)ی سورەتی (لقمان)ە كەدەفەرمووێت:

﴿يَـٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ لقمان: ١٧.

به هەمان شێوه لێرەدا دەبینین ژمارەی ئەم ئایەته (١٧)یە وە له (١٧) وشه و (٦٨) پیت پێکهاتووه که ئەم ژمارەیەش له پاشماوەکانی ژماره (١٧)یە.

واته: ٤ × ١٧ = ٦٨

پاشان کۆی ژمارەی وشەکانی لەگەڵ پیتەکانی هاوتایە لەگەڵ (٥) نوێژە فەرزەکە و ژمارەی ڕکاتەکان:

| ١٧ | + | ٦٨ | = ٨٥ |
|---|---|---|---|
| ژمارەی وشەکان | | ژمارەی پیتەکان | |
| ٥ | × | ١٧ | = ٨٥ |
| ژمارەی نوێژە فەرزەکان | | ژمارەی ڕکاتەکان | |

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە که بەدبەختانی دور له دین ئەم هەموو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە دەبینن کەچی ئیمان ناهێنن بەرەو هەڵدێری گومڕایی هەڵدەخلیسکێن و ڕێگای ڕاست ناگرنەبەر.

## ٣٧ نهێنیەکی سەرسوڕهێنەر دەربارەی نوێژ:

نهێنی یه مەزنەکانی نوێژ هیچ کات لەبن نایەت سەرەتایی هەیە، بەڵام کۆتایی نیه خوای باڵادەست (٥) نوێژی له ڕۆژێکدا فەرزکردووه که لەم باسەدا هەندێك لەو نهێنیه مەزنانه که شایەنی تێڕامان و بیرکردنەوەیه دەخەمه ڕوو به پشتیوانی خوای گەورە ئەویش هەرسێ ژماره (٥، ٧، ١٧)یە ژماره (٥) ژمارەی نوێژە فەرزکراوەکانی ڕۆژێکە، هەروەها ژماره (١٧) ژمارەی ڕکاتەکانی (٥) نوێژە فەرزکراوەکەیە وە ژماره (٧) هەموو کات چاوگی ئیعجاز و نهێنیەکانی قورئانی پیرۆزە سەرەتا کۆی ژمارەی نوێژە فەرزکراوەکان و ڕکاتەکان له پاشماوەکانی ژماره حەوتن



٥ + ١٧ = ١٧٥

ژمارەی نوێژە فەرزکراوەکان    ژمارەی ڕکاتەکان

١٧٥ = (١٧+٥)

١٧٥ = ٥×٥ ×٧

هەردوو ژمارەی (٥) و (٧) پەیوەستن بە (سبع المپانی) و (فەرزەکانی ڕۆژێك کۆی ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژە فەرزەکان لە پاشماوەکانی ژمارە حەوتە.

بەیانی + نیوەڕۆ + عەسر + مەغریب + عیشا

٢ ٤ ٤ ٣ ٤ = ١٧

٤٣٤٤٢ = ٤+٣+٤+٤+٢

٣٤٤٤٢ = ٧×٦٢٠٦

پاشان ئەگەر لە نوێژی عەسرەوە بەپێچەوانەوە کۆیان بکەینەوە

عەسر + مەغریب + عیشا + بەیانی + نیوەڕۆ

٤ ٣ ٤ ٢ ٤ = ٤٢٤٣٤

٤٢٤٣٤ = ٧×٦٠



## ٣٨ ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکەی دەزگای ناسای ئەمریکی موعجیزەیەکی قورئان دەردەخات:

لە بەرواری ٢٠٠٧/٦/٢٤ لە پێگەی تایبەتی دەزگای ناسا بڵاوکرایەوە کە وێنەی تیشکی خۆر پاش ئەوەی بەناو ئاوێزەی شووشەیی کە شێوەی هەرەمی سێگۆشەییە تێپەڕکراوە ئەم ئاوێزەیە تیشکی سپی بۆ حەوت ڕەنگ شیتەڵ دەکات زانایان تێبینیان کرد کە ڕەنگی سەوز ڕێك کەوتووەتە ناوەڕاستی ئەم حەوت ڕەنگە، لەبەرئەوە زانایان دەڵێن ڕەنگی سەوز باشترین ڕەنگە بۆ چاوی مرۆڤ کە جۆرێك لە شادومانی و خۆشی و حەوانەوە بە مرۆڤ دەبەخشێت تەنانەت بیریان لەوە کردۆتەوە

که بۆ چارەسەرکردنی هەندێك حاڵەتی خەمۆکی بەکاریبهێنن، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە جلی بەهەشتییەکان دەکات کە ڕەنگیان سەوزە وەك دەفەرموێت: ﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ (الكهف: ٣١) واتە: پۆشاکی سەوزی جوان دەپۆشن کە دووتوێیە چینی ژێرەوە ئاوریشمی ئەستوورە چینی سەرەوە ئاوریشمی تەنکە.




## زانستی نوێ سوودەکانی ڕۆژوو بۆ خانەکانی لەش ئاشکرا دەکات:

لە سروشتی جەستەی مرۆڤە کە لە هەر چرکەیەکدا (١٢٥) ملیۆن خانە دەمرن، جەستە خۆیانی لێ ڕزگار دەکات تاکو لە جێیاندا خانەی نوێ پێکبێنێت، بەڵام ڕۆژوو لەش دەجوڵێنێت بۆ زیادبوونی ئەو ژمارە خۆی لە هەندێك لە خانە لاوازەکان ڕزگار دەکات بۆ دووربوون لە برسیەتی ئەوەش بە دەرفەتێکی زێڕین هەژمار دەکرێت، پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە بەر لە زیاتر لە چواردە سەدە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٨٤) واتە: ئەگەر بەڕۆژوو بن بۆ خۆتان باشترە ئەگەر بزانن.




## کەعبەی پیرۆز و ژمارەی (٣٧) لە قورئانی پیرۆزدا و ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی تازە:

کەعبەی پیرۆز شێوەیەکی چوارگۆشەی وەرگرتووە، کە بەرزییەکەی (١٥) مەترە و پانی ئەو باڵەی بەردە ڕەشەکەی تێدایە لە بەرامبەردا (١٠) بە (١٠) مەترە، ئەو لایەش کە دەرگاکەی تێدایە (١٢) بە (١٢) مەترە، لە دەرەوەش دیوارێك دەوری داوە کە بەرزییەکەی (٢٣) سانتیمەترە و پانیەکەشی (٣٠) سانتیمەترە کە ناودەبرێت بە (الشاذوران)، کە لە ڕاستی دا ئەو شاذورانە بنەڕەتی بەیت بوو، بەڵام قورەیش وازیان

لێ هێنابوو، لە ئەنجامدا کۆی ژمارەی پێوانەی دیوارەکانی کەعبەی پیرۆز دەکاتە: ٣٧.

١٥ + ١٠ + ١٢ = ٣٧ کێشەی بەردە ڕەشەکەی کەعبەی پیرۆز کە لە پێش وەحی دا ڕوویدا بڕیارێکی خوابوو، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوویە بەژدار لە ناوبژیوانییەکەی نێوان هۆزەکانی قوڕەیش کە بوویە زیاتر مایەی چەسپاندنی ئەمەکداری و ڕاستی و درووستی پێغەمبەرایەتی محمد (صلى الله عليه وسلم). لە گرنگییەکانی ژمارە حەوت ئەوە بەدی دەکرێت خوای باڵادەست (٧) بەرگ ئاسمان و (٧) بەرگ زەوی و (٧) تەواف بەدەوری کەعبەی پیرۆزدا لەسەرمان داناوە، (٥) نوێژی لە ڕۆژێکدا لەسەرمان فەرزکردووە کە لەسەر (٧) ئەندامی لاشە بەجێیان دەگەیەنین خوای باڵادەست لە سورەتی (الحجر) دا دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ الحجر: ٨٧.

واتە: وە بێگومان ئێمە حەوت ئایەتەکەی سورەتی (الفاتحە) کە چەند جارێك لە نوێژدا دەخوێنرێتەوە و دووبارە دەکرێتەوە، هەر ئەم قورئانە گەورەیەشمان پێدایت کە تەواوکەری گشت کتێبە ئاسمانیەکانە، هەمو هەواڵ و بڕیارێکی گرنگی تێدایە ژمارەی وشەکانی ئەم ئایەتە لە (حەوت) وشە پێکهاتوون، هەروەها ژمارەی پیتەکانیشی لە (٣٧) پیت پێکهاتووە، هەروەك زانایان دەفەرموون: ﴿سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى﴾ سورەتی (الفاتحە)یە، ژمارە (٣٧) پلەی نمرەی حەرارەتی ئاسایی مرۆڤە پلەی خوێنی مرۆڤی ئاسایی (٣٧) پلەیە، ئەم هاوسەنگییە لەنێوان ڕەهەندەکانی کەعبەی پیرۆز و هاوسەنگی نمرەی حەرارەی خوێنی مرۆڤ و لاشەی بریتیە لە ئاوێتەبوونی گەرمای لەش و خوێنی مرۆڤ بەزەوییەوە.

توانستی پەیوەستی خواپەرستی بۆ خوای تاك و تەنیا لەم زەویەدا و بە دەوری کەعبەی پیرۆز شوێنی ڕەوانەکردنی پێشەوامان محمد (صلى الله عليه وسلم) لە مەککەی پیرۆز بووە، ئەوەی کەوا ئەو پەیوەستییە خواییە زیاتر چەسپاوتر دەکات،

دەبینین کە لای خوارووی دیواری کەعبەی پیرۆز نێو دەبرێت بە (الشاذوران) کە بەرزاییەکەی (٢٣) سانتیمەترە، ئەم ژمارەیە یەکسانە بە ژمارەی ئەو ڕەنگە سروشتیانەی کە لە خوێنی مرۆڤدایە، ئەم پەیوەستییانە بەهێزێکی مونگناتیسی خوا بەڕێوە دەچێت، بۆیە دەبینین ئەو کەسانەی دەچنە هەردوو مەراسیمی (حەج و عەمرە) بەشێوازێك پەیوەست دەبن پێوەی کە هەموو کات تامەزرۆی گەڕانەوە دەکەن بۆ جارێك و چەندەها جاری دیکە.

ژمارە (٣٧) لە هەردوو ژمارەی فەلەکی (٢٨) و (٩) پێکهاتووە کە ژمارە (٢٨) ژمارەی سوڕی مانگە و ژمارە (٩) جیاوازی نێوان هەردوو ڕۆژژمێری هەیڤی و هەتاوییە، هەموو (٣٠٠) ساڵ جارێك واتە: ٢٨ + ٩ = ٣٧، کە واتایی ئەم ژمارەیەش لە ئایەتی (٣٧)ی سورەتی (ابراهیم)دا دەبینین کە لە خوای گەورە داوا دەکات خێزانەکەی و کوڕەکەی لە کەعبەی پیرۆز نیشتەجێ بکات: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾ (ابراهيم: ٣٧).

واتە: ئەی پەروەردگارمان بێگومان من یەکێ لە منداڵەکانم (ئیسماعیل)ی کوڕم داناو جێهێشت، لە شیو و دۆڵێکی وشك و بێ دەرامەت لای ماڵە پیرۆز و بەڕێزەکەی خۆت لە مەککەدا، ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆ ئەوەی لەوێ بەڕێك و پێکی نوێژەکانیان بکەن و بێتاقەت نەبن، دەسا تۆش دڵی خەڵکێك ڕابکێشە بۆلایان تا بە دڵ خۆشیان بوێن و لەو دۆڵ و شیوەدا میوەجات و ڕزق و ڕۆزیان بدەرێ تا بەڵکو بەباشی خواپەرستی و سوپاسگوزاری تۆ بکەن.

## ٤١ دیلەكانی غەزای بەدر و دەركەوتنی موعجیزەی قورئان:

لە غەزای بەدردا (٧٠) كەس لە كافرەكانی مەككە بە دیل گیران لەلایەن موسڵمانەكانەوە ئەو ئایەتەی كە واتاكەی پەیوەندی بەهێزی بەدیلەكانی جەنگی بەدرەوە هەیە بریتیە لەم ئایەتە خوا دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ (الأنفال: ٧٠).

لێرەدا تابلۆیەك دەخەینە ڕوو كە تیایدا دوو خاڵ بەدی دەكەین:

١- بڕوانە ژمارەی دیلەكانی جەنگی بەدر (٧٠)یە ڕەنوسی ئایەتەكەش (٧٠)یە.

٢- ئەگەر پتر وردببینەوە لە ئایەتەكە دەبینین كە كەمترین دەربڕین لە ئایەتەكەدا كە واتاكەی پەیوەندی بە دیلەكانی جەنگی بەدرەوە هەبێت، بەبێ ئەوەی واتاكەی كەموكوڕی تێدابێت، بریتییە لەو دەربڕینەی ناو ئایەتەكە كە بە وشەی (قل) دەستپێدەكات و بە جوتە وشەی (یغفر لكم) كۆتایی دێت، ژمارەی پیتەكانی ئایەتەكە هەر لەسەرەتای وشەی (قل)ەوە تا كۆتایی جوتە وشەی (یغفر لكم) یەكسانە بە (٧٠) پیت، ئەوەندەی ژمارەی دیلەكان بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە خاوەنی ئەم قورئانە پڕ لە زانست و زانیاریە.

## ٤٢ شیری ئاژەڵان لە خۆراكی ناو ڕیخۆڵە باریكە دەپاڵێورێت:

دوای ئەوەی كە خۆراك هەرس دەبێت و بە شلی دەچێتە ناو ڕیخۆڵە باریكەوە پاشان ماددەی خۆراكی دەچێتە خوێنەوەو لەوێشەوە شیر لە گوانەكاندا دەپاڵێورێت پاشماوەكەشی لە شێوەی پشقل و جگە لەو دەردەكەوێت، ئەم ڕاستییە زانستییە لە قورئانی پیرۆزدا باسكراوە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ

﴿مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ (النحل: ٦٦) واته: بەڕاستی لە بوونی ماڵاتدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێڕامانە لە نێوان ئەو شتانەی کە لە سکیاندا هەیە لە گژوگیای هەرسکراو و خوێندا شیریتێکی پاك و بێگەرد و خۆش و بەتام بەرهەم دێنین بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە.

## ٤٣ دووبارەبوونەوەی هەریەك لە وشەکانی (محمد، روح القدس، السراج، الملکوت، الشریعه) بە یەکسانی لە قورئانی پیرۆزدا:

ناوی کۆتا پێغەمبەری خوا محمد (صلی الله علیه وسلم) لە قورئانی پیرۆزدا (٤) جار دووبارە بۆتەوە لەسەر چوار ئایەتەکانی:

١- ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ (آل عمران: ١٤٤).

٢- ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ﴾ (الأحزاب: ٤٠).

٣- ﴿نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ﴾ (محمد: ٢).

٤- ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ﴾(الفتح: ٢٩).

هەروەها وشەی (روح القدس) بە هەمان شێوە لە قورئانی پیرۆزدا (٤) جار دووبارەبۆتەوە لە هەر چوار ئایەتەکانی:

١- ﴿وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ (البقرة: ٨٧).

٢- ﴿وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ (البقرة: ٢٥٣).

٣- ﴿وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ (المائدة: ١١٠).

٤- ﴿قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ (النحل: ١٠٢).

هەروەها وشەی (سراج) ڕووناكی بە هەمان شێوە لە قورئانی پیرۆزدا (٤) جار دووبارە بۆتەوە لە هەر چوار ئایەتەكانی:

١- ﴿وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا﴾ (الأحزاب: ٤٦).

٢- ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ (النبأ: ١٣).

٣- ﴿وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾ (نوح: ١٦).

٤- ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا﴾ (الفرقان: ٦١).

وشەی (الملكوت)یش دەسەڵاتی یەزدان بە هەمان جۆر (٤) جار لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە بۆتەوە لە هەر چوار ئایەتی:

١- ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ﴾ (الأنعام: ٧٥).

٢- ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ﴾الأعراف: ١٨٥).

٣- ﴿قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (المؤمنون: ٨٨).

٤- ﴿فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (يس: ٨٣).

وشەی (الشريعة)ش كە بە چوار شێوەی جیاواز هاتووە بە هەمان شێوە (٤) جار لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە بۆتەوە:

١- جارێك بە (شريعة) ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الجاثية: ١٨).

٢- جارێك به (شرع) ﴿۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ﴾ (الشورى: ١٣).

٣- جارێك به (شرعوا) ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ (الشورى: ٢١).

٤- جارێك به (شرعة) ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾ (المائدة: ٤٨).

**دەبینین هەریەك لە وشەكانی (محمد، الشریعه، السراج، روح القدس، الملكوت) بە شێوەیەكی یەكسان چوار جار دووبارە بوونەتەوە لە قورئانی پیرۆزدا.**

***



## تەمەنی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) و دەرکەوتنی نهێنیەکی گەورەی قورئان:

(٣٣) ساڵەکەی تەمەنی (عیسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێ) ئەم سەرنجە لەیەك تابلۆ پێکهاتووە بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلاً إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ﴾ (الزخرف: ٥٧)، لەسەر ئەم ئایەتە سێ خاڵ دەخەینە ڕوو:

١) ئەندازیار (عدنان الرفاعی) دەڵێت: ئەم ئایەتە کە باسی (عیسا) پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لەسەربێ) ژمارەی پیتەکانی (٣٣) پیتە بە ئەندازەی تەمەنەکەی بە ساڵ کاتی بەرزکردنەوەکەی بۆ ئاسمان.

٢) مامۆستا نوعمان سەرگەتی لە کتێبی تابلۆ ناوازەکان لەلاپەڕە (٨٩)دا دەڵێت: وشەی (لما)ی ناو ئایەتەکە واتە: کاتێك هەر لەسەرەتای ئەم ئایەتەوە لە وشەی (لما)وە تا کۆتایی سورەتی (الزخرف) ٣٣ ئایەتە، چونکە سورەتی (الزخرف) ٨٩ ئایەتە ئەم ئایەتە لەدوای ئایەتی (٥٦)ەوە دێت. کەواتە ٨٩ – ٥٦ =٣٣ ئایەت، بە ئەندازەی تەمەنەکەی بەساڵ بە دەربڕینێکی تر هەروەك لەسەرەتای وشەی (لما)ەوە تا کۆتایی ئایەتەکە (٣٣) پیتە، هەروەها هەر لەسەرەتای وشەی (ولما)وە تا کۆتایی سورەتەکە (٣٣) ئایەتە ئەوەندەی تەمەنەکەی.

٣) ئەو سورەتەی کە خاوەنی ئەم ئایەتەیە سورەتی (الزخرف) کە (٣٣) یەمین سورەتی مەککی یە لە تەرتیبی سورەتەکانی (مصحف)دا لەلای ڕاستەوە بەگوێرەی (مصحف المدينة النبوية)، زۆربەی مصحەفەکان.

***



## ٤٥ موعجیزەی کۆچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە:

ئەم سەرنجە لە یەك تابلۆ پێکهاتووە ئەم سەرنجە پەیوەندی بە ساڵی (١٣)یەمی پێغەمبەرایەتییەوە هەیە، کە ساڵی کۆچکردنە لە مەککەوە بۆ مەدینە، لێرەدا شەش خاڵ دەخەینە ڕوو چوار خاڵیان لەسەر ئایەتێکی سورەتی (محمد)ە، یەك خاڵ لەسەر ئایەتێکی سورەتی (التوبە)یە و یەك خاڵیش لەسەر هەردوو ئایەتەکە بڕوانە بۆ ئەم دوو ئایەتە:

یەکەم: خوا دەفەرموویت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾ (محمد: ١٣).

دووەم: خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَلَا تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ (التوبة: ١٣).

واتای ئایەتەکەی سورەتی (محمد) بەم جۆرە واتە: (چەندەها گەلی کافری یاخی شاران و وڵاتان هەبوون کە بەهێزتربوون لە گەلەکەی تۆ لە شاری مەککە کە دەریان کردی، تۆش دەستت دایە کۆچ کردن بەرەو شاری مەدینە ئەو گەلانەمان لەناویرد و فەوتاندمانن، هیچ یاریدەدەر و پاڵپشتێکی دەسەڵاتدار نەبوو سەریان بخات و لە دەست ئێمە ڕزگاریان بکات). لەسەر ئەم ئایەتە چوار خاڵ دەخەینە ڕوو پاشان لە ئایەتەکەی سورەتی (التوبة) دەدوێین:

١- هەموو ئایەتەکانی سورەتی (محمد) مەدەنین بێجگە لە ئایەتی (١٣) ئایەتەکەی سورەتی (محمد) پەیوەندی بە کۆچکردنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هەیە هەروەك ڕەنوسی ئایەتەکە (١٣)یە، هەروەها لە ساڵی (١٣)یەمی



پێغەمبەرایەتیدا هاتۆتە خوارەوە لە ڕێگەی کۆچکردنی پێغەمبەردا (صلی الله علیە وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە.

٢- هەروەك ڕەنوسی ئایەتەکە (١٣)یە کۆچکردنی پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە دەکەوێتە ساڵی (١٣)یەمی پێغەمبەرایەتیەوە، کۆچەرە، کە پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) سورەتەکەش بە ناوی (محمد)ەوەیە (صلی الله علیە وسلم).

٣- ئەگەر دووبارە سەرنج لە ئایەتەکە بدەین، دەبینین هەر لە سەرەتای ئایەتەکەوە تا وشەی (ك)ی (اخرجتك) واتاکەی پەیوەندی بە کۆچکردنی پێغەمبەر و دەرکردنی پێغەمبەرەوە هەیە (صلی الله علیە وسلم)، هەر لەسەرەتای ئایەتەکەوە تا وشەی (اخرجتك) ژمارەی وشەکان (١٣) وشەیە لەڕووی نەحویەوە.

٤- ژمارەی وشەکانی ئایەتەکە لەڕووی ڕێنوسەوە بەبێ دووبارەبوونەوە (١٣) وشەیە ساڵی کۆچکردنەکەش ساڵی (١٣)یەمی پێغەمبەرایەتی یە.

٥- ئایەتەکەی سورەتی (التوبة)ش واتاکەی پەیوەندی بە دەرکردنی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم) هەیە لە مەککە، پەیوەندیشی بە کۆچکردنی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە وسلم) هەیە لە مەککەوە بۆ مەدینە بە گوێرەی واتای ڕستەی ﴿وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ﴾. بڕوانە دەستەواژەی (إخراج الرسول) لە ئایەتی (١٣)دا هاتووە (إخراج الرسول) و کۆچکردنی پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) لە ساڵی (١٣)ەی پێغەمبەرایەتی دا بووە.

٦- لە ڕوویەکی ترەوە دەبینین هەروەك ئایەتی دەستەواژەی (أخرجتك)ەی سورەتی (محمد) (٤٨)مین ئایەتی جوزئەکەیە لەلای ڕاستەوە، هەروەها ئایەتی دەستەواژەی (إخراج الرسول)ی سورەتی (التوبة)یش (٤٨) هەمین ئایەتی جوزئەکەیەتی لەلای ڕاستەوە.



## موعجیزەی هەندێك ناو كە بەشێوەیەكی یەكسان دووبارە بوونەتەوە لە قورئاندا:

١- دووبارەبوونەوەی هەریەك لە وشەكانی (الملائكة و الشياطين) هەریەكەی (٨٨) جار.

بەشێوەیەكی سەیر لە قورئانی پیرۆزدا هەردوو وشەی (الملائكة) و (الشيطان) بەیەكسانی دووبارەبوونەتەوە كە هەریەكەیان لە پێكهاتەكانی (الشيطان، شيطانًا، شياطينهم) و (ملك، ملائكة، ملكا، ملكين) ٢٠ جار دووبارەبوونەتەوە.

(الشياطين، شيطانًا، شياطينهم) ٢٠ جار + ٦٨ جار (الشيطان) = ٨٨ جار.

(ملك، ملائكة، ملكا، ملكين) ٢٠ جار + ٦٨ جار (الملائكة) = ٨٨ جار.

٢- دووبارەبوونەوەی هەریەك لە وشەكانی (الدنيا والآخرة) (١١٥) جار:

لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (الدنيا) (١١٥) جار دووبارەبۆتەوە هەروەها لە پێچەوانەی وشەی (الدنيا) وشەی (الآخرة) دوارۆژ بە هەمان شێوە (١١٥) جار دووبارەبۆتەوە، وشەی (الدنيا) لە (٥٠) باسدا بە جیاواز و جێگیری هاتووە، هەروەها هەردوو وشەكە لە (٦٥) باسی دیكەدا بەیەكەوە دووبارەبوونەتەوە كۆی هەردوو جارەكە (الدنيا) ٦٥ + ٥٠ = ١١٥ جار كۆی هەردوو دووجارەكە (الآخرة) ٦٥ + ٥٠ = ١١٥ جار.

هەروەها هەندێك ناوی تر كە بە شێوەیەكی یەكسان دووبارەبوونەتەوە:

وشەی (الحياة) واتە: ژیان بە هەموو شێوەكانیەوە (١٤٥) جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، هەروەها وشەی (الموت) واتە: مردن كە پێچەوانەی وشەی (الحياة)ە بە هەمان جۆر (١٤٥) جار دووبارەبۆتەوە...

وشەی (البعث) واتە: زیندووبوونەوە بە هەموو شێوەکانیەوە (١٤٥) جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، هەروەها وشەیَ (الصراط) واتە: ڕێگەی ڕاستی دواڕۆژ بە هەمان جۆر (١٤٥) جار دووبارەبۆتەوە....

وشەی (الجحیم) واتە: دۆزەخ بە هەموو شێوەکانیەوە (٢٦) جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، هەروەها وشەی (العقاب) واتە: سزا و تۆڵە بە هەمان جۆر (٢٦) جار دووبارە بۆتەوە....

و (النار) واتە: ئاگر بە هەموو شێوەکانیەوە (١٥٤) جار دووبارە بۆتەوە لەگەڵ وشەی (الحریق) واتە: سوتان بە هەموو شێوەکانیەوە بە هەمان جۆر (١٥٤) جار دووبارە بۆتەوە لە بەرامبەر ئەو دوو وشەدا وشەی (الکافرین) واتە: بێ باوەڕان کە شوێنیان ئاگر و سوتانە بە هەمان جۆر (١٥٤) جار دووبارە بۆتەوە...

وشەی (الشتاء) واتە: زستان لەگەڵ (الصیف) واتە: هاوین بەیەکەوە لە یەك سورەتدا (١) جار هاتوون.....

وشەی (البرد) سارد بە هەموو شێوەکانیەوە (٤) جار دووبارە بۆتەوە بە پێچەوانەی (البرد)، (الحر) واتە: گەرم هاتووە کە بە هەمان جۆر (٤) جار دووبارەبۆتەوە....

وشەی (الجهر)، واتە: نهێنی بە هەموو شێوەکانیەوە (١٦) جار دووبارەبۆتەوە بە پێچەوانەی (الجهر)، (العلانیة) واتە: ئاشکرا هاتووە کە بە هەمان شێوە (١٦) جار دووبارە بۆتەوە....

وشەی (النفع) واتە: سود و قازانج بە هەموو شێوەکانیەوە (٥٠) جار دووبارەبۆتەوە، هەروەها پێچەوانەی (النفع) بریتیە لە (الفساد) گەندەڵی و تاوان و زەرەر بە هەموو شێوەکانیەوە بە هەمان جۆر (٥٠) جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا.

وشەی (البصیر و البصیرە) واتە: بینایی و بینەر بە هەموو شێوەکانیەوە و بەیەکەوە (١٤٨) جار دووبارە بۆتەوە، هەروەها لە پەیوەندی چاو بە دڵ و هۆشەوە

هەردوو وشەی (القلب و الفؤاد) واتە: دڵ و هۆش و فائیدە بەیەکەوە بە هەمان جۆر (١٤٨) جار دووبارە بوونەتەوە.

وشەی (القرآن) لە ناو قورئانی پیرۆزدا (٦٨) جار دووبارە بۆتەوە، لە بەرامبەر قورئان و گرنگی قورئان هەرسێ وشەی (النور، الحکمة، التنزيل) واتە: (ڕووناکی، حیکمەت، نێردراو لەلای خواوە بە هەمان جۆر (٦٨) جار دووبارەبوونەتەوە.

وشەی (اللسان) واتە: زوبان لە قورئانی پیرۆزدا (٢٥) جار دووبارە بۆتەوە، لە بەرامبەر وشەی زوبان و کار و پیشەی زوبان وشەی (الموعظة) واتە: ئامۆژگاری بە سود بە هەمان شێوە و بە یەکسانی (٢٥) جار دووبارەبۆتەوە.

وشەی (الدين) واتە: ئاین بە هەموو شێوەکانیەوە (٩٢) جار دووبارە بۆتەوە، لە بەرامبەر (الدين) وشەی (المساجد، والسجود، والركوع) بە هەموو شێوەکانی تریەوە ـ مزگەوت و سوژدە ـ بە هەمان جۆر (٩٢) جار دووبارەبۆتەوە.

وشەی (الحرب) واتە: جەنگ بە هەموو شێوەکانیەوە (٦) جار دووبارە بۆتەوە، لە قورئانی پیرۆزدا لە بەرامبەر جەنگ و کوشتار وشەی (الاسرى) واتە: دیل و بارمتە بە هەمان جۆر (٦) جار دووبارە بۆتەوە.

وشەی (إبليس) واتە: شەیتان لە قورئانی پیرۆزدا (١١) جار دووبارە بۆتەوە، لە بەرامبەر شەیتان و شەڕ و خراپەی وشەی (الاستعاذة) واتە: پەناگرتن بەخوا لە شەڕی شەیتان و وەسوەسەی و فیتنەی بەهەمان جۆر (١١) جار دووبارە بۆتەوە..

وشەی (الضيق) واتە: نائارامی و دڵ تەنگی بە هەموو شێوەکانیەوە (١٣) جار دووبارەبۆتەوە لە قورئاندا، بە پێچەوانەی نائارامی و وشەی (الطمأنية) ئارامی و دامەزراوی و دڵ فراوانی بە هەموو شێوەکانیەوە (١٣) جار دووبارەبۆتەوە.

وشەی (الفحشاء) واتە: زینا لە قورئانی پیرۆزدا (٢٤) جار دووبارە بۆتەوە، لەگەڵ خراپی و ئاسەواری زینادا وشەی (البغی) واتە: سەرکەشی بە هەمان جۆر (٢٤) جار دووبارە بۆتەوە.

* له قورئانی پیرۆزدا وشەکانی (الحرث، الزرع، الفاکهة، العطاء) واته: کێڵگه، کێڵان، میوه، پێدان به هەموو شێوەکانیانەوه و به شێوەیەکی یەکسان هەریەکەیان (١٤) جار دووبارەبوونەتەوه له قورئانی پیرۆزدا.

* له قورئانی پیرۆزدا (٤١) جار باسی موسڵمانان کراوه لەبەرامبەر (٤١) جاریش باسی جیهاد کراوه.

* له (٨٨) ئایەتدا باسی زەکات کراوه له (٨٨) ئایەتیشدا باسی ڕزق کراوه.

* هەروەها (٢٤) جار باسی ئافرەت کراوه، (٢٤) جاریش باسی پیاو کراوه.

* له قورئانی پیرۆزدا (١٦٧) جار باسی چاکەکاران کراوه (١٦٧) جاریش باسی خراپەکاران کراوه.

* هەروەها له (٣٦) ئایەتدا باسی ئاسانکاری کراوه، له (١٢) ئایەتیشدا باسی ناڕەحەتی کراوه واته: ئاسانکاری (٣) بەرامبەری ناڕەحەتی یه ١٢×٣= ٣٦.

* له (٨٣) ئایەتدا باسی خۆشەویستی کراوه، له (٨٣) ئایەتیشدا باسی له خواترسان کراوه.

* له قورئانی پیرۆزدا (٧٩) جار باسی ڕێگەی ڕاست کراوه وه هەروەها له (٧٩) جاریش باسی سۆز و ڕەحم و بەزەیی کراوه.

* له قورئانی پیرۆزدا (٧٥) جار باسی قەدەر و موصیبەت کراوه وه (٧٥) جاریش باسی سوپاسگوزاری کراوه...

* هەروەها (١١٧) جار باسی سزا و لێپرسینەوه کراوه وه (٢٣٤) جاریش باسی لێخۆشبوون و لێبوردن کراوه واته: لێبوردن دوو بەرامبەری سزایه: ١١٧×٢= ٢٣٤.

***

## ٤٧ تەمەن و ساڵی کۆچی دوایی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم)

**ئەم سەرنجە لە دوو تابلۆ پێکدێت کە ئەمانەن:**

**تابلۆی یەکەم:**

پێغەمبەرمان محمد (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی پیرۆزی (٦٣) ساڵ بووە، کە سەرنجی (٦٣)یەمین سورەتی قورئان دەدەین دەبینین کە سورەتی (المنافقون)ە، کە سورەتێکی مەدەنیە و (١١) ئایەتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، کە سەرنجی قورئان دەدەین دەبینین لە کۆتایی (٦٣)یەمین سورەتی قورئاندا کە سورەتی (المنافقون)ە باسی مردن و ئەجەل هاتووە، ئەمەش ئایەتەکەیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ (المنافقون: ١١).

ئەم سورەتە وشەی (المدينة)ی تێدا هاتووە کە مەبەست پێی شاری مەدینەیە سورەتەکەش مەدەنیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ساڵی (١١) کۆچی دا کۆچی دوایی کردووە ئایەتی (١١)ی (المنافقون)یش باسی ئەجەل دەکات و پەیوەندی بە لە دنیا دەرچوونەوە هەیە سورەتی (المنافقون)یش لە ئایەتی (١١)دا دوایی دێت و تەواو دەبێت ڕەنوسی (١١) لەگەڵ ساڵی ئەجەلەکەدا تەوافق دەکات.

**تابلۆی دووەم:**

ئاشکرایە کە تەمەنی پێغەمبەرمان محمد (صلی الله علیه وسلم) (٦٣) ساڵ بووە، لە تەمەنی (٦٣) ساڵی دا وەفاتی کردووە، لە قورئاندا تەنها (٣) جار وشەی (نتوفينك) هاتووە، مەبەست پێیان کۆچی دوایی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) ئەو سێ وشەیەی (نتوفينك) دەکەونە (٣) سورەتەوە، کە یەکەمیان سورەتی (یونس)ە دوو سورەتەکەی تر بریتین لە: سورەتی (الرعد) و (غافر).

| ئەو سورەتانەی کە وشەی (نتوفینك) یان تێداهاتووە مەبەستیش لەم وشەیە وەفاتی پێغەمبەرە (صلی اللە علیە وسلم) | زنجیرەی سورەت لە (مصحف)دا |
|---|---|
| یونس | ١٠ |
| الرعد | ١٣ |
| غافر | ٤٠ |
| کۆی گشتی | ٦٣ ساڵ تەمەنی پیرۆزی |



## ٤٨ ناوەکانی خوای گەورە و ژمارەیان لە قورئانی پیرۆزدا و دەرکەوتنی ڕاستیەکی زۆر گەورە و پایەدار:

ناوەکانی خوا و ژمارەیان لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾.

ناوی خوا (اللە) لە کتێبە پیرۆزەکەیدا (٢٦٩٩) جار دووبارە بۆتەوە، ئەم ژمارەش دابەش ناکرێت بەسەر هیچ ژمارەیەکدا تەنها ژمارە یەك نەبێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی زاتی خوای گەورە ناوی پیرۆزی خوا (اللە) ٢٦٩٩ جار هاتووە لە قورئانی پیرۆزدا، کە کۆتایی ئەم ژمارەیە بە (٩٩) هاتووە وە ناوەکانی خوا (٩٩) ناوە، پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) دەفەرموێت:

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) (أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: لله تسعة وتسعون اسما الا واحدًا لا يحفظها احد الا دخل الجنة وهو وتر ويحب الوتر) اخرجه البخاري ومسلم.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕێتەوە: خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە لە سەد یەك كەم هەر كەس لەبەریان بكات دەچێتە بەهەشتەوە، خوای گەورە تاكە و تاكی پێ خۆشە..

لەم باسەدا ژمارەی ناوەكانی خوای باڵادەست لە ئایەتەكاندا باس دەكەین، هەندێك ئایەت و سورەتەكانی قورئان بە ناوەكانی خوای گەورە دەست پێ دەكەن و كۆتاییان دێت وەك: (إن الله غفور رحيم) یان (إن الله سميع عليم)، دوو ناو لە ناوەكانی خوای باڵادەست لە قورئانی پیرۆزدا زۆر دووبارەبوونەتەوە ئەوانیش (الغفور) و (الرحيم)، ئەم دوو ناوە زۆر كات بەیەكەوە و بەسێ شێوەی جیاواز دووبارەبوونەتەوە:

١- (إن الله غفور رحيم) ٤٩ جار دووبارە بۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا.

٢- (وكان الله غفورًا رحيمًا) ١٥ جار دووبارە بۆتەوە.

٣- (وهو الغفور الرحيم) ٧ جار دووبارە بۆتەوە.

ئەگەر هەرسێ دەستەواژەكە كۆبكەینەوە دەكاتە:

٤٩+١٥+٧= ٧١ جار ئەم ژمارەیە دابەش ناكرێت بەسەر هیچ ژمارەیەكدا تەنها (یەك) نەبێت، ئەمەش لە تاك و تەنهایی خوا و بەرنامەكەیەتی.

* یەكێكی تر لە ناوە زۆر دووبارەكانی خوا: (العزيز) و (الحكيم) ئەم دوو ناوەش پێكەوە بە هەمان جۆر بەیەكەوە و بەسێ شێوەی جیاواز دووبارەبوونەتەوە:

١- (إن الله عزيز حكيم) ١٣ جار دووبارە بۆتەوە.

٢- (إن الله كان عزيزًا حكيمًا) ٥ جار دووبارە بۆتەوە.

٣- (إنك أنت العزيز الحكيم) ٢٩ جار دووبارەبۆتەوە.

ئەگەر هەرسێ دەستەواژەكە كۆبكەینەوە دەكاتە:

١٣+٥+٢٩= ٤٧ ئەم ژمارەیەش دابەش ناکرێت بەسەر هیچ ژمارەیەکدا تەنها (یەك) نەبێت.

* یەکێکی تر لە ناوە دووبارەکانی خوای گەورە (سمیع) و (علیم) (أنت السمیع العلیم) بە هەرسێ شێوەکەیەوە (٤١) جار دووبارەبۆتەوە هەروەها هەندێك ناوی دیکەش بەهەمان جۆر دووبارەبوونەتەوە.

١- (إن الله لطیف خبیر) بە هەر سێ شێوەکەیەوە ٥ جار دووبارەبۆتەوە.

٢- (إن ربك هو القوي العزیز) بە هەر سێ شێوەکەیەوە ٧ جار دووبارە بۆتەوە.

٣- (أنت العلیم الحکیم) بە هەر سێ شێوەکەیەوە ٢٩ جار دووبارەبۆتەوە.

٤- (إن الله واسع علیم) ٧ جار دووبارەبۆتەوە.

٥- (الحي القیوم) ٣ جار دووبارە بۆتەوە.

٦- (عزیز) ٩٩ جار دووبارەبۆتەوە.

٧- (الحکیم) ٩٧ جار دووبارە بۆتەوە.

٨- (قوي) ١٣ جار دووبارەبۆتەوە.

٩- (العلي الکبیر) ٥ جار دووبارە بۆتەوە.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن لە قورئانی پیرۆزدا وەك ڕۆژی ڕووناك بە بەڵگەوە تاك و تەنهایی زاتی پاکی خوای گەورە سەلمێنراوە، بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کە بەدبەختانی دوور لە دین ئەم هەموو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە دەبینن کەچی ئیمان ناهێنن بە خوای گەورە.

❊❊❊



## ٤٩ پاداشتی کردەوەی چاك و دەرکەوتنی موعجیزەیەکی ناوازە لە قورئاندا:

بڕوانە بۆ ئەم ئایەتەی سورەتی (الانعام) خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ (الأنعام: ١٦). واتە: بەیەك خێر و چاکەوە هاتبێت ئەوە دە چەندانەی چاکەکە پاداشتی بۆ هەیە، ئەوەش بە گوناهو هەڵەیەکەوە هاتبێت ئەوا پاداشت نادرێتەوە جگە بە ئەندازەی تاوانەکەی نەبێت و ئەوانە ستەمیان لیّ ناکرێت.

لەسەر ئەم ئایەتە یەك تابلۆ بەدی دەکەین لەسەر ڕادەی پاداشتی کردەوەی چاك بێگومان بە گوێرەی دەقی ئایەتەکە پاداشتی کردەوەی چاك کە ئەنجام بدریّ یەك بە دەیە بەگشتی پێنج خاڵ دەخەینە ڕوو لەسەر ئایەتەکە دەربارەی ئەم مەبەستە:

**یەکەم:** ژمارەی گشت وشەکانی ئایەتی دەستەواژەی: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ = ١٦ وشە بێگومان بە گوێرەی دەقی قورئانی پیرۆز ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ خوێندنەوەی هەر وشەیەکی قورئان خێری (١٠) وشەی هەیە، کەواتە پاداشتی خوێندنەوەی خودی ئایەتەکەی سورەتی (الأنعام) بەقەد خوێندنەوەی (١٦٠) وشە خێری هەیە، کە ژمارەیان = ڕەنوسی ئایەتەکە = (١٦٠) ژمارەی وشەکانی ئایەتەکە × ڕێژەی پاداشت = ١٦×١٠= ١٦٠ هێندەی ڕەنوسی ئایەتەکە، بێگومان دەبێت بزانین هەروەك هەریەك لە (فلا) و (ألا) بەیەك وشە دەژمێردرێن لەڕووی ڕێنوسەوە، بەهەمان شێوە وشەی (لا)یش کاتێك خۆی بەتەنها بێت هەر بەیەك وشە دەژمێردرێت.





**دووەم:** ئەو بەشەی ئایەتەکە کەوا تاکەی پەیوەندی بە کردەوەی چاك و پاداشتەکەیەوە هەیە بریتییە لە دەربڕینی: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ ئەگەر وردبینەوە دەبینین کە ژمارەی وشە نەحوی یەکانی = ١٠ وشە ئەوەندەی

پاداشت کردەوەی چاك کە وشە نەحوییەکان ئەمانەن: (من، جاء، ب، الحسنة، ف، ل، هـ، عشر، أمثال، ها).

سێیەم: دەستەواژە قورئانیەکە کە بریتییە لە: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾، لە دوو ڕستە پێکدێت کە یەك لەدوای یەك بریتین لە ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ﴾ و ﴿فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ لە ڕێزمانی عەرەبیدا لە (زانستی نەحودا) یەکەمیان پێی دەوترێت (جملة الشرط)، دووەمیان پێی دەوترێت (جملة الجزاء).

بەجێهێنانی کردەوەی چاك ڕێژەی پاداشتەکەی بۆ خاوەنەکەی هەر وەك پاداشتی (جزاء)ی کردەوەی چاك (١٠) ئەوەندەی وێنەی خۆیەتی، هەروەها ژمارەی پیتەکانی ڕستەی (الجزاء) لێرەدا بەبێ دووبارەبوونەوە یەکسانە بە (١٠) پیت، بەقەدەر ڕێژەی پاداشتەکە، پیتەکانی ڕستەی (الجزاء) ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ بەبێ دووبارەبوونەوە ئەم (١٠) پیتەن: (ف، ل، هـ، ع، ش، ر، أ، م، ث،ا) دە پیتی هیجائە.

چوارەم: لە ڕستەی (جزاء)ی دەستەواژەی قورئانی یەکەدا کە بریتییە لە ﴿فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾، ئەو دەربڕینەی کەوا تاکەی پەیوەندی بە ڕێژە و بڕی پاداشتی کردەوەی چاکەوە هەیە بریتی یە لە ﴿عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾، کە ژمارەی پیتەکانی یەکسانە بە (١٠) پیت ئەوەندەی ڕێژەی پاداشتەکەیە کە بریتییە لە دەقاتی وێنەی خۆی: ﴿عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ ١٠ پیت.

پێنجەم: وشەی (الحسنة) لە ئایەتەکەدا هاتووە لە قورئاندا وشەی (الحسنە) ٨ جار بە واتای کردەوەی چاك هاتووە، کە پاداشتەکەی لە قیامەتدا هەبێت چ وشەیەکە (ال)ی پێوە بێت یان (ال)ی پێوە نەبێت، وشەی (الحسنات) دووجار بە واتای کردەوەی چاك هاتووە، چ وشەیەکە (ال)ی پێوە بێت یان (ال)ی پێوە نەبێت، کەواتە کۆی ئەم وشانە (الحسنە، الحسنات) لە قورئاندا یەکسانە بە ٨+٢= ١٠. بەڕاستی ئەم قورئانە هەموو پیت و وشەیەکی موعجیزەیە سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار خاوەنی ئەم قورئانە پایەدارە.



## ٥٠ سورەتی (الحدید) و نهێنی ژمارە (٥٧) و دەرکەوتنی موعجیزەیەکی نوێی پڕشنگدار:

ژمارەی سورەتی (الحدید) لە قورئانی پیرۆزدا (٥٧)ە، وشەی (الحدید) لە زمانی عەرەبیدا واتە: ئاسن، لێرەدا پەیوەندیەکی فراوان لە نێوان قورئان و پێکهاتەی کیمیایی ئاسن دا دەبینین:

ئاسن بارستە ژمارەکەی یەکسانە بە ژمارە ٥٧، بە ژماردنی پیتی ئەبجەدی لەلای عەرەب (حساب الجمل) ناوی ئاسن دەکاتە ٥٧.

ئەگەر (ال)ی (الحدید) لابەرین و (حدید) ژمارە بکەین دەبینین:

ح د ی د : حدید

٨ + ٤ + ١٠ + ٤ = ٢٦

ئەنجام ژمارە (٢٦)مان دەسکەوت، ئەوەی لێرەدا گرنگە ژمارەی گەردیلەکانی ئاسن یەکسانە بە (٢٦)، ژمارەی پرۆتۆنەکانی هەریەك لە گەردیلەکانی ئاسن دەکاتە (٢٦)، ژمارەی ئەلیکترۆنەکانیشی دەکاتە (٢٦) وەك لەسەرەتادا باسمان کرد ژمارەی سورەتی (الحدید) لە قورئانی پیرۆزدا (٥٧)ە، قورئان لە (١١٤) سورەت پێکهاتووە کە نیوەی (١١٤) یەکسانە بە (٥٧)، لە قورئانی پیرۆزدا وشەی (الحدید) لە (٥) ئایەتدا دووبارە بۆتەوە کە لە (٣) ئایەتیاندا بە (الحدید) و لە (٢) ئایەتی دیکەیاندا بە (حدید) هاتووە، ئەگەر لەپاڵ یەکدا ڕیزیان بکەین دەبینین دەکاتە (٣٥٢) ئەگەر ئاوڕێك لە هاوهێزی ئاسن بدەینەوە دەبینین کە هاوهێزی ئاسن یەکسانە بە (٣٥٢)، کە ناودەبرێت بە (هێما تایت) و (مەگناتایت) هاوتا لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا.

***





## ٥١ دەرکەوتنی چوار موعجیزەی زۆر گەورە دەربارەی هاوەڵانی ئەشکەوت:

چیرۆکی (أصحاب الكهف) لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (الكهف) باسکراوە، ئەم چیرۆکەش لە ئایەتی (٩)وە دەست پێدەکات، خوای گەورە لەم چیرۆکەدا زەنگێکی ئاگادارکەرەوە نیشانی موسڵمانان دەدات، کە کۆمەڵێك لە لاوانی باوەڕدار بە خوای تاك و تەنیا دژی بت و شیرك و زوڵم و ستەم وەستانەوە و پەنایان بردە بەر خوای گەورە و ڕوویان کردە ئاوایی (ڕەقیم)، خوای گەورەش لە ئەشکەوتەکەدا پشتیوانی لێ کردن و پاراستنی، چونکە ئەشکەوت زۆرکات بووەتە جێگای پاراستنی پێغەمبەران، وەك پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) کاتێك لەبەر قوڕەیش پەنای بردە بەر ئەشکەوت بۆیە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا دەفەرموویت: ﴿وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا﴾ (الكهف: ١٦). لەم چیرۆکەدا کۆمەڵێك موعجیزەی گرنگ دەبینین کە شایەنی تێڕامان و بیرکردنەوەیە بۆیە خوای باڵادەست لەبارەی چیرۆکەکە دەفەرموویت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا﴾ (الكهف: ٩). واتە: ئایا تۆ محمد (صلى الله عليه وسلم) پێت وایە کە یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) (والرقيم) لەناو بەڵگەکانی ئێمەدا شتێکی سەیر و سەمەرەیە وەك ئەوان پێیان وابوو؟ نەخێر، ئەوە بۆ دەسەڵات و توانایی ئێمە شتێ نیە جێگەی سەرسوڕمان بێت، چونکە لە بونەوەردا گەورەتر و سەرسوڕهێنترمان وەك ئاسمان و زەوی هەیە پاشان لەبارەی مانەوەی نوستنی یاران دەفەرموێت:

﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾ (الكهف: ٢٥). واتە: لە ئەشکەوتەکەدا (٣٠٠) ساڵی هەتاوی نوستن وە (٩) ساڵیشیان بۆ زیاد کرد. واتە:

ئەگەر بە ساڵی هەتاوی حسێب بکرێت ٣٠٠ ساڵی ڕەبەق مانەوە، خۆ ئەگەر بە ساڵی هەیڤی حسێب بکرێن (٣٠٩) ساڵ مانەوە ئەم ئایەتە چوار نهێنی گەورەی تێدایە:

یەکەم: ئایەتەکە دەفەرمووێت: (٣٠٠) نوستن و (٩) ساڵمان بۆ زیاد کرد واتە: ئەگەر بە ساڵی هەتاوی حسێب بکرێن (٣٠٠) ساڵ نوستن، خۆ ئەگەر بە ساڵی هەیڤیش حسێب بکرێن ئەوا (٣٠٩) ساڵ نوست ن، لەبەرئەوەی هەموو (٣٠٠) ساڵی هەتاوی بەرامبەرە بە (٣٠٩) ساڵی هەیڤی، چونکە هەموو ساڵێکی هەیڤی کەمترە لە هەتاوی بە ١١ ڕۆژ کە ئەنجام دەکاتە (٩) ساڵ بە (٣٠٠) ساڵەکە.

دووەم: ئایەتەکە دەفەرمووێت: (٣٠٠) نوستن و (٩) ساڵمان بۆ زیاد کرد، چیرۆکی (أصحاب الكهف) لە ئایەتی (٩) دەست پێ دەکات و بە ئایەتی (٢٥) کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾ (الكهف: ٢٥). کۆتایی دێت... ئەگەر لە ئایەتی (٩) تا (٢٥) کە کۆتایی ئایەتەکەیە ژمارەی وشەکانی هەژمار بکەین دەبینین کە لە (٣٠٩) وشە پێکهاتووە: ﴿ أَمۡ حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ﴿١٠﴾ فَضَرَبۡنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمۡ فِي ٱلۡكَهۡفِ سِنِينَ عَدَدٗا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِنَعۡلَمَ أَيُّ ٱلۡحِزۡبَيۡنِ أَحۡصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدٗا ﴿١٢﴾ نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ﴿١٣﴾ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ

مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ ۚ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِ ۖ وَكَلْبُهُم بَٰسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِٱلْوَصِيدِ ۚ لَوِ ٱطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾﴾.

**كۆی ژمارەی وشەكانی هەر (١٦) ئایەتەكە لە (٣٠٩) وشە پێكهاتووە.**

**سێیەم: ژمارەی سورەتی (الكهف) لە قورئانی پیرۆزدا (١٨)یە واتە: هەژدەیەم سورەتە لە قورئانی پیرۆزدا ژمارەی (١٨) لە پاشماوەكانی ژمارە (٩)یە واتە ژمارەكانی (١٨) دەكاتە ٨+١ = ٩ دەكاتە (٩) هەروەها ئایەتەكە دەفەرموێت:** ﴿وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا﴾.

چوارەم: ژمارەی پیتەکانی کۆتا ئایەت کە دەفەرموێت: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ۝٢٥﴾ لە (٣٦) پیت پێکهاتووە کە ژمارە (٣٦) لە پاشماوەکانی ژمارە (٩)یە واتە: ٤×٩= ٣٦.

بەڕاستی پێویستە ئیمانداران ئەم موعجیزە زانستیە گەورانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن کە بەڕاستی ئەوە گەورەترین دیاریە و مایەی سەرفرازی دنیا و قیامەتە.



## هەیف و هەتاو و شەو و ڕۆژ لە قورئانی پیرۆزدا و موعجیزەیەکی ناوازە:

هەروەك دەزانین جیاوازی نێوان هەردوو ساڵی هەیفی و هەتاوی (١١) ڕۆژە، بۆ هەر (١) ساڵ جارێك و (٩) ساڵیش بۆ هەر (٣٠٠) ساڵێك، واتە: ١١×٣٠٠= ٣٣٠٠ پاشان ٣٣٠٠ دابەشی ٣٦٥ یەکسانە بە ٩، خوای گەورە داوامان لیچ دەکات کە کار بە ڕۆژژمێری هەیفی بکەین هەروەك ئاماژەی پێکردووە لە سورەتی (التوبە) ئایەتی (٣٦)، پاشان ئەگەر تێڕامان بکەین لە چەند ئایەتێکی قورئانیدا کە باس لە هەیف و هەتاو و دیاردەی شەو و ڕۆژ دەکات، چەند ئیعجازێکی گرنگ لە هەردوو ژمارە ١١ و ٩ دا دەبینین:

- خوای باڵادەست دەفەرموێت:

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ (إبراهيم: ٣٣).

ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لە هەیف و هەتاو و شەو و ڕۆژ دەکات کە لە (٩) وشە پێکهاتووە، ژمارە (٩) جیاوازی نێوان هەردوو ڕۆژژمێری هەیفی و هەتاوییە، واتە: هەموو (٣٠٠) ساڵێکی هەتاوی بەرامبەرە بە (٣٠٩) ساڵی هەیفی، هەروەك لە سورەتی (الکهف)دا باسی لێوە کراوە واتە: هەموو ساڵێکی هەتاوی دەکاتە (٣٦٤ تا ٣٦٥) ڕۆژ

بەڵام هەر ساڵێکی هەیڤی بەرامبەرە بە (٣٥٤) ڕۆژ واتە: ساڵی هەیڤی کەمترە لە هەتاوی بە (١١) ڕۆژ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکە لە وشەی ١وە تا وشەی (٥) واتە: ﴿وَسَخَّر لَكُمُ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِ﴾ ئەم بەشەی ئایەتی (٣٣) لە (٥) وشە پێکهاتووە کە باس لە (هەیڤ و هەتاو) دەکات، ئەم (٥) وشە لە (٢٤) پیت پێکهاتووە هەروەك دەزانین کە شەو و ڕۆژ یەکسانە بە (٢٤) کاتژمێر.

- پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ (النحل: ١٢). دەبینین بەشێك لەم ئایەتە پیرۆزە لە (٩) وشە پێکهاتووە کە باس لە (شەو و ڕۆژ) و (هەیڤ و هەتاو) دەکات.

- هەروەها خوای باڵادەست لەبارەی هەیڤ و هەتاو دەفەرموویێت:

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٣). هەروەها ئەم ئایەتەش باس لە شەو و ڕۆژ و هەیڤ و هەتاو دەکات و لە (١١) وشە پێکهاتووە وەك زانیمان جیاوازی نێوان هەردوو ساڵی هەیڤی و هەتاوی (١١) ڕۆژە بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

- هەروەها خوای گەورە و باڵادەست لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت:

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا﴾ الفرقان: ٦١). ئەم ئایەتە پیرۆزە بەیەکەوە باس لە هەیڤ و هەتاو و سودەکانیان دەکات بە هەمان جۆر ئەم ئایەتەش لە (١١) وشە پێکهاتووە.

- هەروەها خوای گەورە و باڵادەست لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموویێت:

﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾آل عمران: ١٩٠). بە هەمان جۆر دەبینین ئەم ئایەتە پیرۆزەش باس لە شەو و ڕۆژ دەکات کە لە (١١) وشە پێکهاتووە هەروەها هەردوو وشەی (اللیل والنهار) شەو و ڕۆژ لە (١١) پیت پێکهاتووە وە هەروەها هەردوو وشەی (الشمس والقمر) هەیڤ و هەتاویش لە (١١) پیت پێکهاتووە.

## ٥٣ ساڵی هەیڤی دوازدە مانگە لە قورئاندا:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت:

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾التوبة: ٣٦.

ئیعجازی ژمارەیی لەم ئایەتە پیرۆزەدا: ژمارەی ئەم ئایەتە (٣٦)ە لە سورەتی (التوبه)دا وە ژمارەی وشەکانی ئەم ئایەتە لە (٣٦) وشە پێکهاتووە هەروەها ژمارەی سورەتی (التوبه) لە قورئانی پیرۆزدا (٩)یە واتە: نۆیەم سورەتی قورئانی پیرۆزە ئەگەر بێین لێکدانەوەیەکی ژمارەیی بکەین لەم ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزەیەکی خوایی دەبینین لەم (٣٦) وشەیەدا:

٣٦×٣٦= ١٢٩٦.

ئەگەر ئەم ژمارە دابەش بکەین بەسەر ژمارە (١٢)دا کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ژمارە (١٢) هاتووە:

﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لە مانگی هەیڤی دەکات و دەفەرموویت: ژمارەی مانگەکانیش لە (لوح المحفوڤ)دا بە دوازدە مانگ دانا واتە: ئەگەر ژمارە (١٢٩٦) دابەش بکەین بەسەر (١٢) مانگەکەی ساڵدا دەبینین:

١٢٩٦ دابەشی ١٢ یەکسانە بە ١٠٨ وە ژمارە (١٠٨) کۆی هەر سێ ژمارەکەی دەکاتە:

٨ + ٠ + ١ = ٩ پاشان ئەگەر ژمارە ١٠٨ ÷ ٩ بکەین دەکاتە ١٢ واتە کۆی هەر دوازدە مانگەکەی ساڵ ﴿ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ هەروەها وشەی

(الشهر) ١٢ جار دووبارەبۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا هەروەها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی (٤) مانگە حەرامەکە دەکات و دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ التوبة: ٣٧.

واتە: بێگومان ڕاگوێزان و دواخستنی حورمەتی مانگێك بۆ مانگێکی تر زیادکردنە لە کوفر و خوانەناسی ئەو بێ باوەڕانەی پێ گومڕا دەکرێت کە ساڵێ شەڕ لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا حەڵاڵ دەکەن و ساڵێکیش یاساغی دەکەن هەتا بەو کارەیان ژمارەی ئەو چوار مانگە کە خوا شەڕی تێدا یاساغ کردوون لەگەڵ مانگە حەڵاڵەکاندا بەرامبەر بکەنەوە.

## ٥٤ ئێسك کارگەی بەرهەمهێنانی خوێنە:

قورئانی پیرۆز سەدان ساڵ پێش زانست کەوتووە لە دانپێدانانی زیندوویەتی ئێسك و بایەخی گەورەی ئێسك لە ئەرکەکانی مرۆڤدا، لە سورەتی (مریەم)دا زەکەریا (سەلامی خوای لەسەر بێت) هاناو هاواری بۆ خوای گەورە برد کە منداڵێکی پێببەخشێت ئەگەرچی هاوسەرەکەشی منداڵی نەدەبوو و ئێسکەکانیش لاوازبوون، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا﴾ (مريم: ٤) واتە: پەروەردگارا بەڕاستی من ئێسکەکانم لاوازبوون و قژی سەرم هەر هەمووی سپێتی دایگرتووە، بەڵام من هەرگیز لە دوعاو پاڕانەوەم لە زاتی تۆ نائومێد نەبووم و دەستت نەناوە بە ڕوومەوە. لەم ئایەتە پیرۆزەدا قورئان باس لە پەیوەندی بەرهەمهێنانی منداڵ دەکات بە ئێسکەکانەوە، لەم دواییانەدا زانست

سەلماندی کە ئێسکەکان کارو ئەرکی گرنگیان هەیە بە جۆرێك کە ژیانی مرۆڤی لەسەر وەستاوە. ئێسك هەموو ئەوەی تێدایە کە لەش پێویستی پێیەتی وەك: (فۆسفۆرو کالیسیۆم) کرداری دابەشکردنیان ڕێکدەخات بە شێوەیەك کە لێدانەکانی دڵ و جوڵەی ماسولکەکان دەپارێزێ.

هەروەها ئێسکەکان بە درێژایی ژیانی مرۆڤ و بەبێ پچڕان خڕۆکە سور و سپییەکان بەرهەمدێنن، وەك زانست سەلماندوویەتی کە حاڵەتی ئێسکەکان ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر ئەندامی دەمار، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ دەچنە نێو توانای مرۆڤەوە بۆ بەرهەمهێنانی منداڵ، ئەوەش ئەو ڕاستییە کە قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە چواردە سەدە ئاماژەی پێکردووە.



## باسی پێغەمبەران (عیسا و ئادەم) سەلامی خوایان لەسەر بێت لە قورئاندا موعجیزەیەکی گەورەیە:

**پێغەمبەر عیسا و ژمارە (٢٥):**

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ (آل عمران: ٥٩)، واتە: نموونەی دروستبوونی عیساش کە جێگەی سەرسووڕمانی ئەوانەیە بووەتە جێگەی مشتومڕیان، هەروەك نموونەی دروستبوونی ئادەمە لەلای خوا، ئەوە بوو هەر لە گڵ قاڵبی بۆ ڕشت و شکڵی دروست کرد و پێی وت: ببە خێرا ئەویش بوو، کەوابوو حاڵی عیسا سەرسوڕهێنەر نییە لە حاڵی ئادەم، ئەگەرچی عیسا دایکی هەبوو خۆ ئادەم نە دایکی هەبوو نە باوك بەڵکو لە گڵ فەراهەمی هێنا، ئیتر ئەو مشتومڕەتان لەچییە؟ لەدایکبوونی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) موعجیزەیەکی خوا بوو، هەر لەدایکبوونی و پاشان بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان کە بوو بە مشتومڕی یەهود لە سەرەتادا.

ئەم ئایەتە پیرۆزە کۆمەڵێك موعجیزەی گەورەی تێدایە، ئەم ئایەتە پیرۆزە وشەی (مثل) وەکو دووجار دووبارە بۆتەوە، نهێنی ئەم باسە لەوەدایە کە هەرچی نموونەی ئادەمە وەك عیسایە (سەلامی خوایان لەسەر بێت) لە دوو شتدا، هەر بۆیە وشەی (مثل) نموونەی دووجار هاتووە لە ئایەتە پیرۆزەکەدا، هەردووکیان (عیسا و ئادەم) بەبێ باب هاتوونەتە بوون، هەردووکیان پێغەمبەری خوا بوون، بەڵام شتێکی گرنگتر هەیە ئەویش هەردووکیان لە قورئانی پیرۆزدا بە یەکسانی باس کراون، واتە: لێکچوون هەیە ئەگەر لە قورئاندا بە شوێن وشەی عیسادا بگەڕێین دەبینین (٢٥) جار دووبارە بۆتەوە، خۆ ئەگەر بەشوێن وشەی (ئادەم)یشدا بگەڕێین، بە هەمان جۆر (٢٥) جار دووبارە بۆتەوە. موعجیزەی ژمارە (٧) هەردووەك ناوی عیسا و ئادەم لە هیچ ئایەتێکدا کۆنەبوونەتەوە تەنها لە ئایەتی: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ﴾ دا نەبێت.

ئەگەر سەرنج بدەین لە ئایەتەدا دەبینین لە (٧) وشە پێکهاتووە، جگە لەوەی کە لە باسی عیسا و ئادەم بە یەکەوە لەم ئایەتەدا لە حەوت وشە پێکهاتوون، هەروەها زۆربەی وشەکانیش بە کۆیان لە حەوت پیت پێکهاتوون:

﴿ مَثَلَ عِيسَىٰ﴾ – ﴿كَمَثَلِ ءَادَمَ﴾ نموونەی عیسا + نموونەی ئادەم– لێرەدا دەبینین کە هەردوو دەستەواژەکە لە حەوت پیت پێکهاتووە:

م ث ل ع ي س ى

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ =٧

هەروەها ﴿كَمَثَلِ ءَادَمَ﴾ هەر لە حەوت پیت پێکهاتووە:

ك م ث ل أ د م

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ =٧

دەستەواژەی ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ لەلای خوا هەر لە حەوت پیت پێکهاتووە:

ع ن د ال ل ه

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧= ٧

ناوی (عیسا) له چوار پیت پێکهاتووه وه ناوی (أدم) له سێ پیت پێکهاتووه وه کۆی هەردووکیان دەکاته حەوت:

عیسا+ أدم = ٧

ع ي س ى + أ د م

٧ = ٣ ٢ ١ + ٤ ٣ ٢ ١

ژمارەی پیتەکانی دەستەواژەی ﴿ثُمَّ قَالَ لَهُۥ﴾ پاشان پێی فەرموو له حەوت پیت پێکهاتووه:

ث م ق ا ل ل ه

٧ = ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

ژمارەی پیتەکانی دەستەواژەی ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ واته: ببه ئەویش بوو، له حەوت پیت پێکهاتووه:

ك ن ف ى ك و ن

٧ = ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ + ٢ ١

ژمارەی پیتەکانی هەردوو وشەی ﴿مَثَلَ﴾ و ﴿كَمَثَلِ﴾، هەروەك پێکەوه له حەوت پیت پێکهاتوون:

م ث ل ك م ث ل

٧= ٧ ٦ ٥ ٤ + ٣ ٢ ١

ژمارەی پیتەکانی ناوی ئەو سورەتەی که ئەم ئایەتەی تێدا هاتووه له حەوت پیت پێکهاتووه (آل عمران):

أ ل ع م ر ا ن

٧ = ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ + ٢ ١

خوای باڵادەست (أدم)ی له (تراب) خۆڵ بەدیهێنا، که کۆی هەردووکیان دەکاته حەوت (أدم) + (تراب) =٧

أ د م ت ر ا ب

٧ = ٧ ٦ ٥ ٤ + ٣ ٢ ١

ناوی (أدم) له سێ پیت پێکهاتووه هەروەها وشەی (خلقه) واته: بەدیهێنا له چوار پیت پێکهاتووه که کۆی هەردووکیان دەکاته حەوت:

أ د م   خ ل ق ه

٧ =٧ ٦ ٥ ٤ + ٣ ٢ ١

ناوی خوا (الله) له چوار پیت پێکهاتووه هەر خواشه (أدم)ی بەدیهێنا که کۆی هەردووکیان دەکاته حەوت:

أ ل ل ه   أ د م

٣ ٢ ١ + ٤ ٣ ٢ ١

(الله) جل جلاله (أدم) = ٧

## ٥٦ سورەتی (الاسراء) و نهێنی ژماره (١٧) له قورئانی پیرۆزدا:

خوای باڵادەست وەك ڕێزلێنانێك بۆ پێغەمبەر موحەممەد ﷺ سوورەتی (الاسراء)ی کرده ئەو ناوه، که کاتێك دوای ناڕەحەتی و ئازارەکانی (طائف) و پێش کۆچکردنی بۆ مەدینه به ساڵێك و شەش مانگ، له ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا و له شەوێکی ساماڵدا و له مانگی ٢٧ی ڕەجەبدا شەوڕەوی کرا بۆ (بیت المقدس) و لەوێشەوه بەرزکرایەوه بۆ مەلەکوتی ئاسمانەکان. پاشان هەر لەو بەرزکردنەوەدا خوای باڵادەست نوێژی لەسەر نەتەوەکەی فەرزکرد که له ڕۆژێکدا (٥٠) فەرز نوێژ بەجێبهێنن. پاشان به تکای پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لەسەر بێ) کرایه (٥) فەرز نوێژ له ڕۆژێکدا، که هەر بەرامبەره لەگەڵ (٥٠) فەرزەکەی سەرەتا له ئەجر و پاداشتدا، ئەمەش بۆ خۆی خەڵاتێکی خوایی بوو که لەو شەوەدا کردیه دیاری بۆ نەتەوەکەی.

پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ کۆی ڕکاتەکانی (٥) نوێژە فەرزەکە لە ڕۆژێکدا بەرامبەرە بە (١٧) ڕکات: ٢ بەیانی+ ٤ نیوەڕۆ+ ٤ عەسر + ٣ مەغریب + ٤ عیشا کە کۆی هەر پێنجیان هاوتایە بە (١٧) ڕکات.

سورەتی (الاسراء) حەڤدەهەم سوورەتە لە قورئانی پیرۆزدا وە خوای گەورە لە باسی نوێژدا دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ (المائدة: ٦) ئەم ئایەتە پیرۆزەی سوورەتی (المائدة) کە باس لە نوێژ و چۆنیەتی دەستنوێژگرتن دەکات کۆی وشەکانی لە (١٧) وشە پێکهاتووە. خوای بالآدەست لە سورەتێکی دیکەدا لە باسی نوێژ و زەکات و کاری باشەدا دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (البقرة: ١١٠) ئەم ئایەتە پیرۆزە کە لە باسی نوێژ دەدوێت بە هەمان شێوە لە (١٧) وشە پێکهاتووە هەروەها لە باسی نوێژدا خوای بالآدەست لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿يَـٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ (لقمان: ١٧) لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە لە زاری لوقمانی حەکیمەوە دەفەرموێت: کاتێك ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات بۆ ئەنجامدانی نوێژ و کاری چاکەو ئارامگرتن ئەم ئایەتە پیرۆزە دوو نهێنی گەورەی تێدایە:

یەکەم/ ژمارەی ئەم ئایەتە لە سورەتی لوقماندا (١٧)ەیە.

دووەم/ هەروەها لە (١٧) وشە پێکهاتووە.

***



## دەرکەوتنی سێ نهێنی گەورە لە سورەتی (الأنبیاء)دا:

سێ نموونە لە سەر سوورەتی (الأنبیاء)دا ئەم سێ نموونەیە بریتین لە سێ تابلۆ کە ئەمانەن:

**تابلۆی یەکەم:** لە قورئانی پیرۆزدا ژمارەی گشت ئەو پێغەمبەرانەی کە ناویان هاتووە (٢٦) پێغەمبەرن (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، بە دەربڕینێکی تر تەنها (٢٦) پێغەمبەر ناویان هاتووە لە قورئاندا یەکێك لەوانە (إبراهیم) پێغەمبەرە (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کە بە دوو شێوە ئیملای ناوەکەی لە (مصحف) دا هاتووە، لە هەندێ شوێنی قورئاندا بەم جۆرەیە (إبرهیم) کە لێرەدا شەش حەرفییە دەبێت لە کاتی ژماردنی پیتەکانی ناوی ئەو پێغەمبەرانەدا ڕەچاوی ئەو ڕێنووسە بکەین کە لە (مصحف)دا هەیە بەپێی ڕەسمی عوسمانی مادام ناوی (إبرهم) بە دوو شێوە ڕێنوس کراوە لە (مصحف)دا لەبەرئەوە ویستی خۆمانە هەرکامیان وەرگرین. لێرەدا ناوە پێنج حەرفییەکەمان وەرگرتووە جا ئەگەر ژمارەی گشت پیتەکانی ئەم (٢٦) پێغەمبەرە سەرژمێر بکەین و کۆیان بکەینەوە، سەرجەمیان دەکاتە (١١٢) پیت کە هێندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (الأنبیاء)ە. سورەتی (الأنبیاء) لە قورئاندا ئەو سوورەتەیە ڕێژەییە کە بەناوی پێغەمبەرانەوە ناونراوە.

**تابلۆی دووەم:** ئەم شەش سوورەتەی کە بەناوی یەکێك لە پێغەمبەرانەوە (درود و سەلامی خوایان لێبێت) ناونراون، ناوی سوورەتەکەش واتاکەی تەنها تایبەتە بە یەکێك لە پێغەمبەرانەوە ئەمانەن: سورەتی (یونس، هود، یوسف، إبراهیم، محمد، نوح) ناوی سورەتی (الأنبیاء) واتاکەی بریتییە لە پێغەمبەران، ئەگەر دەست بکەین بە ژماردنی ناوی پێغەمبەران لەو شەش سورەتەو سوورەتی (الأنبیاء)یشدا ئەوا سەرجەمیان دەکاتە (١١٢) هێندەی ژمارەی گشت ئایەتەکانی سوورەتی (الأنبیاء).

تابلۆی سێیەم: لێرەدا باس لە ناوی (إسماعیل) پێغەمبەر دەکەین (سەلامی خوای لەسەر بێت) ناوی (إسماعیل) پێغەمبەر (١٢)جار لە قورئاندا هاتووە، پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان (إسماعیل) پێغەمبەر و قوربانی کردندا بۆ خوا، چونکە کاتێك خوای گەورە (إبراهیم) و (إسماعیل) پێغەمبەری تووشی تاقیکردنەوەیەکی گەورە کرد (درودی خوایان لەسەر بێت)، کە (إبراهیم) پێغەمبەر لە خەوی دا فەرمانی پێکرا بوو ئیسماعیلی کوڕی سەربڕێت، پاش ئەوەی ئیسماعیل ئامادەیی نیشاندا بانگ لە (إبراهیم) کرا لەلایەن خواوە کە دەست هەڵبگرێت لە سەربڕینی کوڕەکەی، وا هەردووکتان لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچوون، بەرانێکی گەورەی بە جبریلدا نارد بۆی کە لەجیاتی (إسماعیل) سەری ببڕێت، ئیتر لەو کاتەوە قوربانی دامەزرا.

هەروەها (إسماعیل) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) پەیوەندی بە حەج و مانگی (ذو الحجة) هەیە لەبەر چەند هۆیەك: یەکێك لەوانە ئەوەیە کە بەشداری کردووە لە دروستکردنی کەعبەدا پەیوەندییە ژمارەییەکە بەم جۆرەیە (إسماعیل) پێغەمبەر تەنها (١٢) جار لە قورئاندا ناوی هاتووە، قوربانی کردن تەنها لە یەك مانگدا ئەنجام دەدرێت، کە ئەویش مانگی (١٢)یەمی ساڵی هیجرییە کە مانگی (ذو الحجة)یە لەناو مانگی (ذو الحجة)شدا تەنها چوار ڕۆژ قوربانیان تیادا ئەنجام دەدرێت، کە یەکێکیان ڕۆژی (١٢)یەمی مانگی (ذو الحجة)یە. بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو پەروەردگار.

***

## ٥٨ موعجیزەکانی غەزای بەدر و مانگی بەدر:

ئەم سەرنجە لە یەك تابلۆ پێکهاتووە: پەیوەندی سوورەتی (القمر) بە غەزای بەدر و مانگی بەدرەوە ڕوون دەکەینەوە سورەتی (القمر) لە سێ ئایەتی دا باس لە غەزای بەدر دەکات پێش ئەوەی بچینە سەر باسی ئەو سێ ئایەتە جێگای خۆیەتی باسی (توافق)ی غەزای بەدر بکەین لە سێ ڕووی جیاوازەوە لەگەڵ سێ شتی جیاوازدا کە ئەمانەن:

١. ڕۆژی غەزای بەدر هاوکاتە لەگەڵ ڕۆژی سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکان دا ڕۆمەکان خاوەن ئاین بوون چونکە ڕۆمەکان مەسیحی بوون و خاوەنی کتێبی ئاسمانی بوون ڕۆژی غەزای بەدر کە موسڵمانەکان تیایدا سەرکەوتن بەسەر بتپەرستەکاندا هەمان ڕۆژی سەرکەوتنی ڕۆمەکان بوو بە سەر فارسە ئاگر پەرستەکانی ئەو سەردەمەدا ئەو سەرکەوتنەی کە قورئان دەریبڕیووە و فەرموویەتی:

﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾

(الروم: ٢-٥) سەرکەوتنی موسڵمانەکان لەگەڵ سەرکەوتنی ڕۆمەکان لە هەمان ڕۆژ و هەمان ساڵدا بوو، لەم ئایەتانەدا ئەو دەربڕینەی کە واتاکەی پەیوەندی بە غەزای بەدرەوە هەیە بریتییە لە دەربڕینی ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾.

ژمارەی پیتەکانی ئەم دەربڕینە قورئانییە = ٢٦ پیت هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)یشدا دەربڕینێکی قورئانی تر هەیە کە واتاکەی پەیوەندی بە غەزای بەدرەوە هەیە و دەکەوێتە ئایەتی (١٢٣)ەوە کە بریتیە لە ﴿وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞ﴾ ژمارەی پیتەکانی ئەم دەربڕینە قورئانییەش = ٢٦ پیت. (الله أكبر) لە گەورەیی و موعجیزاتی ئەم قورئانە پیرۆزە.

٢. ڕۆژی غەزای بەدر هاوکاتە لەگەڵ ڕۆژی هاتنە خوارەوەی قورئاندا لە یەکەم جاری هاتنە خوارەوەی دا، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستیەش لە کتێبەکانی تەفسیردا بڕوانە بۆ تەفسیری ڕستەی ﴿وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ﴾ هەردووکیان کەوتوونەتە ڕۆژی (١٧)ی مانگی ڕەمەزانەوە.

٣. ژمارەی ئەو موسڵمانانەی کە بەشداری غەزای بەدریان کرد (خوایان لێ ڕازی بێ) (٣١٣) یان (٣١٥) کەس بوون، کە ئەمەش هێندەی ژمارەی موسڵمانەکانی سوپاکەی (طالوت)ە، کە غەزایان کرد و بە جەنگ هاتن لەگەڵ سوپای (جالوتی) بێباوەڕدا، ژمارەیان زۆر لە یەکەوە نزیکە، چونکە ژمارەی سوپاکەی (طالوت) (٣١٩) کەس بوون. شایانی باسە هەروەك سووپاکەی بەدر بەو ژمارە کەمەوە و بەو کەم تفاقییەوە سەرکەوتن بەسەر بتپەرستەکانی مەککەدا کە ژمارەیان لە هەزار کەس زیاتر بوو.

بە هەمان شێوە سووپاکەی (طالوت)یش بەو ژمارە کەمەوە سەرکەوتن بەسەر سوپا زۆرەکەی (جالوت) دا. لە ڕوویەکی ترەوە دەبینین کە هەروەك ژمارەی موسڵمانانی غەزای بەدر (٣١٣) یان (٣١٥) کەسە، هەروەها ژمارەی گشت پێغەمبەرە موڕسەلەکانیش (٣١٥) کەسە (درودی خوایان لەسەر بێت)، بەڵگەشمان ئەم فەرموودەیەیە (قال أبوذر: قلت يا رسول الله كم وفاء عدة الأنبياء؟ قال: مائة ألف و أربعة وعشرون ألفا، الرسل من ذلك ثلاث مائة وخمسته عشر جما غفيرا) رواه الإمام أحمد.

لێرەوە دێینە سەر باسی ئایەتەکە سوورەتی (القمر)، سوورەتێکی مەککییە غەزای بەدر بە چەند ساڵێك لە دوای هاتنە خوارەوەی سوورەتی (القمر) لە مەدینەدا ڕوویداوە، هەرچەند سوورەتی (القمر) سوورەتێکی مەککییەو مەدەنی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا لە سێ ئایەتیدا لە غەزای بەدر دەدوێن ئەمانەش ئایەتەکانن خوا دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ۝٤٤ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝٤٥ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ (القمر: ٤٤-٤٦). واتە: یان دەڵێن ئێمە هەموومان کۆین و سەرکەوتووین و

شكت ناهێنن، له ئاینده‌یه‌كی نزیكدا له‌شكر و كۆمه‌ڵیان شكست ده‌هێنێت و هه‌ڵدێن له غه‌زای به‌دردا ئه‌و مژده‌یه هاته‌دی. جگه له‌وه‌ش قیامه‌ت كاتی لێپرسینه‌وه‌یانه كه ڕۆژێكی زۆر سه‌ختتره‌و تاڵتره ڕای زانایانی ته‌فسیری قورئان له‌باره‌ی هاتنه خواره‌وه‌ی ئه‌م سێ ئایه‌ته‌ی سووره‌تی (القمر)ه‌وه دوو جۆره، هه‌ندێ له زانایانی ته‌فسیری قورئان فه‌رموویانه ئه‌م سێ ئایه‌ته مه‌ككین هه‌ندێكیان فه‌رموویانه مه‌ده‌نین ڕای یه‌كه‌میان به‌هێزتره كه فه‌رموویانه ئه‌م سێ ئایه‌ته مه‌ككین، له‌م سێ ئایه‌ته‌دا دوو ڕووی سه‌رسوڕهێنه‌ر به‌دی ده‌كه‌ین سه‌ره‌ڕای ڕه‌وانبێژی ئایه‌ته‌كان به تایبه‌تی ئایه‌تی دووه‌میان:

١. له ڕووی هه‌واڵدانه‌وه له غه‌یبی دا هاتووه: ئه‌م سێ ئایه‌ته به تایبه‌تی دووه‌میان، هه‌واڵ له ڕووداوێكی نادیاری داهاتوو ده‌ده‌ن كه به گوێره‌ی ئه‌و كاته‌ی هاتنه خواره‌وه‌ی قورئانه‌وه داهاتووه نه‌ك به گوێره‌ی كات و سه‌رده‌می ئێمه، كه ئه‌ویش غه‌زای به‌در و شكست هێنانی كافره‌كانه، له‌و غه‌زایه‌دا له پاش ڕوودانی غه‌زای به‌در ئینجا هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له واتاو مه‌به‌ستی ئه‌م سێ ئایه‌ته تێگه‌یشتن.

٢. له‌ڕووی ژماره‌ییه‌وه: به مانگ (القمر) كه له شه‌وی (١٤)یدا به ئاسمانه‌وه ده‌ربكه‌وێت، ده‌وترێت (بدر) بڕوانه بۆ ئایه‌تی (٤٥) خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ (القمر: ٤٥) له‌م ئایه‌ته‌دا ئه‌م چه‌ند خاڵه به‌دی ده‌كه‌ین:

أ- هه‌روه‌ك به هه‌یڤ (القمر) له شه‌وی (١٤)دا ده‌وترێت (به‌در)، هه‌روه‌ها به‌و غه‌زا گه‌وره‌یه‌ش كه له ساڵی (١٤)یه‌می پێغه‌مبه‌رایه‌تییدا ڕوویدا ده‌وترێت غه‌زای به‌در، قورئان له شه‌وی (١٧)ی ڕه‌مه‌زاندا هاته خواره‌وه، غه‌زای به‌دریش له ڕۆژی (١٧)ی ڕه‌مه‌زاندا ڕوویدا ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ﴾، له‌به‌رئه‌وه‌ی هه‌ر له یه‌كه‌م ڕۆژی پێغه‌مبه‌رایه‌تی و دابه‌زینی وه‌حییه‌وه تا ڕۆژی ڕوودانی غه‌زای به‌در (١٤) ساڵی ته‌واوه (الله أكبر) له‌و موعجیزه ناوازه‌یه.

ب- ژمارەی پیتەکانی ئایەتەکە بەبێ دووبارە بوونەوە (١٤) پیتە کە ئەمانەن: (س، ی، هـ، ز، م، ا، ل، ج، ع، و، ن، د، ر)، سەرەڕای ئەوەش دەبینین کە فاصیلەی ئایەتەکە گشت پیتەکانی وشەی (البدر) تێیدا کۆبۆتەوە کە ئەویش بریتییە لە وشەی (الدبر).

ج- هەروەك ژمارەی پیتەکانی ئایەتەکە (١٤) پیتە هەروەها ژمارەی شەهیدەکانی غەزای بەدریش (١٤) شەهیدە.

د- ئەگەر هەر لەسەرەتای سوورەتی (القمر)ەوە گشت ئەو ئایەتانەی سوورەتەکە بژمێرین کە هەر سێ پیتەکەی وشەی (بدر)یان تێدا کۆبۆتەوە، تا دەگەین بە کۆتایی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموویت: ﴿سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ دەبینین کە ژمارەیان (١٤) ئایەتە، کەواتە ئایەتی (٤٥) چواردەیەمینیانە ئەو ئایەتانەی کە هەر سێ پیتی (ب،د،ر)ی تێدا کۆبووەتەوە هەر لە سەرەتای سوورەتی (القمر)ەوە تا ئەم ئایەتە ئەمانەن ئایەتی (٤، ٧، ٩، ١٠، ١٨، ٢٣، ٢٦، ٢٩، ٣٦، ٣٧، ٣٨، ٤٢، ٤٥).

لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە گەورانە بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شادومانییەکی زۆر کاریگەر بۆ بڕواداران وە بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەت دەکەنەوە خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خوا دانپیانانێن.

***





## موعجیزەی دەستەواژەی هاوڕێیانی بەهەشت و هاوڕێیانی ئاگر لە قورئاندا وشەی (صعب)و پەیوەندییان پێکەوە:

ئەم سەرنجە یەك تابلۆیەو ئەم خاڵانە لەخۆی دەگرێت:

١. دەستەواژەی (أصحاب الجنة) ١٣ جار لە قورئاندا هاتووە، ١٢ جاریان بە واتا بنەڕەتییەکەی خۆی واتە: بە واتای ئەهلی بەهەشت هاتووە، دەستەواژەی (أصحاب النار) ٢٠ جار لە قورئاندا هاتووە، ١٩ جاریان بە واتا بنەڕەتییەکەی خۆی واتە: بە واتای ئەهلی دۆزەخ هاتووە، لەمەوە دەردەکەوێت کە هەروەك تەنها یەك جار دەستەواژەی (أصحاب الجنة) بە واتا بنەڕەتییەکەی خۆی نەهاتووە، بە هەمان شێوە دژەکەیشی کە (أصحاب النار)ە تەنها یەك جار بە واتا بنەڕەتییەکەی خۆی نەهاتووە.

٢. لەناو گشت دەستەواژەکانی (أصحاب الجنة)دا، ئەو تاکە دەستەواژەیەی کە واتاکەی بنەڕەتی نییە لە ڕووی هاتنیەوە لە قورئاندا دواهەمینیانە دەکەوێتە ئایەتی (٣١)ی سوورەتی (المدثر)ەوە بە واتای چەند فریشتەیەکی سەرپەرشتیاری ئەهلی دۆزەخ هاتووە، یان هەندێکی تر لە تەفسیر نووسانی قورئان دەڵێن بە واتای چەند کۆمەڵە فریشتەیەکی سەرپەرشتیاری ئەهلی دۆزەخ هاتووە.

٣. ئەو (أصحاب الجنة)ەی واتاکەی بنەڕەتی نییە و ئەو (أصحاب النار)ەی کە واتاکەی بنەڕەتی نییە، هەردووکیان دەکەونە هەمان جوزئەوە کە جوزئی بیست و نۆهەمە.

٤. (١٢) جار دەستەواژەی (أصحاب الجنة) بە واتای ئەهلی بەهەشت هاتووە هێندەی ژمارەی (١٢) نەقیبە بڕوادارەکەی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) و، هێندەی ژمارەی (١٢) حەوارییەکەی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) و هێندەی ژمارەی (١٢) نەقیبە بڕوادارە مەدینەییەکەی موحەممەد پێغەمبەر ﷺ لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا و، هێندەی ژمارەی (١٢) بڕوادارە مەدینەییەکەی پەیمانی یەکەمی عەقەبە لە ساڵی دوانزەهەمی پێغەمبەرایەتی دا. (١٩)جار

دەستەواژەی (أصحاب النار) بە واتای ئەهلی دۆزەخ هاتووە هێندەی ژمارەی فریشتە سەرپەرشتیارەکانی ئەهلی دۆزەخ، یان هێندەی (١٩) کۆمەڵە فریشتە سەرپەرشتیارەکانی ئەهلی دۆزەخ.

٥. لە ئایەتی (١٢)ی سوورەتی (المائدە) دا دەستەواژەی ﴿ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗا﴾ هاتووە، کە مەبەست پێی (١٢) نەقیبەکەی موسا پێغەمبەرە (سەلامی خوای لەسەر بێت) بەسەر بەنی ئیسرائیلەوە، ژمارەی پیتەکانی دەستەواژەی ﴿ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗا﴾ ١٢ پیتە ئەوەندەی ژمارەی نەقیبەکان.

٦. لە قورئاندا (١٢) جار وشەی (الإنجيل) هاتووە، هێندەی ژمارەی حەوارییەکانی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە هەڵگری پەیامی ئاسمانی کتێبی (الإنجيل) بوون، بە تایبەتی دوای بەرزکردنەوەی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کتێبی (الإنجيل) تەنها یەك کتێبەو نابێت بە ناوی هیچ کەسێکەوە بێت چونکە کتێبی خوایە.

٧. وشەی (صحب) کە لە هەندێك لە سەڵەواتەکاندا هاتووە واتای هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگەیەنێت، وشەی (صحب) بە حیسابی جوممەل دەکاتە (١٠٠) ئەوەندەی ژمارەیساڵەکانی سەدەی یەکەمی کۆچی کە صەحابەکانی پێغەمبەری ﷺ تێدا ژیاوە، لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانانەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، ماوەی ژیانی صەحابەکان ١٠٠ ساڵی تەواوە واتە لە دوای ساڵی (١٠٠) کۆچییەوە یەك صەحابەشیان لە دنیادا نەماوەتەوە، دواهەمین صەحابە لە ساڵی (١٠٠) کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە. بەڕاستی بە تەنها ئەو موعجیزەیە بەسە کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاست و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی ئیسلام کە قورئانی پیرۆزە.



## ٦٠ خانەکانی پێست هەڵگری بیرەوەرین:

زانایان ئاشکرایان کرد خانەکانی پێست بۆ ماوەیەکی درێژ بیرەوەری هەڵدەگرن وەك ڕووداوەکان و ئەو دەنگانەی لە دەوروبەرمانن دەتوانرێت ئەو بیرەوەرییانە لە دواییدا بهێنرێنەوە، پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ئاماژەی بەم ڕاستییە کردووە کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (فصلت: ٢١) واتە: تاوانبارەکان گلەییان لە پێستی خۆیان کردو وتیان بۆچی شایەتیتان دژی ئێمەدا؟ ئەوانیش وتیان: خوای گەورە ئێمەی هێناوەتە قسە کە هەموو شتێکی تری هێناوەتە قسە هەر ئەو زاتە یەکەمجار ئێوەی دروست کردو بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە داوا لە خوای پەروەردگار دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە بکاتە ڕووناکی بۆ بڕواداران و بەهانەبڕێکیش بێت بۆ هەموو ئەو مولحیدانەی کە ئەم قورئانە ڕەت دەکەنەوە.



## ٦١ دەرکەوتنی کۆمەڵێك نهێنی گەورە لەبارەی عیسا پێغەمبەرو دایکی لە قورئانی پیرۆزدا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ (مریم: ٣٤).

لەسەر ئەم ئایەتە شەش تابلۆ دەخەینە ڕوو کە ئەمانەن:

١. ناوی مەریەم سێ جار لە سوورەتی مەریەم دا هاتووە کە دواهەمینیان دەکەوێتە ئایەتی (٣٤)ەوە لە قورئاندا. لە قورئاندا (٣٤)جار ناوی مەریەم هاتووە دوا ئایەت لە سوورەتی مەریەم دا کە وشەی مەریەمی تێدا هاتبێت، ژمارەی پیتەکانی =٣٤ پیت کە ئەوەندەی ژمارەی هاتنی ناوی مەریەمە لە قورئاندا.

٢. ئایەتی (٣٤) دوا ئایەتە لە سوورەتی مەریەم دا کە ناوی مەریەمی تێدا هاتبێ، ڕەنووسی ئایەتەکە =٣٤ کە ئەوەندەی ژمارەی وشەی مەریەمە لە قورئاندا.

٣. ناوی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) تەنها یەك جار لە سوورەتی مەریەم دا هاتووە کە ئەویش دەکەوێتە ئایەتی (٣٤)ەوە، پیتەکانی وشەی (عیسی) بریتین لە (ع، یـ، س، ی)، ژمارەی گشت ئەو ئایەتانەی سوورەتی مەریەم کە پیتەکانی وشەی (عیسی)یان تێدا هاتووە، هەر چوار پیتەکەی بە ئەلفەکەشەوە (چ ئەلفی مەقصورە بێت یان ئەلفی مەمدودە)، واتە چ (ی) یان (ا) =٣٣ ئایەت کە ئەمانەن ئایەتی (٤، ٧، ١٠، ١١، ١٥، ٢١، ٢٣، ٢٤، ٢٥، ٢٦، ٣٢، ٣٤، ٣٦، ٣٨، ٤٢، ٤٣، ٤٥، ٤٧، ٤٨، ٤٩، ٥٠، ٥٤، ٥٨، ٥٩، ٦٢، ٦٥، ٧٢، ٧٥، ٧٩، ٨٢، ٨٣، ٩٣، ٩٦) کە ژمارەیان ئەوەندەی تەمەنەکەی دەبێت.

٤. ئەگەر بەهای خانەکانی ژمارە (٣٣) دەستنیشان بکەین واتە: ژمارە (٣٣) لە (٣، ٣٠) پێکدێت، ژمارە (٣) لە خانەی یەکاندا و ژمارە (٣٠) لە خانەی دەیاندا بەرامبەری دوو پیتن. پاشان ئەو دوو پیتە بنووسین کە لە حسابی جوممەلدا هەریەکەیان بەهایەك لەو دوو بەهایەی هەیە، کە ئەوانیش بریتین لە (ج، ل)، پاشان گشت ئەو ئایەتانەی سوورەتی مەریەم سەرژمێر بکەین کە هەردوو پیتی (ج، ل) یان تێدایە، دەبینین ژمارەیان =٣٣ ئایەت، کەواتە ژمارەی ئەو ئایەتانەی کە پیتی (ج، ل)یان تێدایە = ٣٣ ئایەت هێندەی تەمەنی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت).

٥. زنجیرەی سوورەتی مەریەم لە (مصحف)دا = ١٩ سوورەتی مەریەم بە (کهیعص) دەستپێدەکات، پیتی (ع) یەکێکە لە پیتەکانی ئەم ئایەتە، لە ڕوویەکی ترەوە دەبینین کە (١٩)هەمین پیتی هیجائی لە زنجیرەی پیتە هیجائییەکاندا بریتییە لە پیتی (ع)، پیتی (ع)یش یەکەم پیتە لە وشەی (عیسا)دا ژمارەی گشت عەینەکان لەسەرەتای سوورەتی مەریەمەوە تا کۆتایی وشەی (عیسا)= ٣٣ ع، ئەوەندەی تەمەنەکەی بە ساڵ. (الله أکبر) لەو موعجیزە گەورەیەی قورئان، بەڕاستی ئەم قورئانە



پڕە لە زانیاری و وردەکاری هەروەها ژمارەی گشت عەینەکان لە سەرەتای سوورەتەکەوە تا کۆتایی ئەو ئایەتەی وشەی (عیسا)ی تێدایە = ٣٣ع. ناوی (عیسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) ٢٥جار لە قورئاندا هاتووە نۆزدەهەمینیان دەکەوێتە ئەم ئایەتەی سوورەتی مەریەم کە ئایەتی (٣٤)ە، قورئانی پیرۆز موعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەیە تا ڕەوڕەوەی ڕۆژگار بەرەو پێشەوە بڕوات، زیاتر وردەکاریەکان و زانیارییە ڕاستەقینەکانی قورئان بۆ هەموو جیهان ئاشکرا دەبن، ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزە خوای گەورەی تاك و تەنهایە.



## ٦٢ موعجیزە پایەدارەکانی سوورەتی (ق):

چەندین نهێنی وردەکاری کە لە سوورەتی (ق)دا دەرکەوتوون:

**تابلۆی یەکەم:** سێ پەیوەندی بە ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (ق)وە:

١. سورەتی (ق) ٤٥ ئایەتە یەکێکە لەو دوو سوورەتەی قورئان کە تەنها بەناوی پیتێك لە پیتەکانی زمانی عەرەبییەوە ناونراون بریتییە لە سوورەتی (ق)، پیتی (ق) (إسم الحرف)ەکەی بریتییە لە (قاف) کۆی زنجیرەی هیجائی پیتەکانی وشەی (قاف) = ٢٣+١+٢١=٤٥ ئەوەندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (ق).

٢. لە سوورەتی (ق)دا تەنها دووجار وشەی (القران) هاتووە، یەکێکیان دەکەوێتە ئایەتی (١)ی سوورەتی (ق)ەوە، ئەوی تریان دەکەوێتە ئایەتی (٤٥) سوورەتی (ق)ەوە، وشەی (قرأن) بەبێ ئەلف و لام وشەیەکە بەپیتی (ق) دەستپێدەکات ئەو دوو ئایەتەی وشەی (القرأن)یان تێدا هاتووە لە سوورەتی (ق)دا ئەمانەن:

أ- خوا دەفەرموێت: ﴿قٓ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ﴾ (ق: ١).

ب- خوا دەفەرموێت: ﴿نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَقُولُونَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾ (ق: ٤٥).

ئەنجامی لێکدانی ڕەنووسی هەردوو ئایەتەکە = ١×٤٥=٤٥ ئەوەندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (ق)، لە ڕوویەکی ترەوە دەبینین کە گشت ئەو پیتانەی وشەی (القرأن) پێکدەهێنن (٤٥) جار، لە فاصیلەکانی سورەتەکەدا دووبارە بوونەتەوە، واتە: پیتەکانی (هەمزە، ل، ق، ر، ا، ن) بە هەموویانەوە (٤٥) جار هاتوون لە فاصیلەکانی سوورەتی (ق)دا.

٣. سوورەتی (ق) یەکێکە لەو سوورەتانەی کە بە پیتە (مقطعة)کان دەستپێدەکات، چونکە بە (حرف مقطع)ی (ق) دەستپێدەکات، ئەو سوورەتانەی کە بە (حروف) ی (مقطعة) دەستپێدەکەن پەیوەندییان بە ژمارە (١٩)ەوە هەیە سوورەتی (ق)یش یەکێکە لەو سوورەتانەی (١٩)هەمین پیتی هیجائی لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە پیتی (ع).

ژمارەی پیتی (ع) لە سوورەتی قافدا =٤٥ ع، کەواتە سوورەتی قاف ٤٥ جار پیتی نۆزدەهەمی تێدا هاتووە ئەوەندەی ژمارەی ئایەتەکانی.

تابلۆی دووەم: توێژینەوەیەکی ژمارەیی لەسەر ئایەتی (٢٢)ی سوورەتی قاف:

لەناو (٢٩) پیتە هجائییەکەی زمانی عەرەبیدا (٢٢) هەمین پیتیان بریتییە لە پیتی قاف، واتە: زنجیرەی هیجائی پیتی قاف بریتییە لە (٢٢)، ئەگەر لە ناو سوورەتی قاف دا سەرنجی ئەو ئایەتە بدەین کە ڕەنووسەکەی وەکو زنجیرەی هیجائی پیتی قاف وایە، واتە: (٢٢)ە ئەوا چەند نهێنییەك بەدیدەکەین لە پێشدا ئایەتەکە دەخەینە ڕوو، خوا دەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾ (ق:٢٢)

١. زانیمان زنجیرەی هیجائی پیتی قاف =٢٢ دەبینین ژمارەی پیتەکانی ئایەتەکە بەبێ دووبارە بوونەوە =٢٢ پیت.

٢. ژمارەی گشت پیتەکانی ئایەتەکە = ٤٥ ئەوەندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی قاف.

٣. نۆزدەهەمین پیتی هیجائی بریتییە لە (ع)، ژمارەی عەینەکانی سوورەتەکە هەرە لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئایەتی (٢٢) = ٢٢ ع.

٤. ئەگەر بەهای خانەکانی ڕەنووسی ئایەتەکە کە ژمارە (٢٢)ە وەربگرین، واتە: ژمارە (٢٢) لە خانەی یەکاندا ژمارە (٢)و، لە خانەی دەیاندا لە ژمارە (٢٠) پێکدێت، ئینجا ئەو دوو پیتە ئەبجەدییە دیاری بکەین کە ئەو بەهایانەیان هەیە، پاشان گشت پیتەکانی ئەو وشانە کۆبکەینەوە کە ئەو دوو پیتەیان تێدایە یان یەکێك لەو دوو پیتەیان تێدایە ئەوا ژمارەی پیتەکانی ئەو وشانە = ٢٢ پیت بەم شێوەیە:

أ- ڕەنووسی ئایەتەکە = ٢٢

ب- بەهای خانەکانی = ٢+٢٠

ج- ئەو پیتە ئەبجەدییانەی کە ئەو دوو بەهایەیان هەیە = ب، ك

ئەو وشانەی لە ئایەتەکەدا پیتی (ب) یان (ك)یان هەردوو پیتی (ب، ك)یان تێدا هاتووە بریتین لەم وشانە {كُنتَ، فَكَشَفۡنَا، عَنكَ، غِطَآءَكَ، فَبَصَرُكَ} کە سەرجەمی پیتەکانیان = ٣+٦+٣+٥+٥=٢٢ پیت.

٥. لە ئایەتەکەدا دەستەواژەی ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ﴾ هاتووە ڕاستەوخۆ بەدواییدا دەستەواژەی ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾. دەستەواژەی ﴿فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ﴾ واتە: ئینجا ئێمە پەردەمان لەپێش چاوی تۆ لادا دەستەواژەی یەکەم واتاکەی هۆیە کە بۆ ڕوودانی دەستەواژەی دووەم. دەستەواژەی دووەم بریتییە لە ﴿فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ﴾ واتە: ئینجا ئەمرۆ چاوت تیژبینە.

ئەندازیار (عدنان الرفاعی) دەڵێت: لادانی پەردەی غەفڵەت لەپێش چاویدا هۆیەکە بۆ تیژبینی چاو.

ڕستەی هۆ: فَكَشَفۡنَاعَنكَغِطَآءَكَ = ١٤ پیت.

ڕستەی ئەنجام: فَبَصَرُكَٱلۡيَوۡمَحَدِيدٞ= ١٤ پیت.

پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

هەردوو ڕستەکە لە ژمارەی پیتدا یەکسانن مامۆستا نوعمان سەرگەتی لە کتێبی تابلۆ ناوازەکاندا دەڵێت: ئایەتەکە بە وشەی (لقد) دەستپێدەکات ڕاستەوخۆ لە دوای وشەی (لقد)ەوە تەنها ۲ ڕستە دەمێنێتەوە کە ۳ ڕستەی یەك لەدوای یەکن دووەم و سێهەمیان فای تەرتیبیان پێوەیە هەرسێ ڕستەکەش لە ژمارەی پیتدا یەکسانن

| ڕستەی هۆ | ڕستەی ئەنجامە بۆ یەکەم | ڕستەی ئەنجام |
|---|---|---|
| كُنتَ فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا | فَكَشَفۡنَا عَنكَ غِطَآءَكَ | فَبَصَرُكَ ٱلۡيَوۡمَ حَدِيدٞ |
| ١٤ پیت | ١٤ پیت | ١٤ پیت |

٦. ئایەتەکە کۆتایی بە وشەی (حدید) هاتووە وشەی (حدید) واتە: ئاسن، وشەی (حدید) بە حیسابی جوممەل= ٢٦.

حدید = ح+د+ی+د = ٨+٤+١٠+٤ = ٢٦ دەبینین کە گەردیلە ژمارەی ئاسنیش = ٢٦ ژمارەی پرۆتۆنەکانی هەریەکە لە گەردیلەکانی ئاسن = ٢٦ ژمارەی ئەلیکترۆنەکانی هەر گەردیلەیەکی ئاسن لە باری ئاساییدا = ٢٦.

پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە بەڕاستی ئەم قورئانە پیرۆزە موعجیزەیەکی گەورەیە.




## دەرکەوتنی شەش نهێنی زۆر گەورە لەبارەی ئایەتەکەی سوورەتی (الحجر) کە مەدحی سوورەتی (الفاتحه) دەکات:

بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ﴾ (الحجر: ٨٧).

لێرەدا (٧) خاڵ لەسەر ئەم ئایەتە هەیە کە ئەمانەن:

١. ئەگەر لەم ئایەتە وردبینەوە دەبینین کە ژمارەی وشەکانی لە ڕووی ڕێنووسەوە = ٧ وشە کە هێندەی ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (الفاتیحة)ن.

٢. ئایەتەکە وشەی (سبعاً)ی تێدا هاتووە کە واتای ژمارە (٧) دەگەیەنێت، هەر لە سەرەتای ئایەتەکەوە تا کۆتایی وشەی (سبعاً) حەوت وشەیە لەڕووی نەحوییەوە، واتە: وشەی (سبعاً) حەوتەمین وشەی نەحوییە لە ئایەتەکەدا ئەو وشانە بەڕیز ئەمانەن (و، ل، قد، ءاتی، نا، ك، سبعاً).

٣. ژمارەی پیتەکانی ئایەتەکە = ٣٧ پیت، هەروەها ژمارەی وشە نەحوییەکانی سوورەتی (الفاتحة) = ٣٧ وشە.

٤. وشەی (المثاني) ناو ئایەتەکە واتاکەی پەیوەندی بە ژمارە دووەوە هەیە (عاطف علی صله یبی)، نووسەر لە کتێبەکەیدا کە (أسرع الحسابين)ە دەڵێت: تەنها دووجار وشەی (المثاني) لە قورئاندا هاتووە، وشەی (المثاني) یەکێکە لە ناوەکانی سوورەتی (الفاتحة)، سوورەتی (الفاتحة) تاقە سوورەتێکە دووجار دابەزیبێتە خوارەوە، جارێك لە مەککەدا و جارێك لە مەدینەدا. لەگەڵ ئەوەشدا بە سوورەتێکی مەککی ناسراوە. ڕەنووسی ئەم ئایەتەی کە تاقە ئایەتێکە مەدحی سوورەتی الفاتحه بکات بە تایبەت = ٨٧، ئەو سوورەتانەی کە وشەی (مثاني) یان (المثاني)یان تێدا هاتووە تەنها دوو سوورەتن کە بریتین لە سوورەتی: (الحجر، الزمر) ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (الحجر بریتییە لە (٩٩) ئایەت، ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (الزمر) دەکاتە ٧٥ کۆی هەردووکیان = ٩٩+٧٥=١٧٤ دابەشی ژمارەی هەردوو سوورەتەکەی بکەین (١٧٤÷٢=٨٧) واتە ١٧٤= ٢× ٨٧.

٥. لە ئایەتەکانی سوورەتی (الحجر)دا وشەیەکی تێدایە کە یەکێکە لە ناوەکانی سوورەتی (الفاتحة)، کە ئەویش وشەی (المثاني)یە ژمارەی پیتەکانی وشەی (المثاني) = ٧ = ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی الفاتحة.

٦. وشەی (المثاني) کە ناوێکی سوورەتی (الفاتحة)یە، ئەگەر زنجیرەی گشت پیتەکانی لە ئایەتەکەدا وەربگرین پاشان کۆیان بکەینەوە دەبینین ئەنجامەکەیان= ١٤٠، پەیوەندی ئەمەش لەڕووی ژمارەوە بە سوورەتی (الفاتحة)ەوە بەم جۆرەیە:

لەبەرئەوەی وشەی المثاني واتاكەی پەیوەندی بە ژمارە دووەوە هەیە، كەواتە ئەگەر ڕەنووسی ئایەتەكانی سوورەتی (الفاتحة) بە توانی دوو كۆبكەینەوە ئەنجامەكەیان دەكاتە ١٤٠، بە هەمان شێوەش دووجای زنجیرەی پیتەكانی وشەی (المثاني) كە ٧ پیتە هەمان ئەنجام دەكات. بەڕاستی بە تەنها ئەو موعجیزە گەورەیە بەسە كە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاست و دروستی پەیامە پیرۆزەكەی ئیسلام كە قورئانی پیرۆزە.



## ٦٤ پاداشتی قەرزدان لە ڕێگای خوای گەورەو ئاشكرابوونی موعجیزەیەكی گەورە:

پاداشتی قەرزدان لە ڕێی خوا: ئەم سەرنجە لە یەك تابلۆ پێكدێت، بێگومان هەروەك ماڵ و سامان بەخشین لەپێناوی خوادا صەدەقەیە بەهەمان جۆر قەرزدانیش بەخەڵكی لە پێناوی خوادا صەدەقەیە، پێش ئەوەی بچینە سەرباسی ئایەتی (١٨)ی سوورەتی (الحديد) پێویستە فەرموودەیەك یان زیاتر لەبارەی قەرزدانەوە بهێنینەوە خوێنەری بەڕێز بڕوانە بۆ ئەم دوو فەرموودەیە:

* پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {رأيت مكتوباً على ساق العرش ليلة المعراج: الصدقة بعشر أمثالها والقرض بثمانية عشر مثلاً} واتە: بینیم بە پایەیەكی عەرشەوە نووسرا بوو لە شەوی بڵندبوونەوەدا كە پاداشتی صەدەقەیەك بە دەیەو پاداشتی قەرزدان لە ڕێی خوادا بە (١٨)یە.

* فەرموودەیەكی تریش لەم بارەیەوە: عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: {الصدقة بعشر أمثالها والقرض بثمانية عشر} رواه ابن ماجه حديث مرفوع.

که به وردی سەرنج لە قورئانی پیرۆز دەدەین دەبینین ئایەتێکمان دێتە بەردەست کە پەیوەندی بەم مەبەستەوە هەیە کە ئەویش ئەمەیە خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ (الحديد: ١٨).

واتە: بەڕاستی ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە ماڵ و سامان بە خێر و چاکە (صەدەقە) ئەدەن لە ڕێگای خوادا، قەرزیان داوە بە خوا بە قەرزێکی جوان و شیرین و بە ئیخلاسەوە، ئەوەی کە ئەیدەن چەند قات دەکرێتەوە بۆیان ئەوانە پاداشتێکی بەنرخی بەڕێزیان بۆ هەیە کە بەهەشتە. ئەگەر سەرنج لە ئایەتەکە بدەین دەبینین کە سێ پەیوەندی بە پاداشتی چەند قاتی قەرزەوە لە ئایەتەکە بەدی دەکرێت:

١. هەروەك پاداشتی قەرزدان لەبەر خوا (١٨) ئەوەندەی خودی قەرزەکەیە هەروەها ڕەنووسی ئایەتەکەش (١٨)یە.

٢. ژمارەی وشە نەحوییەکانی ئایەتەکە (١٨) وشەیە کە یەك لەدوای یەك ئەمانەن {إن المصدقين، والمصدقات، و، اقرض، وا، الله، قرضاً، حسناً، يظعف، ل، هم، و، ل، هم، اجر، كريم}.

٣. دەربڕینی قورئانی ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ لە ئایەتەکەدا واتاکەی پەیوەندی بە کردەوەی قەرزدانەوەکەوە هەیە، پاداشتی ئەم کردەوەیە دەربڕینی قورئانی ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ دەیگرێتەوە، پاداشتی قەرزدان یەك بە هەژدەیە ژمارەی پیتەکانی ئەو دەربڕینە قورئانیەی کە باسی پاداشتەکە دەکات واتە: ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾ ١٨ پیت، هێندەی ڕێژەی پاداشتەکە ئایەتەکە باسی صەدەقە و قەرزدانیشی تێدایە، ئەوەی قەرز دەدات لەڕێی خواو پاشان وەریناگرێتەوە هەرچەندە بۆی بهێننەوە ئەوا قەرزدانەکەیش هەر صەدەقەیەو واتای ئایەتەکەی بەسەردا دەچەسپێت.



## پەیوەندی نێوان عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) لەگەڵ هەنگ دا و ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی زانستی:

موعجیزەی دروستبوونی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) بەبێ باوك، بەهەمان شێوە مێش هەنگ بەبێ باوك دروست دەبێت، لەم بابەتە باسی دروستبوونی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەربێت) بەبێ باوك دەکەین، چۆن خوای گەورەو میهرەبان بەهۆی زانستەوە بۆ ئێمەی روون کردۆتەوە، لە رێگای دروستبوونی نێرەی مێش هەنگوین کە تەنها لە هێلکەی دایك دروست دەبێت بەبێ بەژداری کردنی باوك، پەیوەندی نێوان عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) و هەنگ بەهۆی موعجیزەی ژمارەیی لە قورئانی پیرۆزدا کە ژمارە (١٦)یە باس دەکەین. سەرەتا باسی نێرەی مێش هەنگوین دەکەین لە قورئان و زانست پاشان باسی پێغەمبەر (عیسا) دەکەین لە قورئانی پیرۆز، بە شێوەیەکی زانستی روونی دەکەینەوە:

١. مێشهەنگوین لە قورئان: تەرتیبی سوورەتی (النحل) لە قورئانی پیرۆزدا (١٦)یە.

٢. ئەو ئایەتەی کە باسی (النحل) کراوە ژمارەی پیتەکان هەتا وشەی (النحل) بەویشەوە (١٦) پیتەو، ژمارەی وشەکانی ئەم ئایەتە (١٦)یە، ئەگەر (واوی عەطف) بە وشەیەك دابنێین: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ (النحل: ٦٨).

٣. ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی (النحل: (١٢٨) ئایەتە کە چەندجارەی (١٦) یە، ١٦×٨= ١٢٨.

**(مێش هەنگوین) و زانستی تازە**

١. ژمارەی کرۆمۆسۆمەکانی مێیەی مێشهەهەنگ = ١٦ جوتە.

٢. ژمارەی کرۆمۆسۆم لە نێرەی مێشە هەنگ (١٦) تاکە واتە: نیوەی مێیە بەمە جیاوازە لەگەڵ هەموو زیندەوەران، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە نێرەی مێش هەنگ

دروست دەبێت لە هێلکەیەکی نەپیتێنراو واتە: بێ باوك وە بەم کردارە دەڵێن: زۆربوونی (العذري) بە یەکێك لەم ڕێگایانە:

یەکەم/ یەك شاژن: لە هەر شانەیەك تەنها یەك شاژن هەیە هەڵدەستێت بە دانانی ٢٠٠-٢٥٠ هەزار هێلکە، واتە ڕۆژانە ١٥٠٠ هێلکە دادەنێت کە زۆربەیان پیتێنراوە بە تۆوە دەبن بە مێیەی مێشهەنگوین، کە هەنگوین دروست دەکەن، ژمارەیەکی کەم لە هێلکەکان نەپیتێنراوە پێویستە وەك زیندەوەرەکانی تر هیچ دروست نەکات بەڵام بە قودرەتی خوای گەورە و میهرەبان دەبن بە نێرەی مێشههەنوین.

دووەم/ لە ڕێگەی شاژنی درۆزن کاتێك شاژن دەمرێت یان بزر دەبێت بە هەر هۆیەك مێیەکانی مێش هەنگ هەڵدەستن بە دانی خۆراکی پاشای (الغذاء الملکی) بە یەکێك لە مێیە کارکەرەکان بەم خۆراکە هێلکەدانی گەشە دەکات هەڵدەستێت بە دانانی هێلکەی نەپیتێنراو کە دەبێتە نێرەی مێش هەنگوین کە (١٦) کرۆمۆسۆمی تاکی هەیە، واتە: بێ باوك دروست بووە.

٣. ئەو ماوەی کە شاژنی درۆزن دەیخایەنێت تا هێلکەدانی پێبگا و دەست بە دانانی هێلکەی نەپیتێنراو بکات ٦-٢٦ ڕۆژ، واتە: بە تێکڕای ١٦ ڕۆژ دەخایەنێت، وەکو پێشتر باسمان کرد کە هێلکەی نەپیتێنراو دەبێتە نێرەی مێشهەنگوین و تاکە ئیشی بریتییە لە پیتاندنی شاژن.

### پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە قورئاندا:

١. پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە قورئانی پیرۆزدا ناوی (٣٣) جار هاتووە بەڵام بە شێوەی جیاواز وەك (ابن مریم، المسیح، عیسی، المسیح ابن مریم) ئەم ژمارەیەش یەکسانە بەو ماوەی کە (عیسا) لەسەر زەویدا ژیاوە واتە: ٣٣ ساڵ، بەڵام ناوی بە تەواوی (عیسی ابن مریم) ١٦ جار هاتووە جا بڕوانە ئەم موعجیزە

گەورەیە پەیوەندییەکی ئاشکرای هەیە لەگەڵ کرۆمۆسۆمەکانی نێرەی مێشهەنگوین کە ١٦ یە.

٢. سوورەتی مەریەم دەکەوێتە جوزئی (١٦) لە قورئانی پیرۆزدا وە چیرۆکی عیسا و دایکی کە مەریەمە لە ئایەتی (١٦) لەم سوورەتە دەست پێدەکات بە وتە پیرۆزەکەی خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەی دا دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا﴾ (مريم: ١٦) جا سەیری ئەم پەیوەندییە دەقیق و جوانە بکە ناوی پیرۆزی خوا (الرحمن) لە قورئان و پەیوەندی بەم بابەتە وشەی (الرحمن) لە سوورەتی مەریەم (١٦)جار دووبارە بۆتەوە لە ئایەتی ١٨ تا ئایەتی ٩٦ کە ئەم ژمارەیەش چەندجارەی ١٦یە: ٦×١٦= ٩٦ جا ئەگەر وردبینەوە لە حیکمەتی دووبارەبوونەوەی ناوی (الرحمن) کە یەکێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە وە بە ژمارەیەك کە لە هەموو سوورەتەکانی تری قورئانی پیرۆزدا زیاتر هاتووە وشەی (الرحمن) ٥٧ جار لە قورئان هاتووە وە ئەم سوورەتە بە تەنها ١٦ جار واتە لە ٣٠٪ لە کۆی گشتی لەبەرئەوەی (والله أعلم) لەم سوورەتە ڕەحمەتی بۆ مرۆڤایەتی بەدی دەکرێت بە ڕێنیشاندان بۆ عەقیدەیەکی ڕاست و دروست کە دەبێتە مایەی ڕەزامەندی خوای گەورە و سەرفرازی لە دنیا و ڕۆژی دوایی.

لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیەی قورئان بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شادوومانییەکی زۆر کاریگەر بۆ بڕواداران وە بەهانەبڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەت دەکەنەوە خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خوا دانپیانانێن.

***

## ٦٦ موعجیزەیەکی ناوازە لە سوورەتی (الدهر):

ئەم سەرنجە لە یەك تابلۆ پێکهاتووە: سوورەتی (الدهر) دوو ناوی هەیە کە بریتین لە (الإنسان)، (الدهر) بێگومان (الدهر) واتای زەمانە ڕۆژگار دەگرێتەوە واتای تریش دەگرێتە خۆی ساڵیش بەشێکە لە زەمانە، ڕۆژگار، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {من صام رمضان ثم أتبعه ستا من شوال كان كصيام الدهر} رواه مسلم. واتە: هەرکەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و پاشان شەش ڕۆژی مانگی شەوالیش بەدویدا بگرێت وەك ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بێت. لەم فەرموودەیەدا مەبەست لە وشەی (الدهر) ساڵەکەیە بە کاملی کەواتە یەکێك لە واتاکانی وشەی (الدهر) بریتیە لە ساڵ. چ ساڵی قەمەری یان ساڵی شەمسی بێت بۆ ڕوونتر تێگەیشتن لە فەرموودەکە بڕوانە بۆ ئەم کردارە بیرکارییە:

ساڵ = ١٢ مانگ

مانگ = ٣٠ ڕۆژ بە گشتی

خێریش لە ئەنجامدانی کردەوەی چاکەدا یەك بە دەیە:

کەواتە: مانگی ڕەمەزان خێرەکەی = ژمارەی ڕۆژەکانی ×١٠ = ٣٠×١٠ = ٣٠٠ ڕۆژ ئەوەندەی دە مانگ

٦ ڕۆژی شەوال خێرەکەی = ٦×١٠ = ٦٠ ڕۆژ ئەوەندەی دوو مانگ کۆی گشتی = ٣٠٠+٦٠ = ٣٦٠ ڕۆژ ئەوەندەی پاداشتی ڕۆژووی یەك ساڵ، بێگومان ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی قەمەری = ٣٥٥ = نزیکەی ٣٦٠ ڕۆژ هەروەها ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی شەمسی = ٣٦٥ = نزیکەی ٣٦٠ ڕۆژ، واتە: ژمارە ٣٦٠ دەکەوێتە نێوان (٣٥٥) و (٣٦٥)ەوە.

وتمان وشەی (الدهر) واتای ساڵیش دەگەیەنێت چ ساڵی شەمسی بێت یان ساڵی قەمەری ئەگەر لە سوورەتی (الدهر) بکۆڵینەوە دەبێت کە وشەی (إنا) لەڕووی نەحوییەوە بە دوو وشە بژمێرین چونکە لە (إن، نا) پێکهاتووە دەبێت وشەی (إما) بە

یەك وشە بژمێرین لەناو سوورەتەکەدا چونکە بۆ تەقسیمە بەڵام وشەی (إنما) دوو باری هەیە یەکێکیان ئەوەیە کە وشەی (إنما) بە یەك وشە بژمێرین چونکە ئامرازی (حصر)ە، ئەو کاتە کۆی ژمارەی وشەکانی سوورەتەکە لە ڕووی نەحوییەوە = ٣٦٥ وشە هێندەی ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی شەمسی (بسیطة)، لەباری دووەمدا خۆ ئەگەر وشەی (إنما) بە دوو وشە بژمێرین لەسەر ئەو بنچینەیەی کە وشەی (إن) حرف توکید بێت (ما) حرف زائدە کافە عن العمل) بێت، ئەوا کۆی ژمارەی وشەکانی سوورەتی الدهر = بە ٣٦٦ وشە هێندەی ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی شەمسی پڕ سوورەتی (الدهر) وشەی (شمسا)ی تێدا هاتووە، بەڵام وشەی (قمر)ی تێدا نەهاتووە بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە ئەم قورئانە سوپاس بۆ خوای گەورە.

##  کۆمەڵێك ئیعجازی ناوازەی ژمارەیی لە قورئاندا:

وشەی ڕۆژ و مانگ و ساڵ، ساڵ: بریتییە لە سوڕانەوەی زەوی بەدەوری (خۆر)دا بۆ یەك جار لەو ماوەیەدا زەوی ٣٦٥ جار بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو، مانگیش فریای دوازدە خول ئەکەویَ بە دەوری زەویدا، وشەی (یوم، یوما) واتە: بە تاك ٣٦٥ جار هاتووە، لە قورئاندا وشەی (شهر) بە تاك ١٢ جار دووبارە بۆتەوە، هەردووك پێغەمبەر (عیساو ئادەم) سەلامی خوایان لەسەر بێت بە موعجیزە دروست بوون، ئادەم بێ باوك و بێ دایك عیسا بێ باوك ناوی هەر یەکێکیان (٢٥)جار هاتووە، لە قورئاندا هەردووك پێغەمبەر (یونس و ئەیوب) (سەلامی خوایان لەسەر بێت) دووچاری ناڕەحەتی جەستەیی بوون هەریەکەی (٤)جار ناویان هاتووە لە قورئاندا.



## ٦٨ ئیعجازێکی درەوشاوەی ژمارەیی قورئان لەبارەی ئەولیاو خەوبینینی باش:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ۝٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ۝٦٣ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ (یونس: ٦٢-٦٤) واتە: ئاگاداربن ئەوانەی کە دۆستی خوان ئەوا حاڵیان وای لێدێت کە لە هیچ شتێکدا ترس و بیمیان بەسەردا نایەت و بۆ نەمانی هیچ شتێك خەفەت ناخۆن و زویر نابن، لە ڕۆژی قیامەتدا نەترسیان دێت بەسەردا لە سزاو خەفەتباریش دەبن لە فەوتانی شتێك، ئەولیای خوا ئەوانەن کە ئیمانی دامەزراویان هەیەو لە خوا دەترسن و لە کوفر و تاوان و کاری پەستی جیهان خۆیان دەپارێزن، ئەو دۆستانەی خوا لە ماوەی ژیانی دنیادا مژدەی باشیان دەدرێتێ بەهۆی موکاشەفاتی ڕۆحی و ئیلهاماتی ئیلاهی و خەوبینینی باشەوە.

هەروەها لە دنیاو لە کاتی سەرەمەرگدا مژدەیان پێدەدرێت کە لە ڕۆژی قیامەتدا فریشتەی ڕەحمەت دێن و هەواڵیان پێدەدەن، کە ئێوە ئیتر ئازار نابینن و بە هەموو جۆرێك ڕزگاربوون. لە ئایەتی (٦٤)ی سورەتی یونس لە ئایەتەکەدا دەستەواژەی ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ چەند مانایەك دەگەیەنێت.

خوێنەری بەڕێز: پێش ئەوەی بچینە خزمەت ئایەتەکە فەرموودەیەکی پێغەمبەریش ﷺ هەیە کە هەردووك پێشەوایان بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

* لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الرؤيا الصالحة جزءُ من ستة وأربعين جزءاً من النبوة) متفق علية، وایە: خەونی باش بەشێکە لە ٤٦ بەشی پێغەمبەرایەتی و وەحی.



خوێنەری بەڕێز: دەچینەوە خزمەت ئایەتەکەی سورەتی یونس ئایەتی ٦٤ بە گوێرەی وشەی (البشری) کە گرنگترینیان خەوی باشە، موسڵمانێك دەیبینێت بەخۆیەوە یان موسڵمانێکی تر خەو بە موسڵمانی یەکەمەوە دەبینێت لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ بە پلەی یەکەم (أولیاء) واتە: وەلییەکان خەونی باش دەبینن یان پێیانەوە دەبینرێت، وەلییەکان زۆرتر خەونی باش دەبینن ئەگەر سەرنجی ئایەتی (٦٤)ی سورەتی (یونس) بدەین، پاشان لە هەریەکە لە ئایەتی (٦٥)ی سورەتی (الکهف)و ئایەتی (٤)ی سورەتی (سجدە) ئەوا ئەم خاڵانەی خوارەوە بەدی دەکەین:

یەکەم: هەروەك خەونی باش (الرؤیا الصالحة) بەشێکە لە (٤٦) بەشی نبوەت بەشێکە لە (٤٦) بەشی وەحی پێغەمبەرایەتی دەبینێت، کە ئایەتی خەونی باش واتە: دەستەواژەی ئایەتی ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ی سورەتی (یونس)یش (٤٦)ی ئایەتی سورەتی (یونس)ە، جا هەروەك خەوی باش بەشێکە لە (٤٦) بەشی نبوەت ئایەتەکەی سورەتی (یونس)یش ئایەتێکە لە (٤٦) ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (پێغەمبەر یونس).

دووەم: (ولی) کە واتاکەی دۆستی خواو ڕوو لە خوا دەگەیەنێت جەمعەکەی بریتییە لە (أولیاء)، مادام وەلییەکان خەونی باش زۆرتر دەبینن یان زۆرتر پێیانەوە دەبینرێت، ئەوا پەیوەندی لەنێوان خەونی باش و (وەلی)دا بەهێزە، وشەی وەلی بە حیسابی ئەبجەدی دەکاتە ٤٦: وەلی+ل+ی=٦+٣٠+١٠= ٤٦.

سێیەم: لە سورەتی (یونس)دا تەنها یەك جار ژمارە (یەك) هاتووە بێگومان ئەویش بە عەرەبی هاتووە کە بریتییە لە وشەی (واحدة)، کە دەکەوێتە ئایەتی (١٩)ەوە لە دەستەواژەی (أمة واحدة) دا، جا ئەگەر لەم ئایەتەوە لەلای ڕاستەوە بەرەو لای چەپ ئایەتەکانی سورەتی (یونس) بژمێرین و ئەم ئایەتەی کە وشەی (واحدە) تێدایە گەر ئایەتی یەك بێت لە ژماردندا، ئەوا ئایەتی خەونی باش واتە: ئایەتی ﴿لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ﴾ (٤٦)ەمین ئایەت دەبێت لە ژماردندا.



شایەنی باسە سەرەڕای ئەوەی کە ئایەتی ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ﴾ ئەم خاڵانەی تێدا بەدیدەکرێت ڕەنوسەکەی (٦٤)ە و خۆیشی (٦٤) پیتە، ئەمەش پشتگیری واتای ئایەتی ﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ﴾ دەکات واتە: پشتگیری ئەو ڕەنووسەی قورئان دەکات کە ئێستاو لەمەوپێش لە مەصحەفەکاندا بووە.

چوارەم: وشەی (ولی) تەنها یەکجار لە سورەتی (السجدة)دا هاتووە، هەرچەند ئەم وشەیە لە سورەتەکەدا واتای گشتییە، بەڵام وەك باسمان کرد وشەی (ولی) بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (٤٦) دەبینیت کە هەر لە سەرەتای سوورەتەکەوە و لە دوای ئایەتی (الم)ەوە گەر وشەکانی سورەتەکە بژمێرین تا دەگاتە وشەی (ولی) دەردەکەوێت کە ٤٦ وشەیە.

پێنجەم: زانایانی ئیسلامی لە بارەی (خضر) (علیه السلام) دوو ڕایان هەیە لەو ڕووە کە ئایا (خضر) سەلامی خوای لەسەر بێت وەلییە یان پێغەمبەرە؟ هەندێکیان فەرموویانە وەلییە هەندێکی تر فەرموویانە پێغەمبەرە، بەڵام ڕای ئەو زانایانە بەهێزترە کە فەرموویانە وەلییە.

بۆ یەکەمجار باسی (خضر) علیه السلام لە قورئاندا لە دوای ئایەتی (٦٤)ی سورەتی (الکهف)ەوە دێت کە ئەمەی خوارەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ (الکهف: ٦٥).

هەر لە سەرەتای ئەم ئایەتەوە هەتا کۆتایی سورەتی (الکهف) ٤٦ ئایەتە، ئەوەش پشتگیری ئەو ڕایە دەکات کە پێی وایە (خضر) سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێت وەلییە. بەڕاستی ئەم قورئانە موعجیزەی ئاوا گەورەی تێدایە.

***



## لێکۆڵینەوە تازەکان بە بەڵگەوە ئەوەیان سەلماند کە ئاو پەیوەندی هەیە بە ڕەنگی بەردەکان:

لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ئەوەی دەرخست کەوا ڕەنگی بەردەکان لە ئەنجامی جیاوازی ئەو توخمانەیە کە لێی دروست کراوە، ئاو بکەرێکی سەرەکییە لە گۆڕانکاری و جیاوازی ڕەنگی بەردی شاخەکان، لە لێکۆڵینەوەیەکی درێژ و زەحمەتدا ئەوەیان بۆ دەرکەوت کەوا ئاو تێنەر و ڕەنگکەری بەردەکان، تەنها بکەرێکی تاکە لە ڕەنگکردنی شاخەکان و جیاوازی ڕەنگەکانیان لە ڕەنگی کانزاکەوە وەردەگیرێن، کەوا لە دروستکردنیدا هاوبەشن. کانزاکانیش بەگوێرەی چەندیەتی ئۆکسانەکان کارلێکە کیمیاوییەکەی ڕەنگ دەکرێن. ئاویش پەیوەندی بەم ئۆکسانەوە هەیە هەرکاتێك زانست پێشبکەوێت ئەوا ئیعجازی زانستی قورئانی پیرۆز زیاتر دەردەکەوێت، سەیرکەن خوای گەورە چۆن باسی ئەم دیاردەیە دەکات:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر: ٢٧–٢٨) واتە: ئایا سەرنجت نەداوە کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێنا کە ڕەنگیان، قەبارەیان، تامیان، بۆنیان، شێوەیان، شوێنیان وەرزیان، جیاوازە، هەروەها هەندێ لە کەژو کێوەکانمان بەزنجیرە کێشاوە هەیانە ڕەشێکی تاریك و تۆخە.

سەیر بکەن چۆن ئاماژەی بە جیاوازی ڕەنگەکان کردووە، بەڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە لەبەرئەوەیە مرۆڤە تێگەیشتووەکان کاتێك گوێبیستی ئەم ئایەتە دەبن سەریان سوور دەمێنێ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ (الحج:٦٣) واتە: ئایا نەتبینیوە کە بەڕاستی خوا بارانی لە ئاسمانەوە باراندووەو زەوی زۆر پێ سەوز دەبێت بەڕاستی خوا وردبین و بەسۆز و دلۆڤان و ئاگایە، کەواتە ئەم ئاوەی خوای گەورە لە ئاسمانەوە دایدەبەزێنێت تاکە بکەرێکی سەرەکییە لە ڕەنگکردنەکەدا.



## دیاردەی شەقبوونی شاخەکان موعجیزەیەکی گەورەی قورئانی دەرخست:

خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانستەکەی خۆیدا دەفەرموێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر: ٢١) واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژ و کێوێك دەتبینی ملکەچ دەبوو ورد و خاش دەبوو، شەق و پەت دەبوو لە ترسی فەرمانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوەو ژیربیان بخەنەکار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون.

دەرکەوتنی موعجیزەیەکی زانستی گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا: بە شێوەیەکی زانست و دەرەنجامی تاقیکردنەوەی تاقیگەکان لەسەر بەرگری و بەدەمەوەچوونی جۆرەها بەرد بۆ ئەو پەستاوتنە جیاوازانەی کە دەکەوێتە سەریان، ئەوە سەلمێنراوە کاتێك بەردەکان ڕووبەڕووی هێزی پەستاوتنەکان دەبنەوە ئەوا بە دەمیەوە دەچن و بەردەکان وێك دێنەوەو دووچاری چەمانەوەو کەرتبوون دێن، بەردەکان کە تووشی هێز و پەستاوتنی توند دەبن بەردەوام دووچاری شێواندنی زیاد دەبن لە حاڵەتی پەستاوتن وێکدێنەوە، واتە: دەچنەوە یەك و لە حاڵەتی ڕاکێشاندا درێژ دەبنەوە پێش ئەوەی تووشی شکان ببن، بە توێژینەوە لەسەر شوێنەواری لابردنی پلە بە پلەی پەستاوتن و گەرمی لەسەر ئەو بەردانەی گوشاریان خراوەتە سەر میکانیزمی شێواو دەردەکەون کە بە هەمان میکانیزمی توێکڵی زەوی کاردەکەن لە حاڵەتی پەستاوتن بەردەکان دووچار بە لەتبوون و پەرش و بڵاوبوون دەبنەوە، لەژێر پەستان و گەرمی نزیك بە ڕووی زەوی کاتێك پەستان و گەرمییەکەش نامێنێت بەردەکان حاڵەتێکی نەرم و شلیان بۆ دروست دەبێت، بەوەش تووشی پێچانەوەو چەمانەوە دەبن ئەمە پێش ئەوەی بەردەکان بگەنە پلەی تووانەوەو ببنە شلەو بتوێنەوە.

ئەم ئاڵوگۆڕە جۆراوجۆرانەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕوودەدەن شێواندن لە شێوەی تەقیودا دەردەکەوێت، ئەو کاتەی کە بەردەکان تووشی شەق بوون دەبن ئیتر

بوارەکە پڕ دەبێت لە شەقبوون کە بەهۆی دیاردەی کەرتبوونەوە ڕوودەدات کە ئەوەش ئالیەتی سەرەکی شێواندنە، بەرد دووچاری وێکهاتنەوە و پێچانەوە دەبێت ئەگەر شێواندن ڕوویدا بەبێ شکان و لەتبوون بە هەردوو ئامرازی پیاکێشان و ڕاکێشان لە حاڵەتی قۆناغی کۆتاییدا کە بەرد لە قوڵایی زەویدا دووچاری پلەی گەرمی و پاڵەپەستۆی بەرز دەبێت زیاتر لە پلەی توانەوە ئەوا میکانیزمی شێوانەکە دەبێتە سێڵاوی تواوەو ئیتر بەردەکە بە شێوەی شلەی تواوە دەڕوات و شێوەی چەماوەی وا دروست دەکات، کە جیاوازە لەو چەماوانەی کە لە ئاستەکانی سەروتردا هەن بەبێ گرژبوون لە بوارە بنەڕەتییەکەی چینەکانی بەرد دا.

بەم شێوەیە بە شێوەیەکی زانستی ئەوە یەکلابۆتەوە کە بەرد بەدەم بانگەوازی هێزی پەستانەوە دەچێت بە وێکهاتنەوە لە قۆناغی یەکەمدا و پاشان لە قۆناغی کۆتاییدا دووچار بە شکان دێت زۆر بە ڕوونی ئەو ڕاستییە زانستییە ئەوە دەخاتە ڕوو کە بەردی شاخەکان خاوەنی دوو تایبەتمەندین کە ئەوانیش خاسیەتی وێکهاتن و پێچانەوە لەگەڵ خاسیەتی شکان.

پێش ١٤٠٠ ساڵ قورئانە پڕ لە زانست و زانیارییەکەی، خوای گەورە ئاماژەی بەم ڕاستیە زانیستییە کردووە کە دەفەرموێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ (الحشر: ٢١) کە لەم ئایەتەوە تێدەگەین کە ترسانی شاخەکان لە خوا لە دیاردەی وێکهاتن و خۆپێچانەوەی شاخەکاندا دەردەکەوێت کە ئەوەش خشوعە وە شکان و لەتبوونی شاخەکانیش پەرتبوونە (تصدع)، هەروەك هێنانی وشەی (خشوع) پێش (تصدع) ئاماژەیە بۆ ڕاستییەکی زانستیتر کە سەرەتا بەرد بە وێکهاتنەوە بە دەم بانگەوازی هێزی پەستانەوە دەچێت کە ئەویش خشوعە پاشان تووشی شکان و لەتبوون (تصدع) دەبێت. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایە بێت کە فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دنیاوە لە خودی خۆیاندا تا بۆیان ڕووبێتەوە بێگومان ئەو قورئانە ڕاستە.



## ٧١ بەردە ئاسمانییەکان ڕاستییەکی گەورەی قورئانیان ئاشکرا کرد:

زانای فەلەکی (کلارك چایمن) کە لێکۆڵەرەوەیە لە هەیئەی عالەمی بۆ تەتبیقاتی عیلمی لە شاری تۆیکسون لە ئەریزۆنا دەڵێت: هەڕەشەو مەترسی گەورە هەیە لەسەر عالەمەکەمان لە ناوچەی دوورەوە لە دوای ئەستێرەی بلۆتۆوە هەوری (ئەوتر) هەیە، کە پێکهاتووە لە بەردی گەورە گەورەو غازی بەستوو و خۆڵ کە لە سەد ساڵێکدا جارێك بەرەو زەوی دێن بەهۆی جازبیەتەوە، گەرە خۆر غازە بەستووەکەی دەکات بە هەڵم و کلکی بۆ دروست دەبێت و ڕووەکەش دەتەقێتەوە بە دەرچوونی غاز و غوبار لێوەی کە ئەوانیش دووسەد دانە دەبن، بەڕاستی مەترسی گەورە ڕوو دەکاتە جیهانەکەمان کە ئێمە نایبینین و ڕەنگە هەستیشی پێنەکەین.

کلکداری هالی کە هەر (٧٦) ساڵێك جارێك دەیبینینەوە ئەگەر بەر زەوی بکەوێت لە یەك چرکەدا کاولی دەکات و پاش سەعاتێکیش لە ئاسمانەوە ئاگر دەبارێ، لە ساڵی ١٩٠٨دا لە سیبریا بەردێکی کەونی کە نزیکەی (٣٠٠)پێ بوو کەوتە خوارەوە بە هێزێکی تەقینەوە کە (١٠)میگا تەن دەبوو. (٧٠٠) میلی زەوی تەخت کرد و لە بازنەیەکی (٧٠ کیلۆمەتر) هەرچی هەبوو سوتاندی و ڕووناکییەکەی کیشوەری ئەورووپای ڕووناك کردەوە، تەنانەت لە دووری (٦٠) میل جلی لە بەردا دەسوتاند.

وەکالەتی ناسای ئەمریکی ئاشکرایکرد کە هەزار تا چوار هەزار بەرد و شهوب هەیە بەرەو زەوی دێن کە تیرەکەیان لە نیو میل زیاترە کە ئەمەیش مرۆڤایەتی و زەوی دەپێچێتەوە تەنها (١٥٠) دانەشیان ناسراون تا ئێستا ئەو بەردانەش کە لە (٣٠٠) پێ زیاترن ژمارەیان دەگاتە سێ سەد هەزار بەرد کە بەرەو ڕێڕەوی زەوی دێن و هیچیان لەبارەوە نازانرێ ئەمەش بەڕاستی موعجیزەی قورئانە کە دەفەرموێت: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ١٧ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ (الملك: ١٦–١٨) واتە: ئایا دڵنیان لەو خوایەی کە لە ئاسماندا کە بای توندتان بنێرێتە سەرتان بە وردە زیخەوە ئەوو دەمە تێدەگەن کە

هەرەشەی ئێمە چۆنە سوێند، سوێند بەخوا ئەو گەلانەی لە پێش ئەماندا بوون پێغەمبەرانی ئێمەیان بەڕاست نەزانی جا چۆن بوو بە گژداچوونەوەی ئێمە لەوان.

(حاصبا) واتە: بەرد، زانای فەلەکی (دۆناڵد یومانز) لە وەکالەتی ناسا لە باسادینا کالیفۆرنیا دەڵێت: لە ڕۆژی ٢٣ی مارسی ١٩٨٩ بەردێکی ئاسمانی ئەسترۆیدس تەنها (٧٠٠) هەزار میلی مابوو بەر زەوی بکەوێ ئەگەر تەنها شەش سەعات دوا بکەوتایە لە هاتندا ئەو بەر زەوی دەکەوت و دنیای کاول دەکرد بەسەر یەکدا، بەڕاستی زەوی لەسەر خولگەی خۆی بە دووری خۆردا دەسووڕێتەوە کە لە دەوروبەری بەردی کەونی زۆر هەیە ئێستا بێت یان لە داهاتوودا بەردێکی هەر بەردەکەوێ، ئەوە ئەگەر شتیتر پێشتر ڕوونەدات، بەڕاستی ئەو کەسانەی کە دوورن لەو ئاینە پاك و پیرۆزە کە ئەو بەڵگانەیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە دەبوو بە دڵ و بە گیان شوێن ئەو قورئانە بکەون، چونکە ئەو ئیسلامە ئاینی پێشکەوتن و زانست و زانیارییە، وە هەتا ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوا زیاتر ڕاستییە زانستییەکان لە قورئاندا ئاشکرا دەبن.



## ٧٢ دۆزینەوەیەکی گەورە لەبارەی شوێنەواری گەلی ثەموود:

گەلی ثەموودو چەند گەلانێکی دیکە بەهۆی لەسنوور دەرچوونیان خوای بەتوانا لەناوی بردن، بەڵام شوێنەوارەکانیان مایەوە، یەکێك لەو شوێنەوارانەی کە تازە دۆزراوەتەوە دروستکردنی تەلاری گەورە بوو کە بەر لە هەزاران ساڵە گەلی ثەموود لە هەڵکۆڵین و تاشینی شاخەکان، لای شاری یەنزای باشووری ئوردن دروستیان کردووە ئەم ڕاستییە مێژووییە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە، دەفەرموێت: ﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ﴾ (الشعراء: ١٤٩) واتە: گەلی ثەموود شاخەکانیان هەڵدەکۆڵی و دەیانتاشی و بیناو خانووی ڕاقییان دروست دەکرد، پرسیارەکە ئەوەیە کێ پێغەمبەری ﷺ لەم کۆشکە هەڵکەنراوانەی شاخەکان ئاگادار کردۆتەوە؟ کە تازە نەبێت نەدۆزراوەتەوە ئایا ئەم موعجیزەیە بەڵگەی ڕاستییەتی پەیامەکەی نییە؟ بەڵێ ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پەیامە پیرۆزەکەی.








## ٧٣ موعجیزەی ئایەتێکی قورئان بووە هۆی موسڵمان بوونی پسپۆڕێکی جیۆلۆجیا:

ڕیچارد فیزلی سەرۆکی کۆمەڵەی ئەفسەری موسڵمانانی بەریتانی کە سەردانی وڵاتی سعودییەی کرد، لەگەڵ وەفدێکی ئەفسەری موسڵمان دا باسی موسڵمان بوونی خۆی دەکات و دەڵێت: هەرچەندە لە بنەماڵەیەکی تاسەر ئێسقان مەسیحیم و هاوسەرەکەشم مەسیحییەو تا ئێستاش شانزە ساڵە موسڵمان نەبووە، حەزم دەکرد شارەزابم لە ئیسلام قورئانێکی ڕاڤەکراو بە زمانی ئینگلیزیم دەستکەوت و ئایەتی ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾ (النبأ: ٧) واتە: ڕەگمان بۆ شاخەکان داناوە، سەرنجی ڕاکێشام لەبەرئەوەی من پسپۆڕیشم لە بواری جیۆلۆجیادایە گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە هیچ پەراوێك پێش هەزار و چوارسەد ساڵ ناتوانێ بگاتە ڕاستی لەو جۆرە، ئەوە بێگومان دەسەڵاتی پەروەردگاری لەدواوەیە.

ڕیچارد هەموو شەوێك دیراسەی جوزئێك لە قورئانی دەکرد و بەوەش گەیشتە کۆمەڵێ ڕاستی کە ڕێگای بۆ ڕووناك کردەوە، کەوتە بانگەوازکردن و خزمەتکردنی ئیسلام لەم پێناوەشدا کۆمەڵەی ئەفسەری پۆلیس موسڵمانی لە بەریتانیا دامەزراند لە ساڵی (٢٠٠٠)ی زایینیدا، کە نزیکەی دوو هەزار ئەفسەری موسڵمان دەبن لە (٣٤) مقاتعەی بەریتانیادا ئەوەش بۆ ئەوەی بتوانێت دەنگی ئەو ئەفسەرانە بگەیەنێتە دەسەڵاتدارانی وڵات، توانی لە ساڵانی ڕابردوودا وا لە حکومەت بکات ڕێی سەرپۆش و حیجاب بدات بۆ ئەفسەرە ئافرەتە موسڵمانەکان، هەروەها ڕەزامەندی وەرگرت کە لە کاتی ڕۆژ و شکاندندا ڕێگا بدرێت ئەفسەرە موسڵمانەکان نان بخۆن و هەروەها جەژنەکانیش ببێ بە مۆڵەتی ڕەسمی و ڕێ بدرێ نوێژی جەژن بکەن. دوو ئایەتی تریش کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر ڕیچارد فیزلی و بە تەواوی ژیانیان گۆڕی، ئایەتەکانیش ئەمانەن:



١. ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات: ٤٧) واتە: ئاسمانمان بەدەستی خۆمان دروست کردووە ئێمە فراوانکاری ئەمانەین.

٢. ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء: ٣٠) واتە: ئایە نەیاندی و نەیانزانیوە ئەوانەی بێبڕوا بوون کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە بوون یەك پارچە بوون، ئینجا لەیەکترمان جیاکردنەوە فەراهەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو.




## پارچە نەیزەکەکەی باشووری ڕووسیا بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ڕاستی قورئانی پیرۆز:

خوێنەری بەڕێز: هەتا ڕەوڕەوەی ڕۆژگار بەرەو پێشەوە بڕوات زیاتر ڕاستی و دروستی ئەم پەیامە خواییە بۆ مرۆڤایەتی ئاشکرا دەبێت، تازەترین موعجیزەی قورئانی دەرکەوت کاتێك پارچە نەیزەکەکە لە باشووری ڕووسیا کەوتە خوارەوە شێوەی هەورێکی کەڵەکەبووی وەرگرتووە کە ئەوەش قورئان ئاماژەی بۆ کردووە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَرَوْا كِسْفًا مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ﴾ (الطور: ٤٤) واتە: ئەگەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن بکەوێتە خوارەوە دەڵێن: ئەمە هەورێکی کەڵەکەبووە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾ واتە: ئایا دڵنیان و ئەمینن کە ئەو خوایەی لە ئاسمانە پارچە بەردتان بۆ ببارێنێت ئەو دەمە تێدەگەن هەڕەشەی ئێمە چۆنە.

* * *



## ٧٥ چیاكان زەوییان جێگیر كردووەو هاوسەنگیان پێبەخشیوە:

زانایان سەلماندیان چیاكان ملیۆنان ساڵە زەوییان جێگیر كردووەو هاوسەنگییان پێبەخشیوە، خۆ ئەگەر زنجیرە چیاكان نەبوونایە توێكڵی زەوی دەكەوتە جووڵەو هاتوچۆ چونكە توێكڵی زەوی لەسەر چینێكی نیمچە شلی گەرمی بەرزە لەبەرئەوە شاخەكان لە ئیشیاندا بە لەنگەری كەشتییەكان دەچن كاتێك لەنگەری پێدەگرن و جێگیریان دەكەن، سەرسوڕهێن ئەوەیە چواردە سەدەیە قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتی قورئاندا ئامازەی بەم ڕاستییە زانستییە داوە هەتا بیگەیەنێت ئەم تەشبیهە هەڕەمەكی نییە، بەڵكو دووپاتكردنەوەی چەندین جار بەڵگەی دەرخستنی هەقیقەتەكەی و ڕووی ئیعجازەكەیەتی.

یەكێك لەو ئایەتانە دەفەرموێت: ﴿وَأَلْقَىٰ فِي ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ (لقمان: ١٠) واتە: لە زەویدا چیاكان وەك لەنگەر دامانناوە تا جێگیرتان بكات و نەكەونە جموجوڵ، هەتا شەستەكانی سەدەی بیستەم نەزانرا بوو ئەركی شاخەكان ئەوەیە كە قورئانی پیرۆز باسی كردووەو لەنگەر بە توێكڵی زەوی دەگرن تا جموجوڵ نەكات، ئەو لێكچوواندنەی قورئان ئیعجازێكی تری تێدا دەخوێندرێتەوە ئەویش ئەوەیە دەریدەخات ژێر توێكڵی زەوی ڕەق نییەو ماددەیەكە جۆرێك لەشلی تێدایەو لە جموجوڵدایە چونكە گەر بۆ كەشتی بەكاردێت كە شەپۆلی دەریاكان كەشتییەكە دەجوڵێنێت واتە: لەم لێكچوواندنەدا ڕوونی دەكاتەوە كە توێكڵی زەوی وەك كەشتی وایەو ماددەی نیمچە شلی ژێر توێكڵەكە وەك دەریا وایەو لەنگەریەكەش وەك چیاكان وایە بۆیە ئەمەش دەبێتە موعجیزەیەكی زانستی كە شایەتی لەسەر ڕاستییەكەی دەدات.

***



## کۆبوونەوەی توخمە قورسەکان لە ناوکی زەویدا:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ۞ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا﴾ (الزلزله: ٢) واتە: کاتێك زەوی هاتە لەرزە بە لەرزینی خۆی، وە زەوی هەرچی قورسییەکانی ناوی هەیە هەمووی فرێدایە دەرەوە. قورئانی پیرۆز لەم چەند ئایەتەدا ئاماژە بە ڕاستییەکی زانستی گەورە دەکات ئەویش دەرهاتنی قورساییەکانی زەوییە، ئەم ئایەتە دەفەرموێت: قورساییەکانی زەوی لە ناوەوەی زەوی شاراونەتەوە هەتا لە ڕۆژی دواییدا ئەو قورساییانە بۆ ڕووی زەوی دێنە دەرەوە کە ئەوەش بەڵگەی تێکچوونی یاساکانی گەردوونە، ئەمڕۆ زانستی چینەکانی زەویناسی ڕاستییەتی ئەو ئایەتەیان سەلماندووە، زانایان دەڵێن: ئەگەر لە چینەکانی زەوی لە توێکڵی زەوییەوە بۆ ناوك بکۆڵینەوە بێگومان بارستەچڕی بەردەکان پلە بە پلە زیاد دەکات، چونکە هەرچەندە لە ناوك نزیك ببینەوە ڕێژەی توخمی ئاسن و ئۆکسیدە جیاوازەکان زیاد دەکەن ئەوەش دەبێتە هۆی قورستر بوونی ماددەکان، لە لایەکی ترەوە هەتا لە ناوك نزیك ببینەوە چڕی زیاد دەبێت چونکە زیاتر پەستراون بەهۆی ئەو گەرمییە بەرزەی لە ناوکدا هەیە توخمە قورسەکانی ئاسن کە چڕی ناوکیان زیاترە کۆدەبنەوە، بەڵام لە چینەکانی سەروتری زەوی بەردە نیشتەنییەکان و بازڵتیەکان کۆدەبنەوە کە چڕیان کەمترە.



## سوودەکانی گەڕان بەسەر زەویدا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَ﴾ (العنکبوت: ٢٠) واتە: پێیان بڵێ بەسەر زەویدا بڕۆن تا بزانن چۆن دروست بوون دەستی پێکرد.. زانایان دەریانخستووە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەڵگەی لەسەر سەرەتای ناوچەیەك دەست بکەوێت پێویستە بەپێ بەسەر زەویدا بڕوات چونکە لەو گەڕانەدا چەندین شوێنەوار و بەبەردبوو دەدۆزێتەوە کە دەتوانرێت لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: جارێك لە کۆلیژی زانستەکانی زەوی لەگەڵ ڕاگرێك دانیشتبووین باسی ئەم ئایەتەمان دەکرد، کە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ناوچەیەك پێویستە بە زەویدا بڕۆین، لەو کاتەدا تیمێکی بیانی کە گەڕانێکی مەیدانیان بەپێ بە چەند ناوچەیەکدا کردبوو هاتنە ژوورەوەو دەستیان کرد بە قسەکردن و وتیان: لێکۆڵینەوەکەی ئێمە زۆر لە تیمەکەی پێشتر وردترە چونکە ئێمە نموونەمان وەرگرتووەو بەپێ گەڕاوین بەو ناوچانەدا، بەڵام ئەوانەی پێشوو بە کۆپتەر بە ناوچەکەدا گەڕان. پرۆفیسۆر دکتۆر (عەبدولمەجید زندانی) دەڵێت: بە ڕاگری کۆلیژەکەم وت: سەیر بکە ئەو تیمە باسی ئایەتە قورئانییەکە دەکەن پێویستە بۆ لێکۆڵینەوە بەسەر زەویدا بگەڕێیت وەك خوای گەورە فەرموویەتی.




## ڕۆچوونی ڕووبەرێکی بچووك ئیعجازێکی تازەی قورئانی دەرخست:

ئایەتێك یان چیرۆکێك لە کۆتاییەکانی سورەتی (القصص) دا هەیە مولحید و بێدینەکان کردبوویانە هۆکارێك بۆ گومانکردن، ئەویش بەسەرهاتنی قاروونە لە سەردەمی موسا پێغەمبەردا کە دەوڵەمەندترین کەس بوو، خوای گەورە ماڵی زۆری پێدابوو بەڵام فیزی بەسەردا دەکردن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ﴾ (القصص: ٧٦)، واتە: ئەوەندە ماڵ و سامانمان پێبەخشی بوو کە کلیلی گەنجینەکانی بە چەند کەسێکی بەهێز گران هەڵدەگیران، واتە: کەسانی بەهێز بە گرانی کلیلی گەنجینەکانیان بۆ هەڵدەگیرا ئەی ئەوەی تێیدا بووە لە گەنجینە و پارەو ئاڵتون دەبێ چەند بووبێت؟ بەڵام ئەی چۆن خوای گەورە کۆتایی بە عاقیبەتی ئەم پیاوە هێنا؟

﴿فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ (القصص: ٨١) واتە: خۆی و ماڵیمان برد بە ناخی زەویدا. پرسیارەکە ئەوەیە زانراوە کە هەمیشە لە ئەنجامی بوومەلەرزەی ویرانکەرەوە رۆچوون ڕوودەدات شارێك یان گوندێك یان ناوچەیەکی زۆر گەورە وێران دەکات، بەڵام رۆچوونی تەنها ماڵێك ئەوە چۆن ڕوودەدات؟! لە هەواڵەکاندا لە ساڵی (٢٠١٣) زایینیدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زەوییەك شەقی برد و خانوویەکی قوتدا تەنها شوێنی خانوویەك بە ڕووبەری چل پەنجا مەترێك بە شێوەیەکی زۆر کتوپڕ بە زەویدا رۆچوو، ئەو خانووە لە ناکاوێکدا دیارنەماو نقوم بوو بۆ قوڵایی ٣٠ یان ٤٠ مەتر.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن ڕاستی و موعجیزەی ئایەتەکانی قورئان وەك ڕۆژی رووناك ئاشکرا دەبن، ئەوەش سەلمێنەری ئەو ڕاستییە گەورەیە کە خاوەنی ئەو قورئانە پیرۆزە خوای گەورەیە کە ئاگادارە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك، ئەو دیاردەیە زانایان دەڵێن تازە دەرکەوتووە کەس نەیدیوە تەنها خانوویەك یان ئۆتۆمبیلێك یان ناوچەیەکی دیاریکراو رۆبچێت. زانایان دەڵێن لەوانەیە پێشبینی گەردەلول و جگە لەوە بکرێت یان لە داهاتوودا پێشبینی بوومەلەرزە بکرێت، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت پێشبینی رۆچوون بکرێت، یان بزانین چی لەژێرتا ڕوودەدات، ئەی ئەوە چۆن ڕوودەدات؟

زانایان دەڵێن: دوای ئەوەی خاك و زەوی لە ڕووی ئەندازەوە جێی خۆی دەگرێت، بەڵام لە هۆکارەکانی کاتدا و دزەکردنی ئاو بۆ ژێرخاك کار لە خاکەکە دەکات و دەبێتە هۆی شیبوونەوەی خاکی کلسی ڕەقی ژێرزەوی، واتە: خاکەکە شی دەبێتەوەو بۆشایی دروست دەبێت، ئەو کاتە هەر قورساییەك لەسەر ئەو شوێنە دەبێتە هۆی رۆچوونی زەوییەکە واتە: بە شێوەیەکی کتوپڕ لەگەڵ کاتدا ڕوودەدات لە ئێستادا بە دەنگ و ڕەنگەوە دەبینرێ، کە چۆن تەنها خانوویەك ڕۆدەچێت و ڕۆچوون ڕوودەدات. لێرەوە ڕاستی مانای وتەی خوای گەورەمان بۆ دەسەلمێت کە دەفەرموێت: خۆی و ماڵیمان برد بەناخی زەویدا بە ڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە.



## ٧٩ زەوی و جیاوازی خاکەکەی موعجیزەیە:

بێگومان خاکی زەوی هاوچەشن نییەو لەیەك جۆر نییە هەروەها لە تاکە توخمێکیش پێکنەهاتووە، قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەم وتەیە دەدوێت و دەفەرموێت: ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ (الرعد:٤) واتە: لەسەر ڕووکاری زەوی پارچەی جۆراوجۆر هەیە لەپاڵ یەکدا کە کاریگەرییان لەسەر چۆنیەتی و بەرهەمی ڕووەك هەیە، جگە لەوەی جیاوازییان نیشانەن بۆ کانزا جۆراوجۆرەکان، هەروەها لە ڕەزی ترێ کشتوکاڵی هەمەجۆر لە دانەوێڵەو بێستانەکاندا دارخورمای یەك قەد و دوو قەد، هەموو ئەوانە بە یەك ئاو ئاودێر دەکرێن و لە یەك جۆر ئاو دەخۆنەوە، بەڵام سەرەنجام ئەو هەموو بەربوومە جیاوازە لە قەبارە و تام و بۆن و ڕەنگ و شێوازدا پەیدا دەبن و هەندێکیانمان لە هەندێکیتر بۆ خۆراکی مرۆڤ نازدارتر و پەسەندتر کردووە، ئا لەو شتانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك ئەقڵ و ژیری خۆیان بخەنە کار.

لەم دواییانەدا زاناکان گەیشتنە ئەو ڕاستییەی توێکڵی زەوی کە بە فاکتەرەکانی داماڵین تێکشکاو و پەرت بووە و وایلێهاتووە ڕەگەزەکانی یەك نەگرنەوە، بەڵکو هەر خاڵێك سروشت و تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە، ئەوەش ئەو مانا زانستییەیە کە ئایەتەکە ئاماژەی پێدەدات، هەر پارچە زەوییەك چەند بەشێکی هاوسێی پێکەوە بکاو پێکدێت، هەرچەندە لە پێکهاتەی ئەو بەشانەدا ماددەی کانزایی یان ئەندامی یاخود یەکتر جیاواز هەن کاتێك ئاودێری بەشێکی دیاریکراوی زەوی دەکرێت دەبینیت بەربوومەکانی هەمە چەشنن، چونکە بە شتگەلی قوڕین و هیتری لمین یاخود کلسی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە بە یەك ئاو ئاودێری دەکرێن کەچی بەربوومەکەیان جیاوازە، (سبحان الله) ئەوەش ئەو زانیارییەیە کە ئایەتە قورئانییەکە پێش زیاتر لە چوار سەدە پێش ئێستا باسی کردووە، ئاخۆ موحەممەد ﷺ ئەم زانیارییانەی لە کوێوە هێناوە؟ بە دڵنیاییەوە خوای گەورە بە وەحی ئەوەی بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە.



##  پشتێنەی موگناتیسی یەکێکە لە بەڵگە ئاشکراکانی قورئان:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٢) واتە: ئێمە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو کەچی ئەوانە ڕوویان وەرگێڕاوە لەو هەموو نیشانەو بەڵگانەی بەسەریانەوەیە.

لە ساڵی ١٩٨٥ زایینی بەهۆی مانگی دەستکردی (Explorer)وە زانست دۆزییەوە، کە بەرگە هەوای زەوی بە هەر پێنج بەش و حەوت چینەکەیەوە لە تیشکی گەردوونی و بای خۆریی کوشندە پارێزراوە، بەهۆی پشتێنەی (ڤان ئەلن)ەوە کە ١٠٠-١٥٠ هەزار کیلۆمەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە و بۆ ماوەی پانی (٧٥٠٠ کیلۆمەتر) درێژ دەبێتەوە، ئەم پشتێنەیە قەڵغانێکی پارێزەر دروست دەکات کە زەوی و بەرگە هەواکەی دەپارێزێت. کاری ئەم قەڵغانە لەبواری موگناتیسی زەوییەوە هاتووە کە پارێزگاری کردنە لە زەوی و بەرگە هەواکەی لە تیشکی گەردوونی هاتووە، لە ئەستێرەکان و بەتایبەتیش لە تیشکی باخۆرییەکان کە خێرایییەکەی بە نزیکەیی دەگاتە تێکرای (١.٥ ملیۆن کیلۆمەتر) لە هەر کاتژمێرێکدا، خۆ ئەگەر ئەم بوارە موگناتیسییەی زەوی نەبووایە کە زەوی و بەرگە هەواکەی دەپارێزێت تیشکی گاما و تیشکی ئێکس و تیشکی ئەلفاو بەشێکی زۆری تیشکی ژێر سوور، زیندەوەرانی سەرزەوی تووشی لەناوچوون دەکرد و ژیان لەسەر زەوی نەدەما، ئەگەر مانای وشەی (السماء) کورت بکەینەوە لەوەدا کە بەرگە هەوای زەوییە ئەوەی باسکرا دەبێتە ڕووی زانستی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت:

﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٢) بەڵام ئەگەر لە مانای وشەی (السماء) وەها تێگەیشتین کە بریتییە لە هەموو ئەوەی لەسەرروومانەوەیە، واتە گەردوون و ئەوەی تێیدایە هەموو شتێك لە گەردووندا پارێزراوە بەهۆی ئەو یاسا وردانەی پەروەردگار بۆی داناون، کە گەلە ئەستێرەو ئەستێرەو هەسارەکانی بە بەرزییەوە ڕاگرتووە، ڕێگای گرتووە لەوەی ئاسمان

بکەوێتە خوارەوە و ئاسمانەکان و زەوی تێکبچن و لەیەك بترازێن تەنها بە فەرمانی زاتی پەروەردگار نەبێت، لە لایەکیترەوە دەبێت ئەوەش بوترێت کە ئایەتەکە مانایەکی فراوانتری تێدایە لە پشتێنەی موگناتیسی زەوی دەشێت سەرجەم چینەکانی بەرگە هەوا بگرێتەوە لە چینی ئایۆنی و چینی ئۆزۆن و جگە لەوانەش کە هەریەکەیان جۆرە قەڵغانێکی پارێزەرن بۆ زەوی.

خوای گەورە هەموو شتێکی بە ئەندازەی دیاریکراو بەدیهێناوە، وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ۝ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ﴾ (القمر: ٤٩–٥٠) واتە: یەك وشەیە دەڵێین ببە دەستبەجێ دەبێت.



## لەرینەوەی دەنکۆڵە خۆڵییەکان ڕاستییەکی گەورەی قورئانی ئاشکرا کرد:

لە ساڵی (١٨٢٨) زایینیدا زانایەکی بەریتانی بەناوی (براون) ئاشکرای کرد کە ئاوی باران لە کاتی دابەزینیدا دەبێتە هۆی لەرینەوەی خاك، واتە لەراندنەوەی دەنکۆڵە خۆڵییەکانی خاك کە دەنکۆڵەی زۆر وردن بەشێوەیەك گەورەترین ئەو دەنکۆڵانە تیرەیان نزیکەی (٣٠٠) مایکۆمەتر، ئەم دەنکۆڵانە بریتین لە چەند چینێکی کانزایی جیاوازی لەسەر یەك ئەو چینانە پێش باران بارین پێکەوە نووساون و لەسەر یەکن، بەڵام کاتێك باران دەبارێتە سەریان بەهۆی جیاوازی کانزاکانەوە لەنێوان دەنکۆڵەکاندا بارگەی کارەبایی جیاواز دروست دەبێت و بە ئایۆنبوون ڕوودەدات، واتە: دەگۆڕێت بۆ ئایۆن ئایۆنیش ئەتۆمێکە بارگەی کارەبایی هەیە ئەگەر یەك سێك یان زیاتر لە بارگە کارەباییەکانی ئەتۆمەکە کەمی کرد ئەوا دەبێتە ئایۆنێکی موجەب، خۆ ئەگەر زیادی کرد دەبێتە ئایۆنی سالب و پێیان دەوترێت (چالاك)، دەنکۆڵە خۆڵییەکان بەهۆی بەئایۆنبوونەوە دەلەرێنەوەو بە چوونە ژوورەوەی ئاو بۆ نێوەندی ئەو دەنکۆڵانە لەرینەوەکە دەستپێدەکات.

ئەم لەرینەوەیە سوودێکی زۆری هەیە چونکە چینەکان یەك لەگەڵ یەکدا پێکەوە نووساون و بەهۆی لەرینەوەکانەوە، بوارێك بۆ چوونە ژوورەوەی ئاو لەنێوان چینەکانەوە دروست دەبێت، کاتێکیش ئاو دەچێتە نێوان چینەکانەوە دەنکۆڵەکان زیاد دەبن و دەخلیسکێن، کە دەنکۆڵە خۆڵییەکان تێربوون بە ئاو وەك کۆگایەکی بچووکیان لێدێت کە ئاو لەنێوان چینەکانیاندا دەپارێزن، لەم حاڵەتەدا وەك ئەوەیە مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵێك کۆگای وردی کانزایی نێو خاك بکەین. ڕووەك ماوەی (٢-٣) مانگ لەو کۆگا وردانەوە ئاو وەردەگرێت، خۆ ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت، واتە: لەرینەوەی دەنکۆڵەکان و خەزنبوونی بڕێك ئاو لەنێوان چینە دەنکۆڵەییەکاندا نەبێت، ئاوەکە بە نێو گڵەکەدا ڕۆدەچێتە خوارەوەو لەماوەی هەفتەیەکدا ڕووەکەکە دەمرێت، بەڵام کۆگا گەورەکانی ئاو درێژە بە ژیانی ڕووەکەکە دەدەن.

(براون) لە ساڵی (١٨٨٢) زایینیدا دۆزییەوە کاتێك باران دەبارێت خۆڵ تووشی لەرینەوە دەبێت دیاردەکەش بە لەرینەوەی براون ناسراوە، بەڵام لە ڕاستیدا پێش لەدایکبوونی براون زانیارییەکە هەبووە پێویستە ئەوانەی مێژووی زانست دەنووسنەوە و هەرگیز نەڵێت براون یەکەم کەسە باسی ئەم دیاردەیەی کردووە، ئەگەر ئینسافیان هەبێت پێویستە بڵێن یەکەم باسکردنی ئەم دیاردەیە لە قورئانی پیرۆزدایە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ﴾ (الحج: ٥) واتە: تۆ زەوی دەبینیت لە وەرزی زستاندا خامۆشە، بەڵام کاتێك ئاوی بارانی بەسەردا دەبارێنین دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و ڕەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن و سەر دەردێنن ئەوسا لە هەموو گژوگیا و گوڵ و گوڵزارێکی جوان پەیدا دەبێت. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایە بێت کە فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دنیاوە وە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون ببێتەوە بێگومان ئەو قورئانە ڕاستە.



## ٨٢ موعجیزەیەكی زانستی گەورە دەربارەی شێوەی گۆی زەوی:

مرۆڤ تاكو سەدەكانی ناوەڕاستیش گومانی دەبرد كە زەوی وەكو ڕوتەختێك وایە، بڕوای وابوو كاتێك كەسێك بە سەر زەویدا بڕوات تا كۆتایی ئەو ڕوتەختە ئەوا لە كەنارێكەوە بۆ شوێنێكی نادیار دەكەوێتە خوارەوە. ئەم بیرۆكەیە تاكو سەدەی بیستەم لەئارادا بوو تا ئەو دەمەی لە ڕێی لێكۆڵینەوەو بەراوردەكانەوە مرۆڤ گەیشتە ئەو بڕوایەی شێوەی زەوی گۆییە، ئەم بڕوایەش گۆڕانكاری بەسەردا هات لە پاش گەیشتنی مرۆڤ بە نێوەندی بۆشایی ئاسمان و وێنەگرتنی زەوی هەموو زەوی لە دوورەوە دەركەوت، شێوەی ڕاستەقینەی زەوی وەك شێلم یان لالەنگییەكی گەورەی لێهاتووە چەمانەوەكەی وەك گۆ لە هەموو لایەكانیەوە وەك یەك نین، بەڵكو لە هەردوو جەمسەری باكورو باشورییەوە كەمی كردووە ئەوە بووەتە ڕاستییەكی سەلمێنراو كە تیرەی زەوی لە هێڵی كەمەرەییدا بچوكترە لە تیرەكەی لە جەمسەرەكانیدا، قورئانی پیرۆز باسی ئەو كەمكردنەوەی دوولای زەوی دەكات و دەفەرموێت:

﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾ (الأنبياء: ٤٤) واتە: ئایا ئەوانە نابینن ویستی ئێمە لەسەر زەویدا دەوری هەیە؟ لایەكانی كەم دەكەینەوە و دەسەڵاتیان لێ زەوت دەكەین، ئایا مەگەر ئەو بێباوەڕانە سەركەوتوون؟ نەخێر بێباوەڕان سەركەوتوو نین، پاشان ئەگەر بە وردی بڕوانینە ئیعجازی قورئان دەبینین چۆن ڕەوانبێژی و ڕاستی زانستی كۆ كردووەتەوە كاتێك دەفەرموێت:

﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ (الحج: ٢٧) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بانگی خەڵكی بكە با بێن بۆ حەج بە پیادە یان بە سواری ئەو وشترانەی كە دووری ماوەكە لاوازی كردوون و لە هەموو ڕێگایەكی قووڵەوە با بێن. لێرەدا پێویستە سەرنج لەو موعجیزە زانستییە گەورەیەی قورئان بدەین كە دەفەرموێت: ﴿مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ و نەیفەرمووە (من كل فج بعيد) ؟ زانستی تازە ئەوەی سەلماندووە، لەبەرئەوەی شێوەی زەوی تەخت نییە بۆیە دەستەواژەكە بە

(عمیق)، واتە: قووڵ هاتووە. (الله أكبر) لەو موعجیزە ناوازە گەورەیە بە ڕاستی پێویستە کە بڕواداران موعجیزەکانی ئەم قورئانە پیرۆزە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن، کە بەڕاستی ئەوەش گەورەترین دیارییەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە، ئێستا ئەگەر کۆمەڵە هێڵێکی ڕاست لەنێوان کەعبەی پیرۆز و ئەو دەوڵەتانەی تردا بکێشین کە دەکەونە ڕووەکانیتری زەوی دەبینین ئەو هێڵانە بە قوڵاییەکانی زەویدا تێپەڕ دەبن نەك بەسەر زەویدا، بە ڕاستی لە وردەکاری ماناکانی قورئانە کاتێك دەستەواژەکە بەو جۆرە هاتووە: ﴿مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾.



## ٨٣ ئاشکرابوونی موعجیزەی زانستی لە سورەتی (الانعام)دا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَآءِ﴾ (الأنعام: ١٢٥) واتە: ئەوەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەوەش کە بیەوێت گومڕای بکات دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەکات، هەروەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە لەم ئایەتەدا بە ڕوونی و ئاشکرایی تەواوەوە ئاماژە بە دوو ڕاستی دەکات کە زانستی تازەی سەردەم دۆزییەوە دانی پێدانا.

یەکەم: گۆڕانی گەورە لە پەستانی هەوادا لە کاتی بەرزبوونەوەی خێرا لە ئاسماندا ڕوودەدات بۆ مرۆڤیش دەبێتە هۆی سنگ تەنگبوون و ناڕەحەتی لە هەناسەداندا.

دووەم: چەند لە ئاسماندا بەرزبینەوە پەستانی هەوا دادەبەزێت و بڕی ئۆکسجین کەم دەکات، لە ساڵی (١٦٤٨) زایینی زانای ناودار (بلیز باسکاڵ) سەلماندی بە بەرزبوونەوە لە ئاستی ڕووی دەریاوە پەستانی هەوا کەم دەکات.

لە ئینسایکلۆپیدیای جیهانیشدا هاتووە بارستەی مەزنی هەوا بە شێوەیەکی یەکسان بە ئاڕاستەی ستوونی دابەش نەبووە بە ڕادەیەك کە (٥٠٪)ی بارستایی هەوای

کەش لەنێوان ڕووی زەوی و بەرزی ٢٠ هەزار پێ لەسەرو ڕووی دەریادایە، (٩٠٪)ی لەنێوان ڕووی زەوی و بەرزی ٥٠ هەزار پێیە لە ڕووی زەوییەوە. بەمجۆرە چڕیی هەوا بەپێی بەرزبوونەوەمان بە ستوونی بۆ سەرەوە بە خێرایی کەم دەکات، تاکو دەگەینە بەرزییەکی زۆر ئیتر چڕی هەوا دەگاتە بڕێکی زۆر کەم هەر لە هەمان سەرچاوەدا هاتووە، سەرجەم بەدیهێنراوە زیندووەکان پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە جگە لە زیندەوەرە پێکهاتە سادەکان کە تەنها لە یەك خانە پێکهاتوون، بۆ نموونە: مرۆڤ پێویستی بە وەرگرتنی ئۆکسجینی هەوا هەیە لە هەناسەدانیدا تاکو بە زیندویی بمێنێتەوە و پارێزگاری لە ئاستی دیاریکراوی پەستان بکات، بۆیە بوونی مرۆڤ لە بەرزایی کەمتر لە ١٠ هەزار پێ لەسەروو ئاستی دەریاوە نابێتە هۆی دروستبوونی گرفتێکی ئەوتۆ بۆ هەناسەدان لە بەرزایی ١٠ هەزار پێ تا ٢٥ هەزار پێشدا هەناسەدان هەر شیاو دەبێت، بە شێوەیەك کە کۆئەندامی هەناسەدانی مرۆڤ دەتوانێت خۆی لەگەڵدا ڕابهێنێت، بەڵام زۆر بە ناڕەحەتی و ئەستەم لە بەرزایی ٢٥ هەزار پێ ئیتر مرۆڤ ناتوانێت بە هیچ شێوەیەك هەناسە بدات، ئەوەش دەبێتە هۆی مردن بەهۆی کەمی ئۆکسجینەوە.

لە ئینسایکلۆپیدیای ئەمریکیدا هاتووە: پێویستە فڕۆکە ئەگەر لە بەرزاییەکی زۆردا بوو پارێزگاری لە ئاستی دیاریکراوی پەستانی ناوەوەی بکات بۆ پارێزگاری سەرنشینەکانی، چونکە پەستانی هەوا لەو بەرزاییانەدا زۆر کەمتر دەبێت لە بڕی گونجاوی دەستەبەرکردنی ئۆکسجینی پێویست بۆ مانەوەی سەرنشینەکان لە ژیاندا، هەروەها گۆڕانی خێرا لە پەستانی هەوادا کە لە ئەنجامی گۆڕانی بەرزاییەوە ڕوودەدات، دەبێتە هۆی وەڕسی و هەراسانکردنی توندی جەستەیی.

هەمووان دڵنیاین لە سەردەمی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ هیچ زانیارییەك نەبووە دەربارەی گۆڕانی پەستان و کەمبوونەوەی ئاستی پەستان بە بەرزبوونەوە لە ئاسماندا ئەمەش دەبێتە هۆی ناڕەحەتی لە هەناسەداندا، بەڵکو زیاد لەوەش تەقینی خوێنبەرەکان لە بەرزاییە زۆرەکاندا لەگەڵ ئەوەشدا ئایەتە پیرۆزەکە بە ڕوونی ئاماژە

بەوە دەدات، کاتێك مرۆڤ لە ئاسماندا بەرز دەبێتەوە سنگی تەنگ دەبێتەوەو بە بەرزبوونەوەی زیاتریش حاڵەتەکە سەختر دەبێت تاکو دەگاتە زۆرترین بڕی ناڕەحەتی و بێتاقەت بوون (سبحان الله). ئەوەش ئەو زانیارییەیە کە ئایەتە قورئانییەکە پێش زیاتر لە چواردە سەدە پێش ئێستا باسی کردووە ئاخۆ موحەممەد ﷺ ئەم زانیاریيانەی لە کوێوە هێنابێت؟ بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئەم زانیارییانەی بە وەحی ناردووە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ.



## ٨٤ قورئان باس لە دەلاقەی ئاسمانی دەکات زانستی تازەش بە بەڵگەوە ئەو ڕاستییە گەورەیە دەسەلمێنێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾ (الرحمن: ٣٥) واتە: ئەم ئایەتە باس لەوە دەکات کە ئەگەر لە سنوور دەرچوون ئەوا بڵێسەی ئاگرو مسی تواوەیان بۆ دەنێرین ئیتر شکست دەخۆن و سەرکەوتوو نابن، هەروەها خوای گەورە لەسەر زمانی (الجن) دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ (الجن: ٨) واتە: ئێمە بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستەکار سەرنجماندا پڕە لە پاسەوانی بەتواناو بێشوومار و شهوبیش. زاناکان دۆزیيانەوە کە بۆشایی ئاسمان بارگاوییە بە گەردە بەئایۆن بووەکانی پلازما، هەروەها پشتێنەیەکی گەورە لە تیشکی مەترسیداریان ئاشکرا کردووە، ﴿شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ﴾ کە لە دوو چیندا دەوری گۆی زەوی داوە و لە زانستدا بە پشتێنەی (ڤان ئەلن) ناسراوە.

ئەم تیشکانە پێکهاتوون لە ئەلیکترۆن و پۆزیترۆنی بارگاوی کە بە خێراییەکی زۆر گەورە دەجولێن، ئەمە جگە لە تیشکەکانی گاما و تیشکە گەردونییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا تێبینی کرا هەوا بە ئایۆن دەبێت گەرچی جیاکراوە بێت و لەنێو دەفری داخراویشدا بێت.

تیبینی ئەوەش کرا ئەم دیاردەیە بە ئایۆنبوونی هەوا هەر ڕوودەدات تەنانەت ئەگەر ئەو دەفرە داخراوانە بە چینێکی ئەستووری قوڕ و شهوبیش داپۆشرا بن کە تیشکی گاما نایانبڕن، لێرەدا زانایان گەیشتنە ئەو بڕوایەی دەبێت تیشکێکیتر ئەو کارە بکات کە لە بۆشاییەکانی گەردونەوە بەرەو زەوی دێت، ئەو تیشکە ناونرا تیشکی گەردوونی کە بە شێوەیەکی بەردەوام لە بۆشایی دەرەوە دەگاتە زەوی، ئەم تیشکە وزەیەکی زۆر مەزنی هەیە بە شێوەیەك کە تێکڕای وزەی تیشکی گەردوونی نزیکەی ١٠ هەزار ملیۆن ئەلیکترۆن ڤۆڵتە، بۆ هەر تاکە تەنۆلکەیەك ئەم تیشکە پێکدێت لە پرۆتۆن بە ڕێژەی ٩١.٥٪ و تەنۆلکەکانی ئەلفا بە ڕێژەی ٧.٨٪ کە هەموو تەنەکان دەبڕێت، گەرچی ئەستوری و سروشتیان هەرچەندێك و هەرچۆنێك بێت زانایان کلارك، هارلۆ، دیمۆند، هیبل، فزیل کە گەورەترین زانایانی ئەم سەردەمەن ئەوەیان دۆزییەوە کە پاسەوانی بێتوانا و بێشومار و شهوبیش ﴿حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا﴾ واتە: چەندین شوهب و نەیزەکی دەرچوو لە ئاسمانەوە کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی گەردوون و فیزیایی گەردوونی نزیکە لەسەر ئەستەمیەتی بڕین و تێپەڕینی ئاسمانەکان ڕێك بکەون لەبەر ئەم هۆیانە:

١- توندی و بڕی تیشك لە پشتێنەی ڤان ئەلندا کە دەوری زەوی داوە لە بەرزاییە جیاوازەکاندا زۆر بەهێز و مەترسیدارن، بە شێوەیەك کە تێپەڕبوونی تەنێك بەو بەربەستە تیشکییەدا و کاریگەر نەبوونی بە تیشکە مەترسیدارەکانی زۆر ئەستەمە، بە هەزاران جار مەترسیدارترن لەو تیشکانەی لە ئەنجامی تەقینەوە ناوەکییەکانەوە دەردەچن.

٢- بەهۆی وزەو توندی تیشکە گەردوونییەکان لە بەرزاییە زۆرەکانی ئاسماندا کە مەترسی گەورە لەسەر تەنە زیندووەکان دروست دەکەن.

٣- مەترسی کاریگەری ئەو شێواندنەی بە بەردەوام ڕوودەدات لە بەرزاییەکانی بەرگە هەوادا کاریگەری هەر دەمێنێت، چونکە چڕی هەوا زۆر کەمەو ناتوانێت هەڵیانمژێت یان پێچەوانەیان بکاتەوە.

٤- ئەو شوهب و نەیزەکانەی لێرەو لەوێ لە ئەستێرەو هەسارەکانەوە دەردەچن چەند بەرز بینەوە بۆ سەرەوە، ئەوەندەش ڕێژەیان چەندجار دەبێت، زاناکان مەترسی نەیزەکەکان بە گرنگترین مەترسییەکان دادەنێن کە دەگونجێت ڕووبەڕووی کەشتییە ئاسمانییەکان ببنەوەو تێکیان بشکێنن، چونکە لە ناوچە بەرزەکانی بۆشایی ئاسماندا نەیزەکی پەرتەوازە و بڵاو هەن کە هەندێکیان بینراون و هەندێکیتریشیان نەبینراون، بریتین لە بارستەی گەورە لە ئاسن و ماددەی کانزایی تر کە کێشیان دەگاتە هەزاران تەن.

٥- چەند بەرەو بۆشایی بەرزبینەوە توندی تیشکی سەرو وەنەوشەیی مەترسییەکەی زیاد دەکات، پشتێنەی (ڤان ئەلن) هەردوو زانا (فیرنوف)ی ڕوسی و (ڤان ئەلن)ی ئەمریکی دۆزییانەوە، ڕوونیان کردەوە کە زەوی لە ناوچەی هێڵی یەکسانیدا بە سێ چین دەورە دراوە تەنۆلکە بارگاوییەکان لە تیشکە گەردوونیەکاندا چڕترە، کۆنترۆڵ دەکرێن کاتێك تەنۆلکەکان دەگەنە ئەم پشتێنەیە ناچاری دوو جۆر جووڵە دەبن:

أ. بە دەوری خۆیاندا خول دەخۆن.

ب. بە درێژایی ئەو هێڵانە خول دەخۆن.

بەڵام زاناکان ئەوەیان دۆزیوەتەوە چەند ناوچەیەك هەن بەتاڵن لە تەنۆلکە کوشندەکان کە وزەیەکی زۆر بەرزیان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ﴾ (المؤمنون: ١٧) واتە: بەڕاستی ئێمە لەڕاسەرتانەوە حەوت چینی ئاسمانمان دروست کردووەو ئێمە هەرگیز لە دروست کراوان غافڵ و بێئاگا نین، ئەم ناوچەیە کە تێپەڕین پیایدا ڕێپێدراوەو دەلاقەی ئاسمانییە لەسەر شاری قودسەوەیە و چوونە ژوورەوە لێیەوە بەرەو بۆشایی دەرەوە گونجاو و ئاساییە، بەبێ تووشبوون بە هەر گرفتێك ئەم کارەش لەڕێی مانگە دەستکردەکانەوە دەبێت، کە ئاسمان دەپشکنن و پاشان لە ناوچەیەکی سەنتەرییەوە کە دەکەوێتە سەرو قودسەوە بەرز دەبنەوە، چونکە ئاسانترینی ناوچەکانە بۆ

دەرچوون بەرەو بۆشایی ئاسمان، بەرەنجامە زانستییە نوێکان دووپاتیان کردۆتەوە مانگە دەستکردەکان بەسەر قودسدا دەسوڕێنەوە و پاشان لێیەوە دەردەچن.

ئەمەش دڵنیایی ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەری مەزن ﷺ دەدات لە ڕووداوی شەوڕەوی و بڵندبوونەوەدا کە لە مەککەوە بۆ قودس ڕۆیشت، پاشان لە مزگەوتی ئەقساوە کە لە قودسدایە بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە.

لەخوای گەورە داوا دەکەم ئەم موعجیزە گەورەیە بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شاردوومانییەکی زۆر گەورە بۆ بڕواداران، بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو مولحیدو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە، خوای گەورە جوانی فەرمووە:

﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە بە کام لە نیشانەکانی خودا دانپیانانێن.

شایانی ئاماژە بۆکردنە خاڵی سەرەتا کە پڕی تەنۆلکە کوشندەکان دەست بە کەمبوونەوە دەکەن، دیسانەوە دەکەوێتە سەرو شاری قودس و بە هێڵێکی لار ڕووەو سەرزەوی ناوچەی جەمسەری باکور درێژ دەبێتەوە، هیچ کەشتییەکی ئاسمانی ناتوانێت بە هێڵێکی ڕاست بەرزبێتەوە، بەڵکو دەبێت لەکاتی بەرزبوونەوەیدا بە دەوری خۆیدا بسوڕێتەوە ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێدەدات و دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ﴾ (الحجر: ١٤) واتە: ئەو بێباوەڕانە ئەگەر دەروازەیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بکرایەتەوە تا پیایدا سەربکەون و تێپەڕ بن (عروج بکەن) و نهێنی دروستکراوەکانی ئێمە ببینن هەر باوەڕ ناهێنن.

***



## زانستی تازەی سەردەم ڕاستییەکی زۆر گەورەی قورئانی ئاشکرا کرد دەربارەی گەردیلە:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ (يونس: ٦١) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ تۆ بە هیچ کارێك هەڵناستیت هیچ بەشێك لە قورئان ناخوێنیتەوە کە ئێمە ئاگادار نەبین، ئێوەش ئەی خەڵکینە بە هیچ هەڵسوکەوتێك هەڵناستن ئێمە شایەت نەبین بەسەرییەوە، لە کاتێکدا ئەنجامی دەدەن و تیایدا ڕۆدەچن هیچ شتێکیش لە پەروەردگاری تۆ ون نابێت، لە پارچە ئەتۆمێکەوە بگرە لە زەوی یان ئاسماندا بچوکتر بێت یان گەورەتر کە لە دۆسیەیەکی تایبەتی ئاشکرادا لای ئێمە تۆمار نەکرابێت، یان دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾ (الزلزلە: ٧–٨) واتە: جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێت، ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە.

لە کۆندا باوەڕ وابوو گەردیلە بچووکترین شتە شتێك نییە کێش و قەبارەی لە گەردیلە بچووکتر بێت، بەڵام زانستی نوێ سەلماندی گەردیلەش توانای بەشکردنی هەیە، ئەوەیە قورئانی پیرۆز بەر لە زانستی نوێ باسی کردووە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستدا ئەو وتەیە سەلمێنرا، کاتێك زانایان ئاشکرایان کرد کە گەردیلەی هەندێك مادە وەك (ڕادیۆم و یۆرانیۆم) هەر خۆی بۆ خۆی بەش دەبێت و لێیانەوە تەنۆلکەی بارگە موجەب دەردەچێت، پێیان دەوترێت (تەنۆلکەی ئەلفا) و تەنۆلکەی بارگە سالب کە پێیان دەوترێت (تەنۆلکەی دەلتا) لەگەڵ تیشکێك کە بە (گاما) ناودەبرێت.

زانستی تازە سەلماندی کە گەردیلە پەرت دەکرێت، لەساڵی (١٩٣٩) زایینی هەردوو زانای ئەڵمانی (هاهن) و (استتراسمان) لە پەیمانگای بەرلین گەیشتنە کەرتکردنی گەردیلەی یۆرانیۆم بۆ دوو بەشی گەورەو چەند بەشێکیتر، ئەم بیرۆدزەی قورئانی پیرۆز

لە سەدەی حەوتەمدا لە سەر زمانی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ﷺ لە نەتەوەیەکی نەخوێندەوار کە لە سارادا دەژیان و هیچ پەیوەندییەکی بەمجۆرە زانیارییانەوە نەبوو، بەڵێ بەڕاست ئەوە موعجیزەیەکی زۆر ناوازە و سەرنج ڕاکێشی قورئانی پیرۆزە کە لە سەدەی زانست و تەکنەلۆژیادا وەك ڕۆژی ڕووناك ئاشکرا دەبێت.

چەندین لێکۆڵینەوە سەلماندیان هەر توخمێك لە گەردیلە پێکدێت ئەو گەردیلانەش لە پێکهاتەیاندا سادە نین، وەك گومان دەبرێت بەڵکو لە تەنۆلکەی بچووك پێکدێت پێی دەوترێت (پرۆتۆن)، بە دەوریشیدا تەنۆلکەی بچووك هەن کە (ئەلیکترۆنەکان)ن ئەم ئەلیکترۆنانە لە جووڵەیەکی بەردەوامدان بە دەوری ناوکی گەردیلەکەدا کە پرۆتۆن و نیوترۆن پێکدێنن، پرۆتۆن بارگەی موجەبی هەڵگرتووەو ئەلیکترۆنیش بارگەی سالب. بارستایی پرۆتۆن ١٨٤٠ هێندەی بارستایی ئەلیکترۆنە، بۆیە ڕاستە بوترێت زۆرینەی بارستایی تەن لە پرۆتۆن پێکدێت لە مانەوە دەردەکەوێت کە پێکهاتەیەك هەیە بچووکتر لە گەرد و گەردیلە دروست وەك ئەوەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەبارەیەوە دواوە ئەوەش بە دۆزینەوەیەکی زانستی دەژمێردرێت کە لەم دوا دواییانەدا ئاشکرا کرا.

##  ٨٦ هاوڕابوونی زانستی تازە لەگەڵ قورئانی پیرۆز لەبارەی دروستبوونی گەردوون:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ (الأنبياء: ٣٠) واتە: ئایا کافرو خوانەناسان نابینن و بۆیان ڕوون نەبووەتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچەبوون و لەوەو دوا لێکمان جیاکردنەوە؟

دوای ئەو گەشەسەندنە گرنگەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا مرۆڤایەتی لەبواری فەلەکناسی تیۆرییەوە بەخۆیەوە بینی، هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی بیردۆزی ڕێژەیی گشتی کە چوارچێوەی ڕاستەقینەی بۆ لێکۆڵینەوەی گەردوون دانا، لە ڕاستیدا مەسەلەی سەرەتای دروستبوونی گەردوون یەکێکە لەو مەسەلانەی فەیلەسوف و

زاناکان لێی دواون، بەڵام بەشێوەیەکی وردو تێرو تەسەل و یەکلاکەرەوانە نەبوو هەربۆیە ژمارەی تیۆر و بۆچوونەکان زۆربوون، تاکو زانای بەلجیکی گەردوونناس (جۆرج لیماتەر) لە ساڵی (١٩٢٧) زایینیدا دەربارەی سەرەتای دەستپێکردنی گەردوون دواو وتی: لە سەرەتای دروستبوونی دا گەردوون بارستەیەکی گازی بووە چڕی و درەوشانەوەو گەرمییەکەی زۆر بەرز و مەزن بوو، پاشان لەم بارستاییەداو بە کاریگەری ئەو پەستانە گەورەیەی لە پلە گەرمییە بەرزەکەیەوە دروست بوو، تەقینەوەیەکی گەورە ڕوویداو پەرتی کردو بەشەکانی بە هەموو ئاڕاستەیەکدا بڵاوەی پێکرد، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا ئەستێرەو هەسارەو گەلە ئەستێرەکان دروست بوون، هەندێك لە زانایان ئەم بیردۆزەیان بە بیردۆزی تەقینەوە گەورەکە ( The Big Bang Theory)..

به ڕای زانایانی فیزیای گەردوون لە بەشێك لە ملیار ملیار بەشی چرکەیەك (١٠- ٣٤) چرکەو، بەر لە زیاد لە چواردە ملیار ساڵەوە گەردوون بارستەیەکی مەزنی پلە گەرمی زۆر بەرزبووەو بە قەبارەی گۆیەکیش بووە، تیرەکەی نەگەیشتووەتە بەشێك لە هەزار بەشی سانتیمەترێك، لە ساڵی ١٩٤٠ی زایینیدا زانای ئەمریکی بەڕەگەز ڕووسی پسپۆڕ لە بواری گەردوونناسی (جۆرج گامۆف) پاڵپشتی تیۆری تەقینەوە گەورەکەی کردووە، ئەوەش ڕێی خۆشکرد لەبەردەم هەردوو زانا (یاترياس) و (ویڵسون) لە ساڵی ١٩٦٥ زایینیدا کە شەپۆلە ڕادیۆییەکان لە هەموو بەشەکانی گەردوونەوە وەربگرن، بە جۆرێك کە لە هەر جێگایەکدا تۆمار بکرانایە هەمان خاسیەت و سیفەتی فیزیاییان هەبوو و بەپێی کات و ئاڕاستەش نەدەگۆڕان، ئەم شەپۆلانە ئەوانەن کە لە سەردەمە دوورەکانەوە هاتوون و پاشماوەی ئەو تەقینەوە گەورەیەن لە چرکە سەرەتاییەکانی ڕوودانیدا کە بە دوایدا دروستبوونی گەردوون دێت.

لە ساڵی ١٩٨٩ زایینیدا ئاژانسی بۆشایی ئەمریکی (ناسا) مانگی دەستکردی (cobe explorer)ی بۆ بۆشایی ئاسمان نارد، کە لە دوای سێ ساڵ زانیاری زۆر وردی بۆ زەوی نارد، زانیارییەکان دڵنیایی تەواو لەسەر ڕاست و دروستی تەقینەوە

گەورەکە دەدەن، ئەم ڕاستییە زانستییە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە لە ئایەتی ٣٠ی سورەتی (الأنبياء)دا هاتووە: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ مانای ئایەتەکە بەو جۆرەیە: زەوی و ئاسمانەکان بە ئەستێرەو هەسارەو گەلە ئەستێرەکانەوە کە هەموویان پێکەوە ئەم گەردوونەی تیایدا دەژین پێکدێنن، لە بنەڕەتدا بریتیبوون لە تەنها یەك بارستەی پێکەوەلکاو، پاشان ئەو بارستەیە تەقیوەتەوە و لە دوای ئەوە ئەستێرەو هەسارەو گەلە ئەستێرەکان دروستبوون، ئەوەش زانایانی گەردوون لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا دۆزیویانەتەوە هەردوو زانا (یاتریاس) و (ویلسۆن) لە ساڵی ١٩٧٨ زایینیدا خەڵاتی نۆبڵیان لە فیزیادا لەسەر ئەم دۆزینەوەیەیان وەرگرت، بە ڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکی زانستیتری تازەی قورئانە کە زاناکان پاش چەندەها لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوتووە کەچی قورئان ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا باسی کردووە.



## ٨٧ خۆر و مانگ بە حسابی ورد دروستکراون:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾ (الرحمن: ٥) واتە: خۆرو مانگیش بە حسابێکی ورد دروست کردوون و دایناون لە خولگەکانیاندا و لە سوڕانەوەدان. ئەم ئایەتە ئاماژە بە ساڵی خۆری و ساڵی مانگی نادات وەك هەندێك کەس گومان دەبەن، بەڵکو ئیعجازێکی گەورە ڕاڤە دەکات کە زانستی نوێ ئاشکرای کرد ئەویش ئەوەیە خۆر و مانگ لە ڕووەکانی گەرمی و قەبارەو دووریەوە سیستمێکی ورد و حساب بۆکراویان هەیە گەر خۆر کەمێك گەورەتر بێت یان نزیکتر بووەوە لە زەوی ئەوا گڕ دەگرێ خۆ ئەگەر کەمێك بچووك بووەوە یاخود لە زەوی دوورکەوتەوە ئەو کاتە دەیبەستێ، بە هەمانشێوە مانگیش گەر کەمێك گەورەتر بوو یان نزیك ببووەوە بەهۆی هەڵکشانی دەریاوە خەڵك نقومی ئاو دەبوو خۆ ئەگەر کەمێك بچووك بێتەوە یاخود لە زەوی دوورتر بکەوێتەوە دەریاکان نامێنن.

## ٨٨ ڕاستییەکی قورئان ئاشکرا دەبێ لەبارەی تەنە ئاسمانییەکان:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ۝ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا﴾ (الجن: ٨-٩) واتە: ئێمەش، واتە پەرییەکان بەڕاستی بەرەو ئاسمان کشاین و هەست و هۆشمان خستەکار سەرنجماندا پڕە لە پاسەوانی بەتواناو بێشومار نەیزەکیش بە هەموو لایەکدا دەکشا، ئێمە جاران لە هەندێك شوێنی ئاسماندا خۆمان حەشار دەدا بۆ گوێگرتن و دەنگوباس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوەی بیەوێت گوێ بگرێت یەکسەر نەیزەکێکی بۆ ئامادەیەو بۆی دەهاوێژرێت. زاناکان دەڵێن: نەیزەك تەنی ئاسمانین قەبارەی جیاوازییان هەیە کە بە خێرایی ٢٢٥٠ کیلۆمەتر چرکە بەرەو زەوی دێن، لە شەویشدا بەهۆی لێکخشاندنیان لەگەڵ گەردەکانی بەرگە هەوای زەوی بە درەوشاوەیی دەبینرێن، هەرکاتێك هەمووی سوتا بە شوهب ناودەبرێت و کاتێکیش بەشێکی مایەوەو کەوتە سەر زەوی ئەوە نەیزەکی پێدەوترێت.



## ٨٩ خێرایی جووڵەی مانگ زیاترە لە خێرایی جوڵەی خۆر:

زانستی نوێ سەلماندوویەتی خۆر و مانگیش دەجولێن: لە ئایەتی (٢)ی سورەتی (الرعد)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ کەواتە هەریەکە لە خۆر و مانگیش لە جوڵەدان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (یس: ٤٠) واتە: نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بە ئاسانی دەسوڕێنەوە، هەریەکە لە خۆر و مانگ بە خێرایی تایبەت بە خۆیان دەسوڕێنەوە:

١. خێرایی جوڵەی خۆر ١٢ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

٢. خێرایی جوڵەی مانگ ١٨ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

٣. خێرایی جوڵەی زەوی ١٥ کیلۆمەترە لە هەر چرکەیەکدا.

سەرنج بدەن لەو موعجیزە زانستییە گەورەیەی قورئان کە فەرمووی: نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بکات، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت. ئەوە لە کاتێکدا کە چواردە سەدە پێش ئێستا ئەوە لە قورئاندا هاتووە زانستی تازەی سەردەمیش ئەوەی بە بەڵگەوە سەماند، بەڕاستی پێویستە بڕواداران موعجیزەکانی ئەم قورئانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن، ئەوەش گەورەترین دیارییەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە.



## قورئان دەفەرموێت: خۆر گەورەترە لە مانگ، زانستی تازەش بە بەڵگەوە ئەو ڕاستییە دەیسەلمێنێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ۝ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ۝ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ۝ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ۝ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ (الأنعام: ٧٥-٧٩) واتە: (بەو شێوەیەش دەسەڵاتی تۆکمەمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەست بێت و لە ڕیزی دڵنیاکاندا بێت، ئینجا کاتێك شەو باڵی کێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەکی گەشی گەورەی بینی بۆیە وتی: ئاگاداربن وا داینێین ئەمەیان پەروەردگارمە کاتێك ئەستێرەکەی لێ ئاوابوو وتی: من شتی لەبەرچاو ونبووم خۆشناوێت و ناپەرستم، ئینجا کاتێك مانگی بینی هەڵهات وتی: ئاگاداربن وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە کاتێك ئەویش ئاوا بوو وتی: سوێند بە خوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایە ئەوە بێگومان لە ڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم ئینجا کاتێك

خۆری بینی هەڵهات وتی: ئاگادار بن وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە ئەمە گەورەتریشە کاتێك ئەویش ئاوا بوو وتی: ئەی خەڵکینە ئەی خزمینە بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردوتانە بە هاوەڵ و هاوبەش بۆ پەروەردگار بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردووەتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لە کاتێکدا (ڕووم لە هیچ شتێکی تر ناکەم بە دڵئارامی تەواویشەوە دەڵێم کە هەرگیز من لە ڕیزی هاوەڵگێراندا نیم بۆ پەروەردگار).

ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) چاو بە ئاسماندا دەگێڕێت بەو نیازەی بەدیهێنەری بدۆزێتەوە کە گەورەترە لە هەموو شتێك، بۆیە لە تێڕاماندا بە پلەبەندی لە بچووکەوە تا پایەبەرزەکان دەچێت بە هەسارەی ڕۆشن دەستپێدەکات کە بە بچووکی دەیبینێت و پاشان ئاوڕ بۆ مانگی درەوشاوە دەداتەوە لە چواردە شەویدا، کە ڕووناکییەکەی ئاسمانی پڕ کردبوو، بەڵام زۆری نەبرد ئەویش ونبوو لە دواییدا دیدو هزری بەرەو خۆر ئاڕاستە دەکات بە گەورەتر لە هەسارەو مانگیش دەیبینێت. ئەمە سەبارەت بە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) و پلەبەندی بیرکردنەوەی مرۆییانە، بەڵام ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژە بە خۆر دەکات بە دەستەواژەی (أکبر) و ئەو دەربڕینەی بۆ مانگ بەکار نەهێناوە، گەرچی پەپکە دیارەکەشی کەمێك گەورەترە لە پەپکەی خۆر زۆریش لە هەسارەکان گەوەرتر دەردەکەوێت، خوای دانا و زانا دابەزێنەری قورئان فێرمان دەکات خۆر لە مانگ و هەموو هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر گەورەترە زانستی نوێ سەلماندوویەتی مانگ زۆر لە خۆر بچووکترە، تیرەکەی (٤٣٦) جار لە تیرەی خۆر بچووکترە و (٣٣٣) هەزار جار لە هەسارەی زەوی بچووکتر. توخوا پێغەمبەر ﷺ ئەوەی چۆن زانی چواردە سەدە پێش ئێستا بەڵێ ئەوە فەرمودەی خوای زانا و کاربەجێیە بەڕاستی موعجیزەیەکی ڕوون و ئاشکرای قورئانە.

***



## نهێنییەکی تازەی زانستی لەبارەی ئەستێرەکان موعجیزەیەکی قورئانی ئاشکرا کرد:

لەو کاتەدا کە زانستی ئەزمونکاری جیایی ناکات لەنێوان ڕووناکی و نووردا قورئانی پیرۆز وەسفی خۆر دەکات بەوەی ڕووناکی بەخشەو مانگیش نوور بەخشە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِیَاۤءً وَٱلۡقَمَرَ نُورࣰا﴾ (یونس: ٥) ڕووناکی (ضوء) ڕاستەوخۆ لەو تەنەوە دەردەچێت کە خۆی ڕووناکی دروست دەکات، کاتێك ئەو ڕووناکییەش دەکەوێتە سەر تەنێکی تاریك نوورەکەی دەداتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَلَـٰمَـٰتࣲۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ یَهۡتَدُونَ﴾ (النحل: ١٦) واتە: نیشانەی زۆر و زەبەندی لە زەویدا دابین کردووەو بەهۆی ئەستێرەکانەوە خەڵکی ڕێی خۆیان دەردەبەن.

یان دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُوا۟ بِهَا فِی ظُلُمَـٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ (الأنعام: ٩٧) واتە: هەر ئەو زاتە ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تا ببێتە هۆی ڕێنموویتان لەناو تاریکییەکانی سەر ڕووکاری وشکانی و دەریاکاندا، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوەداوە کە ڕێنموویی لە تاریکییەکاندا بەهۆی ئەستێرەکانەوەیە نەك هەسارەکان، لەگەڵ ئەوەشدا هەسارەکانیش نوور و ڕۆشناییان وەك ئەستێرەکان دەگاتە زەوی، زانستی نوێ سەلماندوویەتی ئەستێرەکان سەرچاوەی ڕووناکی بنەڕەتین لە ئاسماندا، چونکە ئەوانە تەنی ئاسمانی کڵپە سەندوون و پلەی گەرمییان دەگاتە ملیۆنان پلەی سەدی، لەبەرئەوە ڕووناکی لە خودی خۆیەوە بەرهەم دێنێت و بەرەو دەرەوە دەریدەکات و بەوەی گۆی زەوی ڕووناك دەکاتەوە، بەڵام ڕۆشنایی (ڕوناکی) هەسارەکان بنەڕەتی نین بەڵکو نوور و ڕۆشنایی لە ئەستێرەکانەوە وەردەگرن و بەرەو زەوی دەیدەنەوە، ئەوەش لەبەرئەوەی هەسارەکان تەنی ئاسمانی ساردن و ئاگریان لەنێودا نییەو ناتوانن لە خودی خۆیانەوە ڕووناکی پەخش بکەن.

لێرەدا تێبینی دەکرێت کە قورئانی پیرۆز هەسارەکانی ناو نەبردووە بەوەی هۆی ڕێنموونی بن لە تاریکیەکاندا بەڵکو تایبەتی کردووە تەنها بە ئەستێرەکانەوە ئەوەش

لای مرۆڤ بەر لە (١٤٠٠) ساڵ بە دڵنیاییەوە نەزانرا بوو ئەوە گەورەترین موعجیزەیە، توخوا پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پێش (١٤٠٠) ساڵ چووزانێ باس لە بابەتێکی زانستی ئاوا گەورە بکات کە تازە بە تازە زانستی نوێ پاش چەندەها دیراسات و لێکۆڵینەوە جا ئەوجار ئەو ڕاستییە گەورەیان بۆ دەرکەوت، بەڵێ خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزە خوای گەورەو زاناو دانایە کە ئەو زانیارییانەی بە وەحی بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ڕاگەیاندووە تا ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستی پەیامەکەی.




## مردنی ئەستێرەکان ڕاستیەکی گەورەی زانستییە:

زاراوەی ئەستێرە بە تەنێکی گەردوونی پرشنگداری گۆیی دەوترێت کە بەردەوام کارلێکی ناوکەیەکبوونی تێدا ڕوودەدات ئەویش بە یەکگرتنی ئەتۆمە سووکەکانی گازی هایدرۆجین، کە ئەم گازە پێکهاتەی ئەستێرەکانە لە ئەنجامی ئەم کارلێکەدا گەرمی و ڕووناکی و تیشکەکانی تر پەیدا دەبن و هایدرۆجینیش بۆ هیلیۆم دەگۆڕێت، بۆ نموونە خۆر پلەی گەرمی چەقەکەی ١٥ ملیۆن پلەی سەدییە. زانایان پێیان وایە خۆرەکەی خۆمان بڕێکی زۆر هایدرۆجینی هەیە.

هەروەها خۆر لە هەر چرکەیەکدا ٦١٦ ملیۆن تۆن هایدرۆجین دەکات بە ٦١٢ ملیۆن تۆن هیلیۆم، بەوەش ٤ ملیۆن تۆن کەمدەکات کە دەبێتە وزە بە شێوەی گەرمی و ڕووناکی و تیشکەکانیتر بەو شێوەیە بڕی (٥٣,٢٢٢,٤٠٠,٠٠٠) تۆن هایدرۆجین سوتەمەنی ڕۆژێکی خۆرە، هەروەها لە هەر مەترێکی چوارگۆشەی خۆردا نزیکەی ٦٤ ملیۆن وات وزە دەنێرێتە دەرەوە. کەواتە خۆر بەردەوام لە کەمبووندایە و ڕۆژێك دێت دەکوژێتەوەو دەبێتە تەنێکی ئاسمانی وەکو کونی ڕەش، یان نیوترۆنە ئەستێرەکان یان گرگنی سپی ئەستێرە بە قۆناغەکانی ژیانی خۆیدا تێپەڕ دەبێت، لە سەرەتای دروستبوونییەوە لە تەمگە، لەوە پاشان لەوپەڕی گەنجیدا کە کارلێکەکانی

بەردەوامەو برێکی زۆر هایدرۆجینی هەیەو، لە کۆتایشدا پاش نەمانی هایدرۆجینەکەی و گۆڕانی بۆ تەنێکی ئاسمانی تر کە سیفەتی ئەستێرەی تێدا نییە ئەستێرەکان لەم قۆناغەدا دەگۆڕێن بۆ زەبەلاحی سوور یان نیوترۆنە ئەستێرە، یان گرگنی سپی یاخود کونی ڕەش، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ۝ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ﴾ (التكوير: ١-٢) واتە: دیارە کوژانەوەی خۆر واتای نەمانی کارلێکی ناوکەیەکبوونەکەیەتی کە ئەو کاتە هیچ ڕووناکییەك نادات، هەروەها خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ﴾ (النجم: ١) واتە: سوێند بە ئەستێرەکان کاتێك دەمرێت بەڕاستی ئەو کەسانەی کە دوورن لەو ئاینە پاك و پیرۆزە کە ئەو بەڵگانەیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە، دەبوو بە دڵ و بە گیان شوێن ئەم قورئانە بکەون، چونکە ئەو ئیسلامە ئاینی پێشکەوتن و زانست و زانیارییە هەتا ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوات زیاتر ڕاستییە زانستییەکان لە قورئاندا ئاشکرا دەبن.



## ٩٣ مەلەکردن لە ئاسماندا و مەلەکردن لە زەوی دا لەیەك دەچن:

گەورەترین حەوزی مەلەکردن لە جیهاندا وەکالەتی ئاسمانی ئەمریکی ناسا دروستی کردووە کە پڕ کراوەتەوە بە زیاتر (٢٣٠٠)م[٢] لە ئاو، سەیر لەوەدایە ئەم حەوزە تایبەتکراوە بە ڕاهێنانی کەشتیوانی ئاسمانی لەسەر چاککردنی ئەو لەکارکەوتن و پەککەوتنانەی کە تووشی گالیسکە ئاسمانییەکان دەبێت، بێگومان ئەمە باشترین ژینگەیە بۆ ڕاهێنان چونکە زانایان ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە مەلەکردن لە ئاسماندا و مەلەکردن لە ئاودا تا ڕادەیەکی زۆر لەیەك دەچن و وەك یەك وان، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ڕاستی هاتوچۆو مەلەکردنی گالیسکەکانی لە ئاسماندا بۆ وەسف کردووین کە دەفەرموێت: ﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ (يس: ٤٠) هەر بۆیە قورئانی پیرۆز وشەی مەلەکردن (يسبحون)ی بەکارهێناوە تاوەکو دەربڕینێك بێت بۆ هاتوچۆکردنی گالیسکەکان لە ئاسماندا هەر ئەوەشە کە زانایان جەختی لەسەر دەکەنەوە لە ئێستادا.

## ٩٤ دۆزینەوەی ئەستێرەیەكی نوێ پێكهاتەی لە ئەڵماسە:

ئەو ئەستێرەی كە دۆزراوەتەوە نزیكەی ٩٠٠ ساڵی ڕووناكی لە زەوییەوە دوورە، مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر بەر لە ١١ بلیۆن ساڵ كە لە قۆناغەكانی كۆتاییدا بووە، قەبارەی ئەم ئەستێرەیە بە ئەندازەی زەوی دەبێت بە درەوشانەوەكەی ئاسمان دەڕازێنێتەوە و گرانبەهاترین ئەستێرەیە لە بوونەوەردا، لێرەوە حاڵی دەبین لەوە پێویستە سوپاسگوزاری خوای گەورە ببین پاك و خاوێنی و گەورەیی بۆ ئەو زاتە بەسۆز و میهرەبانە، جێگەی خۆیەتی كە باسی ئەو ئاماژە قورئانییە جوانە بكەین كە باس لە جوانی و ڕازاندنەوەی ئاسمان دەكات بەم ئەستێرانە: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ﴾ (الحجر: ١٦) بەڕاستی ئەم ئایەتەش موعجیزەیەكیترە لە موعجیزە گەورەكانی قورئان.

## ٩٥ ئەستێرە دەنگی لێوە دەردەچێت:

زاناكان ئەوەیان ئاشكرا كرد كە ئەستێرەیەكیان دۆزیووەتەوە دەنگێكی لێوە دەردەچێت وەك دەنگی چەكووش وایە، جگە لەوەش ئەم ئەستێرەیە شەپۆلی كێشكردن دەردەكات كە دەتوانێت هەر شتێكی بیەوێت كونی دەكات بە زەویشەوە لەبەرئەوە دوو ناویان لێناوە یەكەمیان چەكوشی گەردوونی، دووەمیشیان كونكەر ئەم زانیاری و لێكۆڵینەوەی زانایانیش خوای گەورە تەنها بە دوو وشە بە تەواوی باسی كردووە، كە دەفەرموێت: ﴿النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ دەفەرموێت: ﴿وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ۞ النَّجْمُ الثَّاقِبُ﴾ (الطارق: ١-٣)، واتە: سوێند بە ئاسمان و سوێند بە تارق جا تۆ چووزانی تارق چییە؟ ئەستێرەیەكە بە ڕووناكییەكەی تاریكی دەبڕێت. وشەی (الطارق) دەربڕینێكی زۆر تەواوە بۆ كاری ئەم ئەستێرە. هەروەها وشەی (الثاقب) تەواو وەسفی ئەستێرەكە دەكات، (كونكەر) لە كاتی خوێندنەوەی (سبحان الله).

هەروەها زانایەکی تەمەن ٣٢ساڵی هیندی کە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت دۆزییەوە کە ئەگەر ئەستێرەیەك بچووکتر بێت لە (٤،١)ی خۆر ئەوا کە مرد دەبێتە گرگنی سپی و، ئەگەر لە (١،٤ تا ٢،٣) جار لە خۆر گەورەتر بوو دەبێتە ئەستێرەی نیوترۆنی، کە هەزار جار لە خولەکێکدا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، دەنگێك دەردەکات لە خێرایی خولانەوەکەیدا کە وەك تەقە تەقی لەدەرگادان وایە، کە ئەم دەنگەش وەکالەتی ناسا تۆماری کردووەو هەرکەس بیەوێت دەتوانێت لە یوتیوبەوە گوێی لێبگرێت.



## ٩٦ لێکۆڵینەوە تازەکان بە بەڵگەوە ئاشکرایان کرد کە ژیان لە ئاسمانەکاندا هەیە:

دوای دۆزینەوەی پاشماوەی ژیانی سەرەتایی لە سەر یەکێ لە نەیزەکەکان کە لە ئاسمانەوە دۆزرابۆوە، زانایان دەستیانکرد بە گەشت و لێکۆڵینەوە بۆ دۆزینەوەی ئەم بوونەوەرانەی لە ئاسمانەکان دەژین، دوای ئەوەی ئاویان لەسەر ڕووی مەریخ دۆزییەوە چەند ئەستێرەیەکیتر دۆزرایەوە، ئەوان بەو ڕاستیە گەیشتن کەوا ڕاستییەکی گەردوونی هەیە، ئەویش بریتیە لەوەی کەوا بەڵێ ژیان لە هەموو شوێنێك بەرجەستە دەبێت، مەریخ لە ڕووی سیستەمی خۆریشەوە زۆر لە زەوییەوە نزیکە ئەمەش بەهۆی نزیکی خۆیەتی، لە زەوی بۆیەش زانایان بیری بوونی ژیانیان لەسەری کردووە بە وێنەوە خاکی مەریخ دەرکەوتووە کە وەك زەوی خاك و خۆڵ و بەردەکانی دەرکەوتوون ئەمە ڕاستییەك بوو زانایان نەیاندەزانی تاکو سەدەی بیست و یەك، بەڵام قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە ئەوەی باس کردووە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۢ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ﴾ (الشورى: ٢٩) واتە: لە نیشانە و بەڵگەکانی گەورەیی دەسەڵاتی خوا دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو زیندەوەرانەیە کە تیایاندا بڵاوی کردۆتەوە هەرکاتێکیش بیەوێت تواناو دەستەڵاتی

کۆکردنەوەیانی هەیە، (سبحان الله). خوێنەرانی بەڕێز سەیربکەن خوای گەورە دەفەرموێت: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەو زیندەوەرانەیە کە تیایاندان واتە لە ئاسمانەکان و زەوی دانە بەڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورە هەیە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئایا پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لەناو گەلێکی نەخوێندەوار و لە بیابان دا چۆن لە سەدەی حەوتی زاییندا پێش زاناکانی گەردووناسی کەوت، پێی ڕاگەیاندین کە بەڵێ بوونەوەر لە ئاسمانەکانیش بوونیان هەیە. بەڕاستی قورئان موعجیزەی وای تیادایە هەتا ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوات ڕاستییەکانی قورئان ڕۆژ بە ڕۆژ دەردەکەون.



## ٩٧ زانستی تازەی سەردەم هاوڕایە لەگەڵ قورئان سەبارەت بە دروستبوونی هەورەکان:

زانایان کاتێ باسی دروستبوونی هەورەکان دەکەن بەمشێوەیە بۆچی چوونە ئەم هەورە زەبەلاحانەی ئاسمان لە سەرەتادا تەنها پارچەی زۆر بچووك بوونە، وەك پارچە لۆکەی بچووك وان، بەڵام بەهۆی بایەکان بە یەکتریان دەنوسێنن و دەیانکەن بە یەك پارچە هەور تاوەکو بە شێوەی شانی مەزن بەدیار کەون، کە هەریەکەیان نزیکەی ٤٥ هەزار پێ بەرز دەبن، بەم هۆیەشەوە سەرتۆپکەی ئەو هەورە شاخینانە بە بەراورد لەگەڵ ژێرەکەی زۆر سارد دەبێت، لەبەر ئەو جیاوازییەی کەشوهەوایەشیان کە ساردی و گەرمی پێکدەهێنن و هەورە تریشقەو بروسك دروست دەبن، زۆرجاریش ڕووناکییەك دەهاوێژێت کە فرۆکەوانەکان دووچاری کەم بینینێکی کاتی دەبنەوە، ئەوە ئەو دیاردەیەیە کە ناویان ناوە (العمى المؤقت)، کوێرەیی کاتی با سەیرێکی دەربڕینەکانی قورئان بکەین بۆ ئەم دیاردەیە خوێنەرانی بەڕێز ئەم ڕوونکردنەوەی زانایان هەمان ئەم وردەکارییە کە خوای گەورە باس کردووەو دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَن مَّن يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ﴾ (النور: ٤٣) واتە: ئایا نابینیت کە بێگومان خوایە



ئارامی و شێنەیی هەورەکان بە ئاسماندا دەبات، دوایی پەیوەستیان دەکات بەیەکەوە ئەوسا کەڵەکەیان دەکات لەسەر یەك، ئینجا دەبینیت لەتوێی ئەو هەورانەوە کە وەکو کێو وان باران و تەرزە دەبارێنێت، جا لە سوودی ئەو بارانەیە هەر کەس خوا بیەوێت خێرو بەرەکەت دەبەخشێت، هەر کەسیش کە بیەوێت لێی دووردەخاتەوە هەورە بروسکەکان ئەوەندە بەهێزن خەریکە بریسکەکەیان بینایی چاوان بەرێت ئەوە واتە: (العمى المؤقت) خوێنەرانی بەڕێز سەیر بکەن هەمان ئەم وردەکارییانەی تێدایە کە زایان باسیان کردووە پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە کە فەرموتە: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیاوە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەو قورئانە ڕاستە.



## ٩٨ زانایەکی ئەمریکی سەرسام بوو کە گوێبیستی دوو ئایەت بوو لە قورئانی پیرۆز:

ئەستێرەکان وەك چرا وان گەردوون تاریکە ئەگەر بە ڕۆژیش لەسەر ڕووی زەوی بین لە بنەڕەتدا هەر تاریکە، زانا گەردوون ناسەکان ڕایان وایە ئەم ئەستێرانە وەکو ڕووناك کەرەوەی گەردوون وان، واتە وەکو گڵۆپ کاری ڕووناك کردنەوە دەبینن ئایا قورئان باسی ئەم دیاردەیەی کردووە؟

سەیر بکە خوای گەورە چی دەفەرموێت: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾ (یس: ٣٧) واتە: هەروەها بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکراتر بۆیان شەوە کە پۆشاکی ڕووناکی ڕۆژ لەبەر دادەماڵین بەو هۆیەوە دنیایان لێ تاریك دەبێت، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾ (الملك: ٥) واتە: بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان کردووە بە چراخان بەهۆی ئەستێرەکانەوە بەڕاستی ئەمەش بەڵگەیەکیترە لەسەر ڕاستی و دروستی ئاینی پاکی ئیسلام، ئایا پێغەمبەر ﷺ چواردە سەدە پێش ئێستا ئەوەی چۆن زانیوە؟ بەڵێ ئەوە خوای گەورەی زاناو ئاگادار بە هەموو



وردەکارییەك ئەمەی بە وەحی بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی ڕاگەیاندووە، تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی، پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجاری شارەزا لە ئیعجازی قورئان دەڵێت: کاتێك ئەم دوو ئایەتەی سەرەوەم بۆ زانایەکی ئەمریکی خوێندەوە زۆر بە سەرسامییەوە وتی: ناکرێ ئەمە وابێت تەنها مەگەر ئەم قورئانە لەلایەن دروستکاری ئەم گەردوونەوە هاتبێتە خوارەوە.



## ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی زانستی گەورە لە سورەتی (القصص)دا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ۝٧١ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (القصص: ٧١-٧٢) واتە: ئایا بینیوتانە ئەگەر خوای گەورە تا ڕۆژی دوایی زەویتان بۆ بکاتە شەو، کام خوایەی تر جگە (الله) ڕۆژ و ڕووناکیتان بۆ دێنێت، ئایا بینیوتانە ئەگەر خوای گەورە بەردەوام تا ڕۆژی دوایی زەویتان بۆ بکات بەڕۆژ، کام خودایەی تر جگە لە (الله) شەوتان بۆ دێنێت تا تیایا ئارام بن؟ ئایا نابینن و تێنافکرن.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە و سەرنج بدەو بزانە زانستی تازەی سەردەم دەربارەی ئەو بابەتە چی دەڵێت: بەڕاستی ئەوە نیعمەت و بەخششێکی زۆر گەورەیە کە خوای گەورە زەوی دەخولێنێتەوە تا شەو و ڕۆژ دروست ببێت، خۆ ئەگەر زەوی بە دەوری خۆیدا نەخولایەتەوە، ئەوکاتە ڕوویەکی زەوی بەردەوام شەوی یەکجاری و ڕووەکەی تری ڕۆژی یەکجاری دەبوو، بەوەش ڕوویەکی دەیبەستن و ڕووەکەی تری دەسوتا، بۆیە پێویستە سوپاسی خوای گەورە بکەین لەسەر ئەم نیعمەتە مەزنە بەڕاستی ئەو ئایەتە بەسە بۆ ئەو کەسانەی کە تا ئێستا لە گوماندان دەربارەی ئەو قورئانە، چونکە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار چۆن ئەوەی زانی؟ پێش ١٤٠٠ ساڵ کە تازە زانستی نوێ ئەوەی بۆ ڕوون بووەتەوە ئەم قورئانە لە خواوە هاتوە بۆ موحەممەد ﷺ.



## وێنەی خۆرهەڵاتن لە وێستگەی ئاسمانی نێودەوڵەتی و درەوشانەوەی سێ بەڵگەی زۆر گەورە لە قورئانی پیرۆز:

خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانست و پایەدارەکەی دا دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا۝١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا۝٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا۝٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾ (الشمس: ١-٤) واتە: سوێند بە خۆر و ڕووناکییەکەی، سوێند بە مانگ کە بەدوای ئەودا دێت وە سوێند بە ڕۆژ کە خۆر و تیشکەکەی دەردەخات، وە سوێند بە شەو کە خۆر دادەپۆشێت ئەم ئایەتە پیرۆزانە چەند ڕاستییەکی زانستی دەخەنە ڕوو کە لە سەردەمی تازەدا نەبێت نەزانراون:

یەکەم: دەریدەخات کە مانگ ڕووناکییەکەی لە خۆرەوەیە.

دووەم: چینی ڕۆژ بەرگە هەواکەی دەبێتە هۆی دەرخستنی تیشکی ڕۆژ و دنیا ڕووناک دەکاتەوە.

سێیەم: دووری خۆر شەو و تاریکاییەکە ئەمە نەزانرا بوو هەتا مرۆڤ لە بەرگە هەواکە دەرنەچوو چونکە خوای گەورە فەرمووی: سوێند بە شەو کە خۆر دادەپۆشێت.



## چینی ڕۆژ ئیعجازێکی ڕۆشنی قورئانە:

چین یان توێژێکی زۆر ناسك و تەنکەو ئەستووری لە سەددا یەکی ناوچەی زەوی کەمترە، ئەم توێژە وەك پێست دادەماڵرێت بەو شێوەیە بە بەردەوامی دادەماڵرێت و تاریکی بە شێوەی یاسایەکی تۆکمە جێگەی دەگرێتەوە، قورئانی پیرۆز وەك موعجیزەیەك باسی ئەم دیاردەیەشی کردووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ﴾ (یس: ٣٧) واتە: بەڵگەو نیشانەیەکیتر بۆیان شەوەکە ڕووناکی ڕۆژی لەبەر دادەماڵێت و بەو هۆیەوە دنیایان لێ تاریك دەبێت، ئەم توێژەی ڕۆژ مرۆڤ نەیتوانیوە بە ڕوونی بیبینێت تەنها لە سەدەی بیستەمدا نەبێت، بەڵام قورئان پێش چواردە سەدە بۆی باس کردووین.



## شوێنەواری غاردانی ئەسپ هەمان ئەو ڕێڕەوەیە دروست دەكات كە خۆر دروستی دەكات:

ئیعجازی ئەمجارە بریتییە لە ڕێڕەوی خۆر، ڕۆژهەڵاتناسەكان یەكێك لەو وشانەی گومانیان لە سەری دروست كرد وشەی (تجری)، بوو ئەوان دەیانوت: دەبوایە قورئان بیوتایە (تدور)، چونكە وشەی (تجری) واتە: دەڕوات، بەڵام وشەی (تدور) واتە: دەخولێتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە مانگ بە دەوری زەوی دەخولێتەوەو خۆریش لە سەنتەری خولگەی گەلە ئەستێرەی ڕێی كاكێشان دەخولێتەوە.

كەواتە خۆر دەخولێتەوە، ئەی باشە بۆ قورئان لەجیاتی وشەی خولانەوە دەستەواژەی ڕۆیشتنی بەكارهێناوە؟ با لە سەرەتاوە بڕوانین قورئانی پیرۆز چۆن و بە چ دەستەواژەیەك باس لە خولانەوەی خۆر دەكات؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ (یس: ٣٨) واتە: خۆریش لە گەردش و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە و بەرەو سرەوت دەچێت، بێگومان ئەوە توانای زاتێكی باڵادەست و زانا دەردەخات كە هەموو شتێكی بەڕێكوپێكی دروست كردووە، ئێستاش با بچینە لای زاناكانی ڕۆژهەڵات و ئەوانەی باوەڕیان بە قورئان نییە، بێگومان دیاردەی جووڵەی خۆر هەستی یەكێك لە زاناكانی ڕاكێشا بیری لە ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆر كردەوە، ئەگەر لە شەوێكی ساماڵ سەیری ئاسمان بكەی تەونێكی سپی دەبینی كە بە ئاسماندا درێژ بووەتەوە، ئەمە پێی دەوترێت گەلە ئەستێرەی ڕێی كاكێشان كە خۆریش یەكێكە لەو گەلە ئەستێرەیە و زیاتر لە سەد ملیار ئەستێرەی تێدایە.

هەر ئەستێرەیەكیش یان گەورەترە لە خۆر یان ئەوەندەی ئەوەیان بچووكترە گەردوون زیاتر لە سەد ملیۆن گەلە ئەستێرەی تێدایە، ئایا ئێستا لە گەورەیی گەردوون ورد دەبیتەوە؟

کەواتە با بڕوانین بۆ ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (غافر: ٥٧) واتە: بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکردنی خەڵکی زۆر گەورەو گرنگترە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە تێناگەن و پەیپێنابەن و نایزانن، بێگومان جوڵەی خۆر هەزاران ساڵە مەتەڵێکی سەرسوڕهێنەر بووە، زۆر بیروڕا هەبووە بۆ نموونە زەوی جێگیرەو خۆر بە دەوری دا دەخولێتەوە، بەڵام دواتر ڕوون بووەوە کەوا بەم بۆچوونە هەڵەیە هۆی هەڵەبوونیشی ئاسانە، خۆر بە ملیۆن جار لە زەوی گەورەترە بۆیە ناکرێت زەوی خۆر ڕابکێشێ و بە دەوری خۆیدا بیخولێنێتەوە.

خۆر بەهۆی گەورەیی ئەندازەکەی زۆربەی ئەستێرەکان بەلای خۆی ڕادەکێشێت، هەروەك زەوی مانگ ڕادەکێشێت کە زۆر لەو بچووکترە، لەبەرئەوە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەدا زانایان دڵنیابوون لەوەی خۆر جێگیرەو زەوی بە دەووری دا دەخولێتەوە بەڵام ئایا ئەم بۆچوونە ڕاستە؟ لە سەدەی نۆزدەدا ئەوە دەرکەوت کە خۆر هێزی کێشکردنی گەلە ئەستێرەی ڕێی کاکێشانی هەیە و بە دەوریدا دەخولێتەوە بۆیە زانایان وتیان: بێگومان خۆر بە دەوری سەنتەری گەلە ئەستێرەکەمان دەخولێتەوە، بەڵام لە سەدەی بیست ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە خۆر جووڵەیەکیتری هەیە کە بریتییە لە بەرزبوونەوەو دابەزین، بۆیە شتەکەیان بە تەواوی ئاڵۆزی تێکەوت یەکێك لە زاناکان لێکۆڵینەوەی تری کرد و، هەستا بە بەدواداچوونی جوڵەکانی خۆر لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوە بۆ ئەوەی ڕێڕەوی ڕاستەقینەی خۆر لە کاتی خولانەوەی بە دەوری گەلە ئەستێرەکەدا بزانێت.

خوێنەرانی بەڕێز: سەیر بکەن بزانن چی دۆزییەوە ئەم زانایە بۆی ڕوون بووەوە کە بەڕاستی خۆ ناخولێتەوە بەڵکو دەڕوات بە ڕۆیشتنێکی ڕاستەقینە، ڕۆیشتنەکەشی بە ئەسپێك دەچێت لەنێوان کۆمەڵە ئەسپێك لە پێشبڕکێدا، خۆر زیاتر ٩٩٪ی کێشی کۆمەڵەکەی بەرکەوتووە، لەبەرئەوەیە کەوا ئەستێرەکان کێش دەکات و لە خولگەی

ئەودا دەخولێنەوەو لەگەڵ ئەستێرەکانی بە زەوی و مانگیشەوە لە مەلەوانی و جوڵەدان و گەرمییەکەشی لە یەك چرکەدا دەگاتە ٦٠٠٠ پلەی سەدی.

زانایان لەناو گەلە ئەستێرەکەدا دوو جووڵەیان بۆ خۆر دۆزییەوە: یەکەم جوڵەی خولانەوە بە سەنتەری گەلە ئەستێرەکەدا دووەمیش جووڵەیەکی لەرینەوەیە بۆ سەرو خوارووی دا، لەبەرئەمەیە کەوا دیار دەکەوێت خۆر بەرز و نزم دەبێتەوەو بەرەو پێش و پاشەوە هەنگاو دەنێت، بەڵام ئەم سەرو خوارەوەی خۆی دەبێت لەو ڕێڕەوە بێت کە بۆی دانراوە ئەگینا نزمبوونەوەی خۆر بە یەك سانتیم هەموو شتێك دەسوتێنێت و بەرزبوونەوەشی بە یەك سانتیم هەموو شتێك بەفراوی دەبێت و دەیبەستێت، هەروەك نزمبوونەوەی مانگ بەم ئەندازەیە جیهان نوقمی ئاو دەکات و بەرزبوونەوەشی یەك پشکی ئاو ناهێڵێت.

لەیادمان نەچێت ئەم زانایەی باسمان کرد خۆری بە ئەسپێك چواند لە حاڵەتی پێشبڕکێ دا دوای ئەم پێچواندنەی لێکۆڵینەوەیەك کرا، ئەوە دەرکەوت کە شوێنەواری غاردانی ئەسپ هەمان ئەو ڕێڕەوە دروست دەکات کە خۆر دروستی دەکات، کەواتە ئەگەر قورئان وشەی (تجری) لەجیاتی (تدور) بەکارهێنا بێت ئەوا هیچ هەڵە نییە و بەڵکو ڕاستە زانستییەکەیە، ئەمجارەش ڕەخنەگرانی قورئان تەنها سەرشۆڕیان بۆ مایەوە.

لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە پارەدارە بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شادومانییەکی زۆر گەورە بۆ بڕواداران، بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خوا دانپیانانێن.



## ١٠٣ دۆزینەوە زانستییەکان هاودەنگن لەگەڵ قورئان دەربارەی بوونی ئاگر لەناو گەردەلوولدا:

قورئانی پیرۆز باس لە هەقیقەتی گەردەلول دەکات کە قورسترین جۆرەکانی لێکۆڵینەوەن، چونکە گەردەلوول بە خێراییەکی زۆر دەڕوات و هەر شتێك ببێتە بەردەمی لە بندا دەریدێنێت. زانایان دەریانخست سەنتەری گەردوون هەمیشە گەرمترە لە تەنیشتەکانی لەبەرئەوە گەرمی لە ناوەوەیدا شاراوەتەوەو هەندێك جار لە حاڵەتێکی زۆر دەگمەندا دەبێتە دروستبوونی ئاگر لە ناوەوەیدا، بەڵام دەبینین قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی جوان ئاماژەی بۆ ئەم دیاردەیە کردووەو فەرمانی پێکردووین لێی رامێنین وەك دەفەرموێت:

﴿فَأَصَابَهَآ إِعۡصَارٞ فِيهِ نَارٞ فَٱحۡتَرَقَتۡۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ﴾

(البقرة: ٢٦٦) واتە: باخە پڕ لە دارەکەی تووشی گەردەلولێك ببێت کە ئاگر لە ناویا بێت و بەوەش بیسوتێنێت، بەو جۆرە خوای گەورە نیشانەکانی بۆ ئێوە ڕووندەکاتەوە بەڵکو بیر بکەنەوە هەرگیز کەس نەیزانیوە کە دڵی گەردەلول گەرمە، بەڵکو گەردەلوول بینراوە سەرما و باران بەدوای خۆیدا دێنێت ئیتر چۆن ناوکی گەردەلول گەرمە؟ ئەمە ڕاستییەکی زانستییە و ئەمڕۆ بەمانگە دەستکردەکان وێنەی گیراوە، بەڵام قورئانی پیرۆز چەندین سەدە پێش مانگە دەستکردەکان بە وردی ئەم وێنەیەی بۆ گرتووین و بۆی باس کردووین، ئەم دیاردەیە زۆر دەگمەنە لە ناوچە دارستانە چڕەکان بەتایبەتی ئەمریکای ناوەڕاست و باشور و هەندێك ناوچەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ڕوودەدات، ماوەیەکی زۆر کەمی پێدەچێت کە هەندێك جار لە خولەکێك تێناپەڕێت، بەڵام وێرانکارییەکی گەورە بەدوای خۆیدا دێنێت ئاشکرایە پێغەمبەر لە دوورگەی عەرەبیدا ژیاوە لە ناوچەیەکی بیاباناوی هەرگیز لە ژیانیدا هیچ جۆرە گەردەلولێکی ئاگراوی نەبینیوە، چونکە ئەم گەردەلولە ئاگراویانە لە دارستانە چڕەکانەوە بەرهەم دێت.



## ١٠٤ دەرکەوتنی دوو بەڵگەی زانستی تازە لە بارەی هەورە بروسکە:

زانایان دەڵێن ئەو بروسکانەی لە زەوی دەدەن بۆ سەلامەتی بەرگە هەوا زۆر پێویستن، ئەگەر هەورە بروسکە نەبێت ئەوا کەشی زەوی بە کارەبا شەحن دەبۆوە و ژیان نەدەما و بارانیش نەدەبوو، هەروەها زانایان دووپاتی دەکەنەوە کە زەوی لە هەموو چرکەیەکدا تووشی زیاتر لە سەد لێدانی بروسکە دەبێت لە ڕۆژێکدا، لە بەخشندەیی خوای گەورەیە ئەو لێدانانەی هەورە بروسکە لە زەوی لە ناوچەی دوور لە ئاوەدانیدایە، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ (الرعد: ١٢) واتە: خوا ئەو زاتەیە کە هەورە بروسکەکانتان نیشان دەدات هاوڕێ لەگەڵ ترسدا و ئومێد و هیوا بەخشیشە.



## ١٠٥ دەستەی زەویناسی ئەمریکا ئیعجازی ئایەتێك دەردەخات:

زاناکان چینەکانی ئەم زەوییەی کە لەسەری دەژین پۆلێنیان کردووە بۆ حەوت چین، کە هەر چینێك جیاوازە لەوەیتر لە ڕووی چڕی و پلەی گەرمی و جۆری ماددەو پێکهاتەکەی، قورئانی پیرۆزیش پێش چواردە سەدە ئاماژەی بەوە داوە و دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ (الطلاق: ١٢) واتە: خوا زاتێکە کە حەوت ئاسمانی دروستکردووە، وە بە وێنەی ئەوان زەویشی دروستکردووە فەرمانی خوا لەنێوانیاندا دادەبەزێت تا چاك بزانن کە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، بێگومان خوا بە زانین دەوری هەموو شتێکیداوە دوای لێکۆڵینەوەی زۆری زاناکان لە سەرەتادا وتوویانە زەوی لە سێ چین پێکهاتووە، دوایی وتیان پێنج چین هەتا زانستی زەویناسی پێشکەوت دەستەی زەویناسی لە ئەمریکا توانیان بگەنە ئەو ئەنجامەی کە چینەکانی زەوی لە حەوت چین پێکهاتووە بەهۆی شەپۆلەکانی زەمین لەرزەوە.



## ١٠٦ له سروشتدا ملیارەها جۆر هەور هەیە:

بێگومان شێوەکاری هەورەکان بە شێوازێکی زۆر نایاب و پەرش کردنەوەیان بە ئاسماندا موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی خوای بالآدەست و ئاماژەیە بۆ گەورەیی بەدیهێنەرەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ (الروم: ٤٨) واتە: خوا ئەو زاتەیە کە با دەنێرێت و هەورەکان دەجولێنێت و لە ئاسماندا چۆنی بووێت پەرشی دەکاتەوە، لە ڕاستیشدا زاناکانیش ئەوەیان سەلماندووە کە لە سروشتدا ملیاران جۆر لە شێوەی ڕێکخستنی هەورەکان هەیە بە ڕادەیەك کە ئەستەمە دوو هەور ببینیت هاوشێوەی یەکبن.



## ١٠٧ شوێنی گۆڕینی مانگ ئیعجازێکی درەوشاوەی قورئانە:

لە زوودا خەڵکی لێکدانەوەی ئەفسانەیی و دوور لە ڕاستیان بۆ دیاردە گەردوونییەکان کردووە، بۆ نموونە کاتێك مانگیان بینیوە گەورە دەبێت و بچووك دەبێتەوە تا وەك دەمە داسی لێدێت وتوویانە ئەوە ئەژدیهایەك هەیە لە مانگ دەخوات تا تەواوی دەکات دوایی دروست دەبێتەوە، خەڵك نەیانزانیوە هۆکاری گەورەبوون و بچووکبوونی مانگ شوێن گۆڕینیەتی، مانگ (٢٨) شوێن لە (٢٨) ڕۆژدا دەکات هەر شەوێك بەهۆی شوێن گۆڕینەوە سێبەری زەوی لەسەر مانگ دەگۆڕێت بەوەش مانگ لە مانگی چواردەوە باریك دەبێتەوە، ئەم حەقیقەتە زانستییە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا و دوای ئەویش بە چەندین سەدە نەزانراو بووە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە کاتێك دەفەرموێت: ﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾ (یس: ٣٩) واتە: مانگ لە چەند شوێنێك دادەنێین هەتا بەهۆی ئەوەوە وەك لاسکی خورمای چەماوەی کۆنی لێدێتەوە، وشەی (منازل) کۆیە چونکە مانگ (٢٨) (منزل) شوێنی هەیە، کە بەهۆی ئەو مەنزلانەوە گەورەو بچووك دەبێت، هەروەها وشەی (حتی) بۆ سەبەبیە واتە: سەبەبی ئەوەی کە وەك لاسکی خورمای لێدێتەوە ئەوەیە کە مانگ مەنزڵ مەنزل دەکات.



## دۆزینەوەی عەمبارەکانی ئاوی سازگار لە بنی زەریاکاندا ڕاستییەکی گەورەی دەرخست:

زانایان لە زانکۆی (Flinders University) هەستان بە دۆزینەوەی بڕێکی زۆر گەورە لە ئاوی سازگار، کە لەژێر تەختایی زەریاکاندا کۆبۆتەوەو بەردەوامیش هەڵدەقوڵێت، ئەم عەمبارە ئاوانەی بنی زەریاکان بە نیو ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە لە ئاو دەخەملێنن، کە بەسەدان جار زیاترە لەو بڕە ئاوەی مرۆڤ لە سەدەی ڕابردوودا لە چینەکانی سەرەوەی ئاو دەریهێناوە، ئەم بڕە ئاوە خەزنکراوانەش بەشی سەدان ساڵی مرۆڤ دەکات بەپێی گۆڤاری (Nature)ی ئەمریکی ئاوی سازگار لەمیانەی چەند چاخێکی بەستەڵەکدا، واتە لە ماوەی (٢٠) هەزار ساڵدا لە ئەنجامی خلیسکانی چینەکانی زەوی لە بنی زەریاکاندا، ئاو لە ڕێی درز و دەلاقەکانەوە دزەی کردووەو چۆتە ناو تەختایی زەریاکانەوەو بڕێکی زۆر گەورەی لە شێوەی عەمباری ئاودا پێکهێناوە.

پرسیار: ئایا چۆن ئاوی سازگار توانیویەتی دزە بکات بۆ هەزاران مەتر لە قوڵایی زەریاکاندا و ماوەی زیاتر لە (٢٠) هەزار ساڵ لەوێدا جێگیر بێت؟

قورئانی پیرۆزیش بە ئاماژەیەکی جوان هەواڵی ئەم دیاردە سەرسوڕهێنەرە دەدات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ﴾ (الحجر: ٢٢) واتە: ئێمە شنەبامان ناردووە کە پیتێنەرە هەروەها بارانمان لە ئاسمانەوە باراندووەو ئێوەی پێ تێراو دەکەین بێئەوەی ئێوە ئەو ئاوەتان زەخیرە کردبێت، ئێمە لەژێر زەویدا بۆمان دابین کردوون. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەو ئاوەی لە ئاسمان دێتە خوارەوە کە ئاوێکی سازگارە خەزنکراوە بە ڕێگەیەکی زۆر ئاڵۆز کە مرۆڤ ناتوانێت لاسایی بکاتەوە. ئایا کێ ئەم هەواڵە ڕاستییە زانستییەی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندووە، هەواڵی ڕاستییەتی بوونی عەمباری گەورە

له ئاوی سازگار؟ بێگومان خوای گەورە ئەم هەواڵەی ڕاگەیاندووە بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی تاکو ببێتە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ڕاست و دروستی پەیامەکەی، خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانیارییەکەیدا دەفەرموێت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ (النحل: ٨٩) واتە: قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە هیدایەتبەخش و ڕەحمەتە و مزگێنیشە بۆ موسڵمانان.



## مانگە دەستکردەکان بە بەڵگەوە ڕاستی قورئانیان سەلماند لەبارەی دووکەڵی ئاسمانی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ۝ يَغْشَى النَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝ رَّبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ۝ أَنَّىٰ لَهُمُ الذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ۝ ثُمَّ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ۝ إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَائِدُونَ﴾ (الدخان: ١٠-١٥) واتە: جا چاوەڕوانبە ڕۆژێ ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێت هەموو ئادەمی دادەگرێ و دەڵێن ئەمە بەڵایەکی سەختە ئەی پەروەردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی، بەڕاستی ئێمە باوەڕدارین چۆن تەمێ خوار دەبن و ئامۆژگاری وەردەگرن کە بەڕاستی پێغەمبەرێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هاتووە لە پاشان گوێیان پێ نەداوە و وە وتیان فێرکراوێکی شێتە بێگومان بۆ ماوەیەکی کەم ئەم بەڵایە لادەبەین.

**بەڵگەی زانستی:** دەکرێت سەرسوڕماو بێت، لە گێڕانەوەیەکی تەبەری لە ڕاڤەی عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خوا لێیان ڕازی بێت) دەربارەی کارەساتی دووکەڵی چاوەڕوانکراو لە بەرکەوتنی کلکدارێك، لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی مەلیکەوە وتی: ڕۆژێك چووم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەباس، پێی وتم: من ئەمشەو تا بەیانی نەخەوتووم. وتم: بۆچی؟ وتی: پێیان وتووم ئەم هەسارەیە هەڵهاتووە کە کلکی هەیەو وتم: ترسام کە دووکەڵەکەش بەرێوەبێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس گەردوونزان بووە بەڵکو ئەو چەمکەی لە ئایەتی ﴿فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ﴾ وەرگرتووە، لەو ئایەتەدا ئاگادارکردنەوە هەیە بە ڕوودانی کارەساتێك کە بەردەوام دووبارە دەبێتەوەو لەپێش ئێستا جگە لە پێغەمبەر کەس بەوەی نەزانیوە، لە دیارترین دەرکەوتەکانی ئەو کارەساتە دووکەڵێکە کە دەوری گیانداران دەدەن و هۆکەشی بەرکەوتنی تەنێکی ئاسمانی بە زەویدا دەبێت، لەگەڵ ئەو وەسفە سەرسوڕهێنەرەی کە پێشینەکان واقوڕماو کردووە، کۆمەڵێك وەسفی ورد هەن کە تەنها قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە، لەنێو ئەو وەسفانەدا هێما کراوە بە پۆلێك لە باڵندەی ئەبابیل کە بەردی (سجیل) کە بەر هەر ڕوویەك بکەوێت لەسەر زەوی وێرانی دەکەن.ئینجا زۆر بە وردی بەربوونەوەی نەیزەکەکان ئاماژەی پێدەکرێت ئەوەش گونجاوە لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکاندا.

خوێنەری بەڕێز بزانە زانستی تازە چ دەڵێ؟

لە ئێستادا بڕوا وایە کە نەیزەکێك یان کلکدارێك لەپێش (٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە داویەتی لە ناوچەی (یۆکاتان) لە خۆرهەڵاتی مەکسیك، بەوە چاڵێك دروستبووە کە مانگە دەستکردەکان وێنەیان گرتووە، تیرەی دەمی ئەو چاڵە زیاد لە (٢٠٠) کیلۆمەترە تیرەی چاڵەکەش بە زیاد لە (١٠) کیلۆمەتر مەزەندە کراوە، هێزی بەرکەوتنەکەش بە (١٠٠) ملیۆن مێگا تەن خەملێنراوە، بڕواش وایە تەنێکی تر لەو کاتەدا هەبووە تیرەکەی نزیکەی (٤٠) کیلۆمەتر بووە بەر دەریای عەرەب کەوتووە لە خۆرئاوای کەنارەکانی هند.

هەروەها لە ساڵی (١٩٠٨) دا تەنێکی دیکە هاوشێوەی ئەوە پێشوو داویەتی لە ناوچەی (تانگۆسکا) لە سیبریا، بە هێزی (١٥) مێگاتەن و تیرەکەی (٦٠) مەتر بووە، پێشئەوەی پارچە پارچە بێت لە زەپۆشی زەویدا بەهۆی هێزی لێکخشاندنییەوە لەگەڵ بەرگە هەوای زەویدا بێئەوەی بەر زەوی بکەوێت و چاڵ دروستبکات، لەگەڵ ئەوەی ئەو پارچانە زۆر بچووك بوون، بەڵام درەختەکانی ئەو ناوچانەی هەموو

سوتاندووەو پاشماوەکانی بە هەموو لاکاندا پەرش و بڵاوبوونەتەوە بە مەودای بازنەیەك تیرەکەی (٥٠) کیلۆمەتر بوو، هاوڕێ لەگەڵ ئەو بەرکەوتنە هەورێکی ئاگرین بینراوە لە دووری(٥٠٠) کیلۆمەتر و دەنگێکی زۆر گەورەی کەڕکار بیستراوە دانیشتوانی لەندەن گوێیان لەو دەنگە بووە لە دووری (٥٠٠٠) کیلۆمەترەوە، ئاسەواری ئەو وێرانکاریانە جارێکیتر مەودای وێرانکاری ڕووداوی (یۆکاتان)ی وە بیرهێنایەوە، ئامێرەکانی کۆمپیوتەر زۆر بە گەرمی کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە مەودای وێرانکاری هێزی بەرکەوتنە گەورەکە بکات لەگەڵ لەناوچوونی دایناصورەکان و زۆربەی زیندەوەرانیتر پێش (٦٥) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، ئیتر بەو جۆرە تیۆری لەناوچوونی کتوپڕ هاتە کایەوە بۆ زۆربەی ڕووەك و گیانداران لەسەر وشکانی و ناودەریاکان، لە ئەنجامی ئەو بەرکەوتنە ئاگرینەی کە تایبەت بە بڵاوبوونەوەی دوکەڵەکە کە بەشەکانی سەرەوەی ڕووپۆشی زەوی گرتەوە و بۆ ماوەیەکی کاتی ڕووناکی خۆری گرت، بەوەش کرداری تیشکە پێکهاتن لە ڕووەکەکاندا پەکخست و گیاندارە گەورەکانی وەك دایناصورەکانی لەناوبرد، چونکە ئەوان کەمتر بەرگەی بێ ئۆکسجینی و بێ خواردنی دەگرن.

هەرچەندە هۆکاری دیکەش هەیە بۆ ئەو وێرانکاریانە وەك گۆڕانی کەشوهەوا و دوکەڵی گڕکانی بەڵام لەگەڵ دۆزینەوەی چینی نیشتوویی لە ناوچە جیاجیاکانی سەر ڕووی زەوی تەمەنیان نزیکەی (٦٥) ملیۆن ساڵەوەیە پشکنینیان دەرکەوتووە کە ماددەی (ئیبریدیۆمیان) تێدایە، ئەوەش ماددەیەکی ناسراوە کە لەگەڵ بۆردومانە نەیزەکییەکاندا هەن، ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە لەناوچوونی زۆربەی گیاندارەکان بەهۆی کارەساتی دووکەڵی گەردوونییەوە یان دووکەڵی ئاسمانییەوە بووە کە ڕوویداوە.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن لێکۆڵینەوە زانستییە تازەکان هاوڕان لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەکەی سورەتی (الدخان). بەڕاستی ئەم قورئانە موعجیزەی زانستی وا گەورەی تێدایە هەتا ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوات زیاتر ڕاستییەکانی قورئان ئاشکرا دەبن.



## ١١٠ گەورەترین موعجیزەی زانستی قورئان ئاشکرا بوو دەربارەی جووڵەی خۆرو مەلەکردنی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾ (الرعد:٢) واتە: خوا ئەو زاتەیە کە بە چاوی خۆتان دەیبینن چۆن ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکەو ستوون بەرزکردۆتەوەو ڕایگرتووە، لەوەودوا چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی بەو شێوەیەی کە لایەق بە خۆیەتی خۆر و مانگیش ڕامهێناوە، هەریەکەیان لە چەرخ و خولی خۆیاندا بێوچان تا ماوەیەکی دیاریکراو دەسوڕێنەوە، هەر ئەو زاتە کاروباری جیهان هەر هەمووی بەڕێدەکات و ڕێك دەخات، هەروەها ئایەتەکانی قورئان بە وردی و دوورو درێژی دەخاتە بەرچاو بۆ ئەوەی دڵنیابن لە بەخزمەت گەیشتن و ئامادەبوونی بەردەم دادگای پەروەردگارتان بۆ لێپرسینەوەیان، دەفەرموێت:

﴿وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ (یس: ٣٨) واتە: خۆریش لەگەڵ سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامە بەرەو سرەوت دەچێت یاخود بە دەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی باڵادەست و زانا دەردەخات. ڕاڤەکارانی قورئان وەك ڕازی و تەبەری و قورتوبی لە ئایەتەکانی قورئانەوە ئەو ڕاستیەیان هەڵهێنجاوە کە خۆریش وەك زەوی و هەسارەکانیتر لەبارەی جووڵەو مەلەی بەردەوامدایە لە خولگەی تایبەت بە خۆیدا، چینی و یابانییەکان توانیان پێشبینی خۆرگیران و مانگگیران بکەن و لە پاشان گرنگیدان بە زانستی گەردووناس لە سەردەمی یۆنانیدا زیاتر بوو، تالیس و بەتلیمۆس و ئەرستۆ وتیان زەوی جێگیرەو چەوسپاو و بێ جووڵەیە زەوی چەقی گەردوونە و خۆر و هەموو هەسارەکان لە خولگەیەکی گۆیی داخراودا بە دەوریدا دەسوڕێنەوە.

لە سەرەتای سەدەی سێیەمی پێش زایینیدا ئەریستادکوس تیۆرێکیتری هێناو وتی زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، بەڵام وایدانا خۆر جێگیرەو بێ جووڵەیە خەڵکی

ئەم تیۆرەیان ڕەتکردەوەو بانگەشەکارانی تیۆرەکەیان بە گومڕاو سەرلێشێواو داناو توندترین سزایان دەدان.

شتەکە هەروەك خۆی مایەوە تا کۆتایی چاخی ناوەڕاست، لە ساڵی (١٥٤٣) زایینی کاتێك زانای پۆڵەندی (کۆپەرنیکۆس) کتێبەکەی خۆی دانا لەبارەی گەردوون و هەسارەکانەوە بڵاوکردەوە، لە کتێبەکەیدا بیردۆزی سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا جێگیر کرد، بەڵام دیسانەوە ئەویش خۆری بە وەستاو دانا لە پاشان و لەدوای داهێنانی تەلەسکۆب ئەم تیۆرە بووە ڕاستییەکی زانستی و، وردە وردە زانیان مەیلیان بەرەو ئەو هزرە ڕۆیشت تاکو زانای گەردووناسی ئیتاڵی(گالیلۆ) توانی بگاتە ئەم ڕاستیە بەهۆی چاودێری و تەماشاکردنی بەردەوامی جووڵەی ئەستێرەو هەسارەکان لە سەدەی حەڤدەدا، لە هەمان سەدەدا زانای گەردووناسی ئەڵمانی (کیپلەر) گەیشتە ئەو ڕاستییەی هەسارەکان تەنها بەدەوری زەویدا ناسوڕێنەوە، بەڵکو لە خولگەی تایبەتی هێلکەیی (أهليلجی)دا بە دەوری خۆردا سەنتەر دەسوڕێنەوە. زانای ئینگلیزی (ڕیچارد کارینگتۆن) لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا ئاشکرایکرد خۆر بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە بە ماوەی ٢٨ ڕۆژ و ٦ کاتژمێرو ٤٣ خولەك، ئەوەش لەڕێی شوێنکەوتنی خۆرەپەڵە (البقع الشمسية) کە لە خۆردا دۆزرایەوە.

(کیپلەر) ئاشکرایکرد خۆر و هەسارەکانی لە خولگەی تایبەتیاندا مەلە دەکەن بەپێی ڕژێمێکی زۆر ورد و نایاب، کە (ڕیچارد کارینگتۆن) دۆزییەوە خۆر بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، لە ئینسکلۆپیدیای ئەمریکیدا هاتووە: خۆر بە خێرایی (٢٢٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا) بەدەوری چەقی گەلەئەستێرەی ڕێی کاکێشاندا دەسوڕێتەوە، هەروەها هەسارە گەڕۆکەکانیش لەگەڵیدا مەلە دەکەن کە هەر سوڕێکی تەواو بەدەوری گەلە ئەستێرەکەیدا بە ماوەی (٢٥٠ملیۆن ساڵ) تەواو دەکات، هەر لە کاتی لەدایکبوونییەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ (٤.٦ ملیۆن ساڵ) خۆرو پاشکۆکانی هەژدە خولیان بەدەوری گەلە ئەستێرەی ڕێی کاکێشاندا تەواو کردووە، هەر لە هەمان



ئینسایکلۆپیدیادا هاتووه که گەله ئەستێرەی ڕێی کاکێشان (١٠٠ بلیۆن) ئەستێره لەخۆدەگرێت. ئێستا هەندێك له زانایان به (٢٠٠ بلیۆن ئەستێره) لەقەڵەمی دەدەن. هەریەك لەو ئەستێرانه لەگەڵ گاز و تۆزی گەردوونیدا که له نێوانیانداپه به دەوری چەقی گەله ئەستێرەدا دەسوڕێنەوە. خۆر ملیاران کیلۆمەتر (٢.٧×١٠١٧ کیلۆمەتر) له چەقی گەله ئەستێرەکەوه دووره‌و به خێرایی (٢٢٠ کیلۆمەتر چرکه) دەجوڵێت، هەر خولەکێکی تەواوی سوڕانەوەی خۆر به دەوری چەقی گەله ئەستێرەی ڕێی کاکێشاندا نزیکەی (٢٥٠ ملیۆن ساڵ) دەخایەنێت، بەڕاستی ئەوه گەورەترین موعجیزەیه. توخوا کەسێکی وەك پێغەمبەر ﷺ که نەخوێندەوار بووه پێش (١٤٠٠) ساڵ بەر له ئێستا چووزانێ باسی جوڵەی خۆر و مەلەکردنی خۆر بکات، ئەو ئایەته باسه بۆ ئەوانەی له نوورو ڕووناکی ئیسلام دوورن که بەخۆیاندا بچنەوەو باوەش بەم قورئانه پیرۆزەدا بکەن و ڕوو بکەنه ئەو ئایینه ڕاست و دروسته.



## ١١١ زانای فەلەکی ناودار (سێر جیمس جێنز) دان دەنێت بەوەی که قورئان له خواوه هاتووه بۆ موحەممەد ﷺ:

زانای هەڵکەوتووی هیندی (دکتۆر عناية الله الشرقي) دەڵێ: ڕۆژێکی یەك شەممه ساڵی ١٩٠٩ی زایینی باران و لێزمه بوو، بۆ ئیشێك له ماڵەوه هاتمه دەرەوه له ڕێدا زانای فەلەکی بەناوبانگ (سێر جیمس جێنز)م بینی، که مامۆستا بوو له زانکۆی (کمبردج) دەچوو بۆ کەنیسەو ئینجیلێك و چەترێك لەبندەستیدا بوو، لێی نزیك بوومەوەو سەلامم لێکرد، وەڵامی نەدامەوە، جارێکیتر سەلامم لێکردەوه لێی پرسیم چیت لێم دەوێت؟ وتم: دوو شت یەکەم باران دەبارێت چەترەکەشت لەبن دەستدایە، ئەویش پێکەنی و چەترەکەی هەڵدا، وتم: دووەمیش چی وا له زانایەکی ناوداری وەك تۆ کردووه بچێ بۆ کەنیسە؟ بۆ ئەو پرسیارەیان تۆزێك وەستاو وتی: ئەم ئێوارەیه وەره بۆ ماڵمان ئەوسا قسه دەکەین.



دکتۆر (عناية الله الشرقی) دەڵێت: منیش ئێوارە چوومەماڵیان و کەوتە باسی ئەستێرەکان و گەورەیی بوونەوەر و بەجۆرێك مووی سەری ڕاست بوونەوەو دەستی دەلەرزین و فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، پاشان وتی: (عناية الله) کاتێ سەیری جوانی دروستکراوەکانی خودا دەکەم هەموو گیانم دەلەرزێ، کاتێ کڕنوش بۆ خوا دەبەم و دەڵێم تۆ گەورەو دەسەڵاتداریت هەست دەکەم هەموو خانەکانی لەشم دان دەنێن بەو ڕاستییەداو هەست بە ئارامی و دڵنیاییەکی گەورە دەکەم، خۆشییەکم دەست دەکەوێت کە هەزار ئەوەندەی خۆشی خەڵکە، ئینجا نازانم تێگەیشتیت کە من بۆ دەچم بۆ کەنیسە.

منیش وتم: حەز دەکەم بەم بۆنەیەوە ئایەتێکی پەڕاوە پیرۆزەکەی خۆمانت (قورئان) بۆ بخوێنمەوە. وتی: فەرموو: منیش ئەم ئایەتەم بۆ خوێند ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ۝٢٧ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ (فاطر: ٢٧-٢٨) واتە: ئایا نەتدی کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە ئینجا ڕواندمان بەو بارانە هەموو جۆرە میوەیەك کە شێوە و ڕەنگەکانیان جیاوازە و لە چیاکاندا چەند ڕێگا هەیە کە ڕەنگیان سپی و سورە سپی و سورەکانیش جیاوازن و هەشیانە ڕەشێکی تۆخە وە لە ئادەمی و زیندەوەر و ئاژەڵ و ماڵاتیشدا ڕەنگی جۆراوجۆر هەیە بە وێنەی جیاوازی میوەهات بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوا تەنیا زانایان وەك پێویست لەخوا دەترسن.

(سیر جیمس) بە دەنگی بەرز وتی: چیت وت؟ زانایان لە خوا دەترسن سەیرە زۆر سەیرە ئەم شتە من پاش پەنجا ساڵ لێکۆڵینەوەو گەڕان گەیشتووم پێی، کێ هەیە لە خوا زیاتر ئەم هەواڵەی دابێ بە موحەممەد؟ ئەگەر ڕاستە ئەم ئایەتە لە قورئاندایە قەڵەم و کاغەز بهێنەو ئەم شایەتیەی من تۆمار بکە (قورئان وەحییەو خوای پەروەردگار ناردوویەتی بۆ موحەممەد).



## ١١٢ جیاوازی نێوان (نجم) و (کواکب) موعجیزەیەکی درەوشاوەی قورئانە:

قورئان باس لە (نجم) دەکات، (نجم) واتە: ئەستێرە. قورئان دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ﴾ (المرسلات: ٨) واتە: سا هەردەمێك ئەستێرەکان کوژانەوە، واتە: ڕۆشناییان نەما گڕ و گەرمی نامێنێ و، بۆ (کواکب)یش دەفەرموێت: هەڕوون بە هەڕوون دەبێ ﴿وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ﴾ یان دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ﴾ بەڵێ جیاوازی نێوان (کواکب) و (نجوم) لەم سەدەیەی دواییدا لەلایەن زانایانەوە دۆزراوەتەوە، دیارە پێغەمبەر ﷺ خۆ مانگی دەستکرد و فڕۆکەی نەبووە تا بۆ لێکۆڵینەوەی مانگ و خۆر و ئەستێرەکان لە دەرەوەی زەوی بەکارین بهێنێ، هەروەها ئەو جۆرە زانستانەش لەو کات و سەردەمەدا بە هیچ جۆرێك پەی پێنەبراوە.



## ١١٣ ئاشکرابوونی دوو موعجیزەی زانستی دەربارەی ئاسن:

١. هەندێك موسڵمان سەردانی وەکالەتی فەزای ئەمریکییان کرد بە مەبەستی چاوپێکەوتنی پرۆفیسۆر (ئارم سترۆنگ) کە زانایەکی نەصرانییە، وتیان: باسی ئاسنمان بۆ بکە، وتی: لەناو زانایانی فیزیایی ئەتۆمی ڕێکەوتووین لەسەر ئەوەی کە هەموو ماددەکان کە ژمارەیان نزیکەی (١١٨) توخمە، هەمووی لەسەر زەوی دروست بووە جگە لە ئاسن، چونکە پێویستی بە وزەیەکە بۆ پێکەونووسانی پرۆتۆنات و نیوترۆناتی یەك ئەتۆم لە ئاسن کە دەکاتە چوار ئەوەندەی وزەی کۆمەڵەی خۆر، لەبەرئەوە توخمێکە لە دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر دروست بووەو پاشان باریوەتە سەر زەوی، قورئانی پیرۆزیش چی بەکاردەهێنێت بۆ ئاسن؟ قورئان دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ﴾ (الحديد:٢٥) (وَأَنزَلۡنَا) لەناو هەموو توخمەکاندا بۆ ئاسن

بەکارهاتووە؟ ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ (بأس) واتە: هێز دەبینین لە قەڵغانی دەبابەو هێلیکۆپتەری سەختی و لە تانك و تۆپدا ئاسن بەکاردێت.

٢. لە مرۆڤ و ئاژەڵی شیردراردا لەناو خوێنیدا ئاسن هەیە، هەموو بیستوومانە کە کەسێك خوێنی کەمەو بێهێزە، واتە: هیمۆگلۆبینی کەمە، پاشان تووشی نەخۆشی (ئەنیمیا) (فقر الدم) دەبێت، هیمۆگلۆبین لە دوو وشە پێکهاتووە (هێم) واتە: (ئاسن) و (گلۆبین) مادەیەکی پرۆتینیە لەش دروستی دەکات، بەڵام ئاسنەکە لە خۆراکەکەوە بۆی دێت ئەمانە یەك دەگرن، ئاسن کاری هێنانە ژوورەوەی ئۆکسجینە لە سییەکانەوە بۆ هەموو خانەکانی لەش و کردنە دەرەوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوەی بە ڕێژەیەك گونجاو و باش ئاسن لە لەشیدا بێت چالاکی و تەندروتسییەکی باشی پێوە دیارە، بەڵام ئەو کەسەی ڕێژەی ئاسن لە لەشیدا کەم بێت، دەبینن لاوازەو بە کەمترین ئیش ماندوویەتی پێوە دیارە بێگومان ڕێژەی ئاسن لە لەشی پیاودا زیاترە وەك لە ئافرەتدا، ئاسن دوو شێوەی هەیە:

{Fe++} حەیدۆز و {Fe+++} حەدیدیك

بە شێوەی حەدیدیك لەش هەڵی نامژێت بەڵام لە شێوەی حەدیدۆز لەشی هەڵیدەمژێت کە خانەکان پێویستیان بە ئاسن دەبێت، جگەر بە شێوەی حەدیدیك خەزنی کردووە دەگۆڕێت بۆ شێوەی حەدیدۆز و دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی پێویستی پێیەتی، کە دەچێتەوە ناو خانەیەك دەگۆڕێت و شیدەبێتەوە بۆ {حەدیدیك} بۆ ئەوەی ون نەبێت، ئەوە کێ ئەو میکانیزمەی کرد؟ ماددەی ئاسن لە جگەر و سپڵ و نیسك و نۆکدا زۆرە. ئافرەت لە (حیض)دا زۆر لەو ماددەی ئاسنە ون دەکات بۆیە پێویستی بە خۆراکی باش هەیە و هەروەها ئافرەتی دووگیان چی ئاسن لە لەشیدا هەیە دەچێت بۆ ئەو کۆرپەیە، لەبەرئەوە پێویستە سەوزە و جگەر و نۆك و نیسك زۆر بخوات، کە پزیشك فەحصی کردو زانی کە هیمۆگلۆبینی کەمە بە شێوەی عیلاج ئاسنی دەداتێ. ﴿فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ﴾ (بأس) واتە: هێز و توانا ئەگەر لە مرۆڤدا کەمبۆوە ئەوە ئەو مرۆڤە بێهێز دەبێت.





## یۆشیدی کوزایی بەڕێوەبەری مەرصەدی تۆکیۆ شایەتی دا بۆ ڕاستگۆیی قورئانی پیرۆز:

چەند موسڵمانێك چوون بۆ تۆکیۆ چاوپێکەوتنێکیان کرد لەگەڵ زانایەکی گەورەی ئەوێ، کە بەڕێوەبەری مەرصەدی تۆکیۆیە ناوی (یۆشیدی کوزایی)یە لێیان پرسی وتیان: ئەم دنیایە ئەم گەردوونە چۆن دروست بووە؟ ئەویش بانگی کردن سلایدێکی پیشاندان کە ئەو تەلیسکۆبە فەضائیانەی هەیڵ و بێجگە لە هەیڵ گرتوویەتی تەپوتۆزی پیشان دەدا و، لە دوورەوە ملیۆنەهاو ملیارەها کیلۆمەتر لە ئێمەوە دوورە، بێگومان ماوەی فضائي بە کیلۆمەتر حساب ناکرێت بە ساڵی ڕووناکی دەپێورێت، پێی وتن ئەو تەپوتۆزە دەبێتە هۆی دروستبوونی ئەستێرەی نوێ و هەسارەی نوێ و هتد.

گەردوونیش لەوانە دروست بووە ئەوانیش پێیان وت: بەڵام لە قورئاندا دەڵێ لە دووکەڵەوە دروست بووە، وە نوسخەیەکی تەرجومەکراویان پیشان دا کە تەرجوومەی ئەو ئایەتەیە: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ (فصلت: ١١).

وشەی (دخان) واتە: دوکەڵ ئەوانیش دەڵێن تەپوتۆز هەندێك لە زاناکان دەڵێن: تەم و مژ، ئەم زانایە (یوشیدی کوزایی) بیری کردەوەو وتی: بەڕاستی جوانترین و ڕاسترین و وردترین وشە دوکەڵە چونکە تەم ساردەو تەپوتۆز پلەی گەرمی نییە، بەڵام دوکەڵ پلەی گەرمی هەیە، ئەو شتەی کە دەیبینین لەو سلایدەدا پلەیەکی گەرمی زۆر گەورەی هەیە ڕۆژی لێدروست دەبێت، ئەستێرەی لێ دروست دەبێت، من پێتان دەڵێم ڕاسترین وشەی عیلمی کە بەکاربێت بۆ دروستبوونی گەردوون (أشهد بالله) دووکەڵە.

لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە بکاتە مایەی بەهانە بڕینێك بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە، خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە ﴿وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خودا دانپیانانێن.



## قورئان باس له دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا دەكات زانستی تازەی سەردەمیش ئەو ڕاستییە بە بەڵگەوە ئاشكرا دەكات:

شێخ محمد متولی شەعراوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) جوانی باس كردووە وەك دەڵێت: ﴿رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ سەرجەمی زەوییە بە حوكمی ئەوەی زەوی هەسارەیەكی گەڕۆكە دەخولێتەوە بە دەوری خۆردا، بە شێوەیەكی گشتی ڕۆژهەڵاتێك و ڕۆژئاوایەكی هەیە ئەو ئایەتەش كە دەفەرموێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾ هەر زەوی خۆی هەمیشە نیوەی تاریكەو نیوەی ڕووناكە، ئەو خاڵەی كە دەبێتە ڕۆژهەڵات یەكەمجار لەوێوە ڕۆژ هەڵدێت لە هەمان كاتدا لە شوێنێكی ئەوسەردا خاڵێكیتر دەبێتە ڕۆژئاوا بۆی، واتە: ئەو بەشەی كە ڕووناكە و ڕووی لە خۆرە (مشرق و مغرب)ی خۆی هەیە بە پێچەوانەی ڕووە تاریكەكەوە واتە: (مشرق)ی ڕووە ڕووناكەكە (مغرب) ی تاریكەكەیە، (مغرب)ی ڕووناكەكە (مشرق)ی تاریكەكەیە لە ئاكامدا دوو (مشرق) و دوو (مغرب) پێكدێن.

حاڵەتی سێیەم تەفسیرەكەی ﴿بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ﴾هەر خاڵێك وەرگرین لەسەر زەویدا كە دەبێتە (مشرق) لە هەمان كاتدا خاڵێكیتر كە دەبێتە (مغرب) یاخود هەرچی خاڵە لەسەر زەویدا ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای خۆی هەیە خاڵ بەبێ كۆتایی بژمێرە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان بەدوادا دێت بەبێ كۆتایی بەمجۆرە بەم ڕاڤە زانستیە شێخ محمد متولی الشعراوی شەرحی كردووە. خوێنەری بەڕێز سەرنج بدەو بڕوانە زانستی تازەی سەردەم لەو بارەوە چی دۆزیوەتەوە؟ زانستی تازە لەم ساڵانەدا دوو خۆریان دۆزییەوە ناویان نان: ١. (ئەلفاسەنچرا A) كە كەمێك لە خۆرەكەی ئێمە گەورەترە.

٢. (ئەلفاسەنچرا B) كە كەمێك لە خۆرەكەی ئێمە بچووكترە.

هەسارەیەكی گەڕۆكیش ڕۆژانە دەسوڕێتەوە بە دەوری ئەم دوو خۆرەدا، واتە: لە هەموو خولەكێكیدا دووجار ڕۆژهەڵات دروست دەبێت وە دووجار ڕۆژئاوا دروست دەبێت ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾



## دۆزینەوە گەورەکەی دوو زانا بیانییەکە دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز:

زاناکان ئەمڕۆ لە جیهاندا ڕێکەوتوون لەسەر ڕاستییەك لەسەر ڕووداوێکی گەردوونی کە پێی دەوترێت (بیگ بانگ) واتە: تەقینەوە گەورەکە، ئەم تەقینەوە گەورەیە دە هەزار ملیۆن ساڵ لەمەوپێش ڕوویداوە. دوو زانا توانیان دەنگی ئەو تەقینەوەیە تۆمار بکەن کە تەمەنی دە هەزار ملیۆن ساڵ لەوەو پێشە، ئەو دوو زانایەی کە ئەو دۆزینەوە گەورەیان ئاشکرا کرد، یەکەمیان ناوی (ئارنۆلد پێنزایەس)ە کە ئەندازیاری تەلەفۆناتە لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆیدا ناوی (رۆبەرت وێلسن) بوو، کە فەرمانبەرێکی تەلەفۆنات بوو، بەهۆی کۆڵنەدانەوە توانیان خەلاتی نۆبڵ بە دەستبهێنن دەنگی ئەو تەقینەوەیە تۆمار بکەن، واتە: بوو بە یاسایەك لەبەرئەوەی بەڵگەی لەسەر کە تەقینەوەیەك ڕوویداوە نەك تەنها تیۆرێك بێت و بەس.

لە ئەنجامی ئەو تەقینەوەیەدا حاڵەتێك لە گەورەبوونی گەردوون ڕوودەدات سەبارەت بە تەقینەوەکە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٠) ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین باسی (رتق) دەکات (رتق) واتە: یەك پارچە (فَفَتَقْنَاهُمَا) واتە: تەقینەوەکە هەرچی شوێنێك ئەگەر ئاوی تێدا بوو ژیانی تێدایە، ئەگەر بێئاو بوو ژیانی تێدا نییە، ئەمەش یەکێك لەو ڕاستیانەی کە زانست جەختی لەسەر دەکات سەبارەت بە گەورەبوونی ئەم گەردوونەوەو بەردەوامبوونی ئەو گەورە بوونە. دیسان قورئان باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات: ٤٧) ئەگەر بە وردی بڕوانین هەمیشە لە زمانی عەرەبیدا ڕستەی ناوی (الجملة الاسمية) مانای بەردەوامی دەبەخشێت، ئەم فراوان بوونە لە گەردووندا بەردەوامە، زانست گەیشتە ئەوەی کە دەنگەکەی تۆمار بکات وە گەیشتە ئەوەی کە بە ژمارە خێرایی یەکەی بپێورێت، بزانێت چەندەو چۆن گەورە دەبێت فەرموون بزانن (دکتۆر خالد السويدان)

به زمانی خۆی ژمارەکە ئاشکرا دەکات و دەڵێت: (يتسع الكون بسرعة هائلة قدرها العلماء أن حجم الكون يكبر مليون ترليون ترليون سنة ضوئية مكعبة كل دقيقة اليس هذا هو الاتساع وما قدروا الله حق قدره والأرض جميعا قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه).

پاش ئەم ژمارە گەورەیە دەڵێت: (سنة ضوئية مكعبة) واتە: ساڵی تیشکی توان سێ مانای ئەم هەمووە ژمارە گەورە فەلەکیەی کەوتی ئینجا ×ی خۆی دەکرێتەوە ٣ جار لە هەموو دەقیقەیەك دا ئەم گەورەبوونە ئێجگار زۆرە، زاناکان هەندێ جار لە کەناری گەردووندا هەسارەیەك دەدۆزنەوەو دوای ماوەیەك لە دەستیان دەردەچێت، چونکە خێراییەکەی هی ئەوە نییە کە فریای بکەون بەشێوەیەکی بەردەوام، لە هەمانکاتیشدا زاناکان لەگەڵ ئەوەدان کە ڕۆژێك دێت ئەم گەورەبوونە دەوەستێت ئەم فراوانبوونە کۆتایی دێت، ئنجا بە پێچەوانەوە گەردوون بچووك دەبێتەوە ئەگاتەوە ئەو خاڵەی کە یەکەم تەقینەوەکە ڕووی تیادابوو، دەچێتەوە ئەو دۆخەی جارانی دیسان قورئانی پیرۆز جەخت لەو ڕاستییە زانستییە دەکاتەوە.

زاناکان گەردوون بە ئیسپرینگێك بەراورد دەکەن کە ڕادەکێشرێت تا دەگاتە ئاستێك کە بەرەڵای دەکەیت دێتەوە دۆخەکەی جارانی، قورئان دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ (الأنبياء: ١٠٤) ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعۡدًا عَلَيۡنَآ﴾ خوا کردوویەتی بە بڕیارێك پەیمانێکی خۆی کە ئەم گەردوونە گەورە بکات تا ڕادەیەکی دیاریکراو. پاشان پەیمانە لەسەر خۆیەتی فەرموویەتی دەهێنینەوە حاڵەتەکەی خۆی وەك کتێب داخستن وەك سجل داخستن. بەڕاستی قورئان موعجیزەیە کە فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ (النمل: ٩٣) واتە: وە بڵێ هەموو سوپاس بۆ خوایە ئەو خوایە بە زوویی ئایەت و نیشانەکانی نیشانی ئێوە دەدات ئێوەش دەیانناسن کە ئایەتی خوان پەروەردگارت بێئاگا نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن.



## ١١٧ گەورەترین کرداریی حسابکردن ئیعجازێکی زانستی قورئانی ئاشکرا کرد:

لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٦)دا زانایان بەهۆی گەورەترین کرداری حساب کردن کە پێی دەڵێن: (سوپەر کۆمپیوتەر) توانیان وێنەی سێ دووری بوونەوەر بکێشن، ئەوەی سەرسوڕهێنەر بوو بینییان کە هەسارەکان هەروا لە بوونەوەردا دابەش نەبوون، بەڵکو ئەڵێی لەسەر دەزوون و دەزووەکانیش بە گرێییەکەوە بەستراون و بەوەش ئەڵێی چنراون واتە: چنینێکی گەردوونی هەیە پاش دیراساتی زۆر و لێکۆڵینەوەی تازە دەرکەوت، کە ئەمە لەسەدا سەد ئەوەیە کە قورئان ناوی دەبات بە (حبك)و سوێندی پێدەخوات ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡحُبُكِ﴾ (الذاريات: ٧).

بەڵێ زانایان بۆیان دەرکەوت کە هەسارەکان ژمارەیان نزیکەی سەد ملیارەو، هەر هەسارەیەکیش سەدان ملیار ئەستێرەی تێدایە. زانایان ویستیان بزانن وێنەی بوونەوەر کە لە دەرەوە سەیری بکرێت چۆنە هەموو ئەو داتایانەی کە پێویست بوون خستیانە سوپەر کۆمپیوتەرەوە، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە دابەشبوونیان هەر ئەڵێی قوماشێکەو چنراوە، سوپەر کۆمپیوتەر ئەو کۆمپیوتەرەیە لە ساڵی (٢٠٠٠) زاییندا دروستکرا کە خێرایی لە حسابکردندا زیاترە لە دوازدە تریلیۆن کرداری حسابی لە یەك چرکەدا و، ئەم جیهازەش کێشەکەی سەد تەنەو کارەبایەکی دەوێت بۆ ئیشکردن کە ٢.١میگاواتە قەبارەکەشی بە هێندەی دوو یاریگای تێنس کردن دەبێت.

بەڕێوەبەری کۆمپانیای (IBM) کە دروستی کردووە دەڵێت: ئەوەی ئەم کۆمپیتەرە دەیکات لە یەك چرکەدا مرۆڤ بە حاسیبە بە ملیۆنەها ساڵ ناتوانێت بیکات، زانایانی ئەڵمانیا و بەریتانیا و ئەمریکا و کەنەدا دە ملیار زانیاریان خستە ئەو کۆمپیوتەرە گەورەوە، کە لەبارەی نزیکەی بیست ملیۆن هەسارەوە بوو جێبەجێ کردنی کارەکەو ڕێکخستنی زانیاریەکان و کێشانی وێنەی بوونەوەر و دابەشبوونی هەسارەکان (٢٨) ڕۆژی خایاند.



پرۆفیسۆر (کارلۆس فرینك) له زانکۆی (درهام) له بەریتانیا کە بەڕێوەبەری ئەم بەرنامەیە دەڵێت: ئەوە گەورەترین ئیشە تا ئێستا کردبێتمان لەوانەشە گەورەترین بێت لە (الفیزیا الحاسوبیة)دا، ئێستا ئێمە بۆ یەکەمجار نوسخەیەکی (طبق الأصل)ی بوونەوەرمان لەبەردەستایە کە لە بوونەوەری ڕاستەقینە دەچێت ئەوەی کە دۆزیویانەتەوە لەداوی جاڵجاڵۆکە دەچێت، زانایان پێی دەڵێن (النسیج الکونی) دەرکەوت کە هەر تاڵێکی ئەم ئەو چنینە بە هەزاران هەسارەی لەسەر ڕیز بووەو زۆرچاك و قایم چنراوە، ئەم زانایە دەڵێت ئەم کۆمەڵە هەسارانە زۆر دەدرەوشێنەوەو زۆر بە توندوتۆڵی ڕیزکراون و دانراون و چنراون.

چەمکی (النسیج الکوني) چەمکێکی تازەیەو زانایان کاتێ بەکاریان هێنا کە بینییان هەسارەکان ڕیز دەبن لەسەر تاڵی باریکی گەردوونی کە ئەڵێین تاڵی باریك لەچاو قیاساتی گەردوونی دا، ئەگەر ئەستێرەیەك لە فەزادا چەند چرکەیەکی ڕووناکی درێژ بێتەوە ئەوە (خیطی کوني) ملیاران ساڵی ڕووناکی درێژ دەبێتەوە، ئەگەر (خیطی کوني) بچووك بکەینەوە تا تیرەکەی ببێ بە یەك مللیمەتر ئەوا درێژییەکەی سەدان مەتر دەبێت، کەواتە لەمەوەیە کە دەڵێین تاڵی باریکە زۆر قایمەو بە هێزی گەردوونی ڕاکێشراون و توندکراون. دیارە ئەم تاڵانەش کە ئەم گەردوونەی پێچنراوە زۆر گرنگە، بۆیە خوای پەروەردگار سوێندی پێدەخوات.

زانایان دەستەواژەی قورئان بەکاردێنن کە ئەویش وشەی ئینگلیزی (weave)ە کە مانای (حبك)ە لە عەرەبی دا، زانای بەناوبانگ دکتۆر (بول میلر) جەخت دەکاتەوە سەر ئەو ڕێگایەی کە ئەستێرەکان لە سەری دەڕۆن و لەسەری کۆدەبنەوە تا هەسارە دروست بکەن تاڵ (خیوط)و گرێ (عُقد)و تۆڕ (نسیج) دەکات، کە ئەوانەش هەموو لە مانای (حبك) یەکدەگرنەوە، ئەم زانا فەلەکییە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە ئەو چینەو ئەو تۆڕەی بینیوەو دەڵێت: ئێمە بەڕاستی گومانمان نییە لەوەدا کە بۆ یەکەمجارە ئەو تاڵی گەردوونی (خیط کوني)یە، دەبینین ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ تاکو ببێتە بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی.



## ژیانی هەموو زیندەوەرێك پابەندە بە ئاو:

خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الأنبياء: ٣٠) واتە: لە ئاوەوە هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە ئایا هێشتا باوەڕ ناهێنن؟ ئەمڕۆش زانستی نوێ بەو ڕاستیە گەیشتووە کە ئاو هۆکاری مانەوەی هەموو ئەو شتانەیە کە لەم جیهانەدا زیندوون تەنانەت دەرکەوتووە کە ژیانی ڤایرۆس و بەکتریاکانیش هەر بە ئاوەوە بەندەو بەبێ ئاو هیچ زیندەوەرێك و گیانلەبەرێك لەم جیهانەدا توانای ژیانی نییەو ژیانی بەردەوام نابێت. بەڕاستی ئەمەش موعجیزەیەکیتری قورئانە چونکە قورئانی پیرۆز بەر لە (١٤٣٠) ساڵ ئەم ڕاستییەی خستۆتە ڕوو و ئەمڕۆش زانست بەهۆی ئەو هەموو تەکنەلۆژیایەوە ئینجا دەگاتە ئەو ڕاستیانە بەڵام قورئانی پیرۆز زۆر زوتر ئاماژەی بۆ کردوون و باسی لێوە کردوون.



## بەشێوەیەکی زانستی سەلمێنراوە کە قورئان خوێندن ئەرکی سییەکان باشتر دەکات:

هەرچەندە قورئانی پیرۆز نوورێکە کە بەهۆیەوە ژیانی تاریکی مرۆڤایەتی ڕۆشن دەکاتەوەو مرۆڤ بۆ ڕاستترین و شیاوترین و گونجاوترین شتەکان ڕێنمایی دەکات، هاوکات گرنگترین و پڕبایەخترین شت کە قورئان بەمرۆڤەکانی بەخشیوە، ئەوەیە کە بەهۆی نوورەکەیەوە دەستی مرۆڤەکان دەگرێت و بەرەو شا ڕێگای ڕاستەقینە دەیانبات بەرەو بەهەشت، لە ئاخیرەتدا ئاسوودەیی و کامەرانی و خۆشنوودی هەتا هەتاییان پێدەبەخشێت، ئەمە لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی دەبنە هاوڕێ و هاودەمی قورئان لە دنیاشدا چەندین سوودی لێدەبینن.

بۆ نموونە لە دوا لێکۆڵینەوە کە لەبارەی قورئان خوێندنەوە ئەنجامدراوە دەرکەوتووە کە قورئان خوێندن ئەرکی سییەکانی مرۆڤ باشتر دەکات، ئەمەش بەپێی لێکۆڵینەوەیەك کە دکتۆرێکی میسری بەناوی (دکتۆر سەمیر خضر) سەرۆکی کۆمەڵەی هەستیاری لە ئەسکەندەریەو مامۆستا کۆلیژی پزیشکی سەر بە زانکۆی (طنطا) ئەنجامیداوە، ئەم پزیشکە تا ئێستا چەندین لێکۆلێنەوەی لەسەر قورئانی پیرۆز ئەنجامداوە، ئەم پزیشکە میسرییە لە ئاکامی لێکۆڵینەوەکەیدا بۆی دەرکەوتووە کە قورئان خوێندن بە دەنگ و ڕەچاوکردنی لایەنی خۆشخوێندن (تجوید)، یارمەتیدەرێکی زۆر باشە بۆ باشتر ڕاپەڕاندنی ئەرکی سییەکان و، چارەسەرکردنی نەخۆشی هەناسەتەنگی ڕەبۆ، شایەنی باسە کە پوختەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕۆژنامەی (الجمهورية)ی میسریدا بڵاوکراوەتەوە لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە کە:
﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ (الإسراء: ٨٢)
واتە: ئێمە لە قورئاندا ئایەت و سورەتانێك دادەبەزێنین کە ببێتە هۆی شیفاو چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکان و بۆ باوەڕدارانیش ببێتە هۆی ڕەحمەت و میهرەبانی، بۆ بێباوەڕان و ستەمکارانیش تەنها ببێتە هۆی زیادکردنی زیان.




## کاریگەری ئایەتەکانی قورئان گەورە نووسەری جولەکە (هێنریك برۆدێری) هێنایە ناو بازنەی ئیسلام:

(هێنریك برۆدێر) کە نووسەرێکی گەورەی جوولەکەیە موسڵمان بوو کە بەردەوام دژایەتی ئیسلامی دەکرد. ئەو بێباوەڕانەی لێکۆڵینەوە لە قورئانی پیرۆز دەکەن و بیری لێدەکەنەوە ئەگەری موسڵمان بوونیان زۆرە، بەڵام بەو مەرجەی کە بە ئینسافەوە لێکۆڵینەوەی خۆیان بکەن و بیرێکی دروست لە ئایەتە پیرۆزەکان بکاتەوە. ئەوەتا بە گەورە نووسەری جولەکە (هێنریك برۆدێر) بە نموونە بهێنینەوە

ئەو هەرچەند موسڵمان ببوو کەچی جولەکەکان و زۆرانی دیکە باوەڕیان نەکرد کە (هێنریك برۆدێر) موسڵمان بوو بێت، بەڵام دوای ئەوەی کە هەواڵی موسڵمان بوونی لە ڕۆژنامەی ڕاستی نێودەوڵەتی بڵاوکرایەوە ئینجا گومان لە موسڵمان بوونی (هێنریك برۆدێر) نەما.

ئەم نووسەرە بەوە ناسرابوو کە بە بەردەوامی لە نووسینەکانیدا ڕەخنەی توندی لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و لە موسڵمانان دەگرت. ئەو لە گۆڤاری (شپیگڵ)ی ئەڵمانی کاری خۆی دەکرد یەکێك بووە لەو نووسەرانەی کە خەڵکان پەرۆشی خوێندەوەی بابەتەکانی بوون، باشترین بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەوەیە کاتێك لەساڵی (٢٠٠٧) کتێبی (ئەوروپا خۆی بەدەستەوە دەدا) نووسی، کتێبەکەی بوو بە پڕفرۆشترین کتێب لە ئەڵمانیادا. دواتر هاوشان لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی ئیسلام و بیرکردنەوەی لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان تا دەهات زیاتر دەکەوتە ژێر کاریگەری ئایینی پیرۆزی ئیسلام، پاشان بەوپەڕی ڕاشکاوی و ئاشکرایی موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.

لەبارەی مووسڵمان بوونیشی دەڵێت: ئێستا شانازی بەوە دەکەم ئەندامی یەك ملیار و سێ سەد ملیۆن کەس لە جیهاندا باوەڕیان پێی هەیە، بەڵام ئێستا بەپێی دوا ئامارەکان ژمارەی موسڵمانانی جیهان زۆر لەوەش زیاتر بووە، چونکە سوپاس بۆ خوای گەورە بەردەوام خەڵکانی بیانی موسڵمان دەبن و ڕاستییەکانیان بۆ دەردەکەوێت. لە ساڵی (٢٠١١) ئاینی پیرۆزی ئیسلام دووەمین ئاین بوو بەڵام لە ساڵی (٢٠١٢)دا خودی پاپای (ڤاتیکان) بە فەرمی ڕایگەیاندو دانی بەوەدا نا کە ئێستا ئاینی ئیسلام بۆتە ئاینی ژمارەیەك و پێش ئاینی مەسیحی کەوتووە، بەپێی دوا ئامارەکانیش ژمارەی موسڵمانان لە ساڵی (٢٠١٢) بریتییە لە ملیارێك و هەشت سەد ملیۆن و سەد و پێنج هەزار موسڵمان کە دەکاتە ڕێژەی ٢٥٪ی دانیشتوانی جیهان.





***



## ١٢١ زانایەکی فیزیایی سەلماندی قورئان خوێندن وزە بە مرۆڤ دەبەخشێت:

زانایەکی بواری فیزیا لە سوریا بەناوی (عەلی مەنسورکیالی)، لەمیانەی پێشکەشکردنی وانەیەك لە پێشبڕکێی دوبەی نێو دەوڵەتی بۆ قورئان، ئەوەی ئاشکرا کرد کە لە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکدا گەیشتۆتە ئەو ڕاستییەی کە قورئان خوێندن وزە بە مرۆڤ دەبەخشێت و، دەستنوێژ شوشتنیش ئێش و ئازاری جەستە ناهێڵێت. ئەم زانا فیزیاییە ئاماژەی بەوە کردووە کە دەستنوێژ شوتن جگە لەوەی کە ڕەزامەندی خوای تێدایە، هاوکات سوودێکی پزیشکی زۆریشی هەیە، چونکە دەستنوێژ دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئێش و ئازاری جومگەکان و ڕۆماتیزم.

ئەم زانایە ئەوەشی خستەڕوو کە ئاو وزەیەکی سەرسوڕهێنەری هەیە، هەروەها مرۆڤی موسڵمانیش کە ڕۆژانە چەندینجار دەستنوێژ دەشوات ئەوە بەهۆی دەستنوێژەوە لە بارگە کارەباییە زیانبەخشەکان ڕزگاری دەبێت کە دادەبەزنە سەر زەوی و مرۆڤ تووشی ئێش و ئازاری جومگەکان و ڕۆماتیزم دەکەن. هەروەها ئەم زانایە ئەوەشی ئاشکرا کردووە کە ئەو وزەیە دوو جۆرە وزەی باش (ئیجابی) و وزەی خراپ (سلبی) ئەوەش لە قورئانی پیرۆزدا بەڕوونی ئاماژەی بۆ کراوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ (فصلت: ٣٠) واتە: بەڕاستی ئەوانەی وتیان خوا پەروەردگارمانەو لە پاشان بەڕاستی لەسەر ئایین بەردەوام بوون ئەوە فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان و پێیان دەڵێن: کە هیچ مەترسن و خەفەت مەخۆن و موژدە بێ لێتان ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدرا بوو، ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مەلائیکەتی خوا وزەی باش ئیجابی دەهێننە خوارەوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ۝٢٢١ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ﴾ (الشعراء: ٢٢١–٢٢٢) واتە: ئایا پێتان بڵێم کە شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی درۆزن و بوختانچی و تاوانبارو گوناهبار.

لێرەدا ئەوە ئاماژەیەکە شەیتان وزەی خراپ (سلبی) بەرجەستە دەکەن، هەروەها ئەم زانایە ئەوەشی ئاشکرا کردووە کە کاتێك مرۆڤ لە قورئان دووردەکەوێتەوە ئەوە شەیتان دوای دەکەوێت، چونکە بە وزەیەکی خراپی دەزانێت؟ چونکە ئەو دەستی بەو پەتە نەگرتووە کە پڕی دەکات لە وزەی باش کە قورئانە، جگە لەمانەش ئەم زانایە ئەوەشی ڕوون کردەوە کە قورئانی پیرۆز وزەیەکی یەکجار زۆر و سەیری تێدایە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر: ٥٢) واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە بۆ سەر چیایەك ئەوە دەتبینی کە ملکەچ دەبوو و ورد و خاش دەبوو شەق دەبوو لە ترسی فەرمانی خوا لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نموونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و ژیرییان بخەنەکار و شوێن قورئانی پیرۆز بکەون.



## ١٢٢ ئەو ئاوەی ئایەتی شیفای بەسەردا خوێندرابێ جیاوازە:

لێکۆڵینەوەی هەندێك لە زانایان ئاشکرایان کردووە کەوا پشکەکانی ئاو گۆڕانکاری و کاریگەرییان بەسەردا دێت بەو گفتوگۆیانەی لەسەری دەکرێت، لەبەرئەوە ئەو ئاوەی ئایەتی شیفای بەسەردا خوێندرابێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئاوەکانیتر، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا﴾ (الأسراء: ٨٢) واتە: ئێمە لە قورئان ئایەت و سورەتانێك دادەبەزێنین کە ببێتە هۆی شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستییەکان، هەروەها ڕەحمەت و میهرەبانیش.



## ١٢٣ وشەکانی قورئان موعجیزەن:

هەموو وشەیەك لە قورئاندا بە مەبەست بەکارهاتووە تەنانەت زیادکردنی پیت و کەمکردنی بە وردی حسابی بۆ کراوە، بۆ نموونە وشەی (وسواس) دووبارەبوونەوەی (واو) و (سین) دووبارەبوونەوەی هەوڵی شەیتان پیشان دەدات، کە کۆڵ نادات لە وەسوەسە پێکردنی مرۆڤدا، شایەنی باسیشە وشەی (وسواس) لە دەنگی بەریەککەوتنی زێڕ و زیو و خشڵەوە هاتووە کە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێ و سەرقاڵی دەکات. هەروەها وشەی (یخصمون) کە پیتی (صاد) تیایا دووبارەیە ئەو کێشمەکێش و هەوڵە زۆرەی کافرانمان پیشان دەدات، کە لە دنیادا سەرقاڵی کردوون تا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾ (یس: ٤٩).

هەروەها لە پەڕاوی (الظاهرة القرآنية)ی مالك بن نەبی دا هاتووە، دەڵێ: لە زمانی میسری کۆندا بە سەرۆك وەزیران یان سەرۆکی پۆلیس شتێك وتراوە کە ئەگەر وەربگێردرێتە سەر زمانی عەرەبی واتە (عزيز اله الشمس)، بەڵام قورئان کە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە سورەتی (یوسف)دا باسی دەکات تەنها وشەی (العزيز)ی هێناوە، لەبەر یەکخواناسی (توحید) وشەی (اله الشمس)ی لابردووە، ئەم ڕاستییەش قەشە (ڤیگۆرۆ) دۆزییەوە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە.



## ١٢٤ قورئان تەورات و ئینجیل ڕاست دەکاتەوە، دەرکەوتنی دوو بەڵگەی زۆر گەورە لەو بارەوە:



أ. قورئان زۆر ڕاستی شێوێنراو لەناو تەورات و ئینجیل دا ڕاست دەکاتەوە، بۆ نموونە لەبارەی پێغەمبەر (سولەیمان) (سەلامی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ (البقرة: ١٠٢) واتە: سولەیمان کوفری نەکردووەو شەیاتینەکان کوفریان کرد. ڕەنگە کەسێکی فیترەت پاك سەری بسوڕمێ لەم دیفاعەی

قورئان له سلێمان پێغەمبەر، بەڵام ئەگەر سەیری (العهد القديم) بکەین و سەیری بیروباوەڕی شێواویان بکەین، دەبینرێ کە زۆر بە خراپی باس لە پێغەمبەران دەکەن بەتایبەت سلێمان پێغەمبەر، کە کوفرو سیحری دەخەنە پاڵ و دەڵێن بتی پەرستووە بەهۆی کاریگەری ژنەکانیەوە لەسەری، قورئان ئەو بیروبۆچوونە ناڕاستانەی جوولەکەو گاورەکانی ڕاست کردەوەو باسی (معصوم)ی پێغەمبەرانی کرد.

دیارە سولەیمان کە هەزاران ساڵ پێش پێغەمبەر بووە و هیچ زانیارییەکی وا لەبەردەستدا نەبووە لەو سەردەمەدا لەسەری، کەچی چونکە قورئان وتەی خوای گەورەیەو وەحییە، دەبینین زۆر بە جوانی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە خەڵکی دەڵێن چی یان ناڵێن چی، هەقی خۆی دەچەسپێنێ و دوای چواردە سەدە لە هاتنی قورئانیش ئەوانەی کە (دائرة المعارف)ی بەریتانیایان داناوە، لەو هەڵانە خۆیان دەپارێزن و دەگەڕێنەوە سەر هەق و ڕاستی و دەڵێن (لقد كان سليمان موحدا)، واتە: بەڕاستی سولەیمان یەکتاپەرست بووە، هەروەها لە (دائرة المعارف)ی (عهد القديم و الجديد)یشدا کە هەوڵ و کۆششی زۆر زانای مەسیحی بە ئینصافە هەموو ئەو خورافاتەیان دایە دواوەو وتیان سولەیمان پێغەمبەر دوور بووە لە بتپەرستی و شتی نالائیق.

ب. لە (عەهدی قدیم) دا ئەم دەقە هەیە کە دەڵێ: (خلق الله السماوات والأرض في ستة أيام فاستراح في اليوم السابع) (سفر التكوين: ٢-٣) واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا بەدیهێناوە ڕۆژی حەوتەمیش پشووی دا، ئاشکرایە کە ئەمە تەحریف کراوە، قورئانی پیرۆز ئەمەی ڕاست کردەوە و لە سورەتی (قاف) ئایەتی (٣٨)دا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە بە شەش ڕۆژ دروستمان کردوون، هیچ ماندوویەتیەکیش ڕووی تێنەکردووین.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە پاش چواردە سەدە زانایانی مەسیحی وەرگێڕەرانی تەورات ناچاربوون ئەو دەقە بگۆڕن و بەم شێوەیەی لێ بکەن (خلق الله

السماوات والأرض في ستة أيام فرغ من أعماله التي كان يقوم بها في اليوم السابع)/٢٠٢ British and Foreignbible society عەهدی قەدیم ساڵی ١٩٥٨. واتە: خوا بە شەش ڕۆژ ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنا و لە کارەکانی بووەوە لە ڕۆژی حەوتەم دا (الله أكبر) لەو موعجیزە گەورەو ناوازەیەی قورئان. بەڕاستی پێویستە ئیمانداران ئەو موعجیزە گەورانەی قورئان پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن کە بەڕاستی ئەوەش گەورەترین دیارییەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە.




## زانستی تازەی سەردەم سوودەکانی بێدەنگبوون لە کاتی خوێندنی قورئاندا ئاشکرا دەکات:

توێژینەوەیەکی زانستی پشت ڕاستی دەکاتەوە کە خوێندنی قورئانی پیرۆز بە گەردنکەچی و بە وردی و تێڕامانەوە کاری سییەکان باشتر و چالاکتر دەکات، دەبێتە هۆی زوو چاکبوونەوەی نەخۆشی تەنگە هەناسەیی و هەستیاری بەتایبەت لای منداڵان. هەروەها گوێگرتن لە قورئان بە بەردەوامی بەرگری لەش بەهێز دەکات، هەر ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە ئەو کەسانەی چەند جوزئێکی قورئانیان لەبەر کردووەو بەردەوام دەیخوێننەوە و گوێی لێ دەگرن، هەست بە تەندروستییەکی باشتر دەکەن لە کەسانیتر، کەواتە گوێگرتن لە قورئان دەبێتە هۆی داباریینی سۆز و میهرەبانی خوای گەورەو بەخشینی شیفا بۆ بەندەکانی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعراف: ٢٠٤) واتە: کاتێك کە قورئان دەخوێندرێت گوێی بۆ بگرن و دڵی بدەنێ و بێدەنگ بن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێبکرێت و خوای پەروەردگار بەزەیی پێتاندا بێتەوە. خوێنەری بەڕێز بڕوانەو سەرنج بدە هەروەك لە لێکۆڵینەوە زانستییەکە باسکرا لە سوودەکانی گوێگرتن لە قورئان لە کاتی خوێندندا ئایەتە پیرۆزەکەش پێش زیاتر لە چواردە سەدە دەقاودەق ئەوەی باسکردووە بە ڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.



## موعجیزەكانی قورئان دڵان كەمەندكێش دەكات:

زۆر كەس لەگەڵ ئەوەشدا كە زمانی عەرەبی نازانن قورئان كار دەكاتە سەر دڵ و دەروونیان و موسڵمان دەبن، (شێخ أبو العینین الشعشع) كە قورئان خوێنێكی میسرییە دەڵێت: لە فەڕەنسا قورئانم دەخوێند چەندەها فەرەنسی تەنها بە بیستی قورئان موسڵمان بوون، هەروەها (محمد محمود طبلاویش) كە قورئان خوێنێكی میسرییە دەڵێت: من لە ئەمریكا قورئانم دەخوێند چەندەها ئەمریكی بە بیستنی قورئان موسڵمان بوون. زانای ئەمریكی (جفری لنك) لە كتێبەكەیدا بەناونیشانی (الصراع من أجل الاسلام) دەڵێت: كاتێك موسڵمان بووم دەچووم بۆ مزگەوت و بە جەماعەت نوێژم دەكرد و زۆر دڵخۆش دەبووم بە قورئان خوێندنی ئیمامەكە، لێیان پرسیم: خۆ تۆ زمانی عەرەبی نازانیت و لە قورئان تێناگەیت بۆچی ئەوەندە حەزت لە نوێژی جەماعەت و قورئان خوێندنی ئیمامە؟

(جفری لنك) دەڵێت: منیش پێموتن كاتێك منداڵێك دەگری و گوێی لە دەنگی دایكی دەبێت ژێر دەبێتەوە، ئایا هیچ لە قسەكانی دایكی تێدەگات؟ بێگومان نەخێر تەنها پەیوەندی ڕۆحی نێوان دایك و منداڵەكەیە دەبێتە مایەی ژێربوونەوەی منداڵەكە، منیش بە هەمان شێوە هەست بەو پەیوەندییە ڕۆحییە دەكەم لەنێوان من و قورئاندا، دڵ و دەروونمی پێ ئارام دەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ خوای گەورە پەیمانی داوە كە قورئان بپارێزێ، ئەوەتا پاش چواردە سەدە ئەنجامی ئەو پەیمانە دەبینرێ كە قورئان پارێزراوە لە پەڕاودا لە دڵەكاندا.

لە سایەتەكانی ئەنتەرنێت دا قورئان تاكە كتێبە كە ملیۆنەها كەس لەبەریان كردووە، نەك ئەوانەی كە زمانی عەرەبی دەزانن تەنانەت ئەوانەش كە نەخوێندەوارن بە چاكی لەبەریان كردووە، جا نەك هەركەس خاوەن تەمەن و باڵغ بەڵكو منداڵی حەوت هەشتساڵیش توانیویەتی هەمووی لەبەر بكات، بەڕاستی ئەوەش موعجیزەی ئەم ئایەتە پیرۆزە وەك ڕۆژی ڕووناك دەردەخات كە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ

﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ (القمر: ١٧) واته: ئەم قورئانەشمان ئاسان کرد کە بیری لێبکرێتەوە ئاخۆ بیرەوەرێك هەیە؟

واتە: وتەکانیمان سووك کردووەو ماناکەشمان ئاسان کردووە بۆ هەر کەسێك حەز بکات ئامۆژگاری خەڵکی پێبکات. لە بەریتانیا زیاتر لە سەد هەزار منداڵی موسڵمان دوای تەواوبوونی خوێندنی ڕۆژانەی قوتابخانەیان ڕوودەکەنە حەوت سەد مزگەوت بۆ فێربوونی قورئان و لەبەرکردنی، ئەمە بێجگە لەوە کە زیاتر لە سەد و بیست قوتابخانەی ئیسلامی سەربەخۆ هەیە کە منداڵان فێری قورئان و ئیسلام دەکەن.

ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە ئەورووپا بۆ خۆی خزمەتی قورئانی کردووە ئەوەتا لە ساڵی (١٥٣٧)ی زاینیدا، یەکەم نوسخەی قورئان چاپ کرا لە شاری ڤینیسیا لە ئیتاڵیا کە ئەو نوسخەیەش لە یەکێ لە کەنیسەکانی ئیتاڵیادا ماوەو پارێزراوە، پاش ئەوە چاپێکی تری قورئان بۆ یەکەمجار لە شاری (هامبۆرگ)ی ئەڵمانیا کرا لە ساڵی (١٦٩٤) زاینیدا، ئینجا شاژنی ڕووسیا لە ساڵی (١٧٨٧)دا یارمەتی چاککردنی دا، پاشان لە ساڵی (١٨٧٧) زاینیدا لە ئاستانە لە دەوڵەتی عوسمانی چاپکرا.

ئێستاش لە وڵاتی سعودیە لە شاری مەدینەی منەوەرە لە کۆمەڵگەی شا فەهد کە لە ساڵی (١٩٨٤) دا دانراوە، ساڵی زیاتر لە دە ملیۆن قورئان چاپ دەکرێ. شایەنی باسە لە پاکستان هەر سێ ماڵ و حافزێکی قورئانی تێدایە کە دەکاتە نزیکەی حەوت ملیۆن حافز.

دکتۆر (محمد الراوی) کە خەڵکی میسرەو بانگخوازێکی گەورەیەو پێی دەڵێن (الرجل القرآنی)، دەڵێت: لە نەیجیریا بووم پیاوێکی سەوزە فرۆش لەبەردەرگا سەوزەم لێ دەکڕی و بە پیت لە زمانی عەرەبی نەدەزانی حافزی قورئان بوو، سورەتی (الاعراف)ی بۆ خوێندم، دکتۆر محمد دەڵێت: خۆم کە حافیزی قورئانم سوورەتی ئەعراف لەبەرکردنی زۆری دەوێت، خوا ئاگادارە بە جۆرێك خوێندی سەرسام بووم تاقە هەڵەیەکی تەنانەت لە تەجویدیش دا نەکرد، کاتێ لە وڵاتی سعودیەش لە زانکۆ



وانەی قورئانم دەوتەوە لە هۆڵی زانکۆ من قورئانم بۆ دەخوێندن و بۆم تەفسیر دەکردن زۆر لە قوتابییەکان هۆن هۆن فرمێسك دەهاتە خوارەوە بە چاویاندا.

لەم بارەشەوە ڕۆژهەڵاتناس (لورافاکلیری) دەڵێت: تەنها لە میسردا ئەوەندە حافیزی قورئان هەیە کە ژمارەیان زیاترە لەوانەی کە لە هەموو ئەورووپادا دەتوانن ئینجیل بخوێننەوە، قورئان بە زیاتر لە سەد و سی زمان ڕاڤە کراوەو واتای لێکدراوەتەوە و زۆرترین کەس بە دەستی دێنێ و زۆرترین کەسیش دەیخوێنێتەوە لە کاتێکدا کە ئینجیل ڕۆژ بە ڕۆژ خوێنەرانی کەم دەبنەوە، هەرچەندە ماوەیەك لەمەوبەر قەشەیەکی ئینگلیزی بەناوی (هنتون) لە ئوسترالیا ئینجیلی کورت کردۆتەوەو ناوی ناوە (بایبل المائة دقیقة) واتە: ئەو ئینجیلەی کە لە سەد خولەکدا دەخوێندرێت ئینجا زۆر کەم کەسیش دەیخوێنێ و ئەوانەشی کە بتوانن لەبەری بکەن هەر زۆر کەمن وەیان هەر نین.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز قورئان ئەو پەیامە پیرۆزە پڕ لە زانست و موعجیزە پایەدارانەیە کە دڵان کەمەندکێش دەکات و دەیانخاتە سەر ڕێگای سەرفرازی و بەختەوەری دنیا و قیامەت. گۆرانیبێژی ئەمریکی سیلەرز قورئان کاری کرد لە دڵ و دەروونی و موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند. ئەم گۆرانیبێژە دەڵێت ڕۆژێك لە شاری ڤێرجینیا بەلای مزگەوتێکدا تێپەڕیم گوێم لە دەنگێکبوو وامزانی گۆرانیبێژە کە نزیکبوومەوە کابرایەك لە سوچێکدا دانیشت بوو شریتی دەفرۆشت، وتم: ئەوە دەنگی چ گۆرانی بێژێکە؟ وتی: ئەوە گۆرانیبێژ نییە، قورئانخوێنە! شریتەکەم لێ کڕی، وتم: ناوی چییە؟ وتی: خالد القحطاني لە سەیارەکەمدا گوێم لە شریتەکە گرت نەمتوانی سەیارەکەم لێبخوڕم ناچار وەستام بە دڵ گوێم گرت تەواو هەست و هۆشمی هەژاند و هەموو خانەکانی لەشم خۆشییەکەی چەشت دواتر چووم بۆ لای عازفی گیتاری تیپەکەمان کە ناوی کریس بوو موسڵمان بوو بوو، ناوی خۆی کردبوو بە خەلیل، چووم بۆ لای بۆ ئەوەی بۆم ڕوون بکاتەوە ئەو کاریگەرە گەورەیە چییە کە قورئان هەیەتی.

ئەویش شریتەکەی گوێلێگرت و کەوتە وەرگێڕانی بۆم ئەوەی سەیرە سورەتی (الشعراء) بوو منیش بۆ خۆم شاعیرم موسڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند و ناوی خۆم کرد بە هارون سیلەرز. بیرم کردەوە کە لە ڕێی دەزگایەکەوە خزمەت بە ئیسلام بکەم بۆیە دەزگای ئەوانەی بیردەکەنەوە لە بەرهەمم دامەزراند ئینجا پەیوەندیم کرد بە شێخ خالد القحطانییەوە کە ئایا ڕێم دەدات ئەو قورئانەکە بخوێنێ و ئێمەش ئایەت بە ئایەت بەدوایدا بە زمانی ئینگلیزی ڕاڤەی بکەین تا خەڵکی باشتر لە قورئان تێبگەن؟ ئەویش ڕازی بوو.



## ١٢٧ کۆمەڵێك لە ئەهلی کیتاب داندەنێن بەوەدا کە قورئان هاوشێوەی نییەو لە خواوەیە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ: ٦) واتە: ئەوانەی زانست و زانیارییان پێدراوە چ زانستی ئایینی وەك گاور و جوولەکەکان یان زانستی مادی چاك دەزانن ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت ڕەوانە کراوە هەر ئەوە هەقەو هیدایەت و ڕێنموونی بەخشە بۆ ڕێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و شایستەی سوپاس و ستایش. تازەترین بەڵگەش پرۆفیسۆر (أوری روبین)ی جوولەکە کە مامۆستای زمانی عەرەبییە لە زانکۆی تەلئەبیب ناوبراو دوو ساڵ زیاترە خەریکی وەرگێڕانی قورئانە بۆ سەر زمانی عیبری چونکە ئەو وەرگێڕانەی تر کە لەبەردەستدایە کەم و کوڕی زۆریان تێدایە، پرۆفیسۆر أوری پاش وەرگێڕانی نیوەی قورئان خۆی بۆ ناگیرێ و ناچار دەبێت کە لە بارەی قورئان و کاریگەری زۆرییەوە بڵێت بەڕاستی قورئان کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە شێوەی پیتەکانی و بەهۆی داڕشتنیەوە کە بە شێوەی پەخشانی زۆر هاوسەنگ داڕێژراوە و ئیقاعێکی مۆسیقی زۆر تایبەتی هەیە، قورئان بابەتی هەمەچەشنی تیایە

وەك باسی دۆزەخ كە بە شێوەیەكی ئەوەندە ترسناك باسی دەكات كە لێی دوور بكەویتەوە و بە شێوەیەكی ئەوەندە خۆشیش باسی بەهەشت دەكات كە هەوڵی بۆبدەیت، ئەمە كە بێجگە لە شەرع و یاساكە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ ڕێكدەخەن من گەیشتوومەتە ئەوەی كە قورئان دەیەوێت مرۆڤێكی تەواو دروست بكات لە سەر زەوی ئەوەش بە پەیڕەوی كردنی فەراهەم دێت. قورئان كلیلی ڕێگای گەیشتنە بە كامڵ بوون و پێگەیشتن دەدات بە مرۆڤ ئەمەش وای لێكرد كە دانبنێ بەوەدا كە وەرگێڕانی قورئان زۆر كارێكی گرانە.



## ١٢٨ بە بەڵگەوە وەك ڕۆژی ڕووناك ئاشكرا بوو كە قورئان پارێزراوەو دەستكاری نەكراوە:

قورئانی پیرۆز تاكە پەڕاوە كە خوای گەورە پەیمانی پاراستن و بڵاوبوونەوەی داوە بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا هەروەك دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ۝ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (الصف: ٨-٩) پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (سيبلغ هذا الأمر أي الاسلام ما بلغ اليل والنهار) قورئان بە پێچەوانەی پەڕاوەكانی ترەوەیە كە دەستكاری كراون و بەردەوامیش دەستكاری دەكرێن و هەرچی دەكەن نازانن چۆن لە هەڵەو ناتەواوییەكان پەڕاوەكانیان ڕزگاریان بێت. تەورات و ئینجیل شتی وای تێدایە كە شەرمەزارن لە ئاستیدا، ئەوەتا بوختان بۆ دەیان پێغەمبەر (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ئەو كەسانەی كە كیتابی موقەدەسیان نووسیوەتەوە، وەك (مرقص) و (پولس) و (لوقا) قوتابی عیسا پێغەمبەر نەبوون ئەو كیتابی بەناو موقەدەسە كە لەبەردەستایەو وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی نوسخەی ئەسڵی دیار نییە، باشە لە چییەوە وەرگێڕدراوە كەس نازانێت؟ نموونەیەك لە تەحریف كردن لە نوسخەی ئینگلیزی مەلیك جیمس ی كیتابی موقەدەس دا هاتووە:

Blessed are they that well in thy house they will be still )
blessed is the man whose atrength is in you preisine you whose heart is set on pilierima be as they pass through PSLAMS (٤-٦)(the walley of Baca make it awel

وەرگێڕانە عەرەبییەکەی (طوبى لأناس عزهم بك طرق بيتك (الأصل كلمة الحج في قلوبهم ٦:٨٤) عابرين في وادى البكاء يصيرونه ينبوعا أيضا بيركات بغطون مورة) لەم دەقەدا دوو بەشە دەستکاری کراوە یەکەم وشەی (pilBrimage) کە مانای حەج دەگەیەنێ لە نوسخەی عەرەبیەکەدا هەر لایان بردووە، هەروەها وشەی (baca) کە ناوێکی مەککەیەو لە قورئانیشدا هاتووە لە نوسخەی عەرەبیەکەدا کردوویانە بە (وادی البکاء) جا بۆ ئەوەش ئەمەیان کردووە تا مەسیحییە عەرەبەکان کە قورئان دەبیستن نەڵێن ئەو دەقەی ئینجیل باسی مەککەی تیایە و ببێتە مایەی موسڵمان بوونیان، قورئان دەفەرموێت: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۚ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ۝٩٣ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٩٤ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ۝٩٥ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ۝٩٦ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ (آل عمران: ٩٣-٩٧).

ئەوەی سەیرە ئەوەیە لەپێش باسی بەککەوە قورئان باسی ئیفتراو تەحریفاتی گاور و جولەکەکان دەکات، ئەوەتا لای ئەوان ئەو بەڵگە گەورەیە هاتووەو ئاوا تەحریفیان کردووە، ئەوەش بەڕاستی موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە لە موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم قورئانە خوای گەورە خاوەنیەتی کە ئاگادارە بە هەموو ئاشکراو نهێنییەك. ئەم بابەتە پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجار لە گۆشەیەکی خۆیدا لە ڕۆژنامەی (الاهرام)دا بڵاوی کردەوە، وتارەکانی پرۆفیسۆر زەغلول لە ئەهرامدا بووەتە مایەی موسڵمانبوونی ژمارەیەکی زۆر لە گاورەکانی میسر.

دکتۆر زەغلول دەڵێت: پاش بڵاوبوونەوەی ئەو وتارە لەسەر سەفەر بووم، لە فرۆکەخانە لاوێکی مەسیحی بەناوی (جۆن) هات بۆلام و پرسیاری لەو بارەیەوە کرد، منیش وتم: ئینگلیزی دەزانی؟ وتی: بەڵێ دەرچووی کۆلیژم و ئێستا ژمێریارم.

وتم: زۆرچاکە ئەوە هەردوو دەقە ئینگلیزییەکەو عەرەبییەکەیە لەبەردەستایە، خۆت بەراوردی بکە بزانە تەحریف کراوە یان نا، پاش ئەوەی گەڕامەوە میسر بینیمەوە مژدەی دامێ کە موسڵمان بووەو تەنانەت ڕەمەزان بەڕۆژوو بووەو تەراویحیشی کردووە، هەروەها وتی: دایك و باوکم مەسیحین و زۆر دەوڵەمەندن و تەنها منیان هەیە دەترسم موسڵمان بوونم ئاشکرا بکەم جەڵتە لێیان بدات، منیش وتم: دەتوانی جارێ ئاشکرای نەکەی لەبەر ئەوان. دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: پاش دوو مانگیتر بینیمەوە لە دوبەی وتی: هاتووم لێرە فێری ئیسلام ببم تا بتوانم بە چاکی بەرپەرچی ناحەزانی ئیسلام بدەمەوە، بەڵێ دەستکاری تەورات و ئینجیل و پارێزراوی قورئان وادەکات کە خەڵکی دەستە دەستە لە هەر چوار قوڕنەی دنیاوە بێن بەرەو ئیسلام. پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: بەراوردکردنی ئایینەکان و خستنەڕووی تەحریفاتی تەورات و ئینجیل مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە موسڵمانان و بانگخوازان کاری لەسەر بکەن.

***





## بەناوبانگترین پرۆفیسۆری جیهان دانی نا بەوەی ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ تازەترین لێکۆڵینەوەکاندا یەکدەگرنەوە:

پرۆفیسۆر دکتۆر (کیث مور) پرۆفیسۆری زانستی توێکاری و کۆرپەلەزانی لە زانکۆی تورینتۆ لە کەنەدایە، ئەم زانایە پلە بە پلە گەیشتۆتە ئەم ئاستە لە چەندین زانکۆدا لەوانە زانکۆی (توینابێك) لە خۆرئاوای کەنەدا بۆ ماوەی یازدە ساڵ، پاشان چەندین ساڵ سەرۆکی بەشی کۆرپەلەزانی و توێکاری بووە لە زانکۆی (تۆرنتۆ)، سەرۆکایەتی چەندین کۆمەڵەی نێودەوڵەتی کردووە، بۆ نموونە کۆمەڵەی زاناکانی توێکاری و کۆرپەلەزانی لە کەنەدا و ئەمریکا هەروەها ئەنجوومەنی یەکێتی زیندەوەرزانی، هەروەها ئەندامە لە کۆمەڵەی پزیشکی مەلەکی کەنەدا و، لە ئەکادیمیای نێودەوڵەتی خانەزانی و لە یەکێتی ئەمریکا بۆ پزیشکەکانی توێکاری، ئەندامیشە لە یەکێتی هەردوو ئەمریکا کە لە بەشی توێکاریدا. دانەری چەندین کتێبە کە هەندێکیان لە بواری توێکاری ئیکلینکی و کۆرپەلەزانیدایە، هەشت کتێبی هەیە بە سەرچاوەی قوتابی کۆلیژە پزیشکییەکان دادەنرێت کە بۆ شەش زمان وەرگێڕدراون: (ئیتاڵی- ئەڵمانی- پورتوگالی- ئیسپانی- یۆنانی-چینی).

دانەری پەرتوکی قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤە کە بۆ زیاتر لە هەشت زمان وەرگێڕدراوە: (ڕوسی- ژاپۆنی- ئەڵمانی- چینی- ئیتاڵی- پورتوغالی- ئینگلیزی- یوغسلافی)، دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: داوای کتێبێکی باوەڕپێکراوم کرد لەبارەی زانستی کۆرپەلەزانییەوە لە بەریتانیا، ئەوانیش کتێبی پرۆفیسۆر (کیث مور)یان بۆ ناردم. دیسان داوای کتێبێکی باوەڕپێکراوم کرد بۆ هەمان مەبەست لە ئەڵمانیا ئەوانیش هەر کتێبی پرۆفیسۆر (کیث مور)یان بۆ ناردم بە زمانی ئەڵمانی، ئیدی منیش وتم: کەواتە دەبێت دکتۆر (کیث مور) لەم زانستەدا پیاوێکی گەورە بێت.

هەروەها دکتۆر عەبدولمەجید دەڵێت: کاتێکیش هاتم لە ڤیدیۆکاندا گەڕام بۆ زانستی کۆرپەلەزانی ٣٤ فیلمی ڤیدیۆم لەو بارەوە دۆزییەوە کە هەموویان

سەرچاوەکەیان بۆ دکتۆر کیث مور دەگەڕایەوە، وتم: باشە دەبێت ئەم دکتۆر کیث مورە کێ بێت؟ بۆیە ئیتر کەوتمە پرسیارکردن پرسیارم لە دکتۆر ئەحمەد حیجازی کرد کە مامۆستای زانستی کۆرپەلەزانییە لە زانکۆی (مەلیك عەبدولعەزیز لە بارەی پرۆفیسۆر کیث مورەوە ئاخۆ ناوی بیستووە؟) ئەویش پێی وتم: ئەوە باوکی زانستی کۆرپەلەزانییە، وتم: خوایە کێ دەمگەیەنێتە لای ئەو پیاوە؟ ئەوە ئەو پیاوەیە کە من بەدوایدا دەگەڕێم، ئیتر بەو شێوەیە تا لە کۆلیژی پزیشکی مەلیك عەبدولعەزیز شەشەم کۆنگرەی پزیشکی بەسترا، نێردراوی شانشینی سعودیەش مامۆستا عصام شێخ کە ڕاوێژکاری ڕۆشنبیری شانشین بوو لە کەنەدا بانگهێشت کرابوو بۆ ئەوێ، منیش خۆم پێناساندو وتم:

جەنابتان لە کوێن؟ وتی: من پاشکۆی ڕۆشنبیری شانشینی سعودیەم لە کەنەدا.

وتم: لە کەنەدایت؟ برام ڕاستییەکەی ئێمە دکتۆرێکمان دەوێت لە کەنەدا دکتۆر کیث موری ناوە ئەویش پرسی لە چ زانکۆیەکە؟ وتم: لە زانکۆی تۆرینتۆ.

ئەویش وتی: بەڕێوەبەری تۆرینتۆ هاوڕێمە بە سوعبەتەوە وتی: باوکیشیت بۆ دێنم. وتم: نا باوکیم ناوێت خۆیم بۆ بێنە. خوای گەورە پاداشتی چاکەی بداتەوە بە پەرۆشەوە گەڕایەوە بۆ کەنەدا، لەوێوە نامەیەکی بۆ ناردم منیش دکتۆر کیث مورم بانگهێشت کرد کە بێت بۆ زانکۆی مەلیك عەبدولعەزیز، جەنابیشیان خۆشحاڵ بوون بە داواکەمان، ئیتر لەبەر خۆمەوە وتم: ئۆخەیش ئەوە دکتۆرە دێت بۆ زانکۆ، پاشان ئەم مژدەیەم دایە دکتۆر (عبدالله عمر عظيم) ئەویش یەکسەر ڕەزامەندی خۆی نیشانداو دوو بلیتی فڕۆکەی بۆ دکتۆر کیث مور و خێزانەکەی نارد و ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەی بۆ گرتن، ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی لێگرتن.

کاتێك گەیشتن هات بۆ لامان و وتی: چیتان لایە؟ وتمان: هەندێك پرسیارمان هەیە ڕاستییەکەی هەشتا پرسیارمان هەیە لەسەر زانستی کۆرپەلەزانی، بۆ ئەوەش دوو ڕۆژمان بەسەر برد پرسیارمان لێ دەکرد و بە ڤیدیۆ دەمانگرت لەوە دەترساین ڕای بگۆڕێت دکتۆر لێی پرسین و وتی: من سەرم لەم پرسیارانەی ئێوە سوڕماوە

هەندێکیان منداڵێکی قۆناغی سەرەتایی دەیزانێت، پرسیاری واشم لێدەکەن کە تەنانەت گەورەترین زاناکانی ئەم سەردەمە ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، بگرە تا ئێستاش لەژێر لێکۆڵینەوەدایە ئەمە مانای چییە؟

وتمان: بەڵێ نهێنییەك لە بابەتەکەدایە وتی: بەڵێ چیتان لایە؟

وتم: بڕوانە دکتۆر ئێمە لە مێژووی زانست دەکۆڵینەوە، هەرچییەك لە پێش و لەدوای داهێنانی وردبینەوە دۆزراوەتەوە لێی دەکۆڵینەوە، لە کاریگەری ئەوانە دەکۆڵینەوە لەسەر زانستی کۆرپەلەزانی ئەوەی پەیوەندی بە پێش داهێنانی وردبینەوە هەیە پرسیاری سادەن، وەك خۆت دەڵێیت هی قۆناغی سەرەتاییە، ئەوەش کە پەیوەندی بە دوای داهێنانی وردبینەوە هەیە پرسیاری ئاڵۆز و وردن و هێشتا لەژێر لێکۆڵینەوەدان ئەویش قسەکەمانی لا پەسەند بوو بەردەوام بوو لەگەڵمان.

پاشان وتمان: دکتۆر قۆناغی پێش داهێنانی وردبین ئەو ماوەیەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە لەو کاتەدا ئایەتەکانی قورئان دادەبەزی و لەبارەی زانستی کۆرپەلەزانی دەدوا، بۆیە ئێمە پرسیارمان لێدەکرد لەبارەی ئەم ئایەت و ئەو ئایەتەی ترو بەو جۆرە زانیاری وردی پێدەداین و سەری سوڕ دەما، وتی: ئەمە سەرسوڕهێنەرەو پاشان چوو بۆ لای خێزانەکەی و پێی وت: ئێستا ئەزانم بۆچی بانگکراوم ئەوانە باسی چەند ئایەتێك لە قورئان دەکەن کە لەگەڵ تازەترین لێکۆڵینەوەکانی ئەمڕۆدا یەکدەگرنەوە.

ئەویش وتی: منیش ئەو کاتەی لە ئوتێلەکەدا ماومەتەوە قۆستوومەتەوە بۆ خوێندنەوەی ئەم قورئانەو ئەمدیو و ئەودیوم کردووە، تا ئایەتێکم بەرچاو کەوت لەبارەی ئیعجازی زانستی لە زانستی کۆرپەلەزانیدا، خێزانی بە تەنیا بەو کارە هەستاوە، دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: پاشان لە دوای ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی داینەوەو لایەنە ئەرێنییەکانمان تیابەدی کرد بەجێی هێشتین و ڕۆیشت، بەڵام بەهۆی ئەویشەوە چل پرسیاری تری نوێ لە بواری کۆرپەلەزانیدا لامان سەری هەڵدا، دیسان نامەمان بۆ نارد: ئاخۆ دکتۆر دەکرێت بێیتەوە بۆ ئێرە؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەڵێ دەکرێت بەڵام بە مەرجێك. وتمان مەرجەکە چییە؟ وتی: وانەیەك پێشکەش دەکەم و دەبێت پزیشك و قوتابییەکانیش گوێیان لێبێت.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: منیش کەوتمە گێژاوی ئەو پرسیارەوە کە ئاخۆ بۆ دەیەوێت وانەیەك پێشکەش بکات؟ ئاخۆ کە گەڕاوەتەوە بۆ کەنەدا سەرزەنشت کراوە؟ ئاخۆ لۆمەیان کردووە؟ ئێستا داوایان لێکردووە کە ڕابردوو بسڕێتەوە؟

کەواتە با بێت ئێمە باکمان نییە و زانستمان پێیەو هەر لە شوێنی خۆیدا وەڵامی دەدەینەوە، بۆیە وەڵاممان کە فەرموو بەخێربێن ئێمە ئامادەین. کاتێك پرۆفیسۆر کیث مور دووبارە هاتەوە بۆ لامان دەستیکرد بە خستنەڕووی بابەتەکان و وتی: من سلایدم دەوێت، ئێمەش یەك بە یەك سلایدەکانمان بۆ ئامادە کرد فلان سلاید و فلان و فلان و هتد.. بەڵام سەرمان سوڕما لە بابەتی وانەکەی کە شتێکیتر بوو پێچەوانەی ئەوەی کە خۆمان گومانمان لێدەکرد وتم: باشە ناونیشانی ئەم وانەیە چییە؟

هیچم شك نەبرد جگە لەوەی ناوی لێبنێم بەراوردکردنی زانستی کۆرپەلەزانی لەگەڵ ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، ئیدی بڵاومان کردەوە کە لە زانکۆی مەلیك عەبدولعەزیز وانەیەك لەبارەی بەراوردکردنی کۆرپەلەزانی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا پێشکەش دەکرێت لەلایەن پرۆفیسۆر دکتۆر کیث مورەوە، لەبەرئەوەی پزیشکەکان پایەو پێگەی ئەم پرۆفیسۆرەیان دەزانی زۆرباش، بۆیە پزیشکەکان هاتن و کەسانیتریش پێکەوە ئامادەبوون ئەویش وانەکەی بە سلاید دەوتەوەو دەیوت: ئەم ئایەتە ئاوا دەڵێت، ئەوەش ڕاستییەکەیەتی کە لەبەرچاودایە سەیری بکەن، ئەمەش ئایەتێکیتر ئەوەش ڕاستیە زانستییەکەی، لە کۆتاییشدا وتی: ئەم زانستە شایەتیم بۆ دەدات کە دەبێت لەلایەن خواوە بێت. هەروەها شایەتیم بۆ دەدات کە موحەممەد نێردراوی خوایە، ئیتر خەڵك هەمووی چەپڵەیان لێداو هوتافیان کێشا و هەژان، بەڕاستی دەبوو ئەو کەسانەی کە دوورن لە بەرنامە پاك و پیرۆزەکەی ئیسلام و لە گومان و دوودڵیدان لەدوای موسڵمان بوونی ئەم پرۆفیسۆرە ناودارەی جیهان ئەوانیش بەقەد تۆزقاڵێك گومان لە دڵەکانیان نەمێنێ بە تەواوی دڵنیابن و بێنە ژێر سێبەری پەیامە پیرۆزەکەی خوای گەورە.





## ئەو مۆسیقایەی لە قورئاندا هەیە بەڵگەیە لەسەر موعجیزەکەی:

موسڵمانبوونی عەبدالصمد رومیرۆ. دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: ساڵێکیان لە حەج بووم لە عەرەفە پیاوێك هات بۆ لام کە ناوی عبدالصمد بوو، کورە تەمەن نۆ ساڵەکەشی لەگەڵ بوو کە هەموو قورئانی لەبەربوو، پاش چاك و چۆنی کەوتە باسی موسڵمانبوونی خۆی و وتی: من ئیسپانیم و پسپۆرم لە بواری مۆسیقادا ویستم لێکۆڵینەوەیەك ئامادە بکەم لەسەر مۆسیقای کلاسیکی، هەر پەڕاوێکم دەخوێندەوە باسی گەورە مۆسیقاکارەکانی دەکرد وەك بتهۆڤن، منیش پێم باشبوو کە بۆ دەوڵەمەندکردنی باسەکەم لێکۆڵینەوە بکەم لەسەر موشەحاتی ئەندەلووسی، لە موشەحاتەوە یەکخواناسی فێربووم و لەبەرئەوەی کە زۆر باسی پێغەمبەریشی تیایە لام خۆشەویست بوو چونکە بەڕاستی ئەو کەسێکە کە نارەحەتی زۆری هاتەڕێ و خۆگر بوو، بە درێژایی بیست و سێ ساڵ تۆزقاڵێك دانەبەزی لە بیروڕاکەی.

هاوین گەڕامەوە ماڵی باوکم لە (غرناطه) و پاشان چووم خانوویەکم بە کرێ گرت لە گەڕەکی موسڵمانەکان، کە بەڕاستی زۆر ڕێزیان لێدەگرتم، منیش گوێم دەگرت لە قورئانی مزگەوت و زۆرکاری تێدەکردم، بۆیە داوام کرد لێیان کاسێتێکم بۆ بهێنن ئەوانیش کاسێتێکی عەبدولباستیان بۆ هێنام و کاتێك بە کۆمپیوتەر لێکۆڵینەوەم لەسەر کرد بۆم دەرکەوت کە ئەو مۆسیقای لە قورئاندا هەیە بەڵگەیە لەسەر موعجیزەکەی، بەیانیان زوو گوێم دەگرت لە قورئانی پێش نوێژی مزگەوت و زۆر کاری تێدەکردم، تا ڕۆژێك دراوسێکانم وتیان: کۆنفراسێك هەیە لە شاری (تگوان) لەبارەی موشەحاتەوەو هەفتەیەك دەخایەنێت، بڕیارمان دا بەیەکەوە بە ئۆتومبیلەکەی من بچین، پاش سێ ڕۆژ لە کۆنفراسەکە بەناو شاردا گەڕاین، بانگی ئێوارەی داو برادەرەکانم چوون بۆ مزگەوت بۆ نوێژ و منیش بە پیاسە بەدەوری مزگەوتەکەدا دەسوڕامەوە و قورئان خوێندنی پێشنوێژی مزگەوتەکە هەست و هۆشی هەژاندم،

بەپەلە چوومە ناو ئوتومبیلەکەم و زۆر گریام، کە برادەرەکانم هاتنەوە و منیان بینی پرسیاریان کرد چی بووە؟ چی قەوماوە؟

دەڵێ منیش وتم: هیچ نییەو دەمەوێت بە زوترین کات بگەڕێینەوە بۆ شاری (غرناطة)، ئیتر پێکەوە گەڕاینەوەو یەکسەر لە ماڵەوە خۆم شوشت و چووم بۆ مزگەوت و موسڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند.

سەفیری سعودیە کە بەمەی زانی دەعوەتی کردین بۆ حەج، پاشان (منحەیان) داینێ کە خۆم و هاوسەرەکەم لە زانکی (ام القری) بخوێنین و توانیم ماجستێر بهێنم لە دیراساتی ئیسلامیداو، هاوسەرەکەشم بڕوانامەی لە پەروەردەی ئیسلامیدا هێنا.

دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: ناوبراو جارێك لە ڕەمەزاندا هات بۆلام بۆ قاهیرەو لە ماڵمان میوان بوو، شەو کە چووم ئاگاداری بکەمەوە بۆ پارشێو بینیم کە پێشتر هەستاوەو خەریکی شەونوێژە. جارێکیتریش کە چووم لە فرۆکەخانە پێشوازیان بکەم، بینیم پیاوێکی ئینگلیزی لەگەڵدایە کە ژنەکەی ئیسپانی بوو، تەنها لە ماوەی چەند سەعاتی گەشتەکەیاندا لە ئیسپانیاوە بۆ قاهیرە توانیبووی موسڵمانیان بکات. شایانی باسە ئەو پیاوە بانگەوازکارە موسڵمانە کۆلیژی دیراساتی ئیسلامی کردۆتەوەو خەڵکێکی زۆر لێی سوودمەندن، ئەوە جگە لەوەی ئێستگەیشیان هەیەو بووەتە هۆی موسڵمانبوونی خەڵکی و ئێستا نزیکەی ملیۆنێك موسڵمان هەیە لەو وڵاتەدا.

## ١٣١ گەورەترین دۆزینەوە ڕاستگۆیی قورئان دەسەلمێنێت:

کاتێك هەندێك لە جوولەکەکان کەوتنە فرۆفێڵ کردن و حەڵاڵ کردنی ئەوەی کە خوا لێی حەرام کردبوون، خوای گەورە کلکی مەیمونی لێ ڕواندن و هەندێکیشیان کلکی بەرازیان بۆ پەیدا بوو، دەنگیان نەماو وەك مەیمون و بەراز دەنگیان دەردەهات، بۆیە لە ماڵەوە نەهاتنە دەرەوە جا کە خەڵکی نەیان بینین بچنە سەر کاری خۆیان و دیارنەبوون، چوون بۆ ماڵەکانیان بینیان مەسخ بوون و شێوازیان تێکچووەو کلکیان بۆ

پەیدا بووە و چی قسەیان لەگەڵ کردن بە ئیشارەت وەڵامیان دانەوە. بۆ زانینی ئەو باسە سەیری تەفسیری (جامع البیانی تەبەری) بکە لە سورەتی ئەعرافدا، دیارە ئەوەش بەڵایەکی گەورەیە و بوون بە پەندی زەمانە بەرگەیان نەگرت، هەندێکیان سەری خۆیان هەڵگرت و بۆ بیابانی میسری و هەندێکیانیش بەرەو شام و، سەرەنجام لەو بیابان و دەشت و هەردو چۆڵەدا لەناوچوون. هەندێکی تریشیان پاش چەند ڕۆژێك لە ماڵەکانی خۆیاندا گیانیان دەرچوو، بەپێی عادەتی ئەو زەمانە هەندێك لەوانەیان مۆمیا کرد وەك مۆمیای میسرییەکان و لە تابوتی تەختەدا دایان نان کە هیچ بزماری پێوە نییە، بەپێی بیروبۆچوونی جولەکەکان خوای گەورە کە هەردەم دەستی خێری بەو ئوممەتەوەیە لە لوتکەی توانای جوولەکەدا لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٠)دا ئیرادەی خێری وابوو کە ئەو مەسەلەیە وەك بەڵگەو موعجیزەیەك لەسەر ڕاستییەتی قورئان ئاشکرا ببێت.

هەندێ لە شوێنەوارناس و پسپۆڕی موسڵمانی فەلەستینی توانیان قەبرستانێك بدۆزنەوەو ئەو مۆمیایانە دەربهێنن و وێنەی بگرن، مۆمیاکان قژی سەرو لاشەیان ماوەو دەمیان داچەقیوەو ترس و شپرزەییان پێوە دیارە، هەندێکیان کلکیان هەیە وەك مەیموون و هەندێکیان کلکیان بستێك دەبێ وەك بەراز، هەندێکیان ناوقەدیان درێژ بۆتەوەو شێواوە ئەوە جگە لەوەی کە پارچەی تۆڕی ڕاوچییەکانیش دۆزراوەتەوە، ئینجا لەبەرئەوەی کە دەستی جوولەکەی نەگاتێ دایان پۆشیەوەو بە نهێنی هێشتیانەوە تا ئەو ڕۆژەی وەزعەکە باشتر دەبێت. پاشان وێنەکانیان برد بۆ لای نووسەری میسری (محمد عیسی داود)و داوایان لێکرد کە بڵاوی بکاتەوە بەناوی خۆیەوە، ئەویش وێنەکان و باسەکەی لە پەڕاوێکدا بڵاوکردەوە بۆ جیهان ساڵی (٢٠٠٣)، بەناوی (القنبلة یهود مسخهم الله قردة وخنازیر اکتشاف الغزیة حاضرة البحر) تا ببێتە پەند و عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی کە سنوورشکێنی دەکەن و گوێ نادەن بە فەرمانی خوا.



## ١٣٢ زانایەك خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت بەهۆی وردبونەوەی لە ئایەتێکی قورئان:

زانای پاکستانی محمد عبدالسلام لە ساڵی ١٩٧٩دا جائیزەی نۆبڵی وەرگرت لە فیزیادا بەوەی کە لێکۆڵینەوەی گرنگی کرد لە مەسەلەی (الجسميات وقرائنها). توانی بیردۆزێ دابنێ کە تیایدا دوو هێزی سەرەکی لەم بوونەوەرەدا بە یەکەوە ببەستێتەوە، کە ئەوانیش هێزی کەهرومۆگناتیسی و هێزی ناوکی لاوازە پاش ئەوەی جائیزەکەی وەرگرت وتی: وردبوونەوەم لە ئایەتی: ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ﴾ بووە هۆی ئەو لێکۆڵینەوانەم و گەیشتمە ئەو ئەنجامە گرنگانە.



## ١٣٣ موعجیزە زانستییەکانی قورئان و سوننەت بوونە هۆی موسڵمانبوونی پێنج هەزار ئەمریکی:

یەکێك لە بانگخوازەکانی ئەمریکا سەردانی دەزگای (الاعجاز العلمي للقران و السنة)ی کرد لە وڵاتی سعودیە و زانایان زۆر ڕاستیان بۆ ڕوون کردەوە لەسەر موعجیزەکانی قورئان و سوننەت، ئەویش زۆر دڵخۆش بوو هەموو قسەکانی دەنووسی، پاشان کە گەڕایەوە ئەمریکا بانگهێشتی کرد بۆ خەڵکانێکی زۆرو نزیکی شازدە هەزار کەس ئامادەبوون، ئەو بانگخوازەش باسی ئیعجازی بۆ کردن و فیلمی تایبەت بە ئیعجازی پیشاندان و کارتی تایبەتی بەسەردا دابەشکردن، تاوەکو ئەوەی دەیەوێ موسڵمان بێ پەیوەندی پێوە بکات تا فێری ئیمان و ئیسلامەتی بکات و شایەتمان بینێت، سەرەنجام دەرکەوت کە پێنج هەزار کەس حەز بە موسڵمان بوون دەکەن و موسڵمان بوون (سبحان الله) لەو مژدە گەورەیە.

ئەی خوێنەری بەڕێز: بڕوانە موعجیزەکانی قورئان و سوونەت چەند کاریگەرن و چۆن خەڵکی دوور لە دین ڕێنموویی دەکەن و دەیانهێنە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام،

کەواتە پێویستە ئەو موسڵمانانەی کە باری ئابووریان باشەو حەزیان بە بڵاوبوونەوەی ئیسلام و هیدایەتدانی خەڵکی دوور لە دینە، بە پشتیوانی خوای گەورە ئەو پەڕتووکانەی کە تایبەتن بەو موعجیزە زانستییە گەورانە هەوڵ بدەن بەناو خەڵکیدا بڵاویان بکەنەوە و بەدیاری پێیان ببەخشن، ئەوەش دوو ئامانجی گەورە دێنێتە دی: یەکێکیان ئیمان بەهێزبوون و پتەوبوونی ئیمانی موسڵمانانە، یەکێکیتریشیان ڕەواندنەوەی گومان و دوودڵی ناو دڵی ئەو کەسانەیە کە لە گوماندان بۆ ئەوەی بڕوبیانوویان نەمێنێ و بە دڵنیایی تەواوەوە بێنە ژێر سایەتی بەرنامە پاك و پیرۆزەکەی خوای گەورە.



## ١٣٤ کۆمەڵێك ئەمریکی بیروبۆچوونیان گۆڕا کاتێك گوێبیستی موعجیزەی ئایەتێك بوون:

پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: (ئەمیر محمد بن راشد) ناردی بەدوامدا لە دووبەی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دوازدە بازرگانی ئەمریکی کە میوانی ناوبراو بوون، کەوتینە قسەو باس و زۆر بە خراپی باسی موسڵمانانیان دەکرد، دیاربوو کاریگەرییەکی گەورەی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایان لەسەر بوو، کە زۆربەیان دژایەتی ئیسلام دەکەن. دوو سەعاتێك گفتوگۆمان کردو باسی ئیعجازی قورئانم بۆ کردن، خوا ئاگادارە بیروبۆچوونیان گۆڕدرا و داوای زانیاری زیاتریان کرد لەبارەی ئیسلامەوە.

دکتۆر زەغلول دەڵێت: منیش چەند نامیلکەیەکم پێشکەشکردن، باسەکەشم دەربارەی ئەو ئایەتە بوو کە پێش چواردە سەدە باس لەوە دەکات کە ئاسن لە ئاسمانەوە هاتۆتە سەر زەوی کە لە سورەتی حدید ئایەتی (٢٥)دا دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ لەم سەدەیەی دواییدا ئەم ڕاستییە زیاتر بۆ زانایان ئاشکرا بوو وە چەندەها حاڵەتیان تۆمارکرد کە بەردی نەیزەك هاتۆتە سەر زەوی، بۆ نموونە لە ساڵی (١٨٦٨) زایینیدا

له پۆڵەندا سەد هەزار پارچە بەرد لە ئاسمانەوە کە زۆریان ئاسنیان تێدایە کەوتنە خوارەوە، لە ساڵی (١٩١٢) زایینیدا لە (هولبرك) لە ئەریزۆنا دە هەزار پارچە بەرد کەوتنە خوارەوە. لە ساڵی (١٩٤٧) زایینیشدا هەمان شت لە ڕووسیا ڕوویداوە، دیارە بە هەمان شێوەش ئەو تەنانەی کە ئاسنیان تێدایە لە سەرەتای دروستبوونی زەوییەوە لە ئاسمانەوە داباریونەتە سەر زەوی و بەهۆی گەرمی ئەو کاتەی زەویەوە چوونەتە چینەکانی زەویەوە.

##  دۆزیینەوە مێژووییەکان شایەتی بۆ ڕاستگۆیی قورئان دەدەن:

مامۆستا عەقاد لە پەڕاوی (مطلع النور) دەڵێ: لە مێژووی بطليموس دا باسی گەلی عاد و ثەمود کراوە، ناوی عاد وشەی (ارم)ی لەگەڵدا هاتووە لە پەڕاوی یۆنانیەکاندا بە وشەی (ادراميت) ناویان دەبردن بە زمانەکەی خۆیان، کە ئەمیش شایەتییە بۆ قورئان کە بە هەق وشەی (ارم)ی لەگەڵ (عاد)دا بەکارهێناوە. هەروەها شوێنەوارناس (موزيل التشييكي) خاوەنی پەڕاوی (الحجاز الشمالي)، پەیکەرێکی لەلای مەدیەن دۆزیەوە کە بە زمانی (نبطی) و (یۆنان)ی باسی هۆزەکانی ثەمودی لەسەر هەڵکۆڵدراوە، باسی ئەبرەهەش کە قورئان ئایەتی لەسەر ناردە خوارەوە لەسەر دیوارە ڕووخاوەکانی (سد العارب) دۆزرایەوە، کە بە ئەمیری حەبەشە ناوبراوە قورئانیش لە سورەتی (فجر)دا دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ۝ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ۝ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾ (الفجر: ٦–٩) واتە: ئایا نەتزانیوە بە زانینی وەك بینین کە پەروەردگارت چۆنی کرد بە (عاد) و چی بەسەرهێنان؟

ئەم گەلی (ارم)ە کە لە نیوە دوورگەی عەرەبدا خاوەنی خێوەتگا و هێزی زۆربوون بە جۆرێك کە لە وێنەیان دروست نەکراوە لە وڵاتاندا، تا ئەو چەرخ و سەردەمە وە ثەمود ئایا نەتزانیوە خوای تۆ چی پێکردن لە (حجر) لە ناوەندی حیجاز و شامدا دەژیان و شاخیان دەبڕی و دایان دەتاشی بۆ خانوو، ئەم شاخ کون کردن و هەڵکۆڵینەش وردە وردە دۆزراوەتەوە.

**قورئانی پیرۆز باسی پادشای (سبأ) دەکات لە سەردەمی سولەیمان پێغەمبەردا (سەلامی خوای لەسەر بێ)، کە چۆن خۆی و گەلەکەی خۆریان پەرستووە، پاشان هاتنە لای (سولەیمان) و موسڵمان بوون، ئێستا پاشماوەی دێرینی کۆشکی پادشا دۆزراوەتەوە، لە دووری هەزار مەتریشەوە پەرستگا دۆزراوەتەوە کە خۆریان تێدا پەرستووە، ئەوەش بەڕاستی موعجیزەیە ئەگینا بەس تەنها خوای گەورە ئەم وردەکارییە دەزانێ لە بارەی ئەو گەلەوە، قورئان دەفەرموێ: لەسەر زمانی هودهود:**

﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ۝٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ﴾

**(النمل: ٢٣-٢٤) واتە: بەڕاستی من دیم ئافرەتێك پادشای ئەوانە بەناوی بەلْقیس کە هەموو شتێکی پادشایەتی پێدراوەو، تەختێکی پادشایەتی زۆر گەورەی هەیە خۆی و گەلەکەیم دی لەجیاتی خوا سوژدە بۆ ڕۆژ دەبەن و، شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە، بەو هۆیەوە بەرگری کردوون لە ڕێگەی ڕاست بۆیە ئەوان ڕێگای ڕاست نادۆزنەوە.**

***



## بۆچی ناوی فیرعەون لە سورەتی (یوسف)دا نەهاتووە؟

لە قورئانی پیرۆزدا هەرکاتێك باسی فەرمانڕەواکانی میسر بکرێت، ئەوە بە نازناوی فیرعەون ناویان دەهێنرێ لە نزیکەی ٦٠ ئایەتی قورئانی پیرۆزدا. ئەوە تێبینی دەکرێت تەنها لە یەك سورەتی قورئانی پیرۆزدا باسی فەرمانڕەوای میسر کراوە و لەجیاتی بەکارهێنانی نازناوی فیرعەون نازناوی (مەلیك) بەکارهاتووە، ئەویش لە سوورەتی (یوسف)دا لە ئایەتەکانی سورەتی یوسفدا نازناوی فیرعەون بەرچاو ناکەوێت بەڵکو هەر (مەلیك) بەرچاو دەکەوێت.

ئەوەتا خوای گەورە لە هەموو ئایەتەکانی سورەتی یوسفدا لەجیاتی فیرعەون مەلیك بەکارهاتووە:

یەکەم/ ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ﴾ (یوسف: ٤٣)

دووەم/ ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ۚ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ (یوسف: ٥٠)

سێیەم/ ﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِى ۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ (یوسف: ٥٤)

چوارەم/ ﴿قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ﴾ (یوسف: ٧٢)

پێنجەم/ ﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (یوسف: ٧٦)

بەڵێ لە ئایەتەکاندا نازناوی فیرعەون نەهاتووە بەڵکو هەر نازناوی مەلیك هاتووە باشە بۆچی؟ خۆ یوسف پێغەمبەر لە وڵاتی میسر ژیاوە ناوی فەرمانڕەواکانی میسریش بە فیرعەون هاتووە، بەڵام نهێنی ئەوە ئیعجازێکی گەورەیە چونکە بەپێی نوسراوێك کە بە زمانی (هیرۆگلۆفی) نووسراوەو (شاملیۆن)ی پسپۆڕ لە بواری زمانی هیرۆگلۆفی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە سەردەمی (هکسوس)دا ژیاوە.

(هكسوس) ئەوەیە کە توانی سەرکەوێت بەسەر سوپای فیرعەونەکان ئیدی (هكسوس) و سوپاکەی لە ماوەی (١٧٣٠) پێش زایین تا (١٥٨٠)ی پێش زایین لە میسر مانەوە، تا ئەو کاتەی ئەحمەسی یەکەم دەریکردن و دەوڵەتێکی نوێی کۆماری پێکهێنا، (سبحان الله) تۆ سەیر بکە قورئان چەند وردە لە بەکارهێنانی وشەکاندا و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەکاندا، بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی مێژوویی قورئانی پیرۆزە کە دەیسەلمێنێت قورئان خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی.



## ١٣٧ گەنجینەکانی میسرییە کۆنەکان و دەرکەوتنی ڕاستیەکی سەرنجڕاکێش:

قورئانی پیرۆز باسی سەردەمی یوسف (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەکات، پاش هاتنە دەرەوەی لە بەندیخانە کە بە پادشای میسر دەفەرموێت: ﴿ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ (یوسف: ٥٥) لە لێکدانەوەی خەونەکەشدا دەفەرموێت: ﴿تَزۡرَعُونَ﴾ (کشتوکاڵ دەکەن کەواتە: کۆمەڵگەی میسری کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی بووەو ڕووباری نیل وایکردووە کە گرنگی بدەن بە کشتوکاڵ، لەلایەکیترەوە دەردەکەوێت کە شارستانییەتی پێشکەوتوویان هەبووە لەچاو ئەو زەمانەدا و لەو سەردەمانەدا کۆگا (مخزن)ی زۆریان بنیاتنا بۆ عەمبارکردنی گەنم و جۆ و بەرهەمەکانیتر، تا لە کاتی پێویستدا بەکاری بهێنن و دابەشی بکەن.

جا باس لەوەی کە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی بوون و (خزائن) کۆگای گەورەی زۆریان هەبووە غەیب و نهێنییەکی مێژووییەو خوای گەورە خۆی بە وەحی ئەمەی بە پێغەمبەر ﷺ ناردووە، ئەگینا نەك پێغەمبەر ﷺ کێ مێژووی چوار هەزار ساڵ پێش زایینی فیرعەونی میسرییەکانی زانیوە لەو زەمانەدا، پاش دۆزینەوەی پاشماوە دێرینەکانی میسرییە کۆنەکان لەم سەدانەی دواییدا ئەم ڕاستییە ئاشکرا بوو کە لە

پەرستگای (ئەبو سومبول) کە پاشا ڕەمسیسی دووەم بینای کردووە لە دیوارەکانیا، ئەم عیبارەتە هەڵکەندراوە بە زمانی میسرییە کۆنەکان (من بتاح ئەبەخشم بە ڕەمسیسی دووەم بەرووبوومی بەردەوام تا بەردەوام خواردن بدات بە خەڵکی و ئەو بەروبوومە کۆبکاتەوە کە هەروەك لمی گوێ دەریایە، لە کۆگاکانیان کە لە ئاسمان نزیك دەبێتەوە لە بەرزیدا و بەربوومەکەشی بە هێندەی شاخ بەرزبۆتەوە).

لە کۆمەڵێ وێنەشدا کە دیسان لەسەر دیوارەکان هەڵکەندراوە دەردەکەوێت کە چۆن بەربوومی گەنم و جۆو ترێیان کێشاوەو پشکنینان بۆ کردووە، پاشان خەزنیشیان کردووە، کۆمەڵێکیتری شوێنەوارناسی بە سەرۆکایەتی (نادین مولر) کە مامۆستایەکی ئافرەتە لە زانکۆی شیکاگۆ، ئاشکرایان کرد لە ساڵی (٢٠٠٨) زایینیدا لە ناوچەی (تل أدفوا) لە شاری (ئەسوان) لە خوارووی میسر حەوت کۆگای گەورەیان دۆزیوەتەوە کە بینای ئیدارەی گەورەشی لەگەڵدایە، بۆ تۆمارکردنی ئەو بەروبوومانەی کە دێت و پاشان خەزن دەکرێت، ئەو کۆگایانە لە خشت دروستکراون و تیرەکەیان نزیکەی شەش مەتر دەبێت، هەروەها سجیلی تایبەتیان دۆزییەوە کە ئەو شتانەی تێدا تۆمارکراوە کە خەزنکراون، بەڕاستی ئەم بەڵگەیەش وەك ڕۆژی ڕووناك دەیسەلمێنێ کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورەی ئاگادار بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەکە.




## سەرۆکی تیمێکی یابانی کە ڕاستییەکانی بۆ دەرکەوت موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند:

سەرۆکی تیمێکی لێکۆڵینەوەی یابانی موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، دوای ئەوەی دڵنیابوو هەرچی ئەوان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە پێش (١٤٣٠) ساڵ قورئانی پیرۆز باسی کردووە. ڕۆژنامەی (الجزيرە)ی سعودی ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەم چیرۆکە بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر مادەی (الميثالويندن) کردووە،

که بریتییه له مادەیەکی پرۆتینی مێشکی مرۆڤ له یەکتری جیادەکاتەوەو ڕێژەیەکی کەمی ماددەی کبریتی تیایە، لەبەرئەوە دەتوانێ یەکبگرێت لەگەڵ ئاسن و فسفۆڕ، ئەم مادەیەش بۆ لەشی مرۆڤ زۆر پێویستە، چونکه کۆلسترۆڵ کەمدەکاتەوەو دڵ بەهێز دەکات و لایەنی دەروونی هێور دەکاتەوە.

جیاکردنەوەی ئەم مادەیە له مێشکی مرۆڤ له سەرەتای ساڵی ١٥-٣٥ دەستپێدەکات، دواتر به هێواشی کەمدەبێتەوە تاکو تەمەنی ٦٠ ساڵی، بۆیە ئاسان نییە مرۆڤ ئەم مادەیەی دەست بکەوێت، بۆ ئەم چارەسەرە بیریان کردەوە که له گۆشت و ئەندامەکانی لەشی ناو گیانداران سوود وەربگرن، بەڵام ڕێژەیەکی یەکجار کەمیان دەستکەوت، بۆیە ڕوویان کردە ڕووەکان ئەم تیمە یابانییە دەستیان به لێکۆڵینەوە کرد له ڕووەکەکانەوە بۆ دۆزینەوەی ئەم ماددەیەی که کاریگەرییەکی یەکجار گەورەی هەیە بۆ لادانی نیشانەکانی پیری، هەرچەندیان کرد دەستیان نەکەوت، تەنها له دوو میوە نەبێت که بریتیبوون له هەنجیر و زەیتون، له لێکۆڵینەوەکانیان ئەوەیان ئاشکرا کرد کەوا خواردنی زەیتون به جیا یان هەنجیر سوودێکی ئەوتۆی نابێت مەگەر دەبێت هەردووکیان به یەکەوە بخورێت، ئەوجا ئەم مادەیە کاریگەری دەبێت بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ و له نیشانەکانی پیربوون بەدووری دەخاتەوە.

سەیر بکەن خوای گەورە جگه لەوەی هەردووکی بەیەکەوە باس کردووە لەبەر باشی ئەم دوو میوەیە سوێندیشی پێخواردوون که دەفەرموێت: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ (التين: ١) واتە: سوێند به هەنجیر و زەیتون، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە. لایەنێکی زۆر گرنگ و سەرنجڕاکێشی تری موعجیزەکە ئەوەیە دواتر ئەوەیان دۆزیەوە که بۆ باشتر دروستبوونی ئەم مادەیە پێویستە یەك هەنجیر لەگەڵ حەوت دەنکە زەیتون لێکبدرێت ئەوجا کاریگەرییەکی بەرچاوی دەبێت.

دوای ئەوە ئەم لێکۆڵینەوەیان بڵاوکردەوە زانای سعودی دکتۆر طه إبراهیم خەلیفە لێکۆڵینەوەیەکی له قورئانی پیرۆزدا کرد، بۆی دەرکەوت که خوای گەورە یەکجار

باسی هەنجیری کردووەو ناوی زەیتونیش حەوت جار هاتووەو یەك جاریش ئاماژەی پێداوە کە دەفەرموێت: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾ کە مەبەستی داری زەیتونە، کەواتە حەوت جاریش باسی زەیتون کراوە. ئەم دکتۆرە بەڕێز طه إبراهیم خەلیفە ئەو لێکۆڵینەوەی بۆ زانا یابانییەکان نارد و هەموویان موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند. (الله أکبر) لەو موعجیزە زانستییە گەورەیە لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیە بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شادوومانییەکی زۆر گەورە بۆ بڕواداران وە بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خوا دانپیانانێن.



## ١٣٩ قورئان بووە هۆکاری موسڵمانبوونی دکتۆر(لینۆ لیناسۆری):

زاناو بانگخوازی ناودار شێخ (محمود غەریب) دەڵێت: لە ساڵانی حەفتاکاندا لە بەغدا موناقەشەم کرد لەگەڵ دکتۆر لینۆ لیناسۆری کە شارەزا بوو لە نەخۆشییەکانی کشتوکاڵدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، باسی ئەم ئایەتەمان کرد کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ (الأنعام: ٣٨) واتە: هیچ گیانلەبەرێك نییە لە زەویداو هیچ باڵندەیەك نییە کە باڵەکانی بە ئاسماندا بفڕێت مەگەر ئوممەتن وەك ئێوە، هیچ شتێکی پێویست نییە لەم قورئانەدا ئاماژەمان بۆ نەکردبێت، هەمووشیان بۆ لای پەروەردگاریان دەگێڕدرێنەوەو کۆدەکرێنەوە.





پاش سەعاتێك گفتوگۆ لەسەر ئەم ئایەتە دکتۆر لینۆ هەستایە سەرپێ و هەردوو دەستی خستە سەر یەك و سەری دانەواند و وتی: موحەممەد گوێی بۆ دەنگی ئاسمان گرتووە، دکتۆر شەلال لە زانکۆی بەغدا کە قسەکانی وەردەگێڕا پێیوت: مەبەستت

ئەوەیە موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ من نامەی دکتۆراکەم ئامادە دەکرد گەیشتوومەتە ئەو ڕاستییە، شایانی باسە هیلینی کچیشی پاش چەند دانیشتنێك موسڵمان بوو.

شێخ دەڵێت: موسڵمانبوونی هێلین دواکارم بوو لە بەغداد لە مانگی ١١/١٩٨١، کە بەمەش ژمارەی ئەو زانا ئەوروپیانەی موسڵمانبوون لەسەر دەستما پێنج زانا بوون لەگەڵ دوو ئافرەت دا، شێخ مەحمود لەبارەی ئەزموونییەوە لەگەڵ ئافرەتدا دەڵێت: لەگەڵ کردنەوەی مزگەوتی بونیەدا پێنج ئافرەتی سوننە ئامادەی دەرسەکەم بوون کە ئەوانیش خێزانی زاناکانی عێراق بوون، ئەوانە و زۆری تریش کە ئامادەی وانەکان دەبوون وایلێهات هاوینان دەرسیان بە ١٣٥٠ کوڕ و ٩٥٠ کچ دەوتەوە، یەکێك لەو ئافرەتانەی کە شیوعییەکان دەیاننارد بۆ دەرسی ژنان کە پرسیاری موحریجم لێبکات و ببێتە مایەی گومان دروستکردن، بە فەزڵی خوای گەورە ساڵح بوو لە ساڵی کۆتایی کۆلیژی ئابووریدا باسەکەی لەسەر ئابووری ئیسلامی بوو مامۆستاکەی هەر چەند چەپ بوو لەبەر بەهێزی باسەکەی پلەی ئیمتیازی دایە.

ڕۆژێك ئەو ئافرەتە پرسیاری لێکردم کە ئایا لە ڕۆژانی حەیزدا دەتوانێ قورئان بخوێنێ؟ کە وتم نابێت کۆڵێك خەفەتی خوارد و وتی: ئافرەت چۆن دەتوانێ بژی و هەفتەیەك قورئان نەخوێنێت؟ پاشان ئەم ئافرەتە کۆچی کرد بۆ وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامی و دایەنگایەکی ئیسلامی نموونەیی دامەزراند.

***



## وردبوونەوەی بیانییەکان لە موعجیزەکانی قورئان:

بیانییەکان ڕۆژانە دێن بەرەو ئیسلام لە ئەنجامی دیراسەکردنی قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە:

١. یەکێ کە موسڵمان بوو وتی: قورئان دیارە کەلامی خوایە ئەوەتا قورئان ناوی نووسەری لەسەر نییە، بە پێچەوانەی ئینجیلەکانەوە کە ئینجیلی مەتی و بەرنابا و پۆلص و هتد.

٢. یەکێکیتر دیراسەی قورئانی کرد وتی: هەر لە سەرەتاوە قورئان دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِ﴾ (البقرة: ٢) واتە: ئەم پەڕاوە هیچ گومان و کەموکوڕییەکی تیا نییە، دیارە خوا نەبێت کەس ناتوانێك پەڕاوێك بێنێ و بڵێ هیچ گومان و کەموکوڕییەکی تیا نییە. ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ (المائدة: ٦٧) واتە: خوا دەتپارێزێ لە خەڵکی پاسەوانەکانی ئێزن دا، ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، چونکە لەدوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە سەرەڕای ئەو هەموو ناحەزانەی کە هەیبوو کەچی خوای گەورە پاراستی تا وەفاتی کرد، هیچ کەسێك حیمایەتی نەبوو.

٣. یەکێکیتر دەڵێت: خەدیجە کە ئافرەتێکی پایەبەرزی ئەو زەمانەی خۆی بووەو دوو شووی کردووە و بازرگان بووە، شارەزاییەکی تەواوی لەبارەی پیاوانەوە هەبووە، بۆیە کاتێك وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەکات دیارە ڕاست دەکات و لەخۆیەوە نایڵێت کاتێك کە وەحی بۆ هات و زۆر بێتاقەت بوو ئەویش دڵی دایەوەو وتی: هەرگیز خوا تۆ تووشی شتی خراپ و ناهەمواری ناکات، لە کاتێکدا تۆ لەگەڵ هەمووان باشیت خزم و دۆست بەسەر دەکەیتەوە و یارمەتی هەژاران و لێقەوماوان دەدەیت.

٤. زانایەکی جولەکە بەوە موسڵمان بوو کە پێیان وت: بەشکردنی میرات لە قورئاندا بە چەند ئایەتێك باسکراوە و، هەقی هەمووانیشی بە وردی و بە ڕێکوپێکی داوە کە ئایەتەکانیان پیشاندا موسڵمان بوو چونکە لە وڵاتان دابەشکردنی میرات بە کتێبێك تەواو نابێت.

٥. دکتۆر میلەر کە بینی لە قورئاندا لە ٢٥ جێدا باسی عیسا دەکات و تەنها پێنج جار ناوی موحەممەد هاتووە، پاشان چەندجار باسی مەریەم دووبارە بۆتەوە بۆ تاقە جارێکیش باسی خەدیجە یان فاتیمەی کچی پێغەمبەر ناکات، وتی: دیارە ئەمە لە خواوەیەو لە ساڵی ١٩٧٧دا موسڵمان بوو.

٦. گۆرانیبێژی ئەمریکی سیلەرز لە شاری ڤێرجینیا گوێی لە دەنگی قورئانخوێن (خالد قحطاني) بوو، کاسێتێکی کڕی و پاش ئەوەی گوێی لێگرت موسڵمان بوو.

٧. پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: لاوێکم بینی کە شارەزاییەکی باشی هەبوو لە بواری موشەحاتی ئەندەلوسی لە ئیسپانیا بەو مۆسیقایەی لە قورئاندایە موسڵمان بوو.

٨. پرۆفیسۆر دکتۆر (کیث مور) بە قۆناغەکانی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا کە قورئان زۆر بە وردی و زانستیانە باس دەکات موسڵمان بوو.




## دۆزینەوەی بیردۆزی تەرازووی خواردن و خواردنەوە لە قورئاندا لەلایەن دکتۆر جەمیل قودسی دوەیك:

دکتۆر جەمیل کە بەرنامەی هەیە لە کەناڵە فەزاییە ئیسلامییەکاندا و دۆزەرەوەی بیردۆزی تەرازووی خواردن و خواردنەوەیە لە قورئاندا، دەڵێت: قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ (الأنعام: ٣٨) یان ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ من وەك پزیشکێك بیرم کردەوە لە تەقدیری خواو تەرازووی خوایی لە هەموو شتێکدا، تەنانەت مانگ و ئەستێرەکان و خۆریش بە حسابێکی زۆر ورد دروستکراون:

قورئان دەفەرموێت: ﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾ (یس: ٣٩) مانگ چوارسەد هەزار کیلۆمەتر لێمان دوورە بارستاییەکەی یەك لەسەر شەشی بارستایی زەویە، خۆریش یەك ملیۆن جار گەورەترە لە زەوی ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ

ﭐلۡعَزِيزِ ﭐلۡعَلِيمِ﴾ (يس: ٣٨) ئەویش بە تەقدیرات و حسابێکی مەزن دروستکراوە، هایدرۆجین کە چالاکە بەردەوام دەبێت بە هیلیۆم کە سستەو گەرمی ناو خۆر نزیکەی بیست ملیۆن پلەی سیلیلیزیەو، ڕووی خۆریش شەش هەزار پلەیە، کە ئەگەر هەریەکە لە بارستایی ئەو ئەستێرانەیان دووری و نزیکیان بەم شێوەیەی ئێستا نەبووایە ژیان نەدەبوو. ئینجا بێینە سەر ئەو وشانەی لە قورئاندا هاتوون و دووبارە بوونەتەوە ئەویش بە حیسابەو تەقدیرێکی سەیری تیایە بۆ نموونە:

وشەی (بر) وشکانی ١٣ جار هاتووە

وشەی (بحر) دەریا ٣٢ جار هاتووە

هەردووکیان کۆکەرەوە دەکاتە (٤٥) کە وشکانی و ئاوی زەوییە، ئینجا سیازدە دابەش بکە بەسەر ٤٥دا دەکاتە (٩٩.٢٨) کە ڕێژەی وشکانییە بۆ زەوی، هەروەها ٣٢ دابش بکە بەسەر ٤٥ دا دەکاتە (١١.٧١) کە ڕێژەی ئاوە بۆ زەوی، وشەی (شهر) دوانزە جار دووبارە بۆتەوە لە هەموو قورئاندا، کە سەیر دەکەین ساڵێك دوانزە مانگە لەو کاتەوە کە خوای گەورە زەوی و ئاسمانی دروست کردووە ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرًا﴾ (التوبة: ٣٦).

وشەی (یوم) سێ سەد و شەست و پێنج جار دووبارە بۆتەوە کە ساڵێك ئەوەندە ڕۆژەیە، وشەی (صلوات) لە قورئاندا پێنج جار دووبارە بۆتەوەو موسڵمانیش شەو و ڕۆژی پێنج نوێژی فەرزی لەسەرە. وشەی (عزم) بە هەمان شێوە پێنج جار دووبارە بۆتەوە و پێغەمبەرانی خاوەن عەزمیش پێنج پێغەمبەرن کە (نوح و ئیبراهیم و عیسا و موسا و موحەممەد)ن سەلامی خوایان لەسەر بێت.

لە لاشەی مرۆڤدا ژمارەو بڕ بۆ هەر شتێك خوا تەقدیری کردووە، کاتێك ژمارەی خڕۆکە سوورەکان لە سیانزە هەزار کەمتر بێت مرۆڤ تووشی کەمخوێنی دەبێ. کاتێك لە هەژدە هەزاریش زیاتر بێت ئەوە نەخۆشییەو خوێنی زۆرە، ژمارەی خڕۆکە سپییەکانیش بە هەمان شێوە ئەگەر لە چوار هەزار کەمتر بن (نقص مناعة) هەیەو ئەگەر لە یانزە هەزاریش زیاتر بێت ئیلتیهاب یان شێرپەنجە هەیە.

دکتۆر جەمیل قودسی دوەیك دەڵێ ئینجا هاتمە سەر خواردن و خواردنەوە ئەوەی کە حەرام کراوە لە گۆشتی بەراز و مەی لامبرد، ئەوەیترم حیساب کرد. ئینجا بڕی (سحرات)ی حراریم حساب کرد پاشان لەگەڵ ئەو برانەی کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی باسی کردووە، گەیشتمە ئەو ڕاستییەی کە قورئان (١٤)جار باسی میوەی دووبارە کردۆتەوە. حسابی تێدایە کە باسی گۆشتی باڵندەو شتی تری کردووە، هەمووی وردەکاری زۆر گەورەی تیایەو بۆم دەرکەوت کە قورئان تەرازوویەکی زۆر گرنگمان دەداتێ لە مەسەلەی خواردن و خواردنەوەدا کە بۆ مرۆڤ زۆر پێویستە، زەیتون شەش جار باسکراوە یەك جاریش ئاماژەی بۆ کراوە هەنجیریش یەك جار باسکراوە. کاتێ عەمیدی کۆلیژی کشتوکاڵ لە میسر چوو بۆ یابان بۆ دیراسە لەسەر هەنجیر کە ئەنزیمێکی تیایە بەناوی (فیسین)، یابانییەکان داوایان لێکرد کە لەسەر زەیتونیش لێکۆڵینەوەکانی بکات و کاتێ ڕێژەی هەنجیر بۆ زەیتونی پێیوتن کە یەك بۆ حەوتە لە قورئاندا، بەرائەتی ئیختراعیان دایە کە تێکەڵکردنی ئەو دووانە بەو ڕێژەیە ماددەیەکی گرنگی لێ دەردەچێت بۆ مرۆڤ پێویستە، ئینجا زانا یابانییەکە بەهۆی ئەو ڕێژەیە لە قورئاندا موسڵمان بوو.

بەڕاستی پێویستە بڕواداران ئەو موعجیزە زانستییە گەورانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن، کە بەڕاستی ئەوەش گەورەترین دیارییەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە.

***



## لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی موعجیزەی ئایەتێکی قورئان ئاشکرا دەکات:

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی کە لێکۆڵەرانی سەر بە (ساینس ترانسلیوشنال میدیسین) ئەنجامیانداوە، دەرکەوتووە کە کەمخەوی و گۆڕینی ڕیتم و ئیقاعی نووستن لە شەودا و درەنگ هەڵسان لەخەو و درەنگ نووستن، زیان بە کاتژمێری ناوەوەی مرۆڤ دەگەیەنێت و تووشی شێوان و تێکچوونی دەکات، ئەمەش مادەکان کە پەنکریاس کەمتر ماددەی ئەنسۆلین دەربدات، بەمەش ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا زیاد دەکات و لە کۆتاییشدا مرۆڤ تووشی نەخۆشی شەکرە دەکات. جگە لەمەش لێکۆڵەران ئاماژەیان بەوەش کرد کە ئەوانەی بە شەو کەم دەخەون تووشی تەمبەڵی کرداری گۆڕینی خۆراك بۆ وزە دەبن و بەمەش لە کۆتاییدا کێشیان زیاد دەکات و تووشی قەڵەوی دەبن.

شایانی باسە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا کە باسی شەو و ڕۆژ کراوە شەو تایبەت کراوە بۆ نووستن و حەوانەوەی مرۆڤ و ڕۆژیش بۆ کارکردنە، چونکە ئەگەر مرۆڤ بە ڕۆژ کاربکات و بە شەویش بخەوێت و وچان بدات، ئەوە بە دوور دەبێت لە نەخۆشی و ناخۆشی ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ۝١٠ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا﴾ (النبأ: ٩-١١) واتە: نووستنمان کردووە بە هۆی حەسانەوەتان شەویشمان بۆ ئێوە کردووە بە پۆشاکێك و داتان دەپۆشێت، ڕۆژیشمان کردۆتە هۆی کارکردن و بەدەستهێنانی بژێوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی.

***



## لەهجەی مانگاكان و دەركەوتنی ڕاستییەكی زانستی تازە:

لێكۆڵینەوەیەكی تازە ئەوەی ئاشكرا كرد كە مانگاكان خاوەن لەهجەی تایبەتن، ڕادیۆی (بی بی سی) بڵاویكردەوە كە پرۆفیسۆرێكی زانكۆی لەندەن لە دوای لێكۆڵینەوەیەك، گەیشتە ئەو ڕاستیەی كە مانگاكان بەپێی ئەو شوێنەی كە تێیدا دەژین لەهجەی تایبەت بە خۆیان هەیە كە قسەی پێدەكەن، لەو بارەوە پرۆفیسۆر (جۆن وێڵز) پسپۆڕ لە بواری زانستی دەنگسازی لە زانكۆی لەندەن ڕایگەیاند كە دوای ئەوەی جوتیارێك لە یەكێك لە كێڵگەكان هەستی بەوە كردووە كە مانگاكانی هەریەكەیان بە جۆرە لەهجەیەكی تایبەت قسە دەكەن، تووشی سەرسووڕمان بووە، دواتر دوای لێكۆڵینەوە دەركەوت كە ئەو جوتیارە چەندین مانگای هەبووە كە پێشتر لە چەندین شوێنی جیاجیا ژیاون، بۆیە هەریەكەیان خاوەنی لەهجەیەكی تایبەت بە خۆیانن، هەروەها (جۆن وێڵز) ئەوەشی ئاشكرا كرد لەمیانی لێكۆڵینەوەكانیدا كە باڵندەكانیش بەپێی شوێنیان لەهجەی تایبەت بە خۆیان هەیە.

شایانی باسە لە قورئانی پیرۆزدا پێش چواردە سەدە باس لەوە دەكات گیانداران و باڵندەكان وەك مرۆڤ وان كە زمانیان هەیەو قسە دەكەن، بەڵام مرۆڤ لە قسەكردنیان ناگات، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ (الأنعام: ٣٨) واتە: هەر گیانلەبەرێكی سەرزەوی هەروەها هەموو باڵندەیەك كە بە باڵەكانی دەفڕێت ئوممەتانێكن وەكو ئێوە. بەڕاستی دەبوو ئەو كەسانەی تا ئەوپەڕی پلە بێباوەڕن و دوورن لە بەرنامەی ئیسلام كە ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە دەبینن دەبوو بە قەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی لەناو دڵەكانیان نەمابایەو بە هەموو قەناعەتێكەوە هاتبانە ناو بازنەی ئەم ئایینە پێشكەوتوو و پڕ لە زانستیە، چەند جوانی فەرمووە خوای گەورە كە دەفەرموێت: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْءَافَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەكانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیاوە لە خودی خۆیاندا، هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستە، ئایا پەروەردگارت بەس نییە كە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێكدا.



## ١٤٤ ياسایەکی میرات لە قورئاندا بووە هۆی موسڵمانبوونی مامۆستایەکی جوولەکە:

مامۆستایەکی پسپۆڕ لە بواری یاسادا کە لە زانکۆیەکی ئەمریکی دا کاردەکات دەڵێت: لە دانووستانێکدا لەبارەی یاساوە مامۆستایەکی یاسای جوولەکەمان لەگەڵدا بوو کەوتە تانەو تەشەردان لە ئیسلام و موسڵمانان. مامۆستایەکە دەڵێت: منیش بۆ ئەوەی دەمکوتی بکەم لێم پرسی ئایا دەزانی قەبارەی یاساکانی میرات لە دەستوری ئەمریکیدا چەندە؟ وتی: بەڵێ زیاتر لە هەشت موجەڵەدە، منیش پێم وت ئەگەر یاسایەکی میراتت بۆ بهێنم کە لە دە دێڕ زیاتر نەبێت ئەوسا بڕوا دەکەی کە ئیسلام ئاینێکی ڕاستەو هەقە؟ وتی: هەرگیز شتی وا نابێت. منیش ئایەتەکانی میراتم لە قورئان بۆ دەرهێناو دامێ پاش چەند ڕۆژێ هات بۆلام و وتی: هەرگیز عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ حساب بۆ میراتی هەموو خزمان بکات و بەو گشتگیرییەو کەسی لەبیر ناچێ، ئینجا بەشی هەریەکە لەو کەسوکارە بدات بەو عەدالەتەو بەبێ ئەوەی ستەم لە کەس بکات پاشان موسڵمان بوو. بەڕاستی ئەمەیە گەورەیی ئەم قورئانە تەنها ئایەتەکانی میرات بەس بوو کە مامۆستایەکی بواری یاسای جوولەکەی پێ موسڵمان بێت.



## ١٤٥ دکتۆرێکی بەناوبانگی فەرەنسی بە بەڵگەوە سەلماندی کە قورئان کەلامی خوای گەورەیە:

دکتۆری بەناوبانگی فەرەنسی (مۆریس بوکای) دەڵێت: من پێوەرێکی بەرجەستەم پێیەو دەتوانم بیسەلمێنم کە قورئان وتەی خوایە، ئەویش کاتێك سەیری زانیارییەکانی قورئان دەکەم و بەراوردیان دەکەم لەگەڵ ئەو زانیارییانەی لەو سەردەمەدا هەبوون، جا ئەگەر زانیارییەکانیان هاوشێوە بوون ئەوا (موحەممەد) زانیارییەکانی لە دەوروبەرەوە وەرگرتووە، کاتێکیش سەیری کەسایەتی (موحەممەد)م کرد زانیم

نەخوێندەوار بووە، سەیری قورەیشم کرد لەو سەردەمەدا (١٧) کەسی تێدابوو نووسین بزانێت، سەیری پێشکەوتوترین شارستانیەتی ئەو سەردەمە دەکەم کە یۆنانییەکان و میسرییەکان بوون، یۆنانییە کۆنەکان ڕووداوە گەردوونییەکانیان بە هۆکاری بوونی خوا جیاجیا لێکدەدایەوە بە جۆرێك دەیانوت هەور، ئەستێرە، خۆر، با، ئەمانە خوای تایبەت بە خۆیان هەیە.

میسرییەکانیش کاتێك لافاوی نیل دەستی پێدەکرد دەیانوت ڕووباری نیل پادشایەکی تێدایەو لێمان توورە بووە، داوای بووکێکمان لێدەکات لەبەرئەوە جوانترین کچیان دەڕازاندەوەو جلی بووکێنیان لەبەر دەکرد و فڕێیان دەدایە ڕووبارەکەوە هەتا لافاوەکە بنیشێتەوە. پرۆفیسۆر دکتۆر مۆریس بوکای دەڵێت: کاتێك سەیری زانستەکانی قورئانیشم کرد دەبینم هەموو زانستەکانی هاوشێوەی زانستە سەلمێنراوەکانی ئەم سەردەمەن، شیاوی باسە لە پاش زیاتر لە دە ساڵ لێکۆڵینەوە پرۆفیسۆر دکتۆر مۆریس بوکای موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند.



## ١٤٦ هیچ وشەیەك لە قورئاندا بێ مەبەست نەهاتووە:

قورئانی پیرۆز بە شێوەیەك داڕێژراوە مەگەر هەر لە عیلمی خوادا بێت هەروەك دەفەرموێت: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ (النساء: ١٦٦) واتە: بەڵام خوا شایەتی ئەدات لەسەر ڕاستیەتی ئەو قورئانەی کە بۆی ناردووی ناردوویەتییە خوارەوە بە زانستییە تایبەتییەکەی خۆی، کە بێوێنەیەو بێپایان و بێ سنوورە، فریشتەکانیش شایەتی دەدەن وە خوا بەسە شایەت بێت. بەڵێ قورئان ئەگەر لە خواوە نەهاتایە جیاوازی و ناتەواوی زۆری تیادەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفًا كَثِيرًا﴾ (النساء: ٨٢) واتە: بۆ بیرناکەنەوە و ورد نابنەوە لە قورئان تا بۆیان دەربکەوێ کە چەند جوان نەخشێنراوەو چنراوە، جا ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن هەر

نموونە لە قورئاندا:

أ. (١٢) جار وشەی (الشهر) هاتووە بە قەدەر مانگەکانی ساڵ.

ب. (١١٥) جار وشەی (الدنیا) هاتووە (١١٥) جاریش وشەی (الأخرة) هاتووە.

ج. (٥) جار وشەی (یۆثرون) هاتووە (٥) جاریش وشەی (الشح) هاتووە.




## دۆزینەوەکانی دەریای مردوو دەبنە هۆی ئاشکرا بوونی ڕاستییەکی زۆر گەورە:

لە ساڵانی ڕابردوودا کۆمەڵێك دەستخەتی کۆن دۆزرایەوە لە گۆزەی گڵێندا لای دەریای مردوو، کە ئێستا ئەو دۆزراوانە لە وڵاتی ئەردەن. دکتۆر (د.ف. البراین) کە زانایەکی بەناوبانگە لە (أثار الأنجیل) دا دەڵێت: هیچ گومانێك نییە لە جیهاندا لەبارەی ڕاستی و تەواویەتی ئەو دەستخەتانەوە وە ئەو لاپەڕانە شۆڕشێك بەرپا دەکەن لەبارەی فیکری مەسیحیمانەوە، هەروەها قەشە (باول دیفز) لە واشنتۆن لە پەڕاوی (مخطوطات بحر المیت)دا دەڵێت: دەستخەتەکانی دەریای مردوو لە گەورەترین دۆزراوەکانی ئەم چەند سەدەیەی دواییەوە کە تێگەیشتنی ئاسایی دێرینمان بۆ ئینجیلەکان دەگۆڕێت، لەم دەستخەتانەدا ڕاستییەتی ئینجیلی (بەرنابا) زیاتر دەردەکەوێت کە مژدەی ڕوون و ئاشکرای تێدایە بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ، لەم دەستخەتەدا هاتووە دەڵێت: (أن عیسی کان نبیا المسیحین وان هناك نبیا أخر) واتە: عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) پێغەمبەری گاورەکان بووە و پێغەمبەرێکی تریش دێت.

ئەو دەستخەتانە وای لە پاپای ڤاتیکانی پێشوو کرد کە داوای بەستنی کۆنگرەیەك بکات بۆ موسڵمان و گاورەکان لەژێر چاودێری خۆیدا، بەڵام وەفاتی کرد هەندێك دەڵێن کوژرا ڕەنگە بۆ ئەوە بوو بێت کە بەو کارە گرنگە هەڵنەستێ، پاپای دوای ئەو هاتوو

بۆ ماوەی چوار ساڵ لێکۆڵینەوەو ڕاوێژ لەسەر ئەو دەستخەتانە کراو کۆنفراسی بۆ گیرا، سەرەنجام بەیاننامەیەك دەرچوو لە ڤاتیکانەوە کە ئیسلام ئاینێکی ئاسمانی ڕاستەو موسڵمانانیش کۆمەڵێکی سەرفرازن لە قیامەتدا، پێویست ناکات (تبشیر) بکرێن و بانگ بکرێن بۆ سەر ئاینی مەسیحی. نوسخەیەکی ئەو بەیاننامەیە لە (ڕابیتەی عالەمی ئیسلامی)یە لە وڵاتی سعودییە (ئەوە دکتۆر عەبدولمەجید زندانی لەبەرمانەی وذکر لە کەناڵی ئاسمانی ئیمارات لە مانگی ١١/١٩٩٩ باسی کرد).



## بەناوبانگترین زانای جوولەکە موسڵمان بوو بەهۆی موعجیزەی ئایەتێکی قورئان:

(ڕۆبەرت گیلهۆم) بەناوبانگترین زانای جوولەکە لە بواری زانستی بۆماوەییدا پاش ئەوەی توێژینەوەی لەبارەی چەند ئایەتێکی قورئانەوە ئەنجامدا موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند. (ڕۆبەرت گیلهۆم) کە یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی بواری زانستی بۆماوەزانی لەبارەی پەیوەندی هاوسەریەتی و کاریگەرییەکانی لەسەر هاوسەرەکان چەندین توێژینەوەی ئەنجامداوە. ئەم زانا جولەکەیە کە هاوکات سەرۆکی ناوەندی توێژینەوەی (ئەلبرت ئەنیشتانە)، پاش خوێندنەوەی ئەو ئایەتە قورئانیانەی پەیوەندییان بە (عیدەی) ژنانی تەڵاقدراو هەبوو، دواتر بەراوردکردنیان بە توێژینەوەکانی خۆیەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئایینی ئیسلام کامڵترین ئاینە. ڕۆبەرت لە توێژینەوەکانیدا بۆی دەرکەوتووە سێ مانگ پاش لێکجیابوونەوی هەردوو هاوسەرەکە شوێنەواری هاوسەریەتی لە هەردووکیاندا نامێنێت، لە قورئانیشدا هاتووە کە ژنی تەڵاقدراو دەبێ سێ مانگ لە (عیدە)دا بێت و شوو ناکاتەوە، بەم هۆیەوە (ڕۆبەرت گیلهۆم) بە بەراوردکردنی بەڵگە زانستیەکان لەگەڵ ئایەتە قورئانییەکاندا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئایینی ئیسلام ئایینێکی ڕاست و دروست و تەواوە، تەنها ئایینێکە کە ئارامی و ئاسایش و پاکیەتی ئافرەت دابین دەکات.

هەر بەپێی ئەم بنەمایە ئافرەتانی موسڵمان پاکترین ئافرەتانی سەر ئەم زەویەن.
سوپاس بۆ تۆ خوایە بەڕاستی قورئانەکەت پڕیەتی لە موعجیزەی زانستی سەرنجڕاکێش هەر کەسێکیش کە دڵی زیندوو بێ و بە ئینسافەوە لێکۆڵینەوە بکات لە قورئان وەك ئەو زانا گەورە ناودارە جولەکەیە بە هەموو قەناعەتێکەوە دەگاتە دڵنیایی تەواو و موسڵمان دەبێ.



## قەشە (دانکیرز) داندەنێ بە ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆز:

شێخ ئەحمەد دیدات دەڵێت: لە خوارووی ئەفریقا زۆر گەڕام بۆ ئینجیلێك بە زمانی ئەندۆسی لای خۆمان دەست نەکەوت، بە مەرجێ لە هەموو شارێك کتێبخانەی تایبەت هەیە بە ئینجیل. لە شاری (جۆهانسبیرگ) لەلای کتێبخانەیەك ئینجیلێکم دەستم کەوت کە ئەو کتێبخانەیە قەشەی پیری خانەنشین دەیانبەن بەڕێوە، کەوتمە بەراوردکردنی لەگەڵ نوسخەی یۆنانی ئینجیلدا، کابرای خاوەن کتێبخانە کە قەشەیەکی پیری خانەنشینکراو بوو بەناوی (دانکیرز)، زۆر سەرنجی دام و لای سەیر بوو بەم جلوبەرگ و ڕیش و کڵاوەوە ئاوا بە وردی سەیری ئینجیلەکە دەکەم وتی: حەز دەکەم چایەك بخۆیتەوە لام، وتم: پێمخۆشە چوومە لای دانیشتم و کەوتینە قسە، ناوبراو وتی: لام سەیرە ئاوا لەو ئینجیلە ورد دەبێتەوە نازانم هۆکەی چییە؟ منیش وتم: ئەوە من خەریکی بەراوردکردنی ئاینەکانم و بۆم باسکرد لە ئینجیل و قورئانداو قورئان چۆن باسی مەریەم و عیسا دەکات هەموویم بۆ باسکرد و وتم: ئێمە بڕوامان بە پاکییەتی مەریەم و پێغەمبەریەتی عیسا هەیە و ئینجا وتم: توخوا ئەگەر بتەوێت باسی مەریەم بۆ کچەکەیت بکەیت ئەوەی خۆتانی بۆ باس دەکەیت یان ئەوەی قورئان، سەری داخست لە شەرما و وتی: بە دڵنیاییەوە ئەوەی قورئانی بۆ باس دەکەم.



## چەند نهێنی و وردەکارییەك لە قورئاندا بەڵگەن لەبارەی ئیعجازە ناوازەکانی:

دوو وشە هەیە (افرغ) لەگەڵ (صب) ئەمڕۆ لە عەرەبی ئاسایی بەغدایيدا هەردووکی وەك يەك بەکاردێت. ئەڵێ (فرغ لی شای) يان (صب لی مای) (فرغ) و (صب) واتە: تێکردن، بە يەك مانا بەکاردێت کە تەماشای قورئان بکەی ئەبينی (افرغ) تێکردنێکی نەرم و نيانە، خوای گەورە بەکاری دێنێ بۆ ئيمانداران ﴿رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا﴾ (الأعراف: ١٢٦) واتە: خوايە خۆگرييەك بکەيتە ناو دڵمانەوە کە بتوانين ئارامگر بين لە جيهاددا و لە دژايەتی بێباوەڕاندا، بەڵام (صب) تێکردنێکی توندوتيژە ڕۆکردنە ڕشتە بۆ بێباوەڕان بەکار دێت: ﴿فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ﴾ (الفجر: ١٣) خوێنەری بەڕێز بڕوانە قورئان چەند وردەکاری جوانی تيايە.

بێينە سەر دوو وشەی تر لە عەرەبيدا ياسايەك هەيە (زيادة المبني تدل على زيادە المعنی) واتە: هەر وشەيەك کە پيتەکانی زۆرتر بوو مەعناکەی بەهێزترە، قورئانی پيرۆز کە باسی ديوار دەکات کە (ذو القرنين) دروستيکرد بۆ پاراستنی گەلێکی بێدەسەڵاتی بچکۆلەی باوەڕدار، کە بيانپارێزێ لە (يأجوج و مأجوج) ئەو ديوارە بەرزەی بۆ دروستکردن قورقوشمی تواوەی تێکرد بە پاڵپشتی عەمەلی جەماوەر و سوپاکەی خۆی و چوون تاقيبکەنەوە ﴿فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا﴾ (الكهف: ٩٧) بۆ سەرکەوتنی شاخەکە (ٱسۡتَطَٰعُواْ)ی بەکارهێنا ئايەتی سەرکەوتن بەسەر شاخێکدا يان سەرکەوتن بەسەر ديوارێکدا ناڕەحەتترە؟ يان کونکردنی شاخێك يان ديوارێك کە ناو کارەکەی لە قورقوشمی تواوە بێت؟ بێگومان کونکردنی ناڕەحەتترە ئەبينی وشەيەکی گەورەتری بەکارهێناوە بۆ کونکردن (ٱسۡتَطَٰعُواْ)ی بەکارهێناوە، بەڕاستی بوونی ئەو هەموو وردەکاريانە لە قورئاندا، گەورەترين بەڵگەيە کە خاوەنی ئەم قورئانە پيرۆزە خوای گەورەی ئاگادارە بە هەموو نهێنی و ئاشکرايەك.



## ١٥١ وشەی (تفیض) و ڕاستییەکی زانستی گەورە:

لە قورئانی پیرۆزدا دووجار وشەی (تفیض) هاتووە، لە کاتێکدا کە وشەیەکی ناسکەو وشەیەکی زانستیشە، جارێکیان لە سورەتی (المائدة) ئایەتی (٨٣)دا هاتووە کە باسی قەشەکانی حەبەشە دەکات کە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب سورەتی (المائدة)ی بۆ خوێندنەوە کاری تێکردن:

﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ (مائدة: ٨٣)، جاری دووەمیان لە سورەتی التوبە ئایەتی (٩٢)دا هاتووە: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ﴾ (التوبة: ٩٢).

باسی ئەم موجاهیدانە ئەکات کە دەیانەوێ بچن بۆ جیهاد بەڵام ئیمکانیەتیان نییە، کەواتە تەنها ئەم دووجار ئەم وشەیە هاتووە لە قورئاندا. (تفیض) واتە: (سەر ڕێژ) ئەگەر بە وردی تێبینی بکەین دەبینین کە باسی فرمێسک دەکات فرمێسکی چاو سەر ڕێژ دەکات لەنا چاودا غودەی فرمێسک هەیە بیست و چوار سەعات ئیش دەکات لەپێناو دوو هۆکاری سەرەکیدا بۆ ئەوەی:

أ. چاو وشك نەبێتەوە تا لەئیش نەکەوێت.

ب. ئەو فرمێسکە کەرەستەیەکی پاکژ کەرەوەیە دژ بە میکرۆبات و هەموو تەنێکی نامۆ کە بێتە ناو چاوەوە. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەو غودەی فرمێسکەی کە بەردەوام فرمێسك دەڕژێنێتە ناو چاوەوە بۆ کوێ دەڕوات؟ دکتۆرەکان وەڵام دەدەنەوە کەناڵێك هەیە پێی دەڵێن: کەناڵی فرمێسك لەوێوە وەکو چۆڕاوگە ئەڕواتە خوارێ ئەچێ بۆ لوت، بەڵام ئەگەر هاتوو هەڵچوونی مرۆڤ کە دەرەجەی سۆز و خەفەتی مرۆڤەکە زۆر بوو گریانەکەی زۆر زۆر بوو، ئەو چۆڕاوگە نایکێشێ بەشی ناکات سەرڕێژ دەکات و بە شێوەی فرمێسك بە ڕوومەتدا دێتە خوارێ، کە ئەم تەعبیرە (سەرڕێژ تفیض) دەربڕینێکی زۆر ناسك و زۆر زانستییە.





## زانایانی سەردەمی تازە وردەکارییەکانی قورئان دەدۆزنەوە:

هەمیشە قورئان جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو دەنگوباس و بەسەرهاتانەی پێشوو نە پێغەمبەر و نە گەلەکەی پێشتر نەیانزانیوەو ئەو بەسەرهاتانە خوا دابەزاندۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەوەش بۆ خۆی بەڵگەیە کە ئەم قورئانە لە خواوەیە.

قورئان دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَاصْبِرْ ۖ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (هود: ٤٩) واتە: ئەمانەی باسکران لە هەواڵە گرنگە نادیارەکانە بە نیگا بۆمان ناردی، نە تۆ و نە گەلەکەت نەتان دەزانین لەپێش ئەم نیگای ئێمە کەواتە خۆڕاگربە بە ڕاستی سەرەنجام بۆ لەخواترسانە.

بەڵێ قورئان باسی مێژوویەك دەکات کە خوا نەبێت کەس ئەو وردەکاریانە نازانێت، پاش چەند سەدەیەك وردە وردە هەندێکیان لەلایەن زانایانەوە پاش هەوڵ و کۆششی زۆر و خەرجکردنی ملیۆنەها دۆلار دەدۆزرێنەوەو دەبنە بەڵگە لەسەر ڕاستییەتی قورئان، بۆ نموونە:

أ. قورئان بە وردی باسی گەلی سەبەء و بەنداوەکەیان و کشتوکاڵیان و خۆشگوزەرانیان دەکات، پاشان باسی شوکر نەکردنی نیعمەتەکان و ڕووخانی بەنداوەکەو تیاچوونی کشتوکاڵیان دەکات کە دۆزینەوەکان جەخت دەکەنە سەر ڕاستییەتی هەواڵەکانی قورئان.

ب. قورئان باسی پاشای سەبەئو دەستەڵاتیان دەکات لە زەمانی سولەیمان پێغەمبەردا (سەلامی خوای لەسەر بێت). باسی پەرستنی خۆر دەکات لەلایەن ئەو گەلەوە لەو کاتەدا شوێنەوارناسان پەرستگایەکی پەرستنی خۆریان دۆزییەوە لەو ناوچەیەدا، وەك قورئان دەفەرموێت و باسی دەکات پێغەمبەر ﷺ لە کوێ ئەوەی زانی ئەگەر خوا فێری نەکردبێت؟

ج. قورئان دەفەرموێت گەلی ئیبراهیم ئەستێرەیان پەرستووە، شوێنەوارناسان لە عێراق ئاسەواری ئەو سەردەمەیان دۆزییەوە لە ئورو ڕاستییەتی قورئانیان بۆ سەلما.

د. قورئان باسی تۆفانی زەمانی نوح و زۆری و بەرزی لافاوەکە دەکات کە شەپۆلێکی بە هێندەی شاخێك بەرز بووەو، کەشتییەکەش لەسەر شاخی جودی لەنگەری گرتۆتەوەو نیشتۆتەوە. دۆزینەوەکان لەم دواییانەدا ئەمەیان سەلماند خوا نەبێت کێ ئەم هەواڵەی دا بە پێغەمبەر ﷺ.

هـ. قورئان لە ٢٥ شوێندا باسی گەلی عاد دەکات کە چەند هەزار ساڵ پێش زایین ژیاون و باسی تیاچوون و وردەکارییەك دەکات، کە لە ساڵی ١٩٩٦دا لەلایەن کۆمەڵێك زاناوە پاش شەش ساڵ گەڕان و بە یارمەتی تەلەسکۆبی ئەستێرە دەستکردەکان دۆزرایەوە، کە بووە بەڵگەیەکی نوێی دەمکوتکەر بۆ ئەوانەی کە پڕوپاگەندە بۆ قورئان دەکەن.

و. قورئان دەفەرموێت کە لە پەڕاوە پێشنیەکاندا مژدە دراوە بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام، پێغەمبەر ﷺ دیارە ئەوەی نەدەزانی چونکە جوولەکەو گاورەکان ئەوەیان دەشاردەوە، زۆرجار لە وەرگێڕانیدا بۆ زمانەکانیتر وای وەردەگێڕن کە نەزانرێت مەبەست موحەممەدە ﷺ، هەرچەند کەسانی پسپۆڕی بە ویژدانیان جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە ئەو مژدانەی دراوە مەبەست پێغەمبەرە ﷺ. ئەوەتا دۆزینەوەی دەستخەتە کۆنەکانی تەورات و ئینجیل و زەبوور جەخت دەکەنە سەر ڕاستییەتی قورئان و پێغەمبەرایەتی سەرداری پێغەمبەران ﷺ، وەك ئینجیلی بەرناباو دۆزینەوەکانی لای دەریای مردوو دۆزینەوەکانی نەجع ئەلحەمادی لە میسر.

ز. قورئان باسی فیرعەون و خنکانی و ڕزگاربوون و مانەوەی لاشەکەی دەکات بە وردی کە لە تەورات و ئینجیلدا بەو شێوەیە نەهاتووە، لە کاتێکدا مێژووی هەزاران ساڵی پێش پێغەمبەرە ﷺ. پرۆفیسۆر دکتۆر (مۆریس بوکای) دوای چواردە سەدە دێت و بەو چەند ئایەتە ڕاستییەتی قورئانی بۆ دەسەلمێت و دەڵێت: بەڕاستی من یەکێ بووم لەوانەی کە بۆم بوو بە بەڵگەو ئایەت کە قورئان دەفەرموێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾ (یونس: ٩٢) واتە: بەڵام ئەمڕۆ لاشەکەت لە دەریا ڕزگار دەکەین بۆ ئەوەی ببی بە پەند بۆ ئەوەی لە دوای تۆ دێت، بەڕاستی زۆرێ لە خەڵکی بێئاگان لە بەڵگەو نیشانەکانی ئێمە.





## زانستی تازەی سەردەم گەورەترین موعجیزەی قورئانی ئاشکرا کرد لەبارەی (رۆح):

قورئان باسی ئەوە دەکات کە مرۆڤ تەنها مادە نییەو رۆحێك هەیە کە لە خواوەیەو بە فەرمانی ئەو کراوە بە بەریدا و مرۆڤ هیچی وا نازانێت لە بارەیەوە: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ (الحجر: ٢٩) هاتن پرسیاری رۆحیان کرد لە پێغەمبەر ﷺ قورئان وەڵامی دانەوە و فەرمووی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (الأسراء: ٨٥) ئەم پەیامە لە ئاسمانەوە لەلایەن خواوە هاتووە ئەگینا چۆن ئەو راستییەی زانی؟ چی داوە لە باسی رۆح کە لە سەرەتای سەدەی بیست دا زۆر لە زانایان بروایان پێی نەبوو، مرۆڤیان تەنها بە مادە دەزانی تا لە ساڵی ١٩٣٥دا زانای پسپۆڕ لە بواری جومگەی عەصەبیدا (ئەکلن)، پاش چەند ساڵ دیراسات و لێکۆڵینەوە بیردۆزی خۆی پێشکەشکرد کە مرۆڤ تەنها مادە نییە و رۆحیشە.

زانای ناودار (بەنفلید) گاڵتەی بەمە دەهات بڕیاری دا بکەوێتە دیراسەکردن لەسەر مرۆڤ، هەوڵی ئەدا کە بیسەلمێنێت مرۆڤ تەنها مادەیە. پاش (٣٠) ساڵ دیراسە و لێکۆڵینەوەی بەردەوام لەسەر (١٠٥٠) کەس لە ساڵی ١٩٧٤ دا خولاسەی لێکۆڵینەوەکانی بلاوکردەوە بە چەند وتار و پەڕاوێك، بە تایبەت پەڕاوی (لغز العقل البشري).

ڕایگەیاند کە ئەمیش وەك زانای پێشوو (ئەکلن) بڕوای وایە مرۆڤ تەنها مادە نییەو رۆحیشە، هەرچەند زانست دەستەوسانە بەرامبەر ماهیەتی رۆح و تەنها شوێنەوارەکانی دەبینێت، دوای ئەوان دکتۆر مەهدی جەختی کردە سەر دەرچوونی رۆح لە کاتی مردنداو دیراسەی کرد لەسەر ئەو کەسانەی بۆ ماوەیەکی کەم دڵیان دەوەستێ و پاشان دەکەوێتەوە کار، باسی رۆح خوا نەبێت کێ دەتوانێ ئاوا ١٤ سەدە لەمەوبەر باسی بکات، کە ئەوەتا زانست بەو پێشکەوتنەوە تازە داندەنێت بەو ڕاستییەدا و باسی لە بوونی رۆح دەکات لە لاشەی پێغەمبەردا ﷺ، ئیشی چییە بە باسی رۆح ئەگەر خوا فێری نەکردبێت و لە ئاسمانەوە پەیامی بۆ نەناردبێت.



## قورئان بۆچوونەکەی ناحەزانی ئیسلام ڕەت دەکاتەوە دەربارەی ئیسحاق پێغەمبەر:

قورئانی پیرۆز باسی ئیبراهیم پێغەمبەرمان بۆ دەکات (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کە تا نزیکەی نەوەد ساڵێك لە تەمەنی موبارەکی منداڵی نەبووەو هاوسەرەکەشی نەزۆك بووە، بەڵام بەردەوام نزا دەکات کە خوا نەوەیەکی ساڵحی پێ ببەخشێت ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ خوای گەورە مژدەی دایە بە کوڕێکی بەئارام و خۆڕاگر: ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ (صافات: ١٠١) کە ئەویش ئیسماعیل بوو کە لە هاجەرە خاتوون بوو، پاشان بە ئەمری خوا هاجەرە خاتوون و کوڕەکەی برد بۆ مەککە بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا کەعبەی لێیە. پاشان خوا تاقیکردەوە کە ئیسماعیلی کوڕی سەربڕێت و ئەویش و کوڕەکەشی لەو تاقیکردنەوە سەختەدا دەرچوون.

پاشان لەدوای چواردە ساڵێك لە لەدایکوونی ئیسماعیل خوای گەورە مژدەی کوڕێکی تری دایە لە (سارە) خاتوونی هاوسەری، لە قورئاندا لە حەڤدە جێدا ناوی ئیسحاق هاتووە بەبێ ئەوەی بچێتە سەر باسی لایەنەکانی ژیانی و بانگەوازەکەی کە ئەویش پێغەمبەرێکی خوا بووە، چونکە قورئان مەبەستی ئەوە بووە کە پەند لەوەی وەرگرێت کە پیاوکی پیری بەساڵاچووی تەمەن زیاتر لە سەد ساڵێك و ژنێکی نەزۆك کاتێ خوا ویستی بە فەرمانی خوا منداڵی دەبێت، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ۝١٠٨ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ۝١٠٩ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ۝١١٠ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ۝١١١ وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ ۝١١٢ وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ إِسْحَاقَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾ (صافات: ١٠٨-١١٣) ئیسحاق لە هەزارەی دووەمی پێش زاییندا ژیاوەو قورئان باسی دەکات، لە کاتێکدا لە تەورات و ئینجیلدا ناحەزان دەستکاری باسی (ئیسحاق)یان کردووە، گوایە ئەوە کە لە لایەن باوکیەوە خەریك بووە سەربڕدرێت، کەواتە قورئان لە تەوارت و ئینجیلەوە هەرگیز هیچی وەرنەگرتووە وەك دوژمنانی خوا گومان دروست دەکەن، چونکە ئەوەتا پێغەمبەرێکی ئاوا شێوێنراوە جا قورئان بە ڕاست و دروستی بەشی پێویست باسی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە دەکات.



## دۆزینەوەی شوێنەواری گەلی عادی یەکەم بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ڕاستی هەواڵەکانی قورئان:

کاتێك هود پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد و باسی پاداشتی بەهەشتی بۆ دەکردن پاشاکەیان وتی: بەهەشت چییە؟ منیش دەتوانم لەسەر زەویدا بەهەشتێك دروست بکەم، ئینجا هەرچی تواناو دەسەڵاتی هەبوو خستییەکار و وەستای چاك و پسپۆڕی بینای لە هەموو لایەکەوە خڕکردەوەو پارەی خستە بەردەستیان، پاش چەند ساڵێك کە شاری (إرم)یان بۆ دروست کردو لەوەدا بگوێزنەوە ناوی خوای گەورە بە ڕەشەبای لم لەناوی بردن، بەڵام ئاخۆ شوێنەکەیان لە کوێدا بووبێت؟ گەڕان بە دوای شوێنەواری (عاد)دا خولیای زۆر کەس بوو (لورانس العرب) خەوی ئەدی بە دۆزینەوەی ئەم شارەوەو ناوی نابوو (اطلنتس الصحراء) کە ئەمەش ناوێکی ئەفسانەیی یە (لورانس) مرد و ئاواتەکەی بردە ژێر گڵەوە، کۆمەڵێ زانایتری شوێنەواریش لە ساڵی ١٩٤٧ تا ١٩٥٣ کەوتنە گەڕان، وەك (براترام تۆماس)ی بەریتانی کە شوێن قسەی بیابان نشینەکان دەکەوت و سەرەنجام ئەمیش هیچی بە هیچ نەکرد و ئەم هەوڵانەشی لە یادەوەرییەکانیدا تۆمار کرد.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ زایینیدا ئاسەواری (مەملەکەتی ئیبیلا) دۆزرایەوە لە سەرووی خۆرئاوای سوریادا، کە دەگەڕێتەوە بۆ (٢٤٠٠) ساڵ پێش زایین. لەو پاشماوە دێرینانەی کە تیایدا بوو چەند لەوحێکی قوڕی سورەوەکراو بوو کە باسی گەلی عاد و شارستانییەتەکەیانی لەسەر هەڵکەندرابوو، (نیقولاس کلاپ) دەرهێنەری فیلمی وثائقی ئەمریکی خولیای دۆزینەوەی شوێنەواری عاد بوو ناوبراو یادەوەرییەکانی (براترام تۆماس)ی خوێندەوەو، پاش گەڕانێکی زۆر نەخشەیەکی دەستکەوت کە جوگرافیازان و زانای فەلەکی و بیرکاری یۆنانی (کلودیوس بطلیموس) کێشابووی لە سەدەی دووەمی پێش زاییندا کاتێك کە ئەمین مەکتەبەی ئەسکەندەری بوو.

تیایدا ئاماژەی بۆ (ربع الخالی) کرد بوو گوایا گەلی عاد لەوێدا ژیاون ئەم خەریتەیەی لە مەکتەبەی هنتگلتون دەستکەوت. کلاپ لیژنەیەکی پێکهێناو یەکێکیان لە مافناس بوو کردی بە لێپرسیراوی پروپاگەندە کردن بۆ کارەکە و پارە کۆکردنەوە بۆیان.

پرۆفیسۆر دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: کاتێك ناوی لێکۆڵەرەوە و شوێنەوارناسەکان ڕاگەیاندراو زانیم کە هەموو ئەندامەکانی کە (٣٠) کەس بوون جوولەکەن، داوام کرد لە حکومەتی سعودی کە ڕێیان پێنەدا لە خاکی سعودیەوە بێنە ناوەوە، چونکە بەڕاستی جوولەکە ئەمین نین و هەروەك چۆن کەلامی خوایان گۆڕی و پێغەمبەرانیان شەهید کرد، ئاواش ئەو دۆزینەوانە دەگۆڕن و لە بەرژەوەندی خۆیاندا بەکاری دەهێنن کە مەملەکەتی ئیبیلاشیان دۆزییەوە، جوولەکە دەستی بەسەر دۆزینەوەکەدا گرت و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد و چی ویست ئەوەی بڵاوکردەوە، جا حکومەتی سعودی ڕێی نەدان و ئەوانیش چوون لە ڕێی سەڵتەنەی عومانەوە داخڵ بوون و (سوڵتان قابوس)یان ڕازی کرد کە ڕێیان بدات و هاوکاریان بکات، ئەویش خۆی و بانکی عومان و کۆمپانیای نەوت زۆر هاوکاریان کردن.

(کلاپ) لە ساڵی ١٩٨٤دا داوای لە وەکالەتی ناسای ئەمریکی کرد کە بەهۆی ڕاداری سەر مەکۆکە فەزاییەکانەوە وێنەی نیوە دوورگەی عەرەب و (ربع الخالی) بۆ بگرن، ئەوانیش بەهۆی (چالنچر)و مانگە دەستکردەکانەوە دیراسەی ناوچەکەیان بۆ کرد و وێنەکانیان دایە، کە ڕێگای کاروانچییان و شوێنەواری ڕووبار و دۆڵی تیادا بوو، کە هەندێ شوێنی بە (١٨٣) مەتر لم داپۆشرا بوو، ئەم زانیاریانە هەمووی کلاپ سوودی لێوەرگرتن و لە ساڵی ١٩٩٠ی زایینیدا لەڕێی عومانەوە داخلی (ربع الخالی) بوون و لەبەرئەوەی ناوچەکە زۆر گەرم و ترسناك بوو بەهۆی ئەو لمە ئیسفەنجییەوە کە ڕەشەبا دەیگواستەوە نەیانتوانی بەردەوام بن و لەوشەوە شەڕی عێراق و کوەیت هەڵگیرسا و گەڕانەوەو کارەکە دواکەوت.

له ساڵی ١٩٩١ زایینیدا دەستیان کردەوە بە گەڕان لە شوێنی یەکتربڕینی ڕێی کاروانچییەکاندا، پاش شەش ساڵ هەوڵ و زەحمەت و ماندووبوون شاری (إرم)یان دۆزییەوە و ناویان نا (ئوباد)، لە پاشماوەی شارەکەشدا پایەی درێژی نۆ مەتریان دۆزییەوەو بۆیان دەرکەوت کە بەڕەشەبای لم لەناوچوون و خاوەنی دەسەڵات و توانای شارستانیەتییەکی گەورە بوون.

(مرکز دفع النفاث)ی ئەمریکی کە سەر بە وەکالەتی ناسای ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە لەسەر ئەم دۆزینەوەیەو، لەسەری ڕاپۆرتەکەدا ئەم ئایەتەی قورئانیان نووسی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۝ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ۝ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ (الفجر: ٦-٨) پاشان ڕاپۆرتی تر بڵاوکرایەوە لەسەری لە گۆڤاری (طیران العمان)، گۆڤاری (التایم) وە گۆڤاری (لۆس ئەنجلوس تایم) و، هەروەها کۆمپانیای ئارامکۆ فلیمێکی وثائقی لەسەر دەرکرد بەڵێ دەرکەوت ئەو ناوچەیە لە کۆندا دوو ڕووباری تیادا بووەو دەریاچەیەکی هەبووە کە تیرەکەی چەند کیلۆمەترێك بووە، تەختەو زێڕ و زیویان ناردۆتە دەرەوەو پایەی نۆ مەتریان دروست کردووەو لەسەر پایەکانیشەوە بینایان کردووە دیارە ئەوەش ڕاستی قورئانی سەلماند.

بەڵێ قورئان پێش چواردە سەدە باسی پایەکانیان و هۆی تیاچوونیان و شارستانییەتی و دەسەڵاتەکەیانی کردووە بە وەسفێکی زۆر کورت و زانستی سەردەمیش هەمووی سەلماند، (الله أكبر) لە گەورەیی و پایەداری ئەم قورئانە پیرۆزە بەڕاستی بە تەنها ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە بەسە کە گەورەترین بەڵگەیە ئەو کەسانەی کە دوورن لە دین و ئاشنا نین بە پەیامی ئیسلام، دەبوو کە ئەو موعجیزەیە دەبینن بە قەناعەتی تەواوە بێنە ژێر سێبەری ڕەحمەت و بەرەکەتی ئەم ئاینە پاکە. توخوا پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار چواردە سەدە پێش ئێستا ئەوەی چۆن زانی خۆ مانگی دەستکردو تەکنەلۆژیای تازە لەبەردەستدا نەبوو، بەڵێ ئەوە خوای گەورەو شارەزا بە هەموو نهێنییەکان ئەوەی بە وەحی بە خۆشەویستەکەی ڕاگەیاند تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاستی پەیامە پیرۆزەکەی.



## قەڵا دۆزراوەکەی شاری عەدەن نهێنییەکی گەورەی دەرخست لەبارەی گەلی عادی دووەم:

لەساڵی ١٨٣٤ی زایینیدا قەڵایەك لە نزیك شاری عەدەن دۆزرایەوە بەناوی (حصن الغراب)، کە لمێکی زۆر دایپۆشی بوو زۆر شتیان دۆزییەوە لەوانە پارچەیەك مەڕمەڕ بوو کە ئەمەی لەسەر هەڵکەندرا بوو: ئێمە ڕۆژگارێکی دوورو درێژی خۆشمان لەم شوێنەدا بەسەر برد دوور لە نارەحەتی و ناخۆشی و تەنگانە، ئاوی دەریامان لێ نزیکبوو سوودمان لە هەڵکشان و داکشانی وەرگرت و ڕووبارەکانیشمان ئاوی چاکی تیادا بوو، لەناو ئەو دارخورما بەرزانەدا باخەوانەکانمان دارخورمایتریان لە قەراخ جۆگەو شوێنە پێچاوپێچەکاندا دەناشت، ئێمە ڕاومان دەکردو لە قوڵایی دەریاش ماسیمان دەگرت، ئێمە بەنازەوە پێمان دەنا بەسەر زەوی دا و جلوبەرگی ئاوریشم و سندووسمان دەپۆشی، پاشاکانمان پیاوانەو دوور لە نەفس نزمی فەرمانڕەواییان دەکردین و توندوتیژ بوون بەرامبەر خەڵکانی فرِوفێڵاوی و ساختەچی و شەریعەتێکیان بۆ هەڵبژاردبووین کە لە ئاینی (هود)ەوە وەرگیرابوو، ئێمە باوەڕمان بە موعجیزات و زیندووبوونەوە و قیامەت هەبوو. دەرکەوت کە ئەم شارە پاشماوەو شوێنەواری گەلی عادی دووەمن. واتە: نەوەی ئەوانەی کە لەگەڵ هود پێغەمبەردا ڕزگاریان بوو.

قورئان دەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ۝ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ﴾ (النجم: ٥٠–٥١) واتە: خوا گەلی عادی یەکەمی لەناوبرد کەواتە کە عادی یەکەم هەبێ عادی دووەمیش هەیە، ئەوەش ئەوەبوو کە دۆزرایەوە خوای گەورە جوانی فەرمووە لە قورئانەکەیدا: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ (النمل: ٩٣) واتە: وە بەڵێ هەموو سوپاس بۆ خوایە، ئەو خوایە بەزووی ئایەت و نیشانەکانی نیشانی ئێوە دەدات ئێوەش دەیانناسن کە ئایەتی خوان وە پەروەردگارت بێئاگا نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن.



## ١٥٧ دۆزینەوەی دەستنووسەکەی ئینجیلی یەهوزا موعجیزەیەکی قورئانی ئەشکرا کرد:

خوای گەورە سەبارەت بە لەخاچدانی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ﴿وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ (النساء: ١٥٧-١٥٨).

ئەو چیرۆکەش لە ساڵی ١٩٧٢ دەستپێدەکات کاتێك کە یەکێك لە دەستنووسەکانی (نەجع حەممادی) بە زمانی قیبتی دۆزرایەوە، ئەم دەستنووسە مێژووەکەی بۆ سەدەی دووەمی زایینی دەگەڕێتەوە لەسەر گەڵای بەڕەدی نوسراوە، شتێکی زانراویشە کە بەڕەدی ڕووەکێکە لە کەناری ڕووباری نیل دەڕوێ و بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سیقانە بەکاردێت و دەبێتە گەڵا و وەك پەڕاو بۆ لەسەر نووسین بەکاردێت، شایانی باسە میسرییە کۆنەکان یەکەم کەس بوون نوسینیان لەسەر ئەم گەڵایە نووسیوە.

ڕۆژنامەی (واشنتۆن تایمز) لە ژمارەی ٢٠٠٦/٤/٧ دا لە بابەتێکدا باس لەوە دەکات کە زانایان لە کۆمەڵەی جوگرافیای نێودەوڵەتی پەردەیان لەسەر یەکێك لە دەستنوسە کۆنەکان لاداوە، کە لە (ئەلمینای) وڵاتی میسر دۆزراوەتەوە و چەندین ساڵ لە گەنجینەی بانکێکدا پارێزراوە، تا وایلێهات دەستنووسەکە مۆرانە لێیدا و بخورێ و هەڵوەرێ ئەوانیش بە هەوڵێکی زۆر کۆیان کردەوە، بۆیان دەرکەوت کە ئەوە ئینجیلی یەهوزایەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی سێیەمی زایینی.

ئەم ئینجیلە بە یەهوزا ناودەبرێ یەهوزاش یەکێك بووە لە قوتابیانی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت)، مێژووی قیبتی باسی یەهوزا دەکات و بەو پیاوەی لەقەڵەم دەدا کە خیانەتی لە پێغەمبەر عیسا کردووە لە ماوەی پازدە ساڵدا، توانرا ئەم ئینجیلە چاك و نۆژەن بکرێتەوە، لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٥) لە زمانی قیبتییەوە

وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی و لە ساڵی (٢٠٠٦) وەرگێڕدرانی ئەم ئینجیلە تەواو کرا، ئەوسا ئینجیلەکە لە بازاڕەکان دەفرۆشرا، ئەو ئینجیلە وەك ڕۆژنامەی (واشنتۆن تایمز) باسی دەکات ڕاستەوخۆ لە کۆتاییەکەیدا باسی کۆتایی هاتنی ناردنی پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەکات، وەك لە دەقە ئینگلیزیەکەیدا هاتووەو دەڵێ: ئەم دەقە مانای وایە کە پێغەمبەر عیسا لە کۆتایی ئینجیلی یەهوزادا قسە دەکات و بە یەهوزا دەڵێت: ئەی یەهوزا تۆ لەمەودوا لە تەواوی شوێنکەوتەو یاوەرانی من جیاواز دەبی، تۆ دەبیتە ئەو پیاوەی کە قوربانی دەدەی لەبەرئەوەی لە من دەچێت، جێی هەڵوێستە کردنە وشەی (یلبیسنی) کە وەرگێڕ لە نووسینیدا دەستەوسانە.

لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿شُبِّهَ لَهُمْ﴾ واتە: لێیان تێکدان، یەهوزا بە پێغەمبەر عیسا چوێندرا سەلامی خوای گەورە لە عیسا بێت بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەو لەسێدارەی بدەن، بەو شێوەیە ڕاستییەکە دەرکەوت کە پێغەمبەر عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە خاچ نەدراوە، بەڵکو ئەو کەسەی کە لەخاچ دراوە یەهوزای قوتابیەتی.

***





## ڕاستیەکی مێژوویی دەربارەی جولەکەکان هاوڕایە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا:

لەو ڕاستییە مێژووییانی کە ئەمڕۆ بەهۆی لێکۆڵینەوەی مێژوونووسانەوە چەسپاوە ئەوەیە کە جوولەکەکان بەهۆی خراپی کردەوەکانیان و ئاژاوەگێڕیانەوە بە درێژایی مێژوو چەوسێنراونەتەوە، پێش سەردەمی ئیسلام لەسەر دەستی پاشاو حاکمەکان توندترین سزا و ئازار دراون. هەروەها دوای هاتنی ئیسلام و هەتا ڕۆژی ئەمڕۆش ئەوە بەردەوامە، هەزاران ساڵ لەوەوبەر لەسەر دەستی فیرعەون و پاش ئەویش ئەشکەنجەو ئازار دراون، هەروەها ئاشوری و بابلییەکان زیندانیان کردوون و ئازاریان داون، (٧٨٥)ی پێش زایین پاش ئەوانیش ڕۆمەکان جوولەکەیان دەچەوساندەوەو ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن و سوتاندن.

(٦٣)ی پێش زایین دوای دەرکەوتنی ئیسلام جوولەکە بە هەموو مافەکانی خۆیان گەیشتن لەژێر سێبەری ئیسلامی دادپەروەردا، بەڵام دواتر بە تایبەتی لەسەر دەستی گەلانی غەیری موسڵمان سزادرانەوە بەتایبەتی لە ئەوروپا، کە خراپترین جۆرەکانی سزای زۆرلێکردن و دەرکردن و بەپەند بردن هاتن لەسەر دەستی هیتلەر و غەیری ئەویش، جێی سەرنجە ئەو ڕاستیانە کە تازە زانراون قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە ئاماژەی پێکردووە، خوای گەورە لەبارەی جولەکەوە دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الأعراف: ١٦٧) واتە: یادی ئەو کاتەش بکە ئەی موحەممەد ﷺ کە پەروەردگارت بڕیاریدا و ڕایگەیاند بەڕاستی کەسانێك دەنێرێتە سەریان تا ڕۆژی قیامەت ئەشکەنجەو ئازاری سەختیان بدات، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت زۆر بە خێرایی تۆڵە دەسێنێت لە ستەمکاران. هەروەها بێگومان لێخۆشبوو و میهرەبانیشە بۆ تەوبەکاران و ئیمانداران، ئایا کێ هەواڵی ئەم ڕاستیە مێژووییەی بە موحەممەد ﷺ گەیاندووە؟ بە دڵنیاییەوە خوای گەورە ئەم هەواڵەی پێگەیاندووە تاکو ببێتە بەڵگەیەکی ئاشکرا کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای پەروەردگارە کە ئاگادارە بە هەموو ئاشکراو نهێنییەك.



## ڕووبارەکانی میسری کۆن موعجیزەیەکی نوێی قورئانی ئاشکرا کرد:

ئەمڕۆ زاناکان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەو شوێنانەی لە میسردا ئاسەواری کۆنی وەك ئەهرامەکانی تێدایە، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو ناوچانە پڕبوون لە ڕووبار و دارستان ئەو ڕاستییەش یەکلایی نەبۆوە تا نیوەی ساڵی (٢٠١٢)ی زایینی و لەمیانەی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کە چەند ساڵێکی خایاندووە، بەڵام ئەوەی سەیرە قورئانی پیرۆز لەپێش زیاتر لە چواردە سەدە لەمەو بەرەوە زۆر بە وردی ئاماژەی بەو ڕاستییە کردووە زانا پێشینەکان بڕوایان وابوو فیرعەونە کۆنەکان ئەهرامەکانیان لە ناوچە بیابانیەکان دروستکردووە، زانا پێشینەکان زۆر هەوڵیان داوە لە نهێنیەکانی ئەهرام و فیرعەونەکان تێبگەن زۆر نووسین و ژمارەی کۆنیان شیکردەوە، بەڵام نەگەیشتنە بەڵگەیەکی زانستی بەهێز بۆ دەرخستنی ژینگەی ڕاستەقینەی میسری کۆن.

فیرعەونەکان پێش (٥) هەزار ساڵ لەمەوبەر شارستانی خۆیان دروستکردووە خاوەنی هێزێکی گەورەو تەکنینێکی پێشکەوتوو بوون لەو سەردەمەدا، زانستەکانی وەك کیمیا و مۆمیاکردن و ئەندازەی بیناسازی و گەردوونزانیان زۆر بە باشی زانیوە خەڵکی ئەو سەردەمە لە ژیانێکی خۆش و باش و پێشکەوتوودا ژیاون، ژینگەی ئەهرامەکان وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەبینرێ ناوچەیەکی بیابانییە وا دەزانرێ پێش هەزاران ساڵیش لەمەوبەریش هەروا بووە بەو شێوە نەبووە و کەس نەیزانیوە ئەو ناوچە بیابانییە پێشتر ڕووبار و دارستان بووەو سەوزاییەکی قەشەنگ بووە و بەهۆی گۆڕانکاری کەشوهەوای زەوی ئێستا بۆتە بیابان.

بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوە زانستی و مێژووییەکانی ئەم سەردەمە بابەتەکە بە جۆرێکی ترە، توێژەرەوەکان دەڵێن: ئەوە بۆ یەکەمجارە کە دەگەینە ئەوەی گۆڕانی کەشوهەوا هۆکاری سەرەکییە لە داڕمانی شارستانییەکانی وەك شارستانی فیرعەونەکان لە میسر.

لەمیانەی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قوڵ بۆ ماوەی (٥) ساڵ، بەپێی دەیلی مەیلی بەریتانی لە ٢٠١٢/٥/٢٩ و بە پشتبەستن بەو داتایانەی لە مانگ دەستکردەکانەوە بە دەستیان هێناوە، دەرکەوتووە ئەو ناوچانە پێشتر یەك پارچە ئاو و ڕووبار و سەوزایی و دارستان بوون، ئەو ژینگە جوانە هۆکاری ئەو شارستانییە پێشکەوتووە بووە، لەو سەردەمەدا و بە نەمانی ئەو ژینگەیە شارستانیەکەش نەماوە، لەو لێکۆڵینەوەدا زاناکان پێشکەوتنی شارستانی لە ناوچەیەکدا دەبەستنەوە بە ئاوەدانی و زۆری و چڕی دارستان و باخ و ڕووبارەکان، بۆ نموونە بیابانە عەرەبییەکان کە لە میسرەوە بۆ لیبیا و جەزائیر و بە درێژایی هەزاران کیلۆمەتر درێژ دەبنەوە، ڕۆژێك لەڕۆژان ئەو ناوچانە ئاوەدانی و ڕووباری زۆرو دارستانی چڕوپڕ بوون، بەپێی زانکۆی ئۆسکفۆرد لەژێر ئەو لمەی بیابانەکانی میسردا یەکپارچە ڕووبارو دارستان بووە و پێش پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە.

(میخائیل) (پتراگلیا) دەڵێت: ئەو ژینگەیە هۆکاری پێشکەوتنی شارستانی فیرعەونەکان بووە، لە لێکۆڵینەوەیەکیتردا کە لە ڕۆژنامەی دەیلی مەیلی ژمارەی ڕۆژی ٢٠١٢/٨/١٧دا بڵاوکراوەتەوە. بەپێی ئەو شیکردنەوانەی زاناکان لەسەر خەڵوزو تۆز و هەڵاڵەی حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەرەوەی ئەو ناوچەیە کردوویانە دەرکەوتووە گۆڕانی کەشوهەوا و وشکبوونی ڕووبارەکان بۆتە هۆی داڕمانی شارستانی میسری کۆن، ئەوانەی ئەو ئەهرامانەیان دروست کردووە چەندە بەتواناو بەهێزبن ئەوا هەر لاواز بوون بەرامبەر کەشوهەوا وەك ئاژانسی ڕووپێوی جیۆلۆجی ئەمریکی (USGS) ئاماژەی پێدەدات، توێژەرەوەکان تێبینی ئەوەیان کردووە کە ئاستی خەڵوز لەو سەردەمانەی بێ ئاوی و وشکی ڕووی کردۆتە وڵات زیادی کردووە، لە ئەنجامی ئاگر کەوتنەوەی زۆر و تۆز و دەنکە هەڵاڵەش لە کەمیدا بوون بەهۆی کەمبوونەوەی سەوزایی، بەپێی لێکۆڵینەوە زانستیە نوێیەکان فیرعەونەکان ئەو پەیکەرانەیان داتاشیوە لە ژینگەیەکی پڕ ئاو و سەوزاییدا، بەڵام گۆڕانکاری کەشوهەوا بۆتە هۆی بەبیابانبوونی ئەو ناوچانە و بەجێهێشتنیان لەلایەن دانیشتوانەکانیانەوەو بەوەش بەشی زۆری ڕووکارەکانی ژیان لەو ناوچانەدا ونبوون.

پرۆفیسۆر (بنجامین هۆرتۆن) لە زانکۆی بنسلڤانیا جەخت لەوە دەکاتەوە هەموو ئەو ڕووداوانەی بەسەر میسری کۆندا ڕۆیشتووە، وەك بوونی ئەو شارستانیە پێشکەوتووەو گۆڕانی کەشوهەواو نەمانی دارستان و ڕووبارەکان و شارستانیەکەیان هەموو ئەوانە بە وردی تۆمار کراون، لەسەر گەردیلەکانی خەڵوز و تۆز و دەنکەکانی هەڵاڵەو زۆر بوونەوەی وردبینی دیکە تواناو دەسەڵات و باڵادەستی خوای گەورە لەم گەردوونەدا، هەر بۆ خۆیەتی کە ئەو هەموو زانیارییانەی لەو گەردیلانەدا بۆ خەزنکردووین و ئینجا لە قورئانە پیرۆزەکەیشیدا ئاماژەی پێدەدات وەك دەفەرموێت:

﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (الزخرف: ٥١) واتە: فیرعەون هاواری کرد بەسەر گەلەکەیدا و وتی ئایا میسر هەموو موڵکی من نییە و ئەوە نییە ڕووبارەکان بەژێرمدا دەڕوات ئایا نابینن؟.

ئیعجازی زانستی لەو ئایەتەدا لە ﴿وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾ دا خۆی دەبینێتەوە کە ئاماژەیە بۆ بوونی ڕووباری زۆر لە میسری کۆندا ئەوەش لە سەردەمی دابەزینی قورئانی پیرۆزدا نەزانراو بووە، بەڵام لە ئێستادا زاناکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە میسری کۆن لە سەردەمی فیرعەونەکاندا پڕ بووە لە کێڵگەی سەوزی پڕ لە دارو درەختی بەردارو بێبەرو میوەهاتی زۆر و ئاو و ڕووباری بێشومار، ئەو زانیارییانەش هەمووی لە تۆزی ئەو دەنکە هەڵاڵانەوە وەرگیراوە کە لە پێش حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە لە لم و خۆڵی ئەو بیابانانەدا شاراوە بوون. لە ئایەتێکی دیکەدا جارێکیتر ئاماژە بەو ڕاستییە دەدرێت کە پێشتر باسکرا، واتە لە سەردەمی فیرعەونەکاندا میسری کۆن یەکپارچە باخ و دارستان و سەوزایی و ڕووبار بووە وەك دەفەرموێت: ﴿فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ۝ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾ (الشعراء: ٥٧-٥٨).

زاناکان دەڵێن لە گرنگترینی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر میسری کۆندا هاتوون ئەو وشکە ساڵییە بووە، کە پێش (٤٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر ڕوویداوەو بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی برسیەتی و نەبوونی زۆرو ماوەی چەند ساڵێکی خایاندووە، زۆر بە ڕوونی لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوەش دراوە لەمیانەی لێکدانەوەی خەوەکەی پاشا

لەلایەن پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لەسەر بێت) وەك دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّا تُحْصِنُونَ﴾ (یوسف: ٤٨).

ئاخر چۆن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار ئەوەی زانیوە کە پێش هەزاران ساڵ برسێتییەك لەو وڵاتە دوورە لە خۆیانەوە ڕوویداوە؟ پرۆفیسۆر (بنجامین هۆرتۆن) هەستاوە بە ڕووپێوێکی جیۆلۆجی بۆ ناوچەی ئەهرامەکان و ئەبو هول لە میسر و بۆی دەرکەوتووە ئەو ناوچانەی ئێستا وەك بیابان دەردەکەون و بوونەتە شوێنی ئەو ئاسەوارە کۆنانە، ڕۆژێك لە ڕۆژان پڕ باخ و دارستانی چڕوپڕو ڕووبارو ئاوی زۆر بووە، خوای گەورە لە چیرۆکی لەناوچوونی فیرعەوندا ئاوا باسیان دەکات کە چەند باخ و ئاوی زۆر و سەوزایی و پلەوپایەی بەڕێز و میوەی زۆریان بەجێهێشتووە ﴿كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ۝ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ۝ وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ﴾ (الدخان: ٢٥-٢٧) واتە: چەندەهایان بەجێهێشت لە باخات و کانیاو و کشتوکاڵ و جێ و ماوای چاك و خۆش و نازو نیعمەتی زۆر کە ئەوان تیایدا دەژیان و ڕایان دەبوارد.

ئاخر پێغەمبەرێکی وەك موحەممەد ﷺ هەموو ئەو زانیاریانەی لە کوێوە هێناوە بەو وردیەو ئینجا ئەو ئیشی بەو زانیاریانە و وردەکاریانە چی بووە، بەڵێ خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورەیە کە ئاگادارە بە هەموو نهێنی و ئاشکرایەك چەند جوانی فەرمووە خوا: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دنیاوە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

***



## ١٦٠ جوولەکەو گاورەکان قسەی ئەوانەی پێش خۆیان دەڵێنەوە:

لەم دواییانەدا شوێنەوارناسان ژمارەیەك دەستنووسی کۆنی نەخشداری سەر تەختەیان دۆزیەوە، بە هەوڵێکی زۆر دوورو درێژی دەیان ساڵە توانیان شیبکەنەوەو وەریبگێڕن، لەو نووسراوانەدا زاناکان دەریانخست بیروباوەڕی کوڕە خوا بۆ سەدان ساڵ پێش جوولەکەو مەسیحییەت دەگەڕێتەوە، ئەفسانەی داستانی هندۆسەکان دەڵێت: خوای با کوڕێکی هەیە ناوی (Hanuman)ەو بە خێراییەکی زۆر دەڕوات. هەروەها دەڵێن خوا بینا کوڕێکی هەیە ناوی (Nala)یە لێکۆڵینەوەکان دەڵێن ژمارەیەکی زۆر لە پەرستراوەکانی ئەو گەلانە کوڕیان هەبووە، لەبەرئەوە ئەو بیروباوەڕە چەوتە لە بنەڕەتدا لە ئەفسانەی بابلیەکان و فیرعەونە کۆنەکانەوە وەرگیراوە.

خوێنەری بەڕێز با بزانین قورئانی پیرۆز ئەم ڕاستییەی باس کردووە بەڵێ بێگومان خوای گەورەو تاك و تەنها دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ (التوبة: ٣٠) واتە: جوولەکە وتیان عوزەیر کوڕی خوایە گاورەکانیش وتیان مەسیح کوڕی خوایە، ئەوە وتەی ئەوانە بە دەمی خۆیان دەیڵێن وەك وتەی ئەوانە دەڵێنەوە کە پێشتر بێبڕوابوون خوا لەناویان بەرێت چۆن درۆ دەکەن و لە هەق و ڕاستی لادەدەن. ئیعجازی مێژوویی لەو وتەیەدا دەردەکەوێت کە فەرمووی:

﴿يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ﴾ ئەم ئایەتە دووپاتی دەکاتەوە کە بیروباوەڕی کوڕی خوا زۆر کۆن بووە، بە درێژایی مێژوو دووبارە کراوەتەوەو جوولەکەو گاورەکانیش دووبارەیان کردۆتەوە، ئایا پێغەمبەر چۆن ئەو ڕاستییەی زانی؟ بەڵێ ئەوە سەلمێنەری ئەوەیە کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورەی تاك و تەنهایە.



## ١٦١ دەركەوتنی نهێنییەكی زانستی دەربارەی تەوافی كەعبە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾ (الحج: ٢٩) واتە: تەوافی ئیفازە بكەن بە دەوری ماڵی دێرین و بەڕێزدا كەعبە.

زانستی نوێ گرنگی تەوافی بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەرخستووە لەوانە:

* سوڕی خوێن لە لەشدا بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەسوڕێتەوە.

* ئەلكترۆنەكان و ناوك بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەسوڕێنەوە.

* ئەگەر لە سنووری زەوی دەربچین دەبینین مانگ بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەسوڕێتەوە.

* هەروەها زەوی بە دەوری خۆردا بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەسوڕێتەوە.

* هەسارەكانی دیكە بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە.

* خۆر و كۆمەڵەكەی بە دەوری گەلە ئەستێرەی ڕێگای كاكێشان بە پێچەوانەی میلی كاتژمێرە.

* گەلە ئەستێرەكان هەموویان بە پێچەوانەی میلی كاتژمێر دەسوڕێنەوە.

واتە: ئێمە كاتێك تەواف بە دەوری كەعبە دەكەین لەگەڵ هەموو گەردووندا بە هەمان ئاڕاستە تەواف دەكەین. هەموو بوونەوەر بە یەك ئاڕاستەی پێچەوانەی میلی كاتژمێر تەسبیحات و پەرستشی خوای گەورە دەكات ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە ئەو خوایەی فەرمانی بە تەوافی كەعبە كردووە هەر ئەوە هەموو گەردوون دەسوڕێنێت.

❊❊❊





## ١٦٢ فرامینۆی راهیب ئینجیلی بەرنابای دۆزییەوەو ڕاستییەکی گەورە ئاشکرا بوو:

لە سەرەتای مێژووی ئیسلامییەوە تا ئەمڕۆ وە تا قیامەتیش کەسانی خاوەن ویژدان و هەقپەروەر کە بە دوای هەق و ڕاستی دا دەگەڕێت ڕوودەکەنە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بە جیهاندا دەگەیەنن.

موحەممەد ﷺ ئەو پێغەمبەرەیە کە پێغەمبەرانی پێش خۆی مژدەی هاتنیان بە خەڵکی داوە، بۆ نموونە لە ساڵی (٩٢)ی زاییندا واتە: پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ پاپا (جلاسیوس) فەرمانی دەرکرد بە یاساغکردنی خوێندنەوەی چەندەها پەڕاو، یەکێك لەو پەڕاوانە (ئینجیلی بەرنابا) بوو، بۆیە گشت نوسخەکانی کۆکرایەوەو سوتێنرا تەنها نوسخەیەك مایەوە لە کتێبخانەی پاپاداو بە زمانی ئیتاڵی نووسرابۆوە، کاتێك (فرامینۆ) کە ڕاهیبێکی لاتینی بوو چەند نامەیەکی (ئەرینایوس)ی دەست دەکەوێ، سەیر دەکات باسی ئینجیلی بەرنابا دەکات بۆیە دەبێتە خولیای سەری کە بەدوای ئەو ئینجیلەدا بگەڕێ، سەرەنجام لە کتێبخانەی پاپا (سکتش)ی پێنجەمدا کە هاوەڵی دەبێت ئەو ئینجیلە بەدەست دەهێنێ و دەکەوێتە لێکۆڵینەوەی، پاشان زۆر سەرسام دەبێت لەوەی کە لەو ئینجیلەدا ئاماژەی تێدایە دەربارەی پێغەمبەری ئیسلام هەروەك دەڵێت: {وسيبقى هذا إلى أن يأتي محمد رسول الله الذي متى جاء كشف الخداع للذين يؤمنون بشريعة الله} ئینجیلی بەرنابا/الباب/ ٢٢٠.

ئەوەش وایکرد کە (فرامینۆ) موسڵمان ببێت و هەوڵی زۆر بدات بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئینجیلە لە پاشدا نوسخەیەکیتری ئیسپانی دۆزرایەوە لە سەرەتای سەدەی هەژدەی زاییندا کە ئەمەش بووە بەڵگەیەکیتری نوێ.



## ئاشکرابوونی چەندین بەڵگە لە ئینجیلدا دەربارەی ڕاستییەتی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ:

١. لەو ئینجیلەی کە (٣٩) کەنیسە بەشداریان کردووە لە ئامادەکردن و چاپکردنی دا دەقێك هاتووە بە زمانی ئینگیلزی کە ماناکەی بەم جۆرەیە: {أنه الذي يدفع إليه الكتاب فيقول: اقرأ فيقول ما أنا بقارئ}، واتە: ئەوە کە پەڕاوەکەی پێبدرێت دەڵێت: بخوێنە دەڵێت: من خوێندەوار نیم کەچی گاورە عەرەبەکان کە گۆڕیویانە بۆ سەر زمانی عەرەبی بەم جۆرەیان گێڕاوە: {انه الذي يدفع اليه الكتاب فيقول اقرأ فيقول ما أنا بكاتب} واتە: ئەوەیە کە پەڕاوەکەی پێدەدرێ، دەڵێ بخوێنە دەڵێ من نووسەر نیم. ئەمەشیان بۆیە گۆڕیوە بۆ ئەوەی جیاواز بێت لەگەڵ ئەو گفتوگۆیەی نێوان پێغەمبەر ﷺ و جوبرائیل (سەلامی خوای لەسەر بێت) کە هەموو پەڕاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ تۆماریان کردووە.

٢. لە دەقێکیتردا کە هاتووە کە بەمجۆرە وەردەگێردێتە سەر زمانی عەرەبی {عندما يأتي الحجاج الى وادي (بكة) يشربون الماء}، واتە: کاتێك حاجییەکان دێنە دۆڵی بەککە ئاو دەخۆنەوە کە بە ئاشکرا مەبەست مەککەیەو باس لە سەردەمی ئیسلام دەکات، کەچی گاورە عەرەبەکان کە ئەو دەقەیان وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی بەم جۆرەیان لێکردووە: {عندما يأتي الحجاج الى وادي البكاء يشربون الماء}، ئەمەش بۆ ئەوەی هەرکەس ئەو دەقەی خوێندەوە خەیاڵی نەچێت بەلای مەککەو موسڵمانیەتیدا، چونکە لە هەموو جیهاندا یەك شوێن ناوی (بەککە)یە کە ئەویش شاری مەککەی پیرۆزە.

٣. لە ئینجیلدا وشەی (بیریکلیتۆس) هاتووە بە زمانی یۆنانی کە ماناکەی (أحمد و محمد)ە، کەسێك دەگرێتەوە جێی سوپاس و ستایش بێت کە بێگومان پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺی مەبەستە، کەچی وشە یۆنانییەکە گۆڕاوە بە وشەیەکی دیکە

که ئەویش (باراکلیتۆس)ی که ماناکەی بەسۆز و میهرەبان و تکاکارە، که ئەمەش هەر ئاماژەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ چونکه قورئان دەفەرموێت: ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ (التوبة: ١٢٨) ئەم وشەیەش که وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی بووە بە (comfortes)، لە کاتی وەرگێڕانیشیدا بۆ زمانی عەرەبی کراوە بە (معزی) واتە (مساعد معاون) واتە: هاوکارو یارمەتیدەر بەم جۆرە لە هەر وەرگێڕانێکدا تۆزێك لە مانا سەرەکییەکەی دوورخراوەتەوە، تا کەس هەست نەکات که مەبەستی ئینجیل باسکردن و مژدەدانە بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام محەممەد ﷺ.

(شێخ عبدالوهاب النجار) که کتێبی (قصص الأنبیاء)ی نووسیوە، پرسیار لە دکتۆر (کارلونلینو) دەکات که ڕۆژهەڵاتناسێکی ئیتاڵیە لەبارەی وشەی یۆنانی (بیرکلیتۆس)ەوە که لە ئینجیلدا هاتووە ئەویش دەڵێ: قەشەکان دەڵێن ئەو وشەیە مانای (المعزی)یە، واتە: یارمەتیدەرو هاوکار، شێخ عەبدولوەهاب دەڵێ: من وەکو قەشەیەك پرسیارت لێناکەم وەك خۆت پرسیارت لێدەکەم که دکتۆرات هەیە لە وێژەی زمانی یۆنانی کۆندا، ئەویش وتی (بیرکلیتوس) یانی ئەوەی که زۆر سوپاس بکرێ.

بەڵێ دکتۆر بە ویژدان بوو که دانی ناوە بەو ڕاستییەدا که ئەو وشە یۆنانیە ئاشکرای دەکات لە ئینجیلدا مژدەدراوە بە هاتنی موحەممەد بە وشەی (أحمد) ﴿وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ﴾ (الصف: ٦).

٤. مێژوونووسی بەناوبانگی ئینگلیزی (جیبۆن) دەڵێت: زانایانی گاورو جوولەکە پاش هاتنی ئیسلام زۆر دەقی تەورات و ئینجیلیان گۆڕی، هەروەها (بشری زخاری میخائیل) گاور بوو خوا هیدایەتی داو موسڵمان بوو لە پەڕاوەکەیدا (محمد رسول الله هکذا بشرت الاناجیل) دەڵێت: ڕاهیبەکان گۆڕانکاریان کرد که ئەمەش لە چاپە جیاجیاکانی ئینجیلدا دەردەکەوێت: هەروەها (مطراني موصل) (عبد الاحد داود الاشوري) لە پەڕاوەکەیدا (الانجیل والصلب)دا دەڵێت: عیبارەتی {الحمدلله في الاعالي وعلى الارض السلام وبالناس المسرة} لە بنەڕەتدا وانیەو گۆڕدراوە ڕاستیەکەشی ئەوەیە {الحمدلله في الاعالي وعلى الأرض اسلام وللناس أحمد}.



خوێنەری بەڕێز بڕوانە ئەو بەڵگەو ڕاستیانە چۆن وەك ڕۆژی ڕووناك ڕاستی و دروستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەدیان ئاشكرا كرد سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو میهرەبان وە درووود بۆ گیانی پاكی سەردار و سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ.

## ١٦٤ موعجیزەی بڵاوبوونەوەی ئیسلام:

تازەترین ئامارو سەرژمێری ڕۆژئاوا دەربارەی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دەڵێت: ئاینی ئیسلام لە هەموو ئایینەكانیتر خێراتر بڵاودەبێتەوەو تاكە ئاینە كە شوێنكەوتووانی بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر پابەندن بە ئاینەكەیانەوەو، چاوەڕوان دەكرێت بۆساڵی (٢٠٣٠) ژمارەی موسڵمانان لە جیهاندا زیاتر بێت لە (٢) ملیار و (٢٠٠) ملیۆن كەس، كە كۆی گشتی خەڵكی سەر زەوی دەبن بە (٣-٨) ملیار موسڵمان لە زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهاندا بڵاودەبنەوەو بە شێوەیەكی زۆر گەورە، بە تایبەتی لە فەڕەنسا و ئەمریكا و كەنەدا و ئوسترالیا و ئەوروپا گەشە دەكەن ئەمە ڕاستییەكی زانستییە كە بە زمانی ژمارەكان دەبینرێ، بەڵام قورئانی پیرۆز پێش چواردە سەدە ئەمەی باسكردووە و دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣٣) واتە: خوا زاتێكە كە پێغەمبەرەكەی ناردووە بە ڕێنموونی و ئاینی ڕاست بۆ ئەوەی زاڵی بكات بەسەر هەموو ئاینەكان بە گشتی هەرچەندە بتپەرستان پێیان ناخۆش بێت.

باشە پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەوەی زانی كە ئیسلام بەو شێوە گەورەیە بڵاودەبێتەوە؟ بێگومان ئەم ئایەتە پیرۆزە شایەتی دەدات قورئان قسەو فەرموودەی خوای گەورەیە، بەڵێ چواردە سەدەیە خوای گەورە پەیمانی داوە كە ئەم ئاینە سەربخات بەسەر هەموو بەرنامەو ڕێبازەكانیتردا، ئەمڕۆ لە هەموو كات زیاتر موعجیزەی ئەم پەیمانە دەبینرێ.

ئافرەتێکی ڕاهیبە عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) دەچێتە خەویەوەو فەرمانی پێئەدات کە موسڵمان بێت، کە ئەمەش بە دەنگ و ڕەنگ هەیە لە یوتیوب دا کە ئەو ڕاهیبەیە باسی موسڵمانبوونی خۆی دەکات، هەروەها بەڕێوەبەری کۆلیژی پاشایەتی مەشقی فڕۆکەوانی سەربازی بەریتانی (پرۆفیسۆر جۆیل هایۆرد) کە لە ساڵی ١٩٦٤ لەدایك بووەو لە ٢٠٠٧-٢٠١١ لەو پۆستەدا بووە، موسڵمانی ناوبراو نووسەرێکی چالاکەو زیاتر لە بیست کتێبی نووسیوەو لە دوای موسڵمانبوونیشیەوە چەند کتێبێکی لەسەر ئیسلام نووسیوەو وەڵامی زۆر پرسیاری دەربارەی ئیسلام داوەتەوە، لاوانی موسڵمانی بەریتانیا بڕیاریان دا کە هەستن بە هەڵمەتی پاکردنەوەی بەفری بەرماڵان، سا بەشکو لەو ڕێگایەوە خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئیسلام، لە مزگەوتێکی تورکیا ئەو منداڵانەی ١٨٠ نوێژ ئامادەی نوێژی مزگەوت بن ئایپادێکیان بەدیاری دەدەنێ. عەبدولواحید پیرەسن بانگخوازی ئیسلامی دانیمارکی دەڵێت: ساڵی ١٩٨٥ کە من موسڵمان بووم دە پازدە موسڵمانی دانیمارکی هەبوون ئێستا هەفتانە دە پازدە کەس لە نووسینگەکەی من موسڵمان دەبن.




## لێکۆڵەران ئاشکرایان کرد هەموو پیتەکانی قورئان بە وردی و دیقەت بەکارهاتوون:

زمانی ئینگلیزی نزیکەی (٢٠٠٠٠) ڕەگی هەیە کە یەکی نزیکەی دوازدە (اشتاق)ی بۆ دەکرێ و بەمەش نزیکەی دوو سەد و چل هەزار وشە دروست دەبێت، لە زمانی عەرەبیدا کە دەوڵەمەندترە نزیکەی (٥٠٠٠٠) هەزار ڕەگ هەیە و یەکی نزیکەی چل (اشتقاق)ی بۆ دەکرێت و بەمەش نزیکەی دوو ملیۆن وشە دروست دەبێت. قورئانی پیرۆز وشەکانی زۆر بە وردی بەکارهێناون بە جۆرێك کە هەر وشەیەك لەجێی تایبەتی خۆیدایەو هیچیتر جێی ناگرێتەوە.

لێکۆڵەران دەڵێن هەموو پیتێك ئەوەندە بە دیقەت بەکارهاتووە تەنانەت تاقە پیتێك زیادە نییە بۆیە ئەگەر پیتەکانی سورەتی (نوح) بژمێرین دەبینین (٩٥٠) پیتە، کە دەکاتە تەمەنی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت)، ئەمە بێجگە لەوەی کە قورئان باس و خواسی زانستی وای تێدایە کە لەم سەدانەی دواییدا دۆزراونەتەوە، بۆ نموونە (مەوسوعەی بەریتانی) تەنها باس لە بەشی سەر زەوی شاخەکان دەکات، چونکە زانست تەنها ئەوەندەی دۆزیبووەوە تا ئەو ڕۆژەی ئەو مەوسوعەیە نووسرا بوو، بەڵام قورئانێکی پێش چواردە سەدە لەمەوبەر ئاماژە بۆ بەشی ناو زەوی شاخیش دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾ سورەتی النبأ واتە: شاخەکانمان وەك مێخ داکوتاوە کە لە ڕاستیشدا دەقاودەق هەروایە.

شاخی (ئیڤرست) نۆ کیلۆمەتر بەرزە لەسەر ڕووی زەوییەوەو لەناو زەویشدا بە قووڵی نزیکەی (١٣٥) کیلۆمەتر چۆتە خوارەوە، کە بەمەش وەك مێخ وایە کە داکوتراوە بە زەویداو مایەی هاوسەنگی زەوییەو لەنگەری گرتووە هەروەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾ (النازعات: ٣٢) وە دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ (لقمان: ١٠) واتە: خوای پەروەردگار ئاسمانەکانی بەدیهێناوەو ڕایگرتووە بەبێ کۆڵەکە هەروەك دەبینن لەو زەویەدا شاخەکانی داناوە بۆ هاوسەنگی. بەڕاستی پێویستە ئیمانداران ئەم موعجیزە زانستییە گەورانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن، سا بەڵکو بەهۆی ئەو موعجیزانەوە گومان و دوودڵی ناو دڵەکانیان برەوێتەوەو ڕێگای ڕاست بگرنەبەر، بەڕاستی ئەوەش گەورەترین دیارییە و مایەی ڕەزامەندی خوای گەورەو سەرفرازی دنیاو قیامەتە.

❊❊❊



## هەوری شێوە گوشراو ئیعجازی قورئانە:

زانستی تازە ئاشکرای کرد هەورەکان دەگوشرێن تا ئاوی بەخوڕی تاوتاویان لێ بچۆڕێت، سەرسوڕهێنەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز وەسفی ئەو هەورانەی کردووەو ناوی ناوە (المعصرات) واتە: هەورە گوشراوەکان، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا﴾ (النبأ: ١٤) واتە: لە هەورە گوشراوەکانەوە بارانی بەخوڕی تاو تاو دەبارێنین. زانایان سەلماندیان هەور بە تانکی گەورەو قورسی پڕ لە ئاو دەچێت، هەرکاتێك برێك ئاوی بارانی باراندو قورسایی کەمی کرد لەو شوێنەدا دەچێتەوە یەك و شێوەی گوشراو دەبەخشێت، هەروەها سەلمێنراوە ئەم هەورانە بەتاو تاوی توند دەبارێن کە وشەی (ثَجَّاجًا) ئەو واتایە دەگەیەنێت، ئەنجامی ئەم هەورە گوشراوانەش کە بارانی بەلێزمەی لێ دەبارێت باخ و بێستانی چڕو بەیەکداچووە، بۆیە دەبینین دواتر فەرمووی: ﴿لِّنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ۝ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾ (النبأ: ١٥-١٦) واتە: لەم جۆرە هەورانەوە دانەوێڵەو ڕووەك و باخ و بێستانی چڕو لەیەکئالاو دروست دەبێت.

پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە دەبینرێ ئەم ئایەتە پیرۆزە قورئانییە چۆن بە وردترین وەسفی زانستی ئەم دیاردەیە باس دەکات خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل: ٩٣) واتە: وە بڵێ هەموو سوپاس بۆ خوایە ئەو خوایە بە زوویی ئایەت و نیشانەکانی نیشانی ئێوە دەدات ئێوەش دەیانناسن کە ئایەتی خوان وە پەروەردگارت بێئاگا نییە لەوەی کە ئێوە دەیکەن.

***



## ١٦٧ بیناى گەردوونى موعجیزەیەکى زانستى درەوشاوەى قورئانە:

لە گەردووندا زیاتر لە سەد ملیار مەجەڕە هەیەو هەر مەجەڕەیەك لە زیاتر سەد ملیار ئەستێرەى لەخۆگرتووە، زانایان دەڵێن ئەم مەجەڕانە بینایەکى گەردوونى (Cosmic Building) پێکدەهێنن ئەم ڕاستیە زانستییە گەورەو ناوازەیە قورئانى پیرۆز باسى کردووەو تیشکى خستۆتە سەر، خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً﴾ (البقرة: ٢٢) وشەى (بناء) موعجیزەیەکى زانستى گەورەى قورئانى پیرۆزە، چونکە زانایانى تازە زاراوەى (بناء الكوني)یان داناوە، بەڵام قورئان ئەم ڕاستییە گەورەیەى پێش چواردە سەدە بەکارهێناوە، خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا﴾ (النازعات: ٢٧) واتە: ئایا دروستکردنى ئێوە گرانترە یان ئاسمان؟ دروستیکرد باڵاى بەرز کردەوەو ڕێکیخست.

بەڕاستى دەبوو ئەو کەسانەى تا ئەوپەڕى پلە بێباوەڕن و دوورن لە ئیسلام کە ئەو موعجیز زانستییە گەورەیە دەبینن دەبوو بەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵى لەناو دڵەکانیان نەمابایە و، بە هەموو قەناعەتێکەوە هاتبانە ناو بازنەى ئەم ئاینە پێشکەوتوو و پڕ لە زانیارییە گەورانە، سوپاس و ستایش بۆ خواى گەورە خاوەنى ئەم پەیامە پیرۆزە کە ڕاستیە زانستییەکانى لە ڕۆژگارى نوێى زانست و تەکنەلۆژیادا وەك ڕۆژى ڕووناك ئاشکرا دەبن و دەدرەوشێنەوە.



## ١٦٨ شارەزایانى خۆراك هاوڕان لەگەڵ قورئان دەربارەى ڕیزبەندى خواردەمەنییەکان:

شارەزایانى خۆراك دووپاتى دەکەنەوە کە باشترین ڕێگاى خواردن یەکەمجار ئاو خواردنەوەیە، پاشان دواى نیو کاژمێر میوە خواردن ئینجا کاتژمێرێك دواى ئەوە دەتوانن ژەمە خواردن بخۆن، ئەم ڕێگەیە مرۆڤ لە زۆر نەخۆشى دەپارێزێت

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە خواردنەوەی دوو کوپ ئاو لەپێش ژەمە خواردن یارمەتی سوتاندنی زیادەی چەوری و ڕزگاربوون لە کێشی زیاد دەدات، کەواتە ئامۆژگاری شارەزایان لەپێناو تەندروستییەکی باشتردا ئەوەیە کە یەکەمجار ئاو بخۆیتەوە پاشان میوە بخۆیت، پاشان ژەمێك خواردن بخۆیت بەتایبەتی ئەگەر ژەمە خواردنەکە چەور یان گۆشتی لەگەڵ بوو، سەرسوڕهێنەر ئەوەیە قورئانی پیرۆز لەڕێگەی خواردنی بەهەشتیەکان ئەم ریزبەندییەی بە وردی بۆ باسکردووین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ۝١٧ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ۝١٨ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ۝١٩ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ۝٢٠ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ﴾ (الواقعه: ١٧–٢١) واتە: تازە لاوی هەمیشەیی بە سەریاندا دەگەڕێن بە پەرداخ و سوراحی و گلاسی پڕ لە شەرابی سەرچاوە ڕوون نە سەریان پێ دێشێت نە پێی سەرخۆش دەبن، وە میوەهات کە خۆیان هەڵیبژێرن وە گۆشتی باڵندەیەك کە حەزی لێبکەن.



## ١٦٩ لەدەست خوا دەرناچن نە لە زەوی دا و نە لە ئاسمان:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ (الشوری: ٣١) واتە: ئێوە ناتوانن لەدەست خوا دەرچن لە زەویداو نییە بۆ ئێوە جگە لە خوا هیچ دۆست و یارمەتیدەرێك، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ (العنكبوت: ٢٢) واتە: ئێوە ناتوانن لە دەست خوا دەرچن نە لە زەوی داو نە لە ئاسماندا، بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکیترە لە موعجیزە گەورەکانی قورئان، چونکە مرۆڤ تەنها لەم سەدەیەی دواییدا توانی بچێت بۆ ئاسمان، کەواتە ئایەتەکە پێشبینی ئەوەی تێدایە کە مرۆڤ نەك هەر لەسەر زەوی بەڵکو لە ئاسمانیشدا دەبێت، وە لە هیچ شوێنێکدا نە لە زەوی و نە لە ئاسمان ناتوانێت لەژێر دەسەڵات و فەرمانی خوای گەورە دەربچێت.



## دۆزینەوەیەکی سەیر دەربارەی ناوچەوان:

قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکدا باسی ناوچەوان و پێشە سەری مرۆڤ دەکات و دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ۝ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ۝ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ۝ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ۝ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ۝ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ۝ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ﴾ (العلق: ١٦)

واتە: ئایا دیت ئەی موحەممەد ئەو کەسەی جڵەوگیری دەکات لە بەندەیەك کە نوێژ بکات، ئەگەر ئەو کەسە لەسەر ڕێی چاکە بووایە و ئامۆژگاری مەردوومی بکردایە بە خواپەرستی و لەخواترسان لەجیاتی ئەوەی نەیەڵێ نوێژ بکەن چاکتر نەبوو؟ دەی ئەو کەسە ئەگەر بڕوا نەهێنێ و پشت هەڵکات لە هەق و ڕاستی ناترسێ لەوەی کتوپڕ تووشی گەرداوێکی گەورەی بکەین کە هەرگیز لێی ڕزگاری نابێ، ئایا ئەو کەسە نازانێ کە خودا دەیبینێ و ئاگادارییەتی؟

با واز لە سەرکەشی یاخیبوون بهێنێ ئەگەر واز نەهێنێ سوێند بێ بە ناوچەوان و پێشە سەری ڕایدەکێشین بەرەو تیاچوون و دۆزەخ، چ ناوچەوان و پێشە سەرێك؟ ناوچەوان و پێشە سەرێکی درۆزنی بەهەڵەدا چوو بەڵێ درۆو هەڵە سیفەتی خاوەن ناوچەوانەکەیە، بەڵام لێرەدا ئایەتەکە ناوچەوانە کە بە درۆزن و هەڵەکار دادەنێ ئاخۆ دەبێ پەیوەندی لەنێوان پێشەسەر و درۆو هەڵەکردن دا چی بێت؟ ئەو ڕاستییە لە ساڵی (١٨٥١) لە ئەمریکادا بۆ زانایان ئاشکرا بوو ئەویش بەهۆی ئەوەی کە پیاوێك لە ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەردا کاری دەکرد و بەردو بەرزییەکانی ڕێگای دەتەقاندەوە، لە کاتێکدا کە چاڵێکی کرد بووە تاشە بەردێکەوە بە پارچە شیشێك باروتی دەکردە ناویەوە لە ئەنجامی لێکخشانەوە باروتەکە گەرم بوو تەقیەوەو پاڵی نا بە شیشە ئاسنەکەوە، چەقییە چاوی کابراو لەپێش سەرییەوە دەرچوو دەم و دەس کابرایان گەیاندە خستەخانە و پاش چارەسەرێکی زۆر چاك بووەوە، دکتۆرەکان سەیریان کرد کابرا بە هۆی ئەوەی بەشی پێشەوەی مێشکی سەری زیانی لێکەوتبوو هەڵسوکەوتی گۆڕدرا و وەك منداڵ بەبێ ئیرادە دەهات و دەچوو، زانایان لەمەوە تێگەیشتن کە بەشی پێشەوەی مێشك بەرپرسە لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤ، جا لەوەوە دەردەکەوێت قورئان بۆچی سیفەتی درۆو هەڵە دەخاتە پاڵ ناوچەوان و پێشە سەری مرۆڤ.



## ١٧١ بەرنامە پیرۆزەکەی خوای گەورە موعجیزەیە:

بەرنامەکەی خوا موعجیزەیە لەمەوبەر چەندی بۆ خەڵك ئاشکرا بووە لەمەودواش زیاتری لێ ئاشکرا دەبێ و هەردەم مایەی هیدایەتە، ئەوانەش کە بە ئینساف بن داندەنێن بەو ڕاستیانەدا موعجیزەی زانستی زۆر هەن لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ لە هەموو بوارێکدا، خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ﴾ واتە: ئەم قورئانە ڕێنماییکاری مرۆڤە بۆ ڕاسترین و تەواوترین بەرنامە.

موستەشار (سالم بەنساوی) دەڵێ: فەرەنسا کۆمەڵێك یاساناسی نارد بۆ وڵاتی سعودیە بۆ لێکۆڵینەوەی (میرات لە ئیسلام)دا تا سوودی لێوەرگرن لە یاسای فەرەنسادا، ئەو زوڵم و ستەمەی هەیە لە یاساکانی خۆیاندا لای ببەن، هەروەها چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا بۆ یەکەمجار لەسەر داوای خۆیان بۆ ماوەی دە ڕۆژ کۆبوونەوە کرا لەسەر ئابووری لە ئیسلامدا و، ژمارەیەکی زۆر زانای ئابووریناسی ئیسلام بەشداریان کرد، سەرۆکی ژووری پیشەسازی ئەڵمانی وتی: ئێمە دەزانین کە ڕزگاربوونمان لەباری خراپی ئابووریمان بە ئابووری ئیسلام دەبێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئابووری لە ئیسلامدا بەشێکە لە ئاینی ئیسلام و جیاناکرێتەوە بۆ پەیڕەوی کردنی، ئەو جۆرە ئابوورییە دەبێت خەڵکانی ئەڵمانیا موسڵمان بن کە ئەمەش کاتی دەوێت.

هەروەها جێگری سەرۆك وەزیرانی ڕووسیا و کۆمەڵێك ئابووریناس پێش چەند ساڵێك چوونە قاهیرەو لە زانکۆی ئەزهەر ئامادەی کۆبوونەوەیەکی گەورە بوون لەسەر ئابووری، لە ئیسلامدا و لەدوای کۆبوونەوەکان جێگری سەرۆك وەزیران وتی: ئێمە کەموکورتی شیوعییەت و سەرمایەداری دەزانین وە چاك تێگەیشتووین کە ئەو دوو بیروبۆچوونە سوود بە ڕوسیا ناگەیەنن.



## ١٧٢ پرۆفیسۆرێکی ئەمریکی کە سەرپەرشتیاری ٢٠٠ بڕوانامەی دکتۆرایە هاوڕابوو لەگەڵ ڕاستییەکی زانستی لە قورئاندا:

لە ساڵی شەستەکاندا هەندێك هەواڵ لە ڕێگەی ڕۆژنامەو ڕادیۆوە بڵاودەکرایەوەو ڕای دەگەیاند کە کۆمپانیا هەیە لە ئەمریکا باران دەفرۆشێ، کە ئەمەش پێچەوانەی دەقێکی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە ئەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ (لقمان: ٣٤) واتە: بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی، هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی دایکاندایە، وە هیچ کەس نازانێ سبەینێ لە داهاتوودا چی دەکات، وە هیچ کەس نازانێ لە چ شوێن و زەوییەکدا دەمرێ.

مرۆڤی موسڵمان چاك دەزانێت کە قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺ لە چەند شوێن و جێگادا ئاماژە بە گەورەیی زانست و ئەرکی مەزنی زانست دەکەن، فەرمانمان پێدەکەن کە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بین زانستمەند بین بۆیە بەلامانەوە چاوەڕوان نەکراو و نەشیاوە ڕۆژێك لە ڕۆژان وا دەرکەوێت ئایەتێك یان فەرموودەیەکی صەحیح پێچەوانەی هەقیقەتێکی زانستی بێت.

خوێنەری بەڕێز: خوای گەورە کە خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزەیە هەموو کات و سەردەمێك پارێزگاری لێدەکات، بە هیچ شێوەیەك هیچ ڕاستییەکی زانستی دژ ناوەستێ لەگەڵ قورئان. بەڵێ ئێمە وەك موسڵمان بڕوامان بەوە نییە کە مرۆڤ بتوانێ باران ببارێنێ، جا لێرەدا موعجیزەی ئەم قورئانە بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرا بوو چەند مانگێك دوای ئەم هەواڵە ناڕاستەی ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنەکانی ئەمریکا هەر لەناو ئەمریکا گرفتێك دروستبوو، دەیان و سەدان کەس لە کشتیاران و خاوەن زەوییەکان کە کڕیاری باران بوون لە کۆمپانیاکان بۆیان دەرکەوت ئەو شتە واتە: ئەو هەواڵە ڕاست نەبوو، بۆیە سەدان سکاڵا درا بە دادگا و هێندە سکاڵاو ناڕەزایی زۆر بوو

لەسەریان، کار گەیشتە ئەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ڕەسمی داوای لە پسپۆڕانی خۆی کرد لێکۆڵینەوەیەك بکەن لەسەر ئەم کێشەیە، پاش پشکنین و توێژینەوەیەکی زۆر قوڵ لە هەشتاکاندا نەتەوە یەکگرتووەکان بەیانێکی ڕەسمی بڵاوکردەوە، کە تیایدا هاتبوو باران بارین لە ڕێگای مرۆڤەوە یان کۆمپانیاوە بونیادێکی زانستی نییە، بەڵکو چەواشەکردنێکی قۆپیە ئامێز و ساختەکارانەیەو میتۆدێکی زانستی نییە، هەر بۆیە کۆمپانیاکانیش داخران و نەمان. ئا لەوەوە بۆمان ڕوون بووەوە کە هیچ حەقیقەتێکی زانستی لەگەڵ قورئان و فەرموودە پێچەوانە ناوەستێتەوە.

دکتۆر عەبدولمەجید زندانی چاوپێکەوتنێکی کرد لەگەڵ بەڕێوەبەری گەورەترین پەیمانگای لێکۆڵینەوەی کەشناسی لە ئەمریکادا، ئەو پرۆفیسۆرە (٢٠٠) هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا و (١٥٠) ئەندازیاری لەو پەیمانگایەدا لەژێر دەستدایە، سەبارەت هەمان پرسیاری لێکرد کە تا چەند مرۆڤ توانای ئەنجامدانی پرۆسەی باران بارینی هەیە؟ ئەو پرۆفیسۆرە وتی: ڕەگ و ڕیشەیەك و بنەمایەکی زانستی نییە، چونکە ئەگەر وابووایە ئەوا کۆمپانیاکانی ئێرە دەیانتوانی لەو شوێنەدا باران ببارێنن کە پاودەرو تەپوتۆزە کە بە فڕۆکە دەکەن بەسەر گەواڵە هەورەکاندا، بەڵام تا ئێستا لەو شوێنەدا ئەوان ئەو پرۆسەیە ئەنجام دەدەن باران نەباریوە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز: هەروەك قورئان فەرمووی: بەس تەنها خوای گەورە باران دەبارێنێت زانستی تازەی سەردەمیش ئەوەی بە بەڵگەوە سەلماند، بەڕاستی ئەو کەسانەی کە دوورن لەم ئاینە پاك و پیرۆزە کە ئەو بەڵگانەیان بۆ ڕوون دەکرێتەوە، دەبوو بە دڵ و بە گیان شوێن ئەم قورئانە بکەون، چونکە ئەو ئیسلامە ئایینی پێشکەوتن و زانست و زانیارییە، هەتا ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوا زیاتر ڕاستییە زانستییەکان لە قورئاندا ئاشکرا دەبن.



## زانست دەریخست کە ڕووەکەکانیش هاوسەرگیری دەکەن:

زانست دەریخستووە کە ڕووەکەکانیش وەك ئاژەڵان هاوسەری و یەکگرتنیان هەیەو گوڵیش شوێنی ڕوودانی ئەو هاوسەرییەیە لە گوڵدا دەزوولەی نێرینە هەیە کە خوای گەورە دەنگە هەڵاڵەی لێوە پێکدێنێت، ئەمەش بەهۆی باو چەند ڕێگەیەکی ترەوە دەگوێزرێتەوە بە مێینەی گوڵێکەوە دەگیرسێتەوەو بە ملی پۆرگەکەدا دەچێتە خوارەوە و لەوێشەوە دەچێتە ناو هێلکەدان کە جوتبوون تیایدا ڕوودەدات، پێشتر کەس زانیاری نەبوو دەربارەی ڕوودانی هاوسەری یان دەربارەی بوونی نێرو مێ لە ڕووەکدا تاکو زانستی ڕووەك پێشکەوت و دەریخست کە جوتبوون نەك تەنها لە یەك ڕووەکدا، بەڵکو لە ڕاستیدا لە هەموو ڕووەکەکاندا هەیە قورئانی پیرۆزیش چوار سەدە لەمەوپێش باسی ئەوەی کردووەو فەرموویەتی: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ (يس: ٣٦) واتە: پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بە جوت دروست کردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوێت لە خۆشیان لەو شتانەش کە نایزانن (سبحان الله)، تازەترین بابەتی زانستی نوێ دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا، ئەوەش گەورەترین بەڵگەو دەلیلەکە خاوەنی ئەم قورئانە خوای زاناو کاربەجێیە.



## سەیرکردنی باخ و سەوزایی شادومانی بەخشە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ﴾ (النمل: ٦٠) واتە: لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراندوون و باخ و سەوزایی جوان و ڕازاوەو شادومانی بەخشی پێ بەرهەمهێناوە. لەم پەیوەندییە جوانەی نێوان دەستەواژەی ﴿حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ﴾ و وشەی (بَهْجَةٍ) واتە: شادومانی ڕابمێنن لە کاتێکدا کە لێکۆڵەرە تازەکانی سەردەم دەڵێن: سەیرکردنی باخ و سەوزایی شادمانی لە دەروندا دەستەبەر دەکات.



## ١٧٥ قورئانی پیرۆز بووە هۆکاری مسوڵمانبوونی ناودارترین دکتۆری ئەمریکی:

دکتۆر (اسبر ابراهیم شاهین) کەسایەتی ناوداری ئەمریکی موسڵمانبوو، ناوبراو کەسایەتییەکی ناوداری ئەمریکییە کە وتاری زۆر و کتێبی زانستی هەیە، بێژەرێکی وریایەو زۆر بلیمەتە لەقسەکردندا و خەڵاتی (رواد الخطابة العالمیة)ی وەرگرتووە، هەروەها چەندەها خەڵات و ویسامی تریشی وەرگرتووە لە رونالد ریگان و بۆشی باوك و ئەمیر موحەممەدبن فەهد عەبدولعەزیزی سعودی.

دکتۆر (اسبر ابراهیم شاهین) ڕاوێژکاری نێودەوڵەتییەو سەرۆکی پەیمانگای نێودەوڵەتی تەکنەلۆجییە لەئەمریکاو، لەساڵی ١٩٣٧دا لە لوبنان لەدایکبووەو لەسەر ئایینی مەسیحی بوو، لەساڵی ١٩٥٧دا دەچێتە ئەمریکاو لەگەڵ کارکردندا دەخوێنێت و دوو ساڵ لەزانکۆی تەکساس لە ئوستن و دواتر لەزانکۆی ویلایەتی(اوکلاهوما) بەکالوریوس دەهێنێت لەبەشی(الهندسة الکمیاویة)دا، پاشان لەزانکۆی(اریزونا) لەتوسون ماجستێر دێنێت و دوای ئەوەش دکتۆرا لەزانکۆی تینیسی لە نوکسفیل دەهێنێت، لەشەش زانکۆی ئەمریکی دا مامۆستا بووەو لەزانکۆی سعودیەو جەزائیریشدا کاری کردووەو، چەندەها کتێب و و وتاری هەیە لەبواری (هەندەسەی غاز و زەوی و ژینگە و پیشەسازی پترۆکیمیاویات)دا.

دکتۆر لەبارەی موسوڵمان بوونیەوە دەڵێت: من لە منداڵییەوە ئیسلامم خۆشویستوەو مەیلم هەبووە بۆی و لەهەموو قۆناغەکانی خوێندنمدا و، لەو هەموو شتانەی کەخوێندوومەتەوە گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی کە ئیسلام ئاینێکی مەزنەو لە نیوە دوورگەی عەرەبە وە سەری هەڵداوە تا لەهەموو جیهاندا بڵاوبێتەوە. هاوەڵە موسوڵمانەکانم هەمیشە بەڕەوشت و خووی بەرزیان کاریان تێکردووم، بەتایبەت دکتۆر ناسح ئیبراهیم ڕەشید کە ماوەی(٣٣)ساڵە دۆستایەتیمان هەیە، بەڕاستی ئیسلام ئاینێکی واقعییەو بانگەشەدەکات بۆ دادپەروەری و ڕەحمەت و ڕێزی مرۆڤ، بەڕاستی

تەمەن ڕادەبووریَ و ئێمەش دەڕۆین و زۆری تەمەنمان ڕۆیشتووە و کەمی ماوە، دکتۆر دەڵێ دووساڵ لەمەوبەر تووشی شێرپەنجەی پەنکریاس بووم کەزۆر کەم نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو دەبێت لە نەخۆشخانەیەکی ئەمریکا، ئەو شەوەی کە نیاز بوو نەشتەرگەریم بۆبکەن زۆر لە هاوەڵانم پەیوەندییان پێوەکردم و دوعای خێر و سەلامەتیان بۆکردم، تەنانەت هەندێکیان وتیان: لە حەرەمی مەککەدا دوعایان بۆکردووم، ئەو شەوە گوێم گرت لەقورئان بەدەنگی (شێخ عەبدولباست) کەزۆر چێژم لێوەرگرت و ئەوەندە هەستم بەدڵنیایی و گیانێکی ئارامکرد هەر ئەوکاتە بڕیارمدا موسڵمان ببم، پاش سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکەش حەزمکرد ئەم مانگی حوزەیرانە بەڕەسمی موسڵمانبوونی خۆم لەلانکەی ئیسلامەتی لەپایتەختی سعودیە لەشاری ریازدا ڕابگەیەنم.



## ١٧٦ گەورەترین زانای ئابووری لەجیهاندا مووسڵمان بوو بەناوی (کریستۆڤەر شامونت):

ڕۆژنامەی (الراية القطرية) لەساڵی ١٩٩٧دا لەژێر سەردێڕی گەورەترین زانای ئابووری لەجیهاندا موسڵمان دەبێت دەڵێت: پێش چەند ڕۆژێك زانای ئابووری بەریتانی (کریستۆڤەر شامونت) موسڵمانبوو و ناوی خۆی گۆڕی بۆ ئەحمەد، وە لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: ئەوەی بەدوایدا دەگەڕام لەئیسلامدا دۆزیمەوە، بەڕاستی هەرچی گرفتێك بۆ ئادەمیزاد پێشبێت چارەسەرەکەی لە ئیسلامدا دەدۆزێتەوە، بەڕاستی ئیسلام ئاخاوتن لەگەڵ عەقڵدا دەکات و دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست و بەختەوەری دنیا و ئاخیرەتی بۆ دەستەبەردەکات، بۆم دەرکەوتووە کە ئیسلام هۆکارەکانی پێشکەوتنی شارستانی و سەرکەوتنی زانستی تێدایە، خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن ڕاستییە زانستییەکان لەپەیامە پیرۆزەکەی ئیسلامدا ئەم زانا گەورەیەی بەریتانی هێنایە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام، بەڕاستی هەرکەسێکی دوور لە دین ئەگەر بەوردی و بەئینصافەوە لێکۆڵینەوە بکات دەربارەی ئیسلام دەگاتە قەناعەتی تەواو.



## موعجیزەکانی قورئان ئەدیبی شاعیر(نقولاحنا)ی هێنایە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام:

ئەدیبی شاعیر (نقولاحنا) قورئانی خوێندەوە و گەیشتە ئەو یەقینەی کە قورئان پەڕاوێکی موعجیزەی خواییە و لەهەموو موعجیزەکان گەورەترە و هەتا هەتاییە، سەرەنجام موسوڵمان بووەو دەڵێت: قورئانم خوێند سەرسامی کردم قوڵبوومەوە کەمەندکێشی کردم، ئینجا دووبارە خوێندمەوەو ئیمانم هێنا، ئیمانم هێنا بە قورئانی گەورەی خوایی و بەو نێردراوەی کە گەیاندی پێغەمبەری بەڕێزی عەرەبی، من لەگاورەتییەکەمەوە باوەڕم هەبوو بەخوا بەهۆی قورئانەوە باوەڕەکەم بەخوا گەورەتربوو، جاچۆن ئیمان نەهێنم لەکاتێکدا موعجیزەی قورئان لەبەردەستمایەو سەیری دەکەم و هەستی پێدەکەم لەهەموو کاتێکدا قورئان موعجیزەیە، زیاتر لە مووعجیزەکانی تر موعجیزەیەکی خواییە و خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی پەکی لەکەس نەکەوتووە کەباسی بکات و پیایدا هەڵبدات و مژدەی پێبدات.

هەروەها ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی دکتۆر (مادریش) کە هەردوو وەزارەتی دەرەوە و مەعاریفی فەڕەنسی داوایان لێیکرد کە قورئان وەرگێڕێتە سەر زمانەکەیان، ئەویش بە کارەکەی هەستا و لە پێشەکییەکەیدا کە لەساڵی ١٩٢٦ز دەرچووە دەڵێت: شێوازی قورئان دیارییەکە لەخواوەیە، لەڕاستیشدا زۆر لە نووسەرە گوماندارەکان لەئەنجامدا ملیان بۆداو کەوتنە ژێر کاریگەرییەکەیەوە ئەو کاریگەرییەی کەهەیەتی لەسەر سێ سەد ملیۆن موسڵمان، کە بەچوار قورنەی دنیادا بڵاوبوونەتەوە، مژدەدەرە بیانییەکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە کاریگەری ئەم قورئانە ئەوەندە زۆرە لەسەر شوێنکەوتوانی کە تەنانەت نەسەلماوە کە تاقە موسڵمانێك پاشگەزبووبێتەوە لەئاینەکەی، ئەم قورئانە کاریگەریەکی زۆر قوڵی لەسەر دەروونی گوێگرەکەی هەیە ئەگەر لە عەرەبی تێبگات، بۆیە ڕەنجێکی بێهودەیە کە کەسێك هەوڵبدات ئەو کاریگەرییە جوانەی داڕشتنەکەی کە وێنەی ئەوە نەبیستراوە بگۆڕێ بەزمانێکی دیکە،

بەتایبەت زمانی فەڕەنسی کە بەرتەنگە و ناتوانرێت ئەوەی لەهەست و سۆزدایە پێی دەربڕێت، هەروەها ئەدیبی لوبنانی (مارون عبود) بەویژدانەوە دانی نا بە ئیعجازی قورئاندا و خۆشەویستی و ڕێزی خۆی دەربڕی بۆ پێغەمبەر ﷺ و کوڕەکەشی ناونا موحەممەد، هەروەها ئەدیبی گەورەی مەسیحیش (ئیبراهیم الیازجی) نەیتوانی خۆی لادا لەباسی گەورەیی و ئیعجازی قورئان.



## ١٧٨ ئەفسەرێکی ئەمریکی دوای دیراسەکردنی قورئان و فەرموودە بەخۆشحاڵییەوە موسوڵمان بوو:

شێخ موحەممەد حەسان لەوتاری (الاسلام قادم)دا دەڵێت: لەم چەندساڵەی ڕابردوودا کەچووم بۆ ئەمریکا چاوم کەوت بە ئەفسەرێکی ئەمریکی کەناوی (مایکل)بوو، پاش موسوڵمانبوونی ناوی (عبدالصبور)ی لەخۆی نابوو و کۆمەڵەیەکی ئیسلامی دامەزراندبوو، لەبارەی موسوڵمانبوونیەوە پرسیارم لێیکرد ئەویش لەوەڵامدا وتی: من لەگەڵ ئەوەدا کەئەفسەربووم پلەیەکی گەورەی ئایینیشم هەبوو، وە خەریکی قەشەیەتی و ڕێنمایی کردن بووم من قورئان و وەرگێڕانەکەیم خوێندەوەو دیراسەی فەرموودەکانی بوخاری و موسلیمم کرد.

برادەرێکم پێش من موسوڵمانبوو چووم بەدوایدا لەمزگەوت دۆزیمەوە کاتی بانگ بوو لێتان ناشارمەوە لەناخەوە هەژاندمی بەجۆرێك کەناتوانم دەری ببڕم و باسی بکەم، موسوڵمانانم بینی نوێژدەکەن زۆر کاریگەری هەبوو لەسەرم، پرسیارم کرد چۆن موسوڵمان ببم؟ وتیان: خۆت بشۆو شایەتومان بهێنە، منیش ئەوەی پێویستبوو کردم و بەوجۆرە هاتمە ڕیزی موسوڵمانانەوە، بەڕاستی ئیسلام زۆر بەخێرایی لە ئەمریکادا بڵاودەبێتەوە، لەکۆی پەنجا و چوار هەزار ئەفسەری پیاو و ژنی ئەمریکی لەسایەی خواوە نزیکەی سێزدە هەزاریان موسوڵمانبوون، تەنها لەو سەرباز و ئەفسەرانەش کە لەجەنگی کەنداودا بەشدارییان کرد نزیکەی حەوت هەزار کەس موسوڵمانبوون.

ڕۆژێك ئەفسەرێكی ئافرەت موسوڵمانبوو بە خۆداپۆشراوی هاتە سەر كارەكەی، بەڕێوەبەرەكەی پێی وت: برۆ بەرگەكەت بگۆڕە و لەچكەكەشت لاببە، ئەویش وتی: ئەم لەچك و جلە فەرمانی خودایە و هیچ دەسەڵاتێك نییە بتوانێ ڕێگەم لێبگرێت، (عبدالصبور) وتی: من سێ نامەم هەیە بەتۆدا دەینێرم یەكەم بۆ ئەمریكییەكان دەڵێم: ئێمەی موسوڵمان ئیمانمان بە عیسا پێغەمبەر هەیە هەروەك چۆن ئیمانمان هەیە بە پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﷺ، نامەی دووەمیشم بۆ موسوڵمانەكانی ئەمریكایە و دەڵێم: ئارام بگرن و پەلە مەكەن هیچ كارێك بێ ئارامگرتن ناگاتە ئەنجام و خەمبار مەبن لە هەڵە و كەم و كوڕی لەكاتێكدا كە سوور نین لەسەری و تەوبە دەكەن، نامەی سێیەمیشم بۆ موسوڵمانان بەگشتی و موسوڵمانانی میسر بەتایبەتی كەپێیان دەڵێم هەرچەندە هەزارەها میل لێتانەوە دوورین، بەڕاستی ئێمە خۆشماندەوێن لەبەر خوا و بەبرای خۆمانتان دەزانین.



## ١٧٩ موعجیزە زانستییەكان هۆكارێكی كاریگەربوون بۆ موسوڵمانبوونی دكتۆرێكی فەڕەنسی:

دكتۆر (علی سلمان بنوا) لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: من دكتۆرێكی فەڕەنسیم و لە خێزانێكی گاوری كاثۆلیكیدا چاوم بەدنیا هەڵهێناوە، لەبەر ئەوەی خەریكی پزیشكی بووم زیاتر گرنگیم ئەدا بەبواری زانستی و گوێم نەئەدا بەلایەنی ڕۆحی، من بڕوام بەخودایەكی تاك و تەنها هەبوو پێش ئەوەش كەموسوڵمان ببم كە ئەوەش بەشی یەكەمی شایەتومانە: (أشهد أن لا إله إلا الله) كە قورئانیش لە سورەتی (الاخلاص)دا جەخت دەكاتە سەری: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾ ئیمان بوونم بەغەیب وایلێكرد بڕوا بە ئیسلام بهێنم هەرچەندە هۆی تریش هەبوون هانیاندام بۆ هاتن بەرەو ئیسلام، لەوانە بڕوا نەبوونم بەداوای كەنیسە كەگوایە توانای لێخۆشبوونی گوناهیان هەیە و لەخواوە وەریانگرتووە، هەروەها مەسەلەی



(العشاء الرباني) و (الخبز المقدس)، ئەمانە بە ئەقڵمدا نەدەچوون لەلای ئێمە گرنگی نەدەدرا بەپاك و تەمیزی لاشە پێش نوێژ، ئەمەش بەلای منەوە نابێت بکرێت لەهەقی خوادا، چونکە هەروەك خوا ڕۆحی بۆدروست کردووین لاشەشی بۆدروستکردووین و پێویستە گرنگی پێبدرێت.

هەروەها تێبینی ئەوەم دەکرد لەلای ئێمە بێدەنگییەك هەیە بەرامبەر غەریزەکانی مرۆڤ، کەچی لەئیسلامدا زۆر گرنگی بەباسی سروشتی ئادەمی و حسابی بۆکراوە، زیاتر لەهەموو ئەوانەش قورئان کاری تێکردم و هۆکاری بنەڕەتییە لە موسوڵمانبوونمدا پێش ئەوەی موسوڵمان ببم کەوتمە لێکۆڵینەوەی، من زۆر خۆم بەقەرزداری (مالك بن نبی) دەزانم کە پەرتووکی (الظاهرة القرآنية)ی داناوە، قەناعەتی تەواوی پێکردم کەقورئان سروشەو خوا ناردوویەتییە خوارەوە، جا ئەو ئایەتانەی کە باسی لایەنی زانستی دەکەن لەزیاتر بەر لە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوەو تازە زانستی سەردەم دەیانسەلمێنن وایان لێکردم کەبڕوا بەبەشی دووەمی شایەتمان بهێنم (وأشهد أن محمداً رسول الله)، ئابەو جۆرە لەڕۆژی ٢٠ی فێبریوەری ساڵی ١٩٥٣دا موسوڵمانبوونی خۆم لەمزگەوتی پاریس ڕاگەیاند و ناوم لەسجلی موسوڵماناندا تۆمارکرا بە علی سەلمان، من خۆم بەبەختەوەر دەزانم بەم عەقیدەو بیروباوەڕەمەوە. جارێکیتر ڕایدەگەیەنم (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله).

ئەی خوێنەری بەڕێز: بڕوانە موعجیزەکانی قورئان چەند کاریگەرن و چۆن خەڵکی دوور لەدین ڕێنمایی دەکەن و دەیهێننە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام، کەواتە ئەو پەرتووکانەی کەتایبەتن بەو موعجیزە زانستییە گەورانە هەوڵبدەن بەناو خەڵکیدا بڵاویان بکەنەوە و بەدیاری پێیان ببەخشن، ئەوەش دوو ئامانجی گەورە دێنێتە دی، یەکێکیان ئیمان بەهێزبوون و پتەوبوونی ئیمانی موسوڵمانانە و یەکێکیتریشیان ڕەواندنەوەی گومان و دوودڵی ناو دڵی ئەو کەسانەیە کە لەگوماندان بۆ ئەوەی بڕوبیانوویان نەمێنێ و بەدڵنیایی تەواوەوە بێنە ژێر سێبەری بەرنامە پاك و پیرۆزەکەی خودای گەورە.



## دەرکەوتنی چەند نهێنییەکی زانستی لەبارەی مردنی بەرنامە بۆداڕێژراو:

– زانایان بۆیان دەرکەوت کە بەرنامەی مردن لەناو هەموو خانەیەکدا دانراوە هەروەك چۆن بەرنامەی ژیانی تێدا دانراوە، جائەگەر بەرنامەی مردن نەبووایە لاشە نەیدەتوانی بەرگری بکات لە نەخۆشی، ئەوەش بەڕاستی لەقورئاندا ئاماژەی بۆکراوە هەروەك دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ (الملك:٢).

– زانایان دەڵێن لەدروستبوونی نوتفەدا و لەدروستبوونی یەکەم خانەوە بەرنامەی مردنی تێدا دانراوە کە ئەوەش قورئان ئاماژەی بۆدەکات و دەفەرموێت: ﴿نَحْنُ خَلَقْنَـٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ۝ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ۝ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ۝ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ (الواقعة ٥٧–٦٠).

– زانایان هەوڵی زۆریاندا کەچارەسەری مردن و پیری بکەن نەیانتوانی لەبەرئەوەی بەرنامەی مردن و ئەجەلی دیاریکرا و لە هەموو خانەیەکدا دانراوە، ئەوەش پێغەمبەر ﷺ وە موعجیزەیەك ئاماژەی بۆدەکات و دەفەرموێت: {تداوو عبادالله، فإن الله لم يضع داء إلا وضع له دواء إلا داء واحد الهرم} رواه الامام أحمد.

– زانایان جینێکیان دۆزییەوە کە بەرپرسیارە لەپیربوون و مردنی خانە و ناویان (التیلیمیر) ئەو مردنی خانانەش ئەگەر نەمرێت لەکاتی خۆیدا دابەشبوونی زۆر دابەش دەبێت و تووشی شێرپەنجە دەبێت.

***



## دۆزینەوە گرنگەکەی پەڕاوی کۆدی دڵ هاوڕایە لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکانی قورئانی پیرۆز:

کەناڵی جەزیرەی وثائقی باسی پەڕاوێکی کرد کە دۆزینەوەیەکی گرنگ باس دەکات کە بەهێندەی دۆزینەوەی جازبیەتی ئەنیشتاین گرنگە، پەڕاوەکەش ناوی کۆدی دڵەوەیە، ئەم پەڕاوە باس لەوە دەکات کە ئەوکەسانەی دڵیان بۆ دەگۆڕێت زۆر شتیان دەگۆڕدرێت، بۆنموونە: یەکێ: لەوانەی دڵیان بۆگۆڕیوە پێشتر لەسەتڵێك ئاو دەترسا بخنکێت تیایدا کەچی دوای گۆڕینەکە دەچوو بۆ مەلەکردن و لەئاو نەدەترسا، یەکێکیتر کە هەرگیز نەچووە بەلای هۆنراوەدا دوای دڵ گۆڕین ئەکەوێتە هۆنراوە نووسین، یەکێکیتر کەترساوە لەسەر تەپڵەکێکەوە بکەوێتە خوارەوە لەدوای ئەو نەشتەرگەرییە چووە بەشاخدا هەڵگەڕاوە، کە ئەوەش وای لەزانایان کرد کەدان بنێن بەگرنگی دڵدا کە بەجۆرێك لەجۆرەکان فرمان دەکات بەمێشك و دڵ لەپێشی مێشکەوەیە بۆبڕیاردان، جا خوێنەری بەڕێز سەرج بدە و بڕوانە چۆن قورئانی پیرۆز باس لەو ڕاستییە زانستییە دەکات بەر لەچوار سەدە پێش ئێستا قورئان دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ (الاسراء: ٣٦).

وەهەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا﴾ (القصص: ١٠).

وە هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ (الانعام: ١١٣).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَـٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَـٰفِلُونَ﴾ (الاعراف: ١٧٩).

***



## نوێژکردن بۆ ژنی حەیزدار زیانی هەیە و بۆ دووگیانیش سوودی هەیە:

لێکۆڵینەوە نوێیەکانی پزیشکی ئەوەیان دەرخستووە جووڵەکانی لەش و وەرزشی وەکو نوێژ سودێکی زۆریان هەیە بۆ ژنانی دووگیان، هەروەها ئەم وەرزشانە زیانی بۆ ژنانێك هەیە کە لەسووڕی مانگانەدابن، چونکە ژنی نوێژکەر لەکاتی کڕنووش و رکوعدا ڕۆیشتنی خوێن بۆناو ڕەحم زیاد دەکات ئەوە جگە لەوەی خانەکانی ڕەحم و هێلکۆکەکان بەخانەکانی جەرگ دەچن کە زۆرێك خوێن ڕاپێچ دەکەن، بێگومان ڕەحمی ژنی دووگیان پێویستی بەڕێژەیەکی زۆری خوێن هەیە بۆ تێرکردنی کۆرپەلەو خاوێنکردنەوەی پیسییەکانی خوێنی کۆرپەلە.

کاتێك ژنی دووگیان نوێژ دەکات ئەم نوێژە یارمەتی دەدات بۆ گەیاندنی خوێن بۆ کۆرپەلە زۆر بەئاسانی، بەڵام ژنی زەیستان واتە: حەیزدار ئەگەر نوێژ بکات ئەبێتە هۆی تێپەڕینی ڕێژەیەکی زۆری خوێن بۆناو ڕەحمی، ئەوەش دەبێتە هۆی ڕۆیشتنی خوێنی زۆر و دووچاربوون بەکەمخوێنی ڕێژەی خوێن و شلەمەنی لەناوچوو لە لەشی ژن لەکاتی حەیزدا خەمڵێنراوە بە(٣٤)ملم لەخوێن و هاووێنەکانی لە شلەمەنییەکان، ئەگەر ژنی زەیستان نوێژ بکات ئەبێتە هۆی لەناوچوونی ئامێری بەرگری لەلەشدا، چونکە خڕۆکە سپییەکانی خوێن کە ڕۆڵێکی باڵایان هەیە لەبەرگریکردنی ڤایرۆسەکان لەناودەچن، لەنێوان ئەم خوێنە پیسەی کە بەفیڕۆدەڕوات، خوێن بەربوون بەشێوەیەکی گشتی ئەگەرەکانی دووچاری نەخۆشکەوتن زیاد دەکات، بەڵام ژنانی حەیزدار خوای مەزن پاراستوونی لەوەی دووچاری نەخۆشی ببن بە لەناوچوونی کۆمەڵێك لە خڕۆکە سپییەکان لەناو ڕەحمدا لەکاتی سوڕی مانگانەیاندا بۆئەوەی بەرگرییان لەهەمبەر نەخۆشییەکان زیاد ببێت، بەڵام ئەگەر لەکاتی سووڕی مانگانەیاندا نوێژ بکەن ئەوا بەڕێژەیەکی زۆری خڕۆکە سپییەکان دەڕۆن و لەناودەچن ئەوەش دەبێتە هۆی دووچاری نەخۆشکەوتنی زۆرێك لە ئەندامانی لەش وەکو جەرگ و فاتەڕەشەو غوددەی لیمفاوی و مێشك.

ئالێرەدا حیکمەتی قەدەغەکردنی نوێژ بۆ ژنانی حەیزدار بەدیاردەکەوێت تاکو خاوێن نەبنەوە، هەروەك خودای گەورە بەوشەی (أَذًى) باسی کردووە و دەفەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة:٢٢٢) واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عادەی مانگانەی ئافرەت، پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بەدووربگرن لەهاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاك دەبنەوە، جا کاتێك پاك و خاوێن بوونەوە و خۆیان شوشت بچنە لایان بەو شێوەیە کەخوا فرمانی داوە بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت ئەوانەی ڕواڵەت و ناوەڕۆکیان پاکە).

ئەوە جگە لەوەی بەجووڵەی لەش بەتایبەت لە کڕنووش و رکوع خوێنی زیاتر بۆناو ڕەحم دەچێت و لەناو چوونی ئاسان دەبێت لەگەڵ ئەوەی ئەبێتە هۆکاری کەمبوونەوەی ماددەی ئاسنی پزیشکەکان ئامۆژگارییان دەکەن لەکاتی حەیزدا ژن پشوویدات باشترە. هەروەها کاتەکانی خواردن باش بکات تاکو خوێن و شلەمەنییەکانی تر لە لەش کەم نەکات لێرە بەهەمان شێوە حیکمەتی قەدەغەکردنی ژنی حەیزدار لە بە ڕۆژوبوون بەدیار دەکەوێت، چونکە دەبێت لەوکاتانەدا زیاتر خواردن بخوات بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە ئەم قورئانە.



## ١٨٣ دڵ سەنتەری هۆش و بیرکردنەوەیە:

ماوەیەك بەر لە ئەمڕۆ زۆربوون ئەوانەی بەپەرۆشی ئەوەبوون ئاخۆ: ئایا مێشك سەنتەرە بۆ بیرکردنەوە یاخود دڵی مرۆڤ؟ ئایا مێشکی مرۆڤ بەرپرسیاری یەکەمە لە بیرکردنەوە یاخود دڵی؟ دکتۆر(عەبدول مەجید زەندانی) یەکێك بوو لەوانەی کەزۆر پەرۆشی ئەم وەڵامە بوو، بۆیە بەدوای ئەم وەڵامەدا گەڕا ئەوەی دۆزییەوە کەوا زانایان لەکردنی نەشتەرگەری گۆڕینی (دڵ) لێکۆڵینەوەیان کردووەو ئەوەیان

بۆدەرکەوتووە کەوا لەناو دڵی مرۆڤدا هۆرمۆنی بیرکەرەوە هەیەو نامەی زانیاری بۆلەش دەنێرێ و توانای بیرکردنەوەیان هەیە، هەروەك مێشکی مرۆڤ دواتر ئەوەیان دەرخست کە ئەوکەسانەی نەشتەرگەری گۆڕینی دڵیان بۆ کراوە دوای نەشتەرگەرییەکە هەڵسوکەوتی گۆڕانی بەسەرهاتووەو هەڵچوون و تووڕەبوونی بەگوێرەی کەسەکەیان زیاتر بووە یاخود نەماوە.

خوێنەری بەڕێز: ئەمە ئەو زانیارییەی کە خوای گەورە بەر لە چواردە سەدە ئەوە دەردەخات کەدڵ تەنها ترومپایەکی خوێن نییە، بەڵکو ڕایدەگەیەنێت کەدڵ توانای بیرکردنەوەی هەیە، سەیر بکەن خوای گەورە چی دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾ (الحج: ٤٦) واتە: ئایە ئەوانە بەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون بەدڵ و دەروونێکی هۆشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە کوان خەڵکانی ڕابردوو؟ ئەو شارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروست کردووە؟ ئامانج لەژیان چییە؟ یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون بەسەرهاتەکانیان بیستن و لێکی بدەنەوە، جا وەنەبێت چاوان کوێر چاویان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کەوان لە سینەکاندا، چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێکنادەنەوە.

بڕوانە چۆن وشەی بیرکردنەوەی بۆدڵ بەکارهێناوە ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ﴾، لە ئایەتێکیتردا دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ﴾ (الاعراف: ١٧٩) واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردووە ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی هەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی هەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی هەقی پێ نابیستن، ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا، بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئائەوانە هەر غافڵ و بێئاگان لەهەق.

سەیرکەن خوای گەورە لێرەش بەهەمان شێوە خوای گەورە وشەی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی بەکارهێناوە و دەفەرموێت: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ واتە ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی هەقی پێتێناگەن، هەروەها دڵ بە بەرپرسیار دەزانێ و دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ (الاسراء: ٣٦) واتە ئەی مرۆڤ لەشتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەر هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە، ئایا ئەوە هەمان ئەو دۆزینەوەیە نییە کە زانایانی تەندروستی دوای زیاتر لە (١٤٣٠) ساڵ تازە دەڵێن: کە بەڵێ دڵیش توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتنی هەیە؟ ئایە ئەمە یەکێك نییە لەو هەزاران بەڵگە حاشا هەڵنەگرانەی ڕاستی قورئانی پیرۆز، بەڕاستی قورئان موعجیزەی زانستی گەورەی وای تێدایە هەتا ڕۆژگار بەرەو پێشەوە بڕوات زیاتر ڕاستییەکانی بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرادەبن.




## نوێژی عەسر و موعجیزەیەکی زانستی گەورە:

لێکۆڵینەوەیەکی نوێ ئاشکرای کرد: هۆرمۆنێك هەیە لەمرۆڤدا ئەو ڕژێنانە دەردەکات کە لەگورچیلەوە سەر ئەکەون و ئەو هۆرمۆنە پێی دەوترێت(ئەدرینالین)، ئەم هۆرمۆنە چالاکییەك ئەدات بەدڵ لەحاڵەتی ئیشکردندا دروست دەبێت لەحاڵەتی وتووێژی توندو هەڵچوون و هەواڵی ناخۆش و دیمەنی ناشرین و تووڕەبوون دروست ئەبێ، ئەم هۆرمۆنە چالاکییەك ئەدات بەدڵ، لە ئەنجامی ئەو دەردراوانە ترپەی دڵ زیاد دەبێت و شەکرە بەرز ئەبێتەوە پاڵەپەستۆ بەرزئەبێتەوە لەزیادبوونی ئەم هۆرمۆنەدا دەرکەوت دوو لوتکەی هەیە لەکاتی دیاریکراودا یەکێکیان پێش نوێژی نیوەڕۆیە، یەکێکیشیان پاش نوێژی نیوەڕۆیە، تاقیکردنەوەیەك کرا لەسەر (٣١) ئەفسەر کە نیشان بگرنەوە ماندوویان کردن بۆ ماوەی (٧٥) سەعات نەیانهێشت

بنوون، هەروەها نەیانهێشت لەو تاقیکردنەوەیەدا هیچ جۆرە پشوویەك بدەن و شەکەت بوون، بەڵام زوو زوو تخطیطی دڵیان بۆ ئەکردن هێڵکاری خوێنیان بۆئەگرتن خوێنی ئەم (٣١) ئەفسەرە دەرکەوت کە لوتکەی ڕژاندنی ئەدرینالین بۆناو لەشیان، لوتکەی ڕژاندنی ئەدرینالین بۆناو خوێن بێگومان خۆی دوو دەقیقە لەناو خوێندا ئەمێنێتەوە ئیتر شانەکانی لەش هەڵیدەمژن و دوو سەعات زیاتر ئەمێنێتەوە، پاشان لەگەڵ دەردراودا لەگەڵ میزدا ئەچێتە دەرێ لەگەڵ ئەوەی کە ئەمانە (٧٥) دانە سەعات ماندووبوون، دەرکەوت لەنیوەی شەودا ئەدرینالین کەمترین بڕ دێ و زۆر هەست بەماندوویی و هیلاکی و شەکەتی ئەکەن. لەکاتی پاش نیوەڕۆدا زۆر دەبێت، لێکۆڵینەوەکە کە هەمووی ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم هۆرمۆنە لەپاش نیوەڕۆوە زیاد ئەکات، لەکاتی عەسردا ئەگاتە لوتکە تێکڕای دەرپەڕینی خوێن لەدڵەوە لە سەعات (٣) دایە تریەی دڵ ئەگاتە ئەوپەڕی لەسەعات (٤)دا پاڵەپەستۆیەکەی دوای ئەوەیە بەرزئەبێتەوە.

ئەوە لەهەموو مرۆڤێکدا وایە ئیتر ئەو مرۆڤە ماندووە نەخۆشە یان ساغە لەپشوودایە یان نا ئەم دیاردەیە ڕووئەدات وەك یەکە لەسەر هەردوو ڕەگەزەکە ژنە، پیاوە، گەنجە، بەتەمەنە، لەهەچ وڵاتێك بێت لەوکاتی دوای نیوەڕۆیەدا ئەو دیاردەیە ڕووئەدات، لێکۆڵینەوە زانستییەکە ئەڵێت: ئەوە پەیوەستە بە کاتژمێرێکی ناوخۆی مرۆڤەوە کەپێی ئەوترێت (الساعة البایولوجیة) بە کاتژمێری بایۆلۆجی ئەو دەردراوە درووست ئەبێت بۆچی دروست ئەبێ؟ تا ئێستا زانست نازانێ بۆچی؟ بەڵام وەك پێواندن بۆیان دەرکەوتووە کە ئەو هۆرمۆنە زۆرترین کات دێتە خوێنەوە و ناو لەشەوە کاتی نیوەڕۆیە و ئەگاتە لوتکەکەی لەکاتی عەسردا.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە خوای گەورە چی دەفەرموێت لەقورئانە پڕ لەزانستەکەیدا: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ (البقرة: ٢٣٨) واتە: خوای گەورە ئەمرمان پێدەکات کە نوێژەکانمان لەکاتی خۆیدا بکەین بەتایبەت نوێژی ناوەڕاست، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە، ئیمامی زەمەخشەری

له تەفسیری(کشاف) دوا و (ابن کثیر) وەها ئەفەرموون وە هەروەها (سید قطب) یش وەها دەفەرموێ: وە غەیری ئەمانەش لەسەر ئەو ڕایەن پشتیان بەستووە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەڕۆژی جەنگی ئەحزابدا فەرمووی: {شغلونا عن الصلوة الوسطي العصر ملأ الله قبورهم وبيوتهم ناراً} صحیح رواه مسلم واتە: (سەرقاڵیانکردین ئەو بێباوەڕانە لەنوێژی ناوەڕاست لە نوێژی عەسر، خوا قەبر وماڵیان پڕکات لەئاگر)، ئەم فەرموودەیە ئەیسەلمێنێت کە نوێژی ناوەڕاست کە لە قورئاندا هاتووە بریتییە لەنوێژی عەسر ئەم هۆرمۆناتانە کەزیاد ئەبێت ترپەی دڵ لە لوتکەدایە، لەبەرئەوە خوای گەورە ئەمرمان پێدەکات بۆ ماوەیەك دوورکەوینەوە لەدنیا دوورکەوینەوە لە جەنجاڵی ژیان، ڕووبکەینە خوا با ئەوکاتە بە سەلامەتی تێپەڕببێت، چونکە هەر کارێکی زیادە هەر ئیشێکی زیادە خەبەرێکی ناخۆش هەڵچوونێکی دەروونی لەوکاتەدا هۆرمۆنەکە زیاد ئەبێت دڵەکە بەرگەی ناگرێت.

له لێکۆڵینەوەیەکی زانستی تردا زانایان بە ئامارکردن بۆیان دەرکەوتووە کە نسکۆکردنی دڵ لە سەعات (١-٣) ڕوودەدات زیاترینی وەستاندنی دڵ لەکاتی (١-٣)یە، جا ئەو دیراساتانە ئەیسەلمێنێت کە دەردراوی (ئەدرینالین) زۆرە لەوکاتەدا لەبەرئەوە پێویستی بە پشوویەکە دوورکەوێتەوە لەسەرقاڵی ژیان، خوای گەورە فەرمانمان پێئەکات کە لەوکاتەدا دوورکەوینەوە سەرگەرم بین بەدەست نوێژ شتنەوە، ئەو دەستنوێژە پێیدەوترێت (جهد المتوسط) ئەوە ئەو چالاکی دەستە ئەو حەرەکەتی دەستنوێژە وردە وردە هۆرمۆنی (ئەدرینالین)ەکە کەم دەکاتەوەو، ئەو جوڵانە ڕۆیشتنێکی لەسەرخۆ بەرەو مزگەوت چاوەڕوانکردنی نوێژ هەتا مامۆستا دێت نوێژکردن بە جەماعەت، پاشان ئەو وێردو تەسبیحاتەی دوای نوێژکردن ئەو سوننەتانەی کە هەن ئەوانە هەمووی نزیکەی نیو سەعاتێك ئەبات، ئەبینیت لەوکاتە ترسناکە تێپەڕئەبیت نوێژ تەواو ئەبێت ئەدرینالینەکە دائەبەزێت.

پاشان ئەو مرۆڤە توانای ڕووبەڕووبونەوەی تری لادروست ئەبێت، چونکە پاڵەپەستۆکە دابەزیوەتەوە و ئەو فشارەی کەلەسەر دڵ بووە لاچووە، ئەم دیاردەیە

ڕووئەدات لە هەموو مرۆڤێکدا و لە هەموو شوێنێکدا و تەنها لە دەوروبەری عەسردا، کەواتە: بۆمان دەرکەوت ئەم شەریعەتە پیرۆزە لەگەڵ زانستدا دەقاو دەقن هیچ جیاوازییەك نییە لەگەڵ لێکۆڵینەوەی فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەردا ﷺ وە هەرچی ئەم شەریعەتە فەرموویەتی ئایا لەقورئانەوە بێت یان لە فەموودەکانی پێغەمبەرەوە بێت لە بەرژەوەندی مرۆڤدایە؟.

##  ١٨٥ نوێژکردن کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر دەروونی مرۆڤ هەیە:

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ (المؤمنون: ١-٢) واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگاردەبن سەردەکەون ئەو کەسانەی لە نوێژەکانیاندا لەخوا دەترسن گەردن کەچن بۆ خوا.

کاتێك مرۆڤی موسوڵمان بەشێوازی ملکەچ نوێژکردن ئەنجام دەدات ئەوا یارمەتی بیرخستنەوە دەدات کە ئەمەش گرنگترین ڕێگای چارەسەرکردنی پەشۆکان و ماندووبوونی مێشکە، لەبەرئەوە نوێژ چارەسەرێکی باشە بۆ تووڕەبوون و پەلەپەل و ڕۆچوون لەشتانێکی ناپێویست، هەروەها مرۆڤ لەسەرخۆ و لەخواترس و ملکەچ دەکات بۆ خوای گەورە و مرۆڤ فێردەکات چۆن ئارامگرو لەخۆ بووردە بێت، ئەمانە کاریگەری زۆر باشیان دەبێت لەسەر هەموو هەستە دەمارەکان و لەسەر دڵ و ڕێکخستنی لێدانەکانی دڵ و ناردنی خوێن بۆ بەشەکانی لەش بەباشی.

***

## ﴿١٨٦﴾ نوێژ دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی تەمەن:

لێکۆڵینەوەیەك دەری خستووە کەنوێژ تەمەن درێژدەکاتەوە بەهۆکاری دەروونی و جەستەیی زۆربەیان هەواڵی گرنگی نوێژمان پێڕادەگەیەنن، پێغەمبەر ﷺ پێمان ڕادەگەیەنێت کە گرنگترین و خۆشەویسترین ئیمان کە لەقورئان ئاماژەی پێکراوە بۆ لەخوا ترسان قورئان دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ (البقرة: ١-٣)

واتە: بە ئەلیف، لام، میم دەخوێنرێتەوە ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدا نییە ڕێ نیشاندەرە بۆ پارێزکاران ئەوانەی کە بڕوا دەهێنن بە شتە پەنهان و نادیارەکان وە نوێژ دەکەن لەوەی کردوومانە بە ڕۆزییان دەیبەخشن لەبەر خوای گەورە.

هەرکەسێ واز لەنوێژ بهێنێ بە دەرچوون دادەنرێت لە ئیسلام زۆریان بە فاسق دادەنرێن، ئەگەر وازی لەنوێژ هێنا بەهۆی تەمبەڵی ئینکاری لێنەکرد، خوێنەری بەڕێز جا بابزانین ئایا زانا غەیر موسوڵمانەکان نهێنی و سوودی نوێیان بۆ نوێژ دۆزیوەتەوە؟ بۆ ئەمە ئەو هەواڵ و زانستە دەخەینەڕوو لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێی زانستی کاریگەری شیفای نوێژ بەدیارکەوت کە لێکۆڵینەوەکان پێشبینیان نەدەکرد.

لە لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا ئەو ڕاستییە دەرکەوت کەچوون بۆ مزگەوت یا هەرشوێنێکی خواپەرستی دەستی دەبێت لەدرێژکردنەوەی تەمەنی کەسەکە کە بەبەردەوامی و بەڕێکی نوێژەکانی ئەنجامدەدات، توێژینەوەیەکی نوێ کە لە گۆڤاری (psychology and health) بڵاوکراوەتەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەو ئافرەتانەی بەتەمەن داچوونە، بەردەوام لەسەر نوێژەکانیان ڕێژەی مردن لەلایان لە سەدا بیست کەمتر بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کە لەهەمان تەمەنی ئەواندان هەڵنەستاون بە ئەنجامدانی نوێژەکانیان.

گروپێك لە کۆلێژی پزیشکی (ئەلبێرت ئەنیشتاین) لە زانکۆی (یاشینا) سامپڵێکیان پێکهێنا لە هەموو جۆرە ئاینێك بۆ توێژینەوە، هەڵسان بە چاودێری ئەو ئافرەتانە

ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك نوێژەکانیان ئەنجامدابێت بینییان کە نمایشە ئاینییە ڕێکەکان جۆرێك لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی درووست دەکات لە کاری ڕۆژانە، ڕۆڵێکی ئاشکرا دەبینێت لە بەهێزکردنی دروستی و توانی جەستەیی، هەروەها دەرکەوت ئەو ئافرەتانەی کە بەشێوەیەکی ڕێك نوێژەکانیان دەکەن زیاتر دەژین لەچاو پێچەوانەکانیان، توێژەرێکی دەروناس کە سەرپەرشتی ئەم توێژینەوەیەی دەکرد وای بینی کە ناکرێت تەفسیری ئەو پارێزگارییە بکەین کە نوێژ بۆ نوێژخوێنان دەستەبەری دەکات، بەشێوەیەکی ڕوون تەنها بەبوونی هۆکارە چاوەڕوانکراوەکان، لەوانە پشتیوانی بەهێزی خێزانی هەڵبژاردنی جۆری ژیان دوورکەوتنەوە لە جگەرە کێشان و خواردنەوەی کحول لێرە لایەنێکیتری هەیە کە ناکرێت دەرکی پێبکەین.

توێژەران هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لەسەر (٩٢٣٩٥) ئافرەت کە تەمەنیان لەنێوان (٥٠-٧٩) ساڵ دەبوو، دەرکیان بە تەمەنی نائومێدی کردبوو بەشدارییان کرد لە لێکۆڵینەوەکە، لێکۆڵینەوەکە بە ئامانجی چاودێری کردنی تەندروستی ئافرەتەکان لەسەر ئاستی دەروونیان بەڕێوەچوو، بەیارمەتی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ تەندووستی کە ئامانجی بوو کێشە دەروونییەکانی ئافرەت بناسێت بەدرێژایی ژیان، ئەم ئافرەتانە هەڵسان بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی کە لەبارەی ڕەفتاری ڕۆژانەیان و تەندروستی و ڕەوشتە ئاینییەکانە، چاودێری کران بۆماوەی حەوت ساڵ دەرکەوت ڕێژەی مردن دابەزیوە لەچاو ئەو ئافرەتانەی نوێژەکانیان تەنها یەك جار لە یەك هەفتەدا ئەنجام دەدەن بەبەراورد لەگەڵ کەسانیتر، ئەوەی جێگای سەرنجە لەم لێکۆڵینەوەیە کە ئایا ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە چۆن دەبێ ئەگەر لەسەر کەسانی بڕوادار جێبەجێ بکرێت، کە هەڵدەستن بە جێبەجێهێنانی پێنج نوێژەکە و شەو نوێژ؟ بێگومان ئەنجامەکانی سەرسوڕهێنەردەبێت.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن لێکۆڵینەوەکانی زانستی تازەی سەردەم وەك ڕۆژی ڕووناك سوود و قازانجە گەورەکانی نوێژکردنی ئاشکرا کرد.



## خشوع دڵ دەپارێزێت لە شڵەژان و ماندوبوون:

لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە یەکێ لەوانە گۆڤاری کۆمەڵەی دڵی ئەمریکی بڵاوی کردۆتەوە کەڕامان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و ڕێك و پێك دڵ دەپارێزێت لە شڵەژان و ماندوبوون، هەروەها ڕامان کاردەکاتە سەر چارەسەرکردنی فشاری خوێن، هەروەها سووك کردنی لێدانی دڵ هەر وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ﴾ (الحديد:١٦).

هەروەك لێکۆڵەرەکان دەریانخستووە کە دڵ کاری گرنگی هەیە تەنها پاڵنەرێك نییە بۆ پاڵنانی خوێن بۆ بەشەکانی دڵ، لێکۆڵینەوەکان جەخت لەسەر ڕامان خشوع دەکەنەوە بۆ جێگری کاری دڵ، دکتۆرەکان دەڵێن لەم سەردەمەدا نەخۆشییەکانی دڵ هۆکاری یەکەمینن بۆ مردن لە جیهاندا، هۆکاری ئەم نەخۆشیانەش بریتییە لە شڵەژان و ڕێکخەری دڵ لێرەدا گرنگی خشوع دەرك پێدەکەین لەجێگری و ڕێکخستنی کاری دڵ لێکۆڵینەوەکان چەسپاندوویانە کە ڕامان چارەسەری ڕاڕایی و دوودڵی و ڕووخان دەکات، کە بریتین لە نەخۆشییەکانی سەردەم کە بەشێوەیەکی فراوان بڵاوبوونەتەوە، نەك تەنها هەرئەوەندە بەڵکو بینیمان ڕامانی ڕێك متمانە دەبەخشێتە مرۆڤ، هەروەها ئارامی و بەرگەگرتن لەکێشە و غەمی ژیانی پێدەبەخشێت، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد: ٢٨) واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و دڵیان ئارام دەبێت بەیادی خوا ئاگاداربن کە هەر بە یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.

بەمجۆرە خوێنەری بەڕێزئەگەر دەتەوێت دوورکەویتەوە لە شڵەژانی دڵ ئەوا پێویستە خشوع ئەنجام بدەیت ئەگەر چەند ساتێکیش بێت لەڕۆژێکدا.



## ١٨٨ زانستی تازەی سەردەم سوودەکانی خشوع لەنوێژدا ئاشکرا دەکات:

قورئان جەخت لەسەر ڕۆڵی گرنگی خشوع دەکاتەوە لەپاراستنی نوێژدا، چونکە زۆربەی موسوڵمانان پابەندین بەنوێژ لەگەڵ ئەوەی هەوڵدەدەن، بەڵام سەرناکەون لەپاراستنی نوێژدا بەهۆی لەدەستدانی خشوع، خوای گەورە دەفەمووێ: ﴿وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ﴾ (البقرة: ٤٥) واتە:پەنا بەرنە بەر ئارامگرتنن و نوێژ بۆ گەیشتن بە مەبەست وە بێگومان نوێژ ئەرکێکی گەورە و گرانە مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لە خوا دەترسن خۆیان بە زل نازانن

بەمجۆرە ڕۆڵ و گرنگی خشوع لەنوێژدا دەردەکەوێت، هەروەك قورئان نوێژ و خشوع بەیەکەوە پەیوەند دەکات ئەوەی سەیرە لێرەدا قورئان ئارامگرتن و خشوعی بەیەکەوە پەیوەندکردووە زاناکان دەرکیان بەوەکردووە کە ڕامان توانای مرۆڤ لەسەر بەرگەگرتن و ئارامگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی باری دژوار زیاد دەکات، هەندێ لە زانا ئەمریکییەکان تاقیکردنەوەیان لەسەر ئەوکەسانە ئەنجامدا کەنوێژ دەکەن بێگومان بەرێگەی خۆیان بینییان نوێژ کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر شلەژانەکانی دڵ جێگیربوونی کاری دەماغ، بۆیە دەبینین قورئان هەردوو چارەسەری نوێژ و خشوعی پێکەوە کۆکردۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾ (المؤمنون: ٢) واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگاردەبن سەردەکەون ئەو کەسانەی لە نوێژەکانیاندا لەخوا دەترسن گەردن کەچن بۆ خوا.

بەڕاستی ڕۆژگار هەتا بەرەوپێش بڕوات زیاتر ڕاستی و دروستی ئایینی پاکی ئیسلام بۆ خەڵکی جیهان ئاشکرا دەبێت.

***





## بەڕۆژوبوون چارەسەرە بۆ نەخۆشی دەروونی:

خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة: ١٨٥)، واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزاننتان لەسەر پێویست کراوە، هەر وەك لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو بۆئەوەی خواناسی و پارێزگاری بکەن خوای گەورە هیچ شتێك لەسەر بەندەکانی پێویست ناکات گەر لە بەرژەوەندی بەندەدا نەبێ، ڕۆژووگرتن ڕێگەیەکی سروشتییە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان، توێژەرانی ئەمڕۆ جەختیان لەوە کردۆتەوە ئاستی توانا لای ڕۆژوەوان بەڕێژەیەکی بەرز بەرزبۆتەوە، کاتێك بەڕۆژوو دەبێت گۆڕانی زۆر لەناوەوەی جەستە ڕوو دەدات بێ ئەوەی هەستی پێبکرێت، ئەمانە ئەو بەربەستە زۆرانەن کەوا لە شەیتان دەکات کە توانای وەسوەسە و کاریگەری نەمێنێت لەسەرت کە لەڕۆژە ئاساییەکان، هەیانە ئەمە ئاستی توانات بەرزدەکاتەوە چونکە تۆ ڕزگارت بووە لەسەرچاوەی شڵەژان و لەناوچوونی وزەی کاریگەر کە هۆکارەکەی شەیتانە، ئەم ڕێژەیە لەتوانات زیاد دەبێت لەگەڵ زیادبوونی ڕێژەی بەکارهێنانی خواردن و خواردنەوە لەکاتی ڕۆژووگرتن، بێگومان ئەم توانایە بەفیڕۆ ناچێت مرۆڤ هەست بە حەسانەوە و هێزدەکات ئەم توانایە بەکاردێت بۆ لابردنی ژەهراوی بوونی لاشەو پاککردنەوەی پاشماوەی ژەهراوی بوون.

بێگومان لەش ئاستێکی دیاریکراوی لەتوانای هەیە بەبەردەوام کاتێك بەشێکی زۆری ئەم وزەیە پاشەکەوت دەبێت بەهۆی بەڕۆژووبوو و دوور کەوتنەوە لە خواردن خواردنەوە، بەشێکیتری بەهۆی پاکی و خشوع کە دەبێتە ئاکار لەتاك بەهۆی گەورەیی ئەم مانگە، هەروەها توانایەکی زۆر دەستەبەردەکەیت بەهۆی جێگیری دەروونی کە هۆکارەکەی کاریگەری دەروونی ڕۆژووگرتنە. کەواتە وزەی کاریگەر لای تۆ لەکاتی ڕۆژووگرتن لە لوتکەدایە دەتوانی بەئاسانی قورئان لەبەربکەی یان دەتوانی واز لە خوویەکی خراپ بهێنی، چونکە ئەم توانا و وزە دەستهاتووە هێزی بەڕێوەبردن

بەتۆ دەبەخشێت ڕۆژووگرتن توانایەکی زۆری هەیە لەچارەسەرکردنی فشاری دەروونی بەهێز وەك (شیزۆفینیا)، کاتێك ڕۆژوو دەگریت دەماغ و خانەکانی مۆخ بەرەو حەسانەوەیەکی باش دەچن. لە هەمانکاتدا دەبێتە هۆی پاککردنەوەی خانەکانی لاشە لە ژەهراوی بوون ئەوەش ڕەنگدانەوەی باشی دەبێت لەسەر جێگرەوەی دەروونی لای ڕۆژووەوان بەشێوەیەك کە زانا دەروونییەکان چارەسەری نەخۆشییە دەروونییەکان تەنها بە بەڕۆژووبوون دەکەن، لە ئەنجامدا دەگەنە ئەنجامێکی نایابی سەرکەوتوو، بۆیە بەڕۆژووبوون بەدەرمانێکی سەرکەوتوو دادەنرێت بۆ زۆر لە نەخۆشییە دەروونییە درێژخایەنەکان و نەخۆشی (شیزۆفینیا) و خەمۆکی و ڕاڕایی و ڕووخان.

بێگومان بەڕۆژوبوون هۆی باشکردنی توانای مرۆڤە بۆ بەرگەگرتن لەسەر هەوڵدان و ڕووبەڕووبوونەوەی قورسییەکانی ژیان، هەروەها بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی شکانە یەك لەدوای یەکەکان لەو سەردەمەدا کە پڕە لە شکان، خەڵك چەندە پێویستی بەو چارەسەرە هەیە بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ئەو مەترسیانە، هەروەها ڕۆژوو خەوتن باشدەکات و باری دەروونی ڕێکدەخات هەرکاتێك دەست بەڕۆژوگرتن دەکرێت ئەوا خوێن هەڵدەستێت بەفڕێدانی پاشماوە ژەهراوییەکان کە دەبنە هۆی پاکبوونەوە، کاتێك ئەم خوێنە پاکە دەچێت بۆ دەماغ هەڵدەستێت بە پاککردنەوەی دەماغ، بۆیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەماغ توانایەکی زۆری هەبێت بۆ بیرکردنەوەو بەرگەگرتن یان بەدەربڕینێکیتر دەبێتە هۆی ئارامی باری دەروونی، ئێستا پێویستە لەسەرمان یەقینمان دامەزراوبێت کە ئەم ئیسلامە هەرشتێکی هێنابێت ئەوا چاکە و سوودی زۆری هەیە بۆمان، هیچ شتێکیشمان لێ قەدەغە ناکات تەنها ئەگەر زەرەر و خراپەی هەبێت بۆمان، بۆیە پێویستە بزانیت و وردبیتەوە لە موعجیزەی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٨٤) واتە: ئەگەر بەڕۆژوو بن بۆ خۆتان باشترە ئەگەر بزانن.



بەڕاستی زۆر سەیرە کە بەدبەختانی دوور لەدین دوای دەرخستنی ئەم هەموو قازانجەی نوێژ و ڕۆژوو لەلایەن زانستی تازەی سەردەم، کەچی هەر لەگێژاوی گومان و دوودڵیدا دەخولێنەوە و خۆیان بێبەشدەکەن لەم هەموو سوود و قازانجە گەورانەی کە لەنوێژ و ڕۆژوودا دەستدەکەون.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز: نوێژ و ڕۆژوو لەگەڵ ئەوەدا کە فەرزە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان کەچی ئەو هەموو سوودە تەندروستیانەش بەمرۆڤ دەگەیەنێت، مرۆڤی بڕوادار بەهۆی ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژوو لەم دنیایەدا دەگاتە لوتکەی بەختەوەری و گەشبینی و تەندروستی، وە لەڕۆژی قیامەتیشدا ژیانی نەبڕاوە و هەتا هەتایی لە بەهەشتە ڕازاوەکەی خوای گەورە بۆخۆی مسۆگەر دەکات.




## هاوکێشەیەکی قورئانی بەوردی خێرایی ڕووناکی لێوە دەردەچێت و گەورەترین موعجیزەی زانستی ئاشکرا دەکات:

خوای گەورە هاوکێشەیەکی لەم ئایەتە قورئانییەوە باسکردووە کە دەفەرموێت: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ (السجدة: ٥)، عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێت: (هذا في الدنيا، ولسرعة سيده يقطع مسيرة ألف سنة في يوم من أيامكم) واتە: ڕێکخستنی کارەکان ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾، ئەوە لە دنیادایە بۆ خێرایی ڕۆیشتنەکەیەتی کە لەڕۆژێکی ئێوەدا هەزارساڵ دەبڕێت، بگەڕێرەوە بۆ تەفسیری تەبەری و قورتوبی و زەمەخشەری.

قەتادە دەڵێت: (مقدار مسيرة في ذلك اليوم ألف سنة) ئەندازەی ڕۆیشتنی لەو ڕۆژەدا هەزار ساڵە(تەفسیری تەبەری)، قورتوبی دەڵێت: (يعني في يوم كان مقداره في المسافة دوماً ألف سنة) واتە لەڕۆژێکدا ئەندازەکەی لەدووریدا هەزار ساڵە، ئەبو حەیان لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (السنة مبنية على سير القمر) واتە: ساڵ لەسەر ڕۆیشتنی مانگ بنیاتنراوە، عەرەب لەکۆندا لەسەرئەوەوە ڕاهاتبوون ماوەی دوو شوێنیان بەکات

لێکدەدایەوە، بۆ نموونە دەیانوت: ماوەی نێوان مەککە و مەدینە نیو مانگە ئاشکرایە لەگەڵ پێشکەوتنی زانستدا هەمان ماوە بووە نیو سەعات بەخێرایی فڕۆکە، واتە: کاتژمێرێك مانگێکە زانایان سەلماندیان جێگری گەردوون لەخێراییدا خێرایی ڕووناکییە کە ئەوپەڕی خێراییە، ئایەتە قورئانییەکە ئەوە دەگەیەنێت کەباس لە جێگیرترین خێرایی و ئەوپەڕی خێرایی بکات کە دەفەرموێت ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ مەقامی خێرایی پێوانەیە کاتێك کە بەڕۆژێك بەو خێرایە زۆرە بەپێوانەی هەزار ساڵ دەبڕێت کە زانایان بۆ دیاریکردنی خێرایی ڕووناکی چەندین هەوڵیاندا، تا لەکۆتاییدا لەساڵی ١٩٨٣ز دا لە کۆنگرەی پاریس خێرایی ڕووناکی جێگیرکرا کە بریتیبوو لە٢٩٩٧٩٢.٤٥٨ کم\چرکە، ئەگەر لە ئایەتە قورئانییەکەوە سەیر بکەین دەبینین هاوکێشەیەکمان پێدەدات کەخێرایی ڕووناکی تێدا دەدۆزرێتەوە، ئەو ژمارەیەی لە هاوکێشە قورئانییەکەوە دەردەچێت هەمان ژمارەی پەسەندکراو خێرایی ڕووناکییە لە کۆنگرەی پاریس ٢٩٩٧٩٢.٤٥٨ کم\چرکەیە هاوکێشە قورئانییەکە بەمجۆرەیە: ئەو دووریەی ئەمرە گەردوونییەکە دەیبڕێت لەڕۆژێکی زەویدا ئەندازەکەی یەکسانە بە هەزارساڵ بە حسابی ئەوکاتە (مما تعدون) کە حسابی مانگییە.

کەواتە: مانگ چەند دوور دەبڕێت لە هەزارساڵدا یەکسانە بەو دوورییەی ڕووناکی لە ٢٤ کاتژمێردا دەیبڕێت دووری مانگ لە هەزارساڵدا=١٢٠٠٠ جار خولانەوە بەدەوری زەویدا، چونکە لەساڵێکدا ١٢ جار بەدەوری زەویدا دەسووڕێتەوە ئەو دووریەش = ٢٥.٨٣١٣٤٧٢٣ بلیۆن کم لاکەی تری: ئەو دوورییەی کە خێرایی ڕووناکی لەڕۆژێکی زەویدا دەیبڕێت =٢٩٩٧٩٢٤٢٣ بلیۆن کم

لێکدانی ڕۆژێکی زەوی (٦١٦٤.٠٩٩٦٦) چرکەیە لە ئەنجامدا=٢٥.٨٣١٣٤٧٢٣ بلیۆن کم

لەمەوە دەرکەوت هاوکێشە قورئانییەکە چۆن خێرایی ڕووناکی لێوە دەردێت و هەمان نرخی پەسەندکراوی نێودەوڵەتییە کە بریتییە لەSB ٢٩٩٧٩٢ کم\چرکە لەناو خەڵکیدا بۆ ئاسانی دەوترێت ٣٠٠.٠٠٠ کم\چرکە ئەمەش یەکێکیترە لە ئیعجازە

پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆز و دەریدەخات کە قورئانی پیرۆز لەلایەن دروستکاری گەردوونەوە دابەزێنراوە.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە و سەرنج بدە لەو موعجیزە زانستییە ناودارە گەورەیە کە ژمارە قورئانییەکە و ژمارە زانستییەکە وەك یەکن و هەمان ڕەقەمن:

الرقم القرأني: ٢٩٩٧٩٢.٤٥٨ کم\چرکە

الرقم العلمي: ٢٩٩٧٩٢.٤٥٨کم\چرکە

(الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر) لەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایە کە بەبێ گومان و وەك ڕۆژی ڕووناك دەیسەلمێنێ کە خاوەنی ئەم قورئانە خوای گەورە و زانا و ئاگادارە بە هەموو کاروبارێك، بەڕاستی هەموو ئەو مولحید و بێدینانەی کە دوورن لەو ئایینە پاك و پیرۆزە کە ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە دەبینن دەبوو تێکڕا هەرهەموویان بەدڵ و بە گیان و ئەوپەڕی قەناعەت و متمانەوە هاتبانە ناو ئەم ئاینە پیرۆزە و شوێن قورئان بکەوتنایە، ئاخۆ دەبێت بەڵگە و نیشانە لەوە گەورەتر چی بێت؟ بەڕاستی تەنها ئەو بەڵگەیە بەسە کەدڵەکان بەتەواوی لەگێژاوی گومان و دوودڵی ڕزگاربکات و بیانگەیەنێتە دڵنیایی، بە تەواوی داوا لەخوای پەروەردگار دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیە بکاتە مایەی گەورەترین خۆشحاڵی و مژدە بۆ بڕواداران وە بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە.

***



## کەشتییە ئاسمانییەکەی ئەمەریکا ڕاستییەکی زانستی گەورەی قورئانی ئاشکراکرد:

لە ١٩٨٩\٩\٨ز دەزگای ئاسمانی ئەمەریکی کەشتییەکی ئاسمانی بەناوی: (دۆزینەوەی پێشینەی تیشکدەری گەردوون) هەڵدایە دەوری زەویدا بەرزبووەوە تا گەیشتە ٦٠٠ کم لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە، ئەمەش بۆ پێوانەی پلەی گەرمی پێشینەی تیشکدەری گەردوون و پێوانەی هەریەك لە چڕی ماددی و ڕووناکی شەپۆلە وردەکان، بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتی ئەم گەشتەش لە مانگە چواری ساڵی ١٩٩٢ ی زایینی بوو کە سەلماندی ماددەی دیاری تێدابوو، وێنەکە جەخت لەسەر فراوانبوونی گەردوون دەکاتەوە.

هەروەها وێنەی پاشماوە و شوێنەواری ئەو دوکەڵە گیرا کە بەرهەم هاتووە لە ئەنجامی کرداری تەقینەوە گەورەکە (کرداری لێك جیابوونەوە)، هەروەك چۆن پێشینەی تیشکدەری گەردوون خەملێنرا بە کەمتر لە سێ پلەی تەواو وێنەی پاشماوەی ئەو دووکەڵەی یەکەم گیرا، پاش دە ملیار ساڵی ڕووناکی بریتی بوو لەباری دووکەڵی تاریك گەردوون ڕەشبوو بەر لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی، قورئانی پیرۆز پێش هەموو زانیارییەکانی مرۆڤ کەوتووە بە ئاماژەکردن بۆ ئەو ڕاستییە ئەوەش بە زیاتر لە سیانزە سەدەو نیو لەو بارەوە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ (فصلت: ١١)

واتە ئینجا خوای گەورە ویستی ئاسمان ڕێك بخات و دروستی بکات لەکاتێکدا دووکەڵبوو جا بە ئاسمان و زەوی فەرموو فەرمان بەردار و ملکەچی بن بە خۆشی خۆتان یان بەزۆر بتانخەمە ژێر دەسەڵاتی خۆمەوە، هەردوولا خێرا وتیان ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرموویت وادەکەین بەو شێوەیە قورئانی پیرۆز پێشەنگی هەموو زانیارییە مرۆڤایەتییەکانە، بە ئاماژەکردن بۆ چۆنیەتی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەش بە زیاتر لە ١٣ سەدە و ئاماژەکردن بۆ ژمارەیەك کە ڕاستییەکانی ئم

زانسته لەدیارترینیان  تەقینەوە گەورەکەیە، یان کرداری لێکجیاکردنەوەی زەوی و ئاسمانەکان و گۆڕانی ئەو تەنە بچووکە یەکەمییە  بۆ دووکەڵ و بەدیهێنانی هەریەك لە ئاسمانەکان و زەوی لەو دووکەڵە و فراوانبوونی گەردوون، دوای ئەوە بەڕاستی ئەم قورئانە پیرۆزە پڕە لە موعجیزەی زانستی وا گەورە هەتا ڕۆژگاریش بەرەوپێش بڕوات زیاتر ڕاستی ئەم پەیامە خواییە بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرادەبێت. سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە و میهرەبان خاوەنی ئەم قورئانە پیرۆزە.




## جووڵەی پلێتەکانی بەرگی داپۆشەری بەردینی زەوی موعجیزەیەکی درەوشاوەی قورئانە:

سەرەڕای ئەوەی چەمکی خشانی خزینی کیشوەرەکان کە زانای ئەڵمانی (ئەلفێرد واگنەر) لەساڵی ١٩١٥ زایینیدا پێشنیاری کرد مایەوە، تا لەلایەن ڕووبەری زەوی ناسان ڕەتکرایەوە تاوەکو گەلاڵەکردنی (چەمکی جووڵەی پلێتەکانی بەرگی بەردینی زەوی تەواوبوو، لەساڵی ١٩٦٥ی زایینی لەسەر دەستی زانای کەنەدی (تورزو ولست)، دوای هەوڵدانێکی زۆر لەلایەن هەزاران زانا بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە ئەم چەمکە دەوەستێنێتە سەر بنچینەی لەتبوونی بەرگی بەردینی زەوی، لە تۆڕێکی گەورە لەدرزی پێکهاتوو لە زنجیرەیەك لە ڕۆچوونی زەوی کە دەوری زەوی داوە بە دەوردانێکی تەواو بۆ مەودایەك بە دەیان هەزار کیلۆمەتر دەخەملێنرێت و، بەقووڵی (٦٥–٧٠) کیلۆمەتر لەبنکی ڕووبار و زەریاکاندا و، لەنێوان (١٠٠–١٥٠) کیلۆمەتر لەبارستایی کیشوەرەکاندا ئەم تۆڕە درزەی ئەمەشی لێدرووست دەبێت لە ڕۆچوونی زەوی هەڵدەستێت بە دابەشکردنی بەرگی بەردینی زەوی بۆ ژمارەیەك پلێتی زەوی جیاواز، لەڕووبەر و شێوە وبارستایی، ئەم پلێتانە جیاکراونەتەوە لەیەکتری بەم تۆڕە درزانە کە دەمەوانەی ئاسایشی زەوی دەنوێنێت کە چەندایەتییەکی زۆر گەورە لەگەرمی بەرهەمهاتوو لەکرداری شیبوونەوەی توخمە تیشکدەرەکانی تێدا

دەردەپەڕێت، لەپاڵدانی بەردە تواوەکان لە پشتێنەی لاوازی زەوی بۆ پڕکردنەوەی ئەو ڕۆچوونەی زەوی دەبێتە جووڵەی هۆی ئەو پلێتە پێکهاتووەی بەرگی بەردینە زەوی و دەجووڵێت بە بەردەوامی یان لەیەك دووركەوێتەوە لەدیاردەیەك لە بنكی ڕووبارەكان و هەموو زەریاكان دەگرێت، لەبەرئەوە ناودەبرێت بەدیاردەی فراوانبوونی بنكی ڕووبار و زەریاكان ئەگەر لە وشكانی ڕووی بدایە یان بەر یەك كەوتن بووایە لەگەڵ یەكتر، بەشێوەیەك یەكێك لە پلێتە بەر بەریەككەوتووەكان دابەزێتە ژێر ئەوەی تر، بۆ ئەوەی شلبێتەوە شلبوونەوە و توانەوەیەكی بەشەكی یان بەگشتی و دەبێتە هۆی چالاكی گركانی چاوەڕوانكراو، هەروەك پلێتی بەردینی ژێركەوتوو لە پشتێنەی بێهێزی زەوی كاردەكاتە سەر خشانی بڕێك لە تواوەیەو بەمەش كاری لەیەكداچوونە ئاگرینەكان چالاكدەبێت.

یەكێك لە پلێتەكانی بەرگی بەردینی زەوی دەخزێت لەلای سنوورەكەی لەگەڵ ئەوانیتر و، لەگەڵ پلێتە دراوسێكانی بەهۆی ژمارەیەك لە درزەكان كە دەناسرێن بەناوی درزە ئاڕاستەییەكان یان درزی دەستورییەكان یان درزەكانی گۆڕان، ئەگەر خوای گەورە ئەم تۆڕە گەورەیەی لە درز بۆ زەوی درووستنەكرایە زەوی دەتەقییەوە لەسەر شێوەی بۆمبێكی ناوەكی گەورە لە سەرەتای درووستبوون و ڕەقبوونی توێكڵی زەوی.

هەموو زەوی ناسانی ئەمڕۆ و بڕیارلەسەر ئەوە دەدەن لە سیفەت بنچینەكانی گۆی زەوی ئەوەیە كە بەرگە بەردینییەكەی لەت لەتە، بەتۆڕێكی گەورە لەم درزەی دەوری گۆی زەوی داوە بەدەوردانێكی تەواو لە گەیاندنێكی تەواو هەر وەك بڵێی یەك درزی بەردەوامە، پێشتر قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەم ڕاستییە كردووە كە خوای گەورە و باڵادەست فەرموویەتی: ﴿وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ﴾ (الطارق: ١٢) واتە: سوێند بە زەوی كە درزی تێدەبێت بەڕاستی ئەو موعجیزەیەش بەڵگەیەكی ترە لە بەڵگە ڕوون و ئاشكراكانی خوای گەورە.



## خولگەی هەسارۆكەكان بە وردییەكی سەرنجڕاكێش بەرنامە ڕێژكراون:

لە بەرواری ٢٠١٣\٥\٣١ هەسارۆكەیەك بەنزیك زەویدا تێپەڕی، زانایان دەڵێن: هەموو ساتێك ئەم هەسارۆكەیە پارێزگاری دوورییەكانی كردووە تا نەبێتە مەترسی بۆ زەوی كە نزیكترین شوێنی (٨-٥) ملیۆن كیلۆمەتر بوو، پرۆفیسۆر (ئالان فیتەر سیمونز) لە زانكۆی (كوینز) دەڵێت زیاتر لە (٦٠٠) هەسارۆكەی قەبارەگەورە لە نزیك بەرگەهەوای زەوی هەریەكێكیان ئەگەر بە زەویدا بكێشێت كارەساتی ژینگەیی لەسەر ئاستی جیهان دەنێتەوە، هەروەها توانیان (٩٠٠٠) هەسارۆكەی قەبارە جیاواز لەنزیك زەوی بدۆزنەوە، بەڵام ئەوەی زانایانی سەرسامكردووە ئەوەیە كە خولگەی ئەم هەسارۆكانە بە وردییەكی سەرنجڕاكێش بەرنامە ڕێژكراون، بەجۆرێك كاتێك لەزەوی نزیك دەبنەوە لە دوورییەكی سەلامەتدان و ناكێشن بەزەویدا.

ئەمەش لە میهرەبانی خوای بەخشندەیە كە دەفەرمووێت: ﴿إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ (سبأ:٩) واتە: ئەگەر بمانەوێت بەناخی زەویدا ڕۆیان دەچێنێن یان پارچەی تەنی ئاسمانی بەسەریاندا دەخەینە خوارەوە بەڕاستی لەوەدا بەڵگە و پەند بۆ هەر بەندەیەكی ڕوولەخوا هەیە ئەم ئایەتە دووپاتی دەكاتەوە كە پەروەردگار خولگەی ئەو پارچە و هەسارۆكانەی دیاری كردووە بەجۆرێك بەزەویدا نەكێشن تەنیا بەویستی خۆی نەبێت.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە: چۆن لێكۆڵینەوە زانستییە تازەكان هاوڕان لەگەڵ ئایەتە پیرۆزەكەی قورئان، بەڕاستی جوانی فەرمووە خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانست و پیرۆزەكەیدا ﴿وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (النمل: ٩٣) واتە: بڵێ هەموو سوپاس بۆ خوایە ئەو خوایەی بەزوویی ئایەت و نیشانەكانی نیشانی ئێوەدەدات ئێوەش دەیانناسن كە ئایەتی خوان، وە پەروەردگارت بێ ئاگا نییە لەوەی ئێوە دەیكەن.



## دوو موعجیزەی زانستی دەربارەی شەوڕەوی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بەرەو قودس لەوێشەوە بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمان:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی شەوی ئیسرا و میعراجی بڵاوکردەوە کافران زۆر بەتوندی بەرەنگاری بوونەوە به گاڵتەجاڕییەوە دەیانگوت: خەڵکینە وەرن بزانن هاوەڵەکەتان چی بەسەرهاتووەو چی دەڵێت؟ دەڵێت: لە بەشێکی ئەمشەودا سەردانی (بیت المقدس)م کردووە و لەوێشەوە چووم بۆ ئاسمان و هەموو ئاسمانەکان گەڕاوم لەکاتێکدا ئێمە بە مانگێك دەچینە (بیت المقدس) و بە مانگێکیش دەگەڕێینەوە، لەم گاڵتەکردنەدا بوون، بەڵام هەندێکیان ژیرتربوون و وتیان: پێویستە ئەم هەلە لەدەستنەدەین، چونکە دینەکەی شوێنکەوتەی زۆربووە و تەشەنەی سەندووە پێویستە ئەم هەلە بقۆزینەوە و نەیەڵین لەوە زیاتر دینەکەی پەرە بسێنێت..

بۆیە یەکێکیان بۆ شکاندنی پێغەمبەر هاتە پێشەوە و وتی: ئەی موحەممەد ئێمە باوەڕت پێدەکەین کە ئەمشەو چوویت بۆ (بیت المقدس)، بەڵام پرسیارێکمان هەیە ئەگەر تۆ ئەمشەو بۆ (بیت المقدس) چوویت دەزانیت (بیت المقدس) چۆنە؟ بێگومان شێوە و دیوار و سەقف و شتەکانی ناویت بینیوە ئایا دەتوانیت ئەوەی بینیوتە بۆمان وەسف بکەیت؟ لێرەدا پێغەمبەر ﷺ کەوتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی قورس، چونکە ئەو لە (بیت المقدس) سەرقاڵی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ چوونە ئاسمانەکان و حزوری پەروەردگاری خۆی خەریك نەکردبوو بە سەیری دار و دیوارەکەیەوە، بۆیە وەڵامەکەی لاقورس بوو، بەڵام ئایا پەروەردگار وازیلێهێنا بێگومان نەخێر (بیت المقدس)ی هێنایە پێش چاوی ئەویش دەستیکرد بە وەسفکردنی بەرد بە بەردی وەسفەکان هێندە وردبوون کافران خۆشیان کە چەندینجار چووبوون نەیاندەتوانی بەو جۆرە وەسفی بکەن.

بۆیە ئەوکەسەی هەوڵیدا ئەم هەلە بقۆزێتەوە و بڕوا بە پێغەمبەر نەکات بەسەر خۆیدا شکایەوە و ئەوەندەیتر خەڵك دڵنیابوون کە هەواڵەکە ڕاستەو، لەوێدا یەکێکیتر

هەوڵیدا بەپرسیارێکیتر ئاڵای کافرەکان هەڵبگرێتەوەو بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕووی پرسیارێکی تر بکاتەوە کە نەتوانێت وەڵامی بداتەوە، بەڵام ئەو کافرە بەسەهوو چووبوونەی دەزانی، خوای گەورە پشتی پێغەمبەرەکەی بەرنەدا هەستا و وتی: ئەی موحەممەد ئێمە قافڵەیەکمان چووە بۆ فەلەستین ئەگەر تۆ چووبیتە ئەوێ بێگومان ئەوانت لەڕێگا بینیوە، ئایا دەتوانیت هەواڵی ئەوانمان پێبدەیت و بۆمان وەسف بکەیت ئەو قافڵەیە چۆنە و کەی دەگەڕێتەوە؟ لە وەڵامی ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕوونی شوێنی قافڵەکەی پێوتن کە ئێستاکە گەیشتۆتە کوێ و بە وردی وەسفی قافڵەکەشی بۆکردن، هەواڵیشی پێدان فلانە ڕۆژ دەگەنەوە ئێرە دوای ئەوە خەڵکی چاوەڕێی بەڵێنەکەی پێغەمبەر ﷺ بوون هەتا ئەو ڕۆژە قافڵەکە دەرکەوت، بەو شێوەیەی وەسفی کردبوو هاتنەوە شاری مەککە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر ئیمان بێنن و باوەڕدارانیش هێندەی تر ئیمانیان پتەوتربوو. خوێنەری بەڕێز جا بابزانین زانستی تازەی سەردەم لەوبارەیەوە چیدەڵێت؟

دوو ڕاستی زانستی گەورە ئاشکرا بووە:

یەکەم: هەندێك لە زانایان دەڵێن خوای گەورە دەیتوانی هەر لە مەککەوە میعراج بە پێغەمبەر ﷺ بکات بۆ ئاسمانەکان، بەڵام ئیسراکردنی بۆ (بیت المقدس) بۆ ئەوەبوو کە خەڵکی بەهۆی بەشەزەوییەکەی کە ئیسرایە بڕوا بە بەشی ئاسمانییەکەشی بهێنێت کە میعراجە.

دووەم: بەرەو بۆشایی بەرزبوونەوە توندی تیشکی سەروو وەنەوشەیی مەترسییەکەی زیاد دەکات، پشتێنەی (ڤان ئەلن) هەردوو زانا (ڤیرنوفی ڕوسی و ڤان ئەلنی ئەمریکی دۆزیانەوە ڕوونیانکردەوە کە زەوی لە ناوچەی هێڵی یەکسانیدا بەسێ چین دەورە دراوە، تەنۆلکە بارگاوییەکان لە تیشکە گەردوونییەکاندا بە هۆی بواری موگناتیسی زەوی کە بوارێکە نارێك و پێکەوە لە جەمسەرەکاندا چڕترە کۆنترۆڵ دەکرێت، کاتێك تەنۆلکەکان دەگەنە ئەم پشتێنەیە ناچاری دووجۆر جووڵە دەبن:

١.  بەدەوری خۆیاندا خول دەخۆن.

٢.  بەدرێژایی ئەو هێڵانە خول دەخۆن.

بەڵام زاناکان ئەوەیان دۆزییەوە چەند ناوچەیەك هەن بەتاڵن لە تەنۆلکە کوشندەکان کە وزەیەکی زۆر بەرزیان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ﴾ (المؤمنون: ١٧) واتە: بەڕاستی ئێمە لە لاسەرتانەوە حەوت چینی ئاسمانمان درووستکردووەو ئێمە هەرگیز لە دروستکراوان غافڵ و بێئاگانین.

ئەم ناوچەیە کە تێپەڕین پیایدا ڕێپێدراوە و دەلاقەی ئاسمانییە لەسەر شاری قودسەوەیە، چوونە ژوورەوە لێیەوە بەرەو بۆشایی دەرەوە گونجاو و ئاساییە بەبێ تووشبوون بە هەر گرفتێك، ئەم کارەش لەڕێی مانگی دەستکردەکانەوە دەبێت کە ئاسمان دەپشکنن و پاشان لە ناوچەیەکی سەنتەرییەوە کە دەکەوێتە سەرو قودسەوە بەرزدەبنەوە، چونکە ئاسانترینی ناوچەکانە بۆ دەرچوون بەرەو بۆشایی ئاسمان بەرەنجامە زانستییە نوێیەکان دووپاتیانکردۆتەوە مانگە دەستکردەکان بەسەر قودسدا دەسووڕێنەوە و پاشان لێیەوە دەردەچن، ئەمەش دڵنیایی ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەرﷺ دەدات لە ڕووداوی شەوڕەوی و بڵندبوونەوەدا کە لە مەککەوە بۆ قودس ڕۆیشت، پاشان لە مزگەوتی ئەقساوە کە لەقودسدایە بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە(الله أكبر) لەو موعجیزە زانستییە گەورەیە.

خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر:٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشاندەدات، جا ئێوە بەکام نیشانەکانی خودا دانپیانانێن.

***



## دەرکەوتنی نهێنییەکی زانستی لەبارەی بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمان:

لەپێنج شوێندا باسی (العروج) کراوە، واتە: سەرکەوتن بەئاسماندا بە چەماوەیی و بەلایی نەك بەهێڵی ڕاست، کە ئەمەش لە سەدەی بیستەمدا زانرا کاتێ مرۆڤ بیری کردەوە لە چوونە دەرەوە لە زەوی و چوونە سەر ئەستێرەکان ئەمەش ئایەتەکانی ترە لەو بارەیەوە.

١. ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ (المعارج: ٤) واتە: فریشتەکان و جوبرەئیل بەرزدەبنەوە بۆلای پەروەردگار لەڕۆژێکدا کە ماوەی پەنجا هەزار ساڵە بەحسابی ئادەمیزاد، یاخود ڕەنگە مەبەست لە درێژی ڕۆژی قیامەت بێت کە پەنجا هەزار ساڵ دەخایەنێت بەنیسبەت خوا نەناسانەوە.

٢. ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الحديد: ٤) واتە: خوا دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویدا و چیشی لێدێنێتە دەرەوە چی لە ئاسمان دێتە خوارەوە و چی پیادا سەردەکەوێت، جا لە هەر شوێنێکدا بن ئەو زاتە لەگەڵتاندایە وپێتان دەزانێت و دڵنیابن کەخوا بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن بینایە.

٣. ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ﴾ (السبأ:٢) واتە: خوا دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویدا و چیشی لێدێتە دەرەوە و چی لە ئاسمان دێتە خوارەوە و چیش پیایدا بەرزدەبێتەوە بەڕاستی ئەو خوایە میهرەبان و لێخۆشبووە.

٤. ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ۝ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ (الحجر: ١٤–١٥) واتە: ئەو بێباوەڕانە ئەگەر دەروازەیەکمان لەئاسماندا بۆ بکرایەتەوە تا پیایدا سەرکەون ئەوە دەیانوت: بێگومان ئێمە چاوبەستمان لێکراوە و چاومان داخراوە یاخود ئێمە کەسانێکی جادو لێکراوین.

٥. ﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ (السجدة: ٥) واتە: ئەو خوایە لە ژوور ئاسمانەوە کاروبار ڕێکدەخات و سەرپەرشتی دەکات لەوەودوا ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان و کاروبار کردنەوەی بەندەکان دەگەڕێتەوە بۆلای، لەڕۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بەو حیسابەی کە ئێوە دەیکەن لەسەر هەر پێنج جێگاکادا قورئانی پیرۆز وشەی (یعرج) بەکاردەهێنێت بۆ چوون بۆ ئاسمان، کە ئەمەش بۆخۆی حیکمەتی خوای گەورە دەردەخات کە ئەو وشەیەی بەکارهێناوە و تازە زانستی سەردەم تێیدەگات، ئایا کردنەوەی دەرگا هەروا لە بۆشایدا دەبێت؟ دیارە نابێت کەواتە کە جاران وادەزانرا ئاسمان بۆشاییە و هیچی تێدانییە وانیە، بەڵکو ئاسمان بینراوە و ماددەی تێدایە و ئەو دەرگایە لەو ئاسمانە بیناکراوەدا دەکرێتەوە کەڕێی ڕۆیشتن و دەرچوونی مرۆڤە بۆ ئاسمان.

خوێنەری بەڕێز: جا با بڕوانین و بزانین زانستی تازەی سەردەم چی دەڵێت لەو بارەیەوە دەڵێت: خاڵی سەرەتا کەبڕی تەنۆلکە کوشندەکان دەست بەکەمبوون دەکەن دیسانەوە دەکەوێتە سەرو شاری قودسەوە و بەهێڵێکی لار ڕووەو سەرەوەی ناوچەی جەمسەری باکور درێژدەبێتەوە، هیچ کەشتییەکی ئاسمانی ناتوانێت بەهێڵێکی ڕاست بەرزبێتەوە، بەڵکو دەبێت لەکاتی بەرزبوونەوەیدا بەدەوری خۆیدا بسوڕێتەوە ئەمەش ئەو ئاراستەیەیە کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێدەدات و دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ﴾ (الحجر: ١٤) واتە: ئەو بێباوەڕانە ئەگەر دەروازەیەکمان لەئاسمانەوە بۆ بکردنایەتەوە تا پیایدا سەربکەون و تێیپەڕن (عروج) بکەن و نهێنی دروستکراوەکانی ئێمە ببینن هەر باوەڕ ناهێنن، بەڕاستی بەتەنها ئەو بەڵگەیە بەسە کە دڵەکان بەتەواوی لەگێژاوی گومان و دوودڵی ڕزگار بکات و بیانگەیەنێتە دڵنیایی بەتەواوی، هەق وایە ئەو کەسانەی تا ئەوپەڕی پلە بێباوەڕن و دوورن لەبەرنامەی ئیسلام کە ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە دەبینن دەبوو بەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی لەناو دڵەکانیاندا نەمابایە و بەهەموو

قەناعەتێکەوە هاتبانە ناو بازنەی، ئەم ئایینە پێشکەوتوو پڕ لەزانستییە، چەند جوانی فەرمووە خوای گەورە: ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت: ٥٣) واتە: لەمەودوا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشاندەدەین لەئاسۆی دنیاوە لەخودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوونبێتەوە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بەڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

##  هەنگ بۆ یەکەمین جار لە چیاکاندا ماڵ و خانەی دروستکرد:

هەنگ دەفڕێت و کاردەکات گوڵاو دەمژێت خانەکەی دروست دەکات، هەموو ئەوە بەویست و وەحی خوای گەورەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾ (النحل: ٨) واتە: پەروەردگاری تۆ ئەی مرۆڤ نیگا و ئیلهامی بۆ هەنگ کردووە کە جێگا لە کون و کەلێنی چیاکاندا بۆخۆی ساز بکات، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەش کە مرۆڤ بۆی ئامادە دەکات، پاشان لێکۆڵینەوە زانستییە نوێیەکان گەیشتنە ئەوەی کە خوای مەزن وەها لە هەنگ دەکات بۆ مژینی گوڵاوی گوڵەکان، بفڕێت هەزاران مەتر لە خانەکەی دوور دەکەوێتەوە دووبارە بۆی دەگەڕێتەوە، بەبێ ئەوەی هەڵەبکات و بچێت بۆ خانەیەکیترەوە و وێڕای ئەوەی خانەکانی نێو پوورەی هەنگ لە تەنیشت یەکترەوەن، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە خوای گەورە جۆرە هەستێکی کارەبایی موگناتیسی لە جەستەیدا خولقاندووە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل: ٦٩) واتە: پاشان فێرمان کردووە کە لە هەموو بەروبووم و شیلەی گوڵان و شتی بەسوود بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە ئەو نەخشانەی کە پەروەردگارت بۆی کێشاویت بە ملکەچییەوە ئەنجامی بدە.

جا لەناوسکی ئەو هەنگانەوە شلەیەکی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە کە شیفای تێدایە بۆ زۆر نەخۆشی خەڵکی، سەرەڕای تامی شیرین و خۆشی بەڕاستی ئالەمەشدا بەڵگە و نیشانەی بەهێز هەیە بۆ کەسانێك بیربکەنەوە.

لەدوای ئەوەی هەنگ گوڵاوی گوڵەکان لە نێو لەشە بچووکەکەیدا کۆدەکاتەوە وە ئیدی لەشە بچووکەکەی دەبێتە کارگەیەك ئەو گوڵاوە بۆ شلەیەکی ئەوتۆ دەگۆڕێت کە شیفای بۆ مرۆڤ تێدایە، ئەو وەسفەی قورئانی پیرۆز کە  هەنگوین شیفای بۆ مرۆڤ تێدایە ڕاستییەکی زانستییە و شیکارییە زانستییەکان بۆ ئەم ماددەیە ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی هەنگوین شیفای بۆ مرۆڤ تێدایە، هەندێك لەوانەی تەمەنی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی مێرووەکان تەرخان کردووە گەیشتوونەتە ڕاستی سەیر و نامۆ، کە دروستی زانیارییەکانی نێو ئایەتە کە دەیسەلمێنن چەندین پۆلی هەنگ هەن لەشاخەکان نیشتەجێن لە ئەشکەوتی چیاکاندا پەناگەی خۆیان بونیات دەنێن، چەندین جۆریتر لەنێو کلۆری درەختەکاندا پەناگە دروست دەکەن لەنێو ئەو کونانەی لە قەدی درەختەکاندا هەن، کاتێکیش مرۆڤ ویستی سود لە هەنگوین وەربگرێت ماڵی کرد و خانەی تایبەتی لەقوڕ یان تەختە بۆ دروستکرد تاکو لە کۆتاییدا بمێنێتەوە و بژی.

بەمجۆرە ئایەتەکە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەچۆن ئەم مێروانە بە ئیلهامێکی خوایی پەناگەی بۆخۆی بونیاتناوە و دەنێن، هەر لەدێر زەمانەوە تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ زانستی نوێ سەلماندوێتی هەنگ بۆ یەکەمین جار لە چیاکاندا ماڵ و خانەی دروست کردووە، پاشان لە درەختەکاندا و لەدواییشدا لەو خانە و شوێنانەدا کەمرۆڤ بۆی دەسازێنێت و دروستی دەکات.

***



## هاوڕابوونی زانستی تازەی سەردەم لەگەڵ ڕاستییەکانی قورئان لەبارەی جەستەی ئەسپ:

لەم دواییانەدا زانستی نوێ دوپاتیکردەوە لەپێناو هەڵبژاردنی چاکێتی و ڕەسەنیەتی ئەسپ پێویستە پشکنینی ڕواڵەتی بۆبکرێت، کۆڵەکەی ئەو پشکنینەش ئەوەیە ئەسپەکە ناچاربکرێت تا ماوەیەك غاربدات و لەکاتی ڕاکردن و غارغارێندا چاودێری بکرێ، ئەمکارەش بۆ زانینی سەلامەتی ئەندامەکانی جەستەی ئەسپەکە بەسوودە و وێڕای پێ وقاچەکانی و هەماهەنگیان لەگەڵ بەشەکانی تری لەشیدا، لەپاش غارغارێن و ڕاکردنە کە لێدانی دڵی ئەسپەکە دەگرێت لەگەڵ پشکنینی لاقەکانی، ئەوەش بەمەبەستی زانینی ڕادەی توانایی بۆ ڕێڕۆیشتن و ڕاکردن و غاردان هەر ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لە چیرۆکی سولەیمان پێغەمبەردا (سەلامی خوای لەسەربێت) ئاماژەی پێداوە.

سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) پشکنینی بۆ ئەو ئەسپانە کرد کە بۆ یەکەمین جار پێشانی دران، ئەو فەرمانی کرد ناچاری ڕاکردن و ڕێڕۆیشتن بکرێن تا دوورترین دووری لەدوای لە چاوونبوونیان داوایکرد یەکسەر بۆ هەمان جێگا بگێڕدرێنەوە، دوای ئەوەی ئەسپەکان گەیشتنەوە جێ پشکنینی خوێنبەرەکانیان کرد بۆ زانینی لێدانی دڵیان پاشان ڕوانییە لاقەکان و پێیەکانی، تاکو لەدوای ئەو جوڵە زۆرەیانەوە حاڵ و کاریگەربوونیان بزانێت، ئەو زانیاریانە لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ڕوون و ئاشکران، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ﴾ (ص: ١٣-٣٣)

واتە: کاتێك دەمەو ئێوارە ئەو ئەسپە چاکانەی بۆ غەزا ئامادەکرابوون هێنانیان و لەپێش چاویدا نمایشکران، ئینجا وتی: من هەمیشە حەز لەم جۆرە کارانە دەکەم و گرنگیدان بەم ئەسپانە بەخێر دەزانم لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ببنە هۆی ئەوەی لەیادی پەروەردگارم بێئاگام بکات و یادی فەرامۆش بکەم ئەسپەکان غاریان کرد تا لەچاو

ونبوون لەوەودوا سولەیمان فەرمانیدا بیانگێڕنەوە و کەگەڕانەوە بۆلای دەستی بەڕان و ملیاندا دەهێنا بەمجۆرە دەبینین وەسفی ورد و زانستی و پشکنینی پزیشکی ڤێتێرنەری سەلمێنەری ئەو زانیاریانە دەبن کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیان پێدراوە، بەڕاستی ئەم بەڵگەیە بەسە بۆ ئەو کەسانەی کە لەگومان و دوودڵیدان بۆ ئەوەی بە تەواوی دڵنیابن و ڕێگای ڕاست بگرنەبەر.

## ١٩٨ مانگا زەردەکەی بەنی ئیسرائیل و دەرکەوتنی ڕاستییەکی زانستی نوێ:

لە سورەتی (البقرة)دا چیرۆکی ئەو مانگایە دەخوێنینەوە کەخوای مەزن فەرمانی بە نەتەوەی موسا (سەلامی خوای لەسەربێت) دەدا سەری ببڕن. لە چیرۆکەکەدا و لەمیانەی گفتوگۆی نێوان موسا و نەتەوەکەیدا باس لە ڕەنگەکەشی دەکرێت، خوای مەزن لەسەر زمانی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت) دەفەرمووێت: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ (البقرة: ٦٩) واتە: وتیان: داوا بکە لە پەروەردگارت بزانین ڕەنگی چۆنە؟

موسا وتی: بێگومان خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە مانگایەکی ڕەنگ زەردی تۆخە تەماشاکەرانی دڵخۆش دەکات، هەر لەسەر زمانی (موسا)وە بە نەتەوەکەی دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ (البقرة: ٧١) واتە: موسا وتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەوە مانگایەکە هێشتا ڕانەهێنراوە زەوی بکێڵێت و جوت بکات ئاودێری کشتوکاڵیش ناکات هیچ نەنگی نییە و یەك ڕەنگە و هیچ پەڵەیەکی تێدانییە، ئەوسا وتیان: ئائێستا ئیتر هەواڵی ڕاستەقینەت پێداین، ئیتر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەدەستیان هێنا و سەریان بڕی هەرچەندە خەریکبوو ئەوکارەش نەکەن.



یەکێك لە ڕایە پەسەندەکان لە پزیشکی ڤێتێرنەریدا ئەوەیە باشترین و چاکترین مانگا ئەوەیە کە ڕەنگەکەی زۆر زەرد و بێگەردبێت و سەلامەتی ددانەکانیشی تەندروستی مانگاکەن، هەروەها لەنیشانەکانی جۆر چاکی و باشییەکەی تۆز هەستاندنیەتی لەجێی پێیەکانیەوە لەکاتی ڕێکردنیدا، ئەوەش بەکاریگەری هێز و توندییەوە کار و ماندوویەتیشی نەبینیبێت لەکێڵانی زەوی و کارە کشتوکاڵیەکاندا، زانستی نوێ ئاشکرایکرد: ڕەنگی زەرد لەئایەتەکەدا دەلالەتی تایبەتی هەیە ڕوونبووەتەوە کەبۆ بینینی ڕەنگی زەرد پێویست بەهێزی هاوێنە ناکات، واتە: بەبێ ماندوو بوونی چاو هەرخۆی ڕاستەوخۆ لەسەر تۆڕەی چاو کۆدەبێتەوە لەکاتێکدا کە مەسەلەکە جیاوازدەبێت، بۆ نموونە ڕەنگی سوور هاوێنەی چاو پێویستی بەهێز و توانایی هەیە بە بینینی ڕەنگی سوور ئەمە وەهامان لێدەکات لەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز تێبگەین، کە ئاماژە بە ڕەنگی زەرد دەدات لە دیاریکراوی ڕەنگی زەرد ﴿صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ﴾.

بەڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق: ٣٧) واتە: بێگومان لەو باسەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێك خاوەن دڵێکی زیندووبێت یان ژیربێ یان گوێ بگرێ بۆ قورئان و بیریشی لەلابێ.

***




## زانستی تازە موعجیزەیەکی گەورەی قورئانی ئاشکراکرد لەبارەی مێش:

توێژەرە تایبەتمەندەکانی زانستی مێرووەکان دۆزیویانەتەوە کەمێش خاوەنی لیکەڕژێنە درێژەکانە، پڕن لەلیك بەبەردەوامی مێش ئەو لیکە دروست دەکات، ئەم مێشە لەگەڵ خواردنێکی هەڵگرت دەستبەجێ لیکێکی زۆری لێ دەرژێنێت بەسەردا و دەیگۆڕێت بۆ ماددەیەکی تر خۆ ئەگەر مێش کەمێك لەو خۆراکانەی کە دەیانخۆین ببا و بمانەوێت لێی بستێنینەوە، بەهیچ شێوەیەك ناتوانین ئەوکارە بکەین، بۆچی ئەوەی مێش بیبات ناتوانین لێی بستێنینەوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: چونکە لەگەڵ وەرگرتن و بردنی ئەو خۆراکەدا دەست بەجێ لیکی بەسەردا دەرژێنێت و دەیگۆڕێت بۆ ماددەیەکیتر ئەگەر بێت و مێشەکە بکوژرێت و بگەڕێن بۆ ئەو ماددەیەی بردوویەتی نایدۆزنەوە، چونکە ئەوەی بردوویەتی گۆڕیویەتی بۆ ماددەیەکی تر، جا ئایا قورئان باسی ئەو ڕاستییەی کردووە؟

بەڵێ قورئان باسیکردووەو نموونەی لەسەر کەمتوانای و بێ دەسەڵاتی مرۆڤ پێهێناوەتەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ (الحج: ٧٣) واتە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد نمونەیەکی نایاب هێنراوەتەوە و باسکراوە، ئینجا ئێوەش گوێ بگرن ئەم نموونەیە یاسایەك دادەنێت و شتێکی ڕاست و ڕێك دەردەخات، خوای کاربەجێ هەواڵی پووچەڵی ئەقڵی ئەو کەسانە ڕادەگەیەنێت کە جگە لە خوا پەرستراویتر بۆخۆیان دادەنێن هانایان بۆدەبەن و پشتیان پێدەبەستن، واتە: هەرچی پەرستراو هەیە جگە لە خوای گەورە هەر هەموویان کۆببنەوە ناتوانن تاقە مێشێك درووست بکەن، جا بەهەرهەموویان ئەو کارەیان بۆنەکرێت دەبێت تاك تاك چییان لەدەستبێت؟ ئەگەر مێش شتێکیان لێ

بفرێنێت ناتوانن لێی بسەننەوە داواکەر کە ئەوانەن غەیری خوا دەپەرستن و داوالێکراو کە هەر پەرستراوێکە جگە لەخوا کە هەردووکیان لاواز و بێدەسەڵاتن.

خوێنەری بەڕێز: ئەم نهێنییە لە دروستکردنی مێش دا تازە نەبێت نەزانراوە مرۆڤەکان پێش پەیدابوونی ئامێرە پێشکەوتووەکانی توێژینەوە زانستییەکان نەیاندەزانی گەر خوای تاك و تەنیا ئەوە فێری پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکات لەکوێ دەیزانێت.



## زانستی نوێ نهێنییەکی گەورەی ئاشکراکرد دەربارەی زمان دەرهێنانی سەگ:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ ۚ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۚ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الاعراف: ١٧٦) واتە: خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپاند بە زەوییەوە و دەستیکرد بە دنیا پەرستی و شوێن ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەریبکەیت و پیایدا هەڵبشاخیت هەناسەبڕکێیەتی زمان دەردەکێشێت یاخود ئەگەری وازی لێبهێنێت ئەوا هەر هەناسەبڕکێیەتی و ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە بڕوایان پێی نەبووە.

کەوابوو ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی دابچڵەکێن و بیربکەنەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا زانیاریەك دەربارەی سەگ هاتووە کە دوای چواردە سەدە لە دابەزینی ئایەتەکە ئینجا دەرەنجامە زانستییەکان دەریانخست و ئاشکرایان کرد زانستی نوێ لەم دوا دواییانەدا ئاشکرایان کرد کە سەگ ئارەقە ڕژێنی نییە جگە لە کەمێك نەبێت لە بنی پێیدا ئەمەش بەس نییە بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمی لەشی دیارە

کە کاری ئارەقە ڕژێنەکان بەدەردانی ئارەق پلەی گەرمی ڕووی دەرەوەی زیندەوەرەکە لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری دەسازێت لەبەرئەوەیە سەگ بەهۆی ئەوەی وەك ئاژەلانیتر ئارەقەڕژێنی تەواوی نییە لەڕێی دەرکێشانی زمانییەوە بە هەناسە برکێ پلەی گەرمی لەشی دادەبەزێنێت بەهۆی هەناسەبرکێکەیەوە زۆرترین ڕووبەری بۆشایی دەم و زمانی بەرکەوتەی هەوا دەبن شایەنی باسە سەگ ئەو کارە دەکات لە پشوودابێت یان لەکاتی ماندووبوونداا بەڕاستی ئەم قورئانە موعجیزەی زانستی گەورەی تێدایە هەتا ڕۆژگار بەرەوپێش بڕوات زیاتر ڕاستییەکانی ئەم پەیامە پیرۆزە بۆ هەموو خەڵکی ئاشکرا دەبێت.



## نهێنییەکانی قورئان ئاشکرا دەبن دەربارەی باس کردنی پوش وپەلاشی وشك :

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ۝٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ۝٥ ﴾ الأعلى: ٤-٥. واتە: هەر ئەو زاتەیە کە گژوگیا دەردێنێت و دەیکاتە لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ بەلام دوای ماوەیەك دەیکاتە پوش و پەلاشێکی زەرد و ڕەش هەڵگەڕاو﴿ غُثَآءً ﴾ وشکییە و (احوى) لە (الحوە) هاتووە کەلە (لسان العرب) دا بەمانای ڕەشی سەوز باو یان سوورێکی مەیلەو ڕەش هاتووە بۆیە ڕاڤەی ﴿ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً ﴾ واتە: ئایا ڕووەکێك هەیە کاتێك وشك ئەوەی دوای سەوزیەتی کردوویەتی بەوشکێکی ڕەش لێرەدا پرسیار ئەمەیە ببێت ڕەنگی ڕەش ببێت؟ بەدڵنیاییەوە ئەو ڕووەکانەی تائێستا ئێمە ناسیومانن بەو جۆرە نین.

خوێنەری بەڕێز بابزانین زانستی تازە لە بارەیەوە چی دەڵێت{جرترودهارتمان } دەڵێت:ج

ڕووەکەکان لە پێشترینی دیمەنەکانی ژیانن کەلەسەر ڕووی زەوی دەرکەوتوون، شانشینی ڕووەکی بەر لە شانشینی ئاژەڵی لەسەر ڕووی زەوی دەرکەوتوون، چوونکە

ئاژەڵ ناتوانێت بەبێ خواردنی ڕووەکەکان بژی لە ڕاستیدا ڕووەکە سەرەتاییەکان بەدەستی مرۆڤ نەڕوێنراون، چونکە لە پێش ڕووەکەوە مرۆڤ بەدی نەهێنراون بەڵکو ڕووەکەکان خۆیان هاتوون بێ ئەوەی مرۆڤ ڕواندبنی، دیمەنی ژیانی ڕووەکی کەلەسەر زەوی بەدیهێنراون جۆراو جۆر و جیاوازن بەشێوەی ناوچەی سەوز لەڕووەکە گوڵدارە چڕەکان، بەوەش گۆی زەوی بەپۆشاکێکی سەوزی زۆر جوان و بەرز لەڕازاوەییدا داپۆشراوە کەملیۆنان ساڵ بەڵکو هەزاران ملیۆن ساڵ بەسەریدا تێپەڕیووە و گۆی زەویش بەژمارەیەکی زۆری گۆڕانکاری گەردوونی و ژینگەیی توندا تێپەڕیوە، زەوی توشی مەوسیمی بارانی بەلێشاو بووە، پاشان بەدوایدا چەند ماوەیەکی وشکی درێژ چەندین جار تووشی (با) و گەردەلوولی ترسناك بووە.

کەدارەکانی پەرش و بلاو کردووەتەوە و ڕەگی ڕووەکەکانی لەبنەوە دەرهێناوە، بەوەی جار لەدوای جار لەئاوی لافاوی گەورەدا نوقووم بوون، بۆیە شیبوونەوەیان بۆ ماددە ئەندامیە سەرەتاییەکان هۆکارێك بووە بۆ سازاندنی کەشی دووبارە ڕوانی ڕووەکی تری نوێ، کە دووبارە ئەم ڕووەکە نوێیانەش ڕووبەڕووی گەردەلوول و ڕەشەباو لادانە ژینگەییە ئیکۆلۆژییەکان بوونەتەوە، ئەم خولانەش لەماوەی ملیۆنان ساڵدا چەندین جار دووبارە بوونەتەوە پاشماوەی ڕووەك و دارە ڕۆچووەکانی ناخی زەوی بەتێپەڕبوون و درێژی کات دەگۆڕێن بۆ خەڵوز کەڕەنگی ڕەشە.

(سبحان الله)لەگەورەیی ئەو خوایە چۆن قورئانە پیرۆزەکەی فەرمووی: ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ الاعلى: ٤_٥. واتە: هەر ئەو زاتەیە کە گژوگیا دەردێنێت و دەیکاتە لەوەڕگا بۆ ئاژەڵ، بەڵام دوای ماوەیەك دەیکاتە پوش و پەڵاشێکی زەردو وشك و ڕەشهەڵگەڕاو، زانستی تازەی سەردەمیش وەك ڕۆژی ڕووناك ئەو ڕاستیە گەورەیەی سەلماند.





## ٢٠٢ سەرەتا لەسەر زەوی ئاو هەبووە پاشان ڕووەك:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ ﴾ عبس: ٢٥-٢٧.

واتە: بێگومان ئێمە ئاومان باراندووەتە خوارەوە چۆن داباریندێك لەوەو دوا زەویمان بۆ لەت لەت کرد بە چەکەرەی ناسکی ڕووەك، ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند، ئەم ئایەتانە ئاماژە بەوە دەدەن کەلەسەرەتای بەدیهێنانەوە لەسەر زەوی ئاو دەرکەوتووە لەدوای ئەوە ڕووەك و پاشان مرۆڤ بەدیهێنراوە.

زانایانی فەلەك دەڵێن زەوی بەر لە ملیۆنان ساڵ پێك هاتووە لەدوای جیابوونەوەی لە خۆر، سەرەتا بەشێوەی گازێکی کلّپە سەندوو بووەو، پاشان بەهۆی خولانەوەی ئەم بارستایە گازییە بەدەوری خۆیدا لەبۆشایی دەرەوە شێوەی گۆیی وەرگرتووە. پاشان بەهۆی دوورکەوتنەوەی ئەم بارستایە لەخۆر، گازەکان ساردبوونەتەوە و ئەوەش هۆکاری پێکهاتنی ڕووی دەرەوەی بووە کەبە پلەبەندی ڕەقهەڵاتووە، بەو پێیەش کە گازەکان لەئۆکسجین و هایدرۆجین پێکهاتوون و هەر ئەو دوانەش توخمی پێکهێنەری ئاون، لەبەر ئەوە لەنێو ئەم بارستە گازییەدا ئاو درووست بوو، پاشان بەهەڵمبوو و ەبەرزبووەوەو دووبارە بەشێوەی لێزمەباران بۆی گەڕاوەتەوە و داباریوەتە سەری، بەم جۆرە سەرەتا زەوی درووست بووەو پاشان ئاوی لێ دەر چووە لەدوای ئەو ڕووەك درووست بووە.

***



## کشتوکاڵ بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر زیندووبوونەوە:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ النحل:٦٥ واتە: هەر خوا بارانی لەئاسمانەوە باراندووە و زەوی پێ زیندووکردۆتەوە دوای ئەوەی کە ئەوەی کە مردووبوو، بە ڕاستی ئالەو دیاردەیەدا نیشانە و بەڵگەی تەواو هەیە بۆ کەسانێك کە گوێ بۆ ڕاستی دەگرن یان دەفەرموویت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ فصلت:٣٩ واتە: (لەبەڵگە و نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە دەبینێت زەوی وا کش و ماتە جا کاتێك باران بەسەریدا دەبارێنێت دەخرۆشێت و گەشەو نەشونما دەکات، چونکە بەڕاستی ئەو زاتەی کە زەوی زیندووکردەوە مردووانیش زیندوو دەکاتەوە بێگومان ئەو خوایە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

کشتوکاڵ کردارێکە بە هۆیەوە مرۆڤ پیشانی خۆی دەدات چۆن خوای مەزن زەوی لە دوای مردنی بە ئاو زیندوو دەکاتەوە، کاتێك وشك و زەرد هەڵگەڕابوو و هەنوکە لێوان لێوانە لە ژیان وزیندەوەران بەو جۆرە مرۆڤ بە چاوی خۆی هەندێك دیاردەو تواناى خوا دەبینێت لە بەدیهێنانی ژیان لە زەوی مردووەوە، مرۆڤیش لە خاکی زەوی بەدیهێنراوە وەك پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الروم: ٢٠. واتە: لە نیشانە و بەڵگەکانی خوا ئەوەیە کە ئێوەی لەخاك دروست کردووە، دوای بڕینی چەند قۆناغێك کتوپڕ بوونەتە مرۆڤێك و بڵاودەبنەوە بەزەویدا، زانستی نوێ بە شیکاری جەستەی مرۆڤ سەلماندوویەتی کە لەش لە هەمان توخمەکانی خاك پێك هاتووە، لەبەر ئەوە ئەو زاتەی زەوی لە دوای مردنی دەژێنێتەوە بێگومان مردووەکانیش لەڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکاتەوە بەم جۆرە کشتوکاڵ دەبێتە بەڵگەیەکی ماددیی لەسەر زیندووبوونەوەی دوای مردن.

## ٢٠٤ ڕووەكەكانیش پشوو دەدەن لە شەودا:

شەو ئەو وشەیەیە كە پشوودان و حەوانەوە و جوڵە و باری ئارامی و سوبات، ئەوە سووننەتێكە خوای گەورە دایناوە بۆ مرۆڤ تا جێبەجێی بكات، تا مرۆڤ لە شەودا بحەوێتەوەو پشوو بدات، لەو بارەیەوە ئایەتەكانی قورئان زۆرن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ ﴾ النبأ: ٩-١١.

واتە: نووستنمان نەكردووە بە هۆی حەوانەوەتان، شەومان نەگێڕاوە بە كالاّ داپۆشەر وە ڕۆژمان نەگێڕاوە بە كاتی ژیان و هەڵسوڕان و پەیداكردنی ژیوار.

سوبات بۆ حەوانەوە و بۆ پشوو دانە، زۆرینەی ئەو هۆرمۆناتانەی كە لەش دەریدەكات لەكاتی بەخەبەر بووندایە لەكاتی ڕۆژدایە، لەشەودا ڕێژەیان كەم دەبێتەوە لەكاتی نوێژی عەسردا ئەدرینالین بەرز دەبێتەوە، لەهەمان كاتدا ماددەیەك هەیە وەك میلاتۆمین كەغودەی سنۆبەری دەیڕژێنێ و پشوو دەدات، بەلەش دەركەوتووە هەتا دەورو بەرەكە تاریكتر بێت ئەو ماددەیە زیاتر دەڕژێتە خوێنەوە ئەم ڕاستییە كەوا شەو بۆ نوستن و حەوانەوەیە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ ﴾ النبأ: ١١. واتە: مرۆڤەكان بلاّوببنەوە بۆ جێبەجێكردنی كار و بژێوی خۆیان لە ڕۆژدا و ئەوی تریشی بۆ پشووە لە باڵندە و ئاژەڵیشدا ئەمە هەیە، كشتیارێكی یابانی زەوییەكی هەیە و هەمووی كردووە بە چەڵتووك، كۆمپانیایەكی یابانی دێت گڵۆپ و بلاجیكتۆر و ڕووناكییەكی زۆر بەشەودا دادەنێت بۆ پرۆپاگەندەی خۆی، ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی كە بەشەویش ئەو كێڵگەیەی تەنیشتیان ڕووناك بێت، پاش ماوەیەك كشتیارەكە هەست بەلاوازی كشتوكاڵ و چەڵتوكەكەی دەكات و دەبینێ كە لاواز و سیسە، هەر بۆیە سكالاّیان لەسەر بەرز دەكاتەوە و دەنوسێ لاوازی چەڵتووكەكەم بە هۆی ئەو گڵۆپ و بلاجكتۆرانەوەیە كە ئەو كۆمپانیایە دایگیرساندوون، پاش لێكۆڵینەوەیەكی

وورد لە سکالاّی کشتیارەکە دەردەکەوێت کە بەڵێ ئەم کشتیارە ڕاست دەکات و هۆکاری ئەو دابەزینی ئاستی نەشونمای چەڵتوکە، پەیوەندی هەیە بەڕووناکی شەوانەی ئەو گڵۆپانەوە بۆ کێڵگەکە کێشەکە دەباتەوەو کۆمپانیاکەش قەرەبووی دەداتی.

## ٢٠٥ ئیعجازێکی زانستی قورئان دەربارەی گرنگی ڕووەکی کولەکە:

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرموویێت: ﴿ وَبِٱلَّيۡلِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ١٣٨ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ١٣٩ إِذۡ أَبَقَ إِلَى ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ١٤٠ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُدۡحَضِينَ ١٤١ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ١٤٢ فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ ١٤٣ لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٤٤ فَنَبَذۡنَٰهُ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٞ ١٤٥ وَأَنۢبَتۡنَا عَلَيۡهِ شَجَرَةٗ مِّن يَقۡطِينٖ ١٤٦ وَأَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلۡفٍ أَوۡ يَزِيدُونَ ١٤٧ ﴾ الصافات: ١٣٨–١٤٧.

واتە: وە بەڕاستی یونس پێغەمبەرێك بوو لە پێغەمبەران کاتێ ڕایکرد بۆلای کەشتیەکی پڕ لە خەڵك، ئینجا قورعە کێشی کرد لەگەڵ خەڵکی ناو کەشتیەکە و ئەو لە دۆڕاوان بوو، خرایە دەریا کەو ئینجا نەهەنگێك قوتی دا، ئەویش شایەنی سەرزەنشت بوو، خۆ ئەگەر بەڕاستی ئەو لەیادکارانی خوا نەبوایە تا ڕۆژی زیندوودەکرێنەوە لە ناو سکی ئەو نەهەنگەدا دەمایەوە، بەهۆی ئەوەوە فڕێماندایە زەویەکی ڕوت بێ دار و درەخت نەخۆشیش بوو، وە ڕووەکێکی کولەکەمان بەسەریدا ڕرواند ئەوسا بەپێغەمیەرێتی ناردمان بۆلای سەد هەزار کەس یا زیاتر گەلەکەش باوەڕیان هێنا و بەو هۆیەوە بەهرەمەندمان کردن لە ژیان.

تا ماوەیەك (یقطین) لە فەرهەنگەکاندا ئەو ڕووەکانەن کەقەدی سەربەخۆی نیە، قەدێکی تەواوی نیە وەکو کاڵەك و شوتی و خەیار و کولەکەی شیرین، کولەکەی خەیاری دەگرێتەوە، ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە کولەکەی شیرینە کە بەرەکەی پێی دەوترێت (قرع) پێشیدەوترێ (دباع )، لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا زاناکانی ئەڵمانیا بۆیان

دەرکەوت چەند ماددەیەك هەیە کەلەناو کولەکەی شیریندا سەنتەری یاد کردنەوە لە مێشکدا دەوروژێنێن و چالاکی پێئەدەن هێزی عەقڵی پێنج شێوازی هەیە:

یەکەم: هێزی بیرکردنەوە

دووەم: هێزی یادکردنەوە

سێ یەم: هیزی گوێگرتن

چوارەم: هێزی فێربوون

پێنجەم: هێزی تێروانین

ئەم هێزانە پێیان دەڵێن ( هێزی عەقڵ ) هەریەکەیان جۆرە سەنتەرێکی هەیە لە مێشکی مرۆڤدا، ئەوەی کە پەیوەندی بە یادکردنەوە هەبێت ئەو ماددەیەیە کە لە کولەکەدا هەیە دەیوروژێنێت، واتە: ئەو کەسانەی کە زۆر شتیان بیردەچێتەوە جار جار کولەکەی شیرین بخۆن سوودمەند ئەبن لێی، ئەمە زاناکانی ئەڵمانیا دۆزیویانەتەوە بێجگە لەوەی کە چالاککەرە سوودی تریشی هەیە، مرۆڤ کە توشی شۆك (صدمە) یەك دەبێت شتی بیر دەچێتەوە. خوای گەورە یەك جار ئاماژەی بەو (یقطین )ـە کردووە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا، کە بۆ ئەم حاڵەتە بەکاریهێناوە کەوەك زاناکانی ئەڵمانیا دەریانخستووە ئامێری یادکردنەوە چالاك دەکات دەمارەکانی دەنگ دەنگە ژێکان چالاك دەکات، هەروەها:

یەکەم: ئامێری یاد کردنەوە چالاك دەکات.

دووەم: ئامێری دڵ بەهێزدەکات.

سێیەم: بۆ هەوکردنی بۆری میز سوودمەندە لەهەمانکاتدا دەرهاویشت ئاسان دەکات.

چوارەم: تۆوەکەی لەگەڵ تۆوی خەیار و کاڵەك (خصوبە ) جیا دەکات.

لەسەر ئەم سوودانە چەندان سودی تریش کەلەبواری پزیشکیدا هەیە، بڕیار درا ئەو ژەمە خواردنەی لە خوێندنگاکانی ئەڵمانیا دا خوێندکاران ئەیخۆن ئەبێت لەهەفتەیەکدا یەك ژەمی کولەکەبێت، خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن ڕاستییە زانستییەکانی قورئانی پیرۆز وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرا دەبن سوپاس و ستایش بۆ خوای زاناو کاربەجێ خاوەنی ئەم پەیامە پیرۆزە..

## ٢٠٦ زەیتی زەیتون کاریگەرە بۆ ڕەنگکردنی زۆربەی ڕووەکەکان:

دوای زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکان زانایان گەیشتن بەم ئەنجامەی کەوا هەندێك لە زەیتی زەیتون پارێزەر دەبێ لەنەخۆشی شێرپەنجەی دەمارەکان، ئەوان دەڵێن ڕۆنی زەیتون دەوڵەمەندە بە ماددەی (البولیفینولات )(Polyphenois) ئەمەش بریتی یە لە ماددەیەکی کیمیایی ڕووەکی و بەرپرسیارە لە ڕەنگ کردنی هەندێك لە ڕووەکەکان، کەواتە دەکرێت زەیتی زەیتون سوودی لێوە ببینرێ و کاریگەرییەکی باش و ئەرێنی دەبێ بۆ نەهێشتنی شێرپەنجەی دڵ و دەمارەکان، لە ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەی دەرخستووە کەوا بەکار هێنانی ڕۆنی زەیتون کاریگەری ئەرێنی دەبێ لەسەر (کۆلسترۆڵ) و دژە تەنی لەش بۆ بەرەنگاری بوونەوەی ئەنسولین، کەسەردەکێشێ بۆ جۆرێك لەنەخۆشی شەکرە، هەروەها بۆ هەوکردنی ئیلتیهاباتی دەمارەکان و بلاوبوونەوەی شێرپەنجە لەناو لەش و نەهێشتنی وەرەمە پیسەکان و دواکەوتنی پیربوون، لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکاندا زاناکان ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بەوەی ڕۆنی خواردەمەنییەکان بگۆڕن بۆ ڕۆنی زەیتون، جا بابزانین قورئانی پیرۆز لەو بارەوە چی دەڵێت:

یەکەم: ئەم ڕۆنە سوکەی لەناو زەیتی زەیتون هەیە.

دووەم:ماددە ڕەنگکەر کەناویان ناوە (polyphenois) .

سەیربکەن خوای گەورە چۆن باسی زەیتون دەکات

﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ المؤمنون:٢٠ . واتە: درەختێکیشمان بۆ ڕواندوون کە لەکێوی توور لە بیابانی سینا سەزو دەبێت کە ڕۆن و چەوری لێ دەردەهێنرێت و ئامادەیە بۆ کەسانێك کەدەیخۆن، مەبەست درەختی زەیتونە کەهەمیشە سەوزە و تەمەن درێژە و بێ ئەرکە و کالسیۆم و ئاسن و فوسفۆڕ و ڤیتامینی جۆراو جۆر و پرۆتینی تێدایە، گەلێك داودەرمانیشی لێ دەردەهێنرێت سەیربکەن وشەی (تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە زەیتون ڕۆنێکی سوودبەخشی

هەیە، چۆن دەزانی سوودبەخشە؟ چوونکە خوای گەورە لە باسی نیعمەتەکانی باسی کردووە. هەروەها وشەی (وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ) ئاماژەیە بۆ گرنگی ئەو ڕەنگەی لەناو زەیتون دا هەیە و سوودی بۆ مرۆڤ هەیە زاناکان ناویان ناوە بە کاریگەرێگ بۆ ڕەنگ کردنی زۆربەی ڕووەکەکان، پاك و بێگەردی بۆتۆ خوایە بەڕاستی قورئانەکەت پڕە لە ئیعجازی نوێ و جوان.



## ٢٠٧ گوڵی ڕەنگاڵەیی و موعجیزەیەکی زانستی نوێ:

خوای گەورە لەباسی دیمەنێکی ڕۆژی دواییدا دەفەرموویت: ﴿ قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ ﴾ الرحمن: ٣٧. واتە: هەرکاتێ ئاسمان قلێشی برد بەڕەنگی گوڵ و کەوڵی سوور، یان گووڵی سوور یان گووڵی لە ڕۆن هەڵکێشراو یان گوڵێك لە ڕۆندا سوور بوبێتەوە هاتە بەر چاو.

دکتۆر ( محمد راتب نابلسی ) دەڵێت لەبەرواری ٣١ی تشرینی یەکەم لە ساڵی ١٩٩٠بەهێزترین وەکالەی ئاسمانی لە جیهاندا دیمەنێکی لە ئاسمانەوە گواستەوە، بەوەی دەیبینی وایدەزانی وێنەی گوڵەباخە چونکە بەهەموو شێوەیەك لەگوڵەباخ دەچوو وێنەی تەقینەوەی ئەستێرەکە کەلەشێوەی گوڵی سووردایە لەلایەن (ناسا) وەرگیراوە، ئەگەر بەراوردی بکەین بە وێنەی گووڵی سوور دەبینیت زۆر لەیەك دەچن، شایەنی باسە زانایانی گەردوون بەم ئەستێرەیە دەڵێن گووڵی سووری ئاگرین، واتە بەهەمان وشەکانی قورئان گوزارشت لە ڕاستییەکانی گەردوون دەکەن سووری تۆخ گەڵای سەوز لەناوەڕاستیدا کاسەیەکی شین هەبوو، بەڵام دیمەنی تەقینەوەی ئەستێرەیەك بوو لەدەوری سێ هەزار ساڵی تیشکی زەویەوە لە ناوی چاوە پشیلە ئەم دیمەنە بە (١٤٠٠) ساڵ زیاترە بە ڕوونی لە بوونەوەردا دەبینرێ.



## جوتەکان لە ڕووەکدا و ڕاستییەکی ناوازەی زانستی:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ یس: ٣٦. واتە: پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی هەر هەموو بەدیهێنراوەکانی بەجوت درووست کردووە لەوەی لە زەویدا دەڕوویت لە خۆیشیان لەو شتانەش کە نایزانن.

لەسەردەمی زانستدا ڕوون بۆتەوە کە هەموو بەدیهێنراوان ماددی و مەعنەوی جوتن ئەمەش دەست پێشخەرییەکی قورئانە و خستنە ڕووی ڕاستییەکی زانستییەکە زانستی نویێ بەم دواییانە پێی گەیشتووە، خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا باس لە جوتەکان لە ڕووەکدا دەکات، ئەو کاتەی ئەم ئایەتانەش دابەزیوون هیچ کەسێك نەیانزانیووە کە ڕووەکەکان جوتن تەنها خورما نەبێت کە عەرەب دەیزانی نێر و مێی هەیە، تەنها زانستی تازە سەلماندی کە هەموو ڕووەکێك لەجیهانی ڕووەکدا جوتن یان نێرە یان مێ و بەجوتی ناو دەبرێت ئەم دەستپێشخەرییەی قورئان دەیچەسپێنێت کە قورئان وتەی خوای گەورەیە و ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم )، شایەتە لەسەر پێغەمبەرێتی و پەیامەکەی بۆ هەموو خەڵکی. ئەم قورئانەش وەك موعجیزەیەك دەمێنێتەوە و هەموو سەردەمێك نویێ دەبێتەوە هەتا بەڵگە لەسەر هەموو مرۆڤەکان درووست بکات. خوای گەورە جوانی فەرمووە: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت: ٥٣. واتە: ئێمە لە ئایندە دا بەڵگە و نیشانەی سەر سوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی گەردووندا لە خوودی خۆشیاندا ئەمەش بۆ ئەوەی تاچاك بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کە ئەو قورئانە حەق و ڕاست و ڕەوایە ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە کە بێگومان ئاگا و زانایە بەهەموو شتێك.



## ئیشکردنی بە شەو و مەترسی توش بوون بە شێرپەنجە:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ﴿ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۝٩ ﴾ النبأ:٩
واتە: نووستنمان کردووە بەهۆی حەسانەوەتان دوای ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرموویت :﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ۝١٠ ﴾ النبأ:١٠.

واتە: شەویشمان بۆ ئێوە کردووە بە پۆشاکێك و داتاندەپۆشێت شەو وەك پۆشاکێك وایە کە بەمرۆڤەکان درابێت تاکو بە ئارامی بخەون ڕۆژیش بۆ کارکردنە هەر وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ۝١١ ﴾ النبأ:١١.

واتە: ڕۆژیشمان کردووەتە هۆی کارکردن و بەدەست هێنانی بژێوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی ڕۆژ بۆ ئیش کردن و پەیدا کردنی بژێوی ژیانە، بەڵام شەو بۆ پشوودانە پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە بەر لە ١٤٠٠ساڵ قورئانی پیرۆز وا باسی شەو و ڕۆژی کردووە، کەچی تازە بەتازە لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی ئەڵمانی ئەوەی دەرخستووە ئەوانەی بەشەو کاردەکەن مەترسی توشبوون بەنەخۆشی شێرپەنجەیان لێدەکرێت، ئەم لێکۆڵینەوەیە لەلایەن بنکەی پزیشکی ژینگەیی سەر بە زانکۆی (کۆلۆنیا) ی ئەڵمانی ئەنجام دراوە، لێکۆڵینەوەیەکە ئەوەی ئاشکرا کردووە کارکردنی ئافرەتان بەشەو مەترسی تووشبوون بەنەخۆشی شێرپەنجەی مەمکی لێدەکرێت، کارکردنی پیاوانیش لەشەودا مەترسی تووشبوون بە شێرپەنجەی پرۆستاتی لێدەکرێت، بەتایبەتیش ئەگەر پیاوان و ئافرەتان لەشەودا کاتێکی زۆر کار بکەن.

بەپێی لێکۆڵینەوەکە کارکردنی شەوان بۆ هەریەك لە ئافرەتان و پیاوان دەبێتە هۆی تێکچوونی ئامێری بەرگری مرۆڤ و کەمبوونەوەی هۆرمۆنی (میلاتۆنین)، کە ڕێگە لەگەشەسەندنی شێرپەنجە دەگرێت، لەم بارەشەوە پرۆفیسۆر (تۆماس ئارین) کەسەرپەرشتی لێکۆڵینەوەکەیە دەڵێ: (هۆرمۆنی میلاتۆنین تەنها بەشەو کاردەکات و تەنها لە تاریکیش کاردەکات و لەشەوی تاریکیشدا تەنها یەك ئیش دەکات ئەویش

ئەوەیە کە سوود لەتاریکی شەو وەردەگرێت تاکو ئامێری بەرگری مرۆڤ بەهێز بکات، بەڵام کە مرۆڤ بەشەو کاریکرد ئیدی کاری ئەم هۆرمۆنە تێکدەچێت و شیرازەی کارەکانی تێکدەچێت، بۆیە ناتوانێت وەك پێویست کاری خۆی بکات بەمەش بەرگری لەش بێهێز دەبێت و ئەمەش وادەکات کە ئەوانەی لەشەودا کاردەکەن توشی نەخۆشی شێرپەنجەبن، شایەنی باسە دەقی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕۆژنامە (الاهرام ) ی میسریدا بەزمانی عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.



## ٢١٠ ئەنجامدانی کاری باش خەمۆکی ڕادەماڵێت:

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی نوێ کەلەڕۆژنامەی (دەیلی ئێکسپرێس )ی بەریتانی بلاْوکراوەتەوە دەرکەوتووە کە ئەنجامدانی کاری باش سوودی جەستەیی و دەروونی بۆ مرۆڤ هەیە، هەروەها کاری باش خەمۆکی لەناو دەبات و تووڕەیی مرۆڤ کەم دەکاتەوە و دڵ و دەروونی مرۆڤ ئاسوودە دەکات، ئەم لێکۆڵینەوەیەش لەلایەن پسپۆڕان و شارەزایانی زانکۆی ( سایکس ) ی بەریتانیەوە ئەنجام دراوە، لە قورئانی پیرۆزیشدا بەر لە چواردە سەدە دەربارەی کاری باش ئاوای فەرمووە: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ ﴾ هود: ١١٤. واتە: بەڕاستی چاکەکان خراپەکان ڕادەماڵن ئەمەش بیرخستنەوەیەکە بۆ ئەوانەی کە یادی خوا دەکەنەوە، کاتێك کە مرۆڤی گوناهبار ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنێتەوە بێگومان دڵی زۆر خۆش دەبێت و خەمەکانی دەڕەوێتەوە و زیاتریش پەرۆشی ئەوە دەبێت کە کاری باشە ئەنجام بدات و لە کاری خراپە دوور بێت.

***



## لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی موعجیزەی ئایەتێکی قورئانی ئاشکرا کرد:

بەپێی چەندین سەرچاوەی پزیشکی و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لەبارەی فرمێسکەوە دەرکەوتووە کە فرمێسکڕشتن سودێکی زۆری بۆ چاوی مرۆڤ هەیە، سەرچاوە پزیشکییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە فرمێسك چاوی مرۆڤ دەشواتەوە و پاکی دەکاتەوە و وادەکات کە چاو لەنەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی چاوەوە بەدووربێت، جگە لەمەش لێکۆڵینەوەیەکی ئەمریکی ئەوەی خستۆتەڕوو کە فرمێسك ڕشتن بۆ مرۆڤ بەگشتی و ئافرەت بەتایبەتی سوودێکی زۆری هەیە، چونکە فرمێسك ڕشتن دەبێتە هۆی ئەوەی کە چاوەکان گەش بن و لە ماندووبوون و شەکەتی بەدووربن، هەر بۆیە لێکۆڵینەوەکە ئامۆژگاری ئافرەتانی کردووە کە ئەگەر دەیانەوێت چاویان جوان و گەش بێت ئەوە با فرمێسك بڕێژن، ئەمەش باشترین هەوڵە کە لەپێناو تەندروستی و جوانی چاویانەوە بیدەن، شایەنی باسە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بەر لە چوارده سەدە پێش لێکۆڵینەوەی ئەم زانایانە فەرموویەتی: ﴿ فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨٢ ﴾ التوبة:٨٢. واتە با کەم پێبکەنن و زۆر بگرین بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزەش نابێت مرۆڤی موسڵمان کاری تەنها و تەنها هەر گریان بێت، نەخێر بەڵکو دەبێت ئاگای لە پێکەنینیش بێت، چونکە پێکەنینیش سوودی خۆی هەیە بەڵام ئەوەندە هەیە کە دەبێت گریان زیاتربێت لە پێکەنین.

❊❊❊



## پەیوەندی دونیا و ژیان و موعجیزەیەکی گەورە:

خوێنەری بەڕێز ئەگەر ووردبینەوە لە ژمارە پیتەکانی وشەی دونیا دەبینین شەش پیتە: (الدنیا)، هەروەها وشەی (الحیاة) بەهەمان شێوە شەش پیتە، ئاسمانەکان و هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکاندایە لەگەڵ زەوی و هەموو ئەوانەی لەسەر زەوین، ڕەگەزەکانی دونیان و ئاماژە بە دونیا دەکەن و ژیان بەئەوانەوە بەستراوە، لەڕاستیدا قورئانی پیرۆز ئەوەی چەسپاندووە کە خوای پەروەردگار ڕەگەزەکانی دنیای لە شەش ڕۆژ واتە بە شەش قۆناغ درووست کردووە، بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف:٥٤. واتە بێگومان پەروەردگارتان (الله) یە کەدرووستکاری ئاسمانەکان و زەویە لەماوەی شەش ڕۆژدا، ئەگەر سەرنجی وشەی مرۆڤ (الإنسان) یش بدەین دەبینین لە حەوت پیت پێکهاتووە، قورئانی پیرۆزیش ئەوەی چەسپاندووە کە مرۆڤی بەحەوت قۆناغ درووست کردووە، قورئانی پیرۆز بەم جۆرە باسی ئەفراندنی مرۆڤ دەکات لە ئایەتەکانی (١٢–١٤) ی سورەتی (المؤمنون) دا وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾﴾ المؤمنون:١٢–١٤.

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە، لەوەو دوا لەجێگەیەکی پارێزراو و لەباردا کە مندااڵدانە لەشێوەی نوتفەیەکی زۆر بچووکدا دامان مەزراندووە، لەوەودوا نوتفەکەمان کردووە بە خۆهەڵواسەرێك، پاشان ئەمیشمان کردووە بەگۆشتیارەیەك، ئینجا شێوازی گۆشتیارەکەمان بە پەیکەری ئێسك گۆڕیوەو بەگۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیووە، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێك

و پێکەو ڕۆحی پێ بەخشراوە، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەر و چاکترین دروستکارە.

بەواتایەکی تر وشەی (الدنیا) شەش پیتەو بە شەش قۆناغیش دروست کراوە، مرۆڤیش (الإنسان) حەوت پیتەو بەحەوت قۆناغ درووست کراوە، لەجێگەیەکی تردا دەبینین دەستپێکی قورئانی پیرۆز و یەکەم سوورەتی کە (الفاتحە) یەو، ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾﴾ الفاتحة:٧-١.

دەبینین حەوت ئایەتە بە دانانی ﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾ بە ئایەتێك لەو سوورەتە کە لەهەموو سوورەتێکدا دووبارە دەبێتەوە، بێجگە لە سوورەتی (براءة) و لەهیچ کام لە سوورەتەکانیشدا بێجگە لە (الفاتحە) بە ئایەت دانەنراوە کەواتە (فاتحە) بە (بسملە) وە حەوت ئایەتەو، بەبێ (بسملە) شەش ئایەتە. دواهەمین سوورەتی قورئانی پیرۆزیش کە سوورەتی (الناس) ە و ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾﴾ الناس:٦-١ .

دەبینین بەبێ (بسملە) شەش ئایەتە ژمارە حەوتیش ئەویش لە کۆمەڵەی (ئیحجازی ژمارەیی لە قورئاندا زیاد لەوەیش وشەی (الإنسان) ە کە لە حەوتپیت پێك دێت و بە حەوت قۆناغ دروست کراوە یەکسانیشە بە ژمارەی وشەکانی ( القرآن، الفرقان، الإنجیل، التورات ). هەروەها باوکی پێغەمبەران ( ابراهیم و موسا ) سەلامی خوایان لەسەر بێت (صحف موسی) یش لە حەوت پیت پێك دێت، ئایە ئەمە ئاماژەیەکی ژمارەی و هاوسەنگییەتی ژمارەیی نیە بۆ گەیاندنی ئەو مانایانەی کە ئەم پەیام و پەڕاوانە لە ڕاستیدا بۆ مرۆڤ دابەزێنراون لە سەرجەم قۆناغە جیاوازەکانیدا و، بەجیاوازی ئەو بارو دۆخانەی پێیدا تێپەڕ بووە تێدەپەڕێت؟



له بەرامبەریشدا دەبینین وشەی (الشیطان) بە هەمان شێوە لە حەوت پیت پێك دێت! جا ئایا ئەمە جەخت کردنەوە نیە لە سەر دوژمنایەتی شەیتان بۆ مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا و بەجیاوازی بارودۆخەکان لەهەوڵی ئەوەدایە بەتەواوەتی لەو ڕێگە ڕاستە دووری بخاتەوە کە خوای پەروەردگار نیشانی داوە، بێ کەم و کورتی و بە گشتگیری لەڕێی پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و پەڕاوەکانی موسا و تەورات و ئینجیل و قورئانی پیرۆزەوە بەهەق دابەزاندووە و پاك وبێگەردی بۆ خوا (لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ) الأعراف: ٥٤، کە ئەمەش (لَهُ ٱلۡخَلۡقُ ) (لَهُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ) پیتەکانی حەوتن.

هەروەها ئەگەر ویستی لەسەر شتێك بێ دەفەرمووێت: ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ البقرة:١١٧.

کە ئەمیش حەوت پیتە، لە سەرووی مرۆڤەکانیشەوە حەوت چین ئاسمانی بەدیهێناوە بەپێی ئەم دەقە پیرۆزە:﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ١٧ ﴾ المؤمنون:١٧.

واتە: بەڕاستی ئێمە لە ڕاسەرتانەوە حەوت چین ئاسمانمان دروست کردووەو ئێمە هەرگیز لە دروست کراون غافل بێ ئاگا نین.

هەروەك دەرگاکانی دۆزەخیش حەوت دەرگان بە پێ ئەم ئایەتە:﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ٤٣ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ٤٤ ﴾ الحجر: ٤٣-٤٤.
واتە: بێگومان دۆزەخیش بەڵێنگای هەر هەموو ئەوانە بەگشتی حەوت دەروازی گەورەی هەیە، هەر دەروازەیەکیش چەند دەرگا وچەند بەشێکە کە دەستەی دۆزەخیان بەگوێرەی تاوان و گوناهیان ڕاپێچ دەکرێت بۆ ناوی.

لە دوای ئەم هەموو بەڵگەیە لە سەر گەورەیی قورئان، سوێند بە خوا هەر کەسێکی دوور لە دین ئەگەر خۆی نەخەڵەتێنێ و ڕانەکات لە بەڵگە زانستیەکان ئەو بەڵگانەی بەسە بۆ ئەوەی بگاتە دڵنیایی تەواو، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نووسەر و ئەدیب، یان هەتا زانایەك بوایە لە زانستەکاندا هێشتا

نەیدەتوانی پەراوێکی وەك قورئان دابرێژێت، ئەی چی دەڵێت کاتێك دەزانێت کە ئەو (صلى الله عليه وسلم) کەسێکی نەخوێندەوار بووە؟ بەڕاستی ئیتر لە دوای ئەم هەموو ڕاستییە جێگایەك بۆ گومان و دودڵی نیە، سەبارەت بەوەی کە زاتی ( الله ) قورئانی پیرۆزی ناردووەتە خوارەوە بۆ باشترین کەس لە دونیا و لە ئاخیرەتدا، تاببێتە چرای ڕووناکی بۆ هەموومان:﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ ﴾ الإسراء: ٩.

واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە هیدایەت بەخشە بۆ چاکترین ڕێگاو ڕێباز و بەرنامە .




## هاوسەنگی ژمارەیی واژەیی هاو پەیوەست لە قورئانی پیرۆزدا:

مەبەست لەوشە یان واژە هاوپەیوەستەکان یاخود پێکەوە بەستراوەکان: شەو و ڕۆژ، ژیان و مردن ، دنیا و ئاخیرەت.. هتد، نموونەش لە سەر هاوسەنگی ژمارەیی دەشتوانرێت بوترێت هاوسەنگی ژمارەیی ئیعجازی وەك دووبارە کردنەوە وشەی مانگ (١٢) جار لە قورئانی پیرۆزدا، کەیەکسانە بەژمارەی مانگەکانی ساڵ، هەروەها دووبارەکردنەوەی وشەی (اليوم) (٣٦٥)جار لە قورئاندا، واتە بەژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ. ژمارەیەکیش لە زانایانی ئیسلام چەندین توێژینەوەیان پێشکەش کردووە لەسەری هەروەك و زانا ڕۆژئاواییەکانیش دە لێکۆڵینەوەیان لەم بوارەدا پێشکەش کردووە لە قورئانی پیرۆزدا ئیعجازی ئەوەندە وورد و جوان و زانستی دۆزراوەتەوە بۆ نموونە:

ژیان (الحياه) (١٤٥) جار دووبارە بۆتەوە.

مردن (الموت) (١٤٥)جار دووبارە بۆوتەوە .

کارە چاکەکان (الصالحات) (١٦٧) جار دووبارە بووەتەوە.

کارەخراپەکان (السيئات) (١٦٧) جار دووبارە بووەتەوە.

دنیا (الدنيا) (١١٥)جار دووبارە بووەتەوە.

ئاخیرەت (الأخرة) (١١٥) جار دووبارە بووەتەوە.

فریشتەکان (٨٨) جار دووبارە بووەتەوە. شەیتانەکان (١٤٥) جار دووبارە بووەتەوە.

خۆشەویستی (المحبە) (٨٣)جار دوبارە بووەتەوە.

گوێڕایەڵی (الطاعة) (٨٣)جار دووبارە بووەتەوە.

ڕێنوێنی (الهدی) (٧٩) جار دووبارە بووەتەوە.

بەزەیی (الرحمە) (٧٩)جار دووبارە بووەتەوە.

تەنگانە(الشدە) (١٠٢) جار دووبارە بووەتەوە.

ئارامگرتن (الصبر) (١٠٢)جار دووبارە بووەتەوە.

ئاشتی (السلام) (٥٠٩) جار دووبارە بووەتەوە.

پاکەکان (الطیبات) (٥٠)جار دووبارە بۆوەتەوە.

کارەسات (المصیبە)(٧٥) دووبارە بۆتەوە.

ستایش (الشکر) (٧٥) جار دووبارە بۆتەوە.

ئاشکراکردن (١٦) جار دووبارە بۆتەوە، ئاشکرا (العلانیە)(١٦) جار دووبارە بۆتەوە. محمد و جیهانی بەرزەخ و ڕۆحی پاك (جبریل علیە السلام ) وچرا (السراج) هەرکەیان (٤) جار ناویان هێنراوە. بەخشندە (الرحمن )(٧٥) جار دووبارە بۆتەوە. میهرەبان (الرحیم) (١١٤) جار واتە: دوو هێندەی بەخشندەیە.

پاداشت (الجزا ء) (١١٧) جار دووبارە بۆتەوە، لێخۆ شبوون (المغفرە) (٢٣٤) جار دوو هێندەی پاداشت. سەختی (العسر) (١٢) جار دووبارە بۆتەوە ئاسانی (الیسر)(٣٦) جار سێ ئەوەندە بۆتەوە . (قل) واتە بڵێ (٣٣٢)جار دووبارە بۆتەوە، وتیان (قالوا) (٣٣٢) جار دووبارە بۆتەوە، ئەوەی شایانی باسە کە وشەکانی قورئان لە (٧٠) هەزار وشە زیاترن ئێستا ئەگەر هەموو وشەکانی قورئان بخرێنە ژێر لێکۆلینەوەی ژمارەیی چۆن دەبێت؟

ئەی ئەگەر پیتەکانی قورئان کە دەگاتە چەند سەد هەزار پیت بخرێنەژێر لێکۆلینەوە چی دەبێت؟ کۆمپیوتەر رۆڵێکی گەورە دەبینێت لە توێژینەوەی زانستدا خۆ ئەگەر هەرکەسێك یان هەر زانایەك بیەوێت کتێبێك دابنێت کە چەندین ڕستەی فرە مانا و چەندین ئیعجاز لە خۆبگرێت کەلە سەرووی تێگەیشتنی مرۆڤەوە بێت، لە سەر ئەفراندنی گەردوون و نەفسی مرۆڤ وبەدیهێنانی مرۆڤ، لەسەر سیفاتەکانی مرۆڤ و بێ گیان و گیانلەبەر و ڕووەك و زەوی ئاسمانەکان بە مەرجێك وشەکانی ڕێك خات، هەروەك ئەوەی کە لەباسێکدا وێنەی ( اللیل ، النهار، الحیاة، الموت، الدنیا، الآخرة) هتد لەو وشانەی کەلە ژمارە نایەن.

هەمان ئەو هاوسەنگییە ژمارەیەلە خۆبگرێت کە لەقورئانی پیرۆزدا هەیە، ئایا دەتوانرێت پارێزگاری لەو هاوسەنگیە سەرسوورهێنەرە بکات؟ ئەی چەند ساڵی دەوێت بۆ دانانی کتێبێکی لەم جۆرەو چەند جار دەبێت ئالۆگۆڕ لە وشەکانیدا بکات بۆ ئەوەی ئەم هاوسەنگیە ژمارەییە بەدەست بهێنێت، بەبێ ئەوەی کاربکاتە سەر ئەو مانا و مەبەستانەی دەیەوێت لە ڕستەکاندا ڕوونیان بکاتەوە. یاخوود بیانگۆڕێت جا ئەو کەسە لە ڕووی زمانەوانیەوە هەرچەندیش ڕەوانبێژ بێت و ئاگا و ڕۆشنبیر بێت لە بوارە زانستی و مێژوویی و جیۆلۆجی و جوگرافی و گەردوونییەکاندا، ناتوانێت کتێبێکی بەو جۆرە دابنێت ئەگەر سەدان ساڵ بواریشی پێ بدرێت، هەموو ئەو بەڵگانەی کە باس کران سەلمێنەری ئەوەن کە خاوەنی ئەم قورئانە پڕ لە ووردەکاری و زانیاریانە تەنها وتەنها خوای گەورە و پەروەردگارە کە ئەم قورئانەی بەوەحی ناردووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ی نەخوێندەوار تاکو ببێتە گەورەترین موعجیزە لەسەر ڕاستی پەیامە پیرۆزەکەی.




***

## ٢١٤ بەهۆی مێروولەوە زانایەکی ئوسترالی موسڵمان بوو:

پێش چەند ساڵێك هەندێك بێباوەڕ کۆبوونەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە قورئانی پیرۆز، دوای هێنان و بردنێکی زۆر، هەوڵەکانیان بوو بە بەڵگە لەسەر ڕاستی و دروستی قورئانی پیرۆز ئەوان هاتن قورئانیان هەڵگێر و وەرگێڕ کرد، تا گەیشتن بەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ النمل:١٨. بەتایبەتی وشەی (لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ) واتە: ئەوانەی ڕەخنەیان لەو وشەیە هەبوو وتیان وشەی (یتحطم) واتە وێرابوون، شکاندنی مێروولەش ئەم مانایە ناگرێتەوە، مێروولە شوشە نیە تاکو بشکێت کەواتە ئەمە ڕەخنەیە، کەبە داوی ئەوەی هاتن ئەم بۆچونەیان بلاَوکردەوە بەهەموو شوێنێکدا کە گوایە ڕەخنەیان لە قورئان گرت.

دوای چەند ساڵێك لە لێکۆڵینەوەکەیان زانایەکی ئوسترالی لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر مێروولەکرد، بینی کەشتیوەها سەیری تێدایە مرۆڤ چاوەڕوانی ناکات ئەو لەو لێکۆڵینەوەیدا باسی ئەوەی کردووە کە مێروولە بەشی زۆری لەشی لە ماددەی شوشە پێك هاتووە، دوای ئەوەی ئەم ئایەتەشیان پیشاندا کەدەفەرموێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ النمل: ١٨. واتە هەتا گەیشتە دۆڵی مێروولە، مێروولەیەکی مێیە هاواری کردو وتی مێروولەینە بچنە ماڵەکانتانەوە نەوەکو سلێمان و سەربازانی بتان شکێنن، لەکاتێکدا هەستتان پێنەکەن.

دوای ئەوەی ئەم ئایەتەیان پیشانی ئەم زانایەدا و وتی بەڕاستی ئەم زانی پەرتووکێك هەیە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ باسی ئەم لێکۆڵینەوەیەی منی کردووە (أشهد أن لا إله إلا الله أشهد أن محمداً رسول الله).



## شایەتیدانی پرۆفیسۆر (بالمەر) دەربارەی ڕاستی و دروستی قورئان و ئیعجازە ناوازەکانی:

پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: لەم حیوارەدا پرۆفیسۆر (بالمەر) مان لەگەڵدایە لە ناودارترینی زانایانی جیۆلۆجیایە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرۆکی لیژنەی ئاهەنگی سەد ساڵەی کۆمەڵەی جیۆلۆجییەکانی ئەمریکایە، کاتێك پێی گەیشتین و ڕووەکانی ئیعجازی زانسیتی قورئان و سوونەتمان پیشاندا سەرسوڕمان گرتی، چیرۆکێکی خۆش باس دەکەین کەسەرەتای دەست پێکردن بوو لەگەڵیدا پێمان وت قورئان باسی نزمترین ناوچەی سەر زەوی کردووە و دەست نیشانی کردووە، کەنزیکی قودسە کە لەوێدا جەنگێك لە نێوان فارس و ڕۆمەکاندا ڕوویدا، وەك خوای گەورە ئاماژەی بۆ کردووە و دەفەرموویێت: ﴿ الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ ﴾ الروم: ١-٣.

واتە: ئەلیف لام میم ڕۆمەکان تێکشێنران لە نزمترین شوێنی زەویدا، بەڵام دوای ئەم شکانەیان سەردەکەونەوە وشەی (أدنى) بە واتا نزیکترین و نزمترین دێت. کاتێك ئەم باسەمان لای پرۆفیسۆر دکتۆر (بالمەر) کرد، وتی نەخێر چەندین ناوچەی تر هەن لەو ناوچەی نزمترن، نموونەی چەند ناوچەیەکی تری لە ئەوروپا و ئەمریکا هێنایەوە.

دکتۆر زندانی دەڵێت: ئێمەش پێمان وت جەنابی دکتۆر ئێمە دڵنیا بووین لەوە، ئەو وێنەیەکی بەرجەستەی جوگرافی لابوو کە بەرزی و نزمەیەکانی لە سەردیاری کرابوو، وتی کارەکە ئاسان بوو ئەوە موجەسەمێکە نزمترین شوێنی تیایدا دیاری کراوە، گۆی زەوییەکەی بەدەست خولاندەوە تا چاوی کەوتە سەرناوچەیەکی نزیك لە بەیتول مەقدیس، تیرێك ڕاکێشرابوو لەسەری نووسرابوو نزمترین شوێن لەڕووی زەوی، پاشان بە خێراییەك ئاوڕی دایەوەو وتی: ئەوەی وتت ڕاست بوو! پاشان لەسەر نەخشەیەك باسی ئەو شوێنەی لای دەریاچەی تەبەریەی دەکرد وتی: ئەمە نزمترین شوێنی ڕووی جیهانە لە ڕاستیدا ئەم نەخشەیە پێمان دەڵێت نزمترین شوێن لە ڕووی جیهاندا تەنیشتی دەریای مردووە.

بێگومان کاتێك پرۆفیسۆر دکتۆر باڵمەر بینی قورئان وەسفی ڕابردوو دەکات، کە چۆن درووست بوونی زەوی دەستی پێکردووە و ئاسمان چۆن بووە و دەریاکان چۆن لەناو سکی زەوی دەرهاتن، چیاکان چۆن وەك لەنگەر دروست بوون؟ ڕووەکەکان چۆن دەرهاتن و چۆن ئەم ڕووداوانە هاتن و چۆن وەسفی ڕووی زەوی لە ئێستادا دەکەن و وەسفی چیاکان و دیاردەکانی سەری دەکەن، پاشان ئەو دۆخانەی زەوی پیایدا تێپەڕیووە و سەبارەت بە دوورگەی عەرەبی چی ڕوویداوە؟ تەنانەت وەسفی داهاتووی زەوی ولاتی عەرەبی حاڵەتی داهاتووی زەویش دەکات وتی: بەڕاستی ئەم پەرتووکە سەر سوڕهێنەرە وەسفی ڕابردوو، وەسفی ئێستا و وەسفی داهاتوومان بۆ دەکات، لە دواییدا بیروڕای خۆی ئاشکرا کرد.

توێژینەوەیەکی لە قاهیرە سەبارەت بەئیعجازی بواری زەوی ناسی پێشکەش کرد و کۆتایی توێژینەوەکەی بەم وتانە هێنا: من نازانم ئاستی ڕۆشنبیری لەسەردەمی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم ) چەند بووە و نازانم لە چ ئاستێکی زانستی دا بوون؟ ئەگەر کارەکە بەو جۆرە بێت وەك دەیزانین لەبارەی پێشینەکانەوە ئاستی زانستیان زۆر لاواز بووە، توانای ئەمانەیان نەبووە بێگومان دەیسەلمێنێت کە ئەو زانستەی ئێستا لە قورئاندا دەیخوێنینەوە ڕۆشنایی زانستی خوایە و بۆ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) نیگا کراوە.

بەڵێ ئەوە یەکێکە لە گەورە زانایانی جیۆلۆجیای جیهانی سەردەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوودڵ نیە دان بە ڕاستییەکاندا بنێت و، پێشکەشی بکات و ڕوونی بکاتەوە. بەڕاستی دەبوو ئەو کەسانەی دوورن لە بەرنامە پاك و پیرۆزەکەی ئیسلام لە گومان و دوودڵی دان لەدوای دان پیانانە کەی ئەو پرۆفیسۆرە ناودارەی جیهانی دەربارەی ئیعجازە درەوشاوەکانی قورئان ئەوانیش بەقەد تۆزقاڵێك گومان لە دڵەکانیان نەمێنێ و بەتەواوی دڵنیابن و بێنە ژێرسێبەری پەیامە پیرۆزەکەی خوای گەورە.





## قورئان وەڵامی پرسیارەکەی کەشتیوانی ئاسمانی ڕووسی تیتۆف دەداتەوە:

کەشتیوانی ئاسمانی ڕووسی (تیتۆف) کاتێك بەکەشتییەکەی لە ئاسمانـدا دەسوڕایەوە وتی: کاتێك کە من لە کەشتیەکی ئاسمانی بووم لەپەنجەرەی کەشتییەکەوە سەیری زەویم کرد، بینیم وەك تۆپێکی هەڵواسراوە لە ئاسماندا، ئەوە لەلام سەیر نەبوو بەڵکوسەرسوڕما لەو پرسیارە کە لەدەروونمدا دەهاتوو و دەچوو کێ ئەمەی گرتووە واتە: زەوی هەتا نەکەوێت بەهەڵواسراوی لە ئاسماندا بمێنێتەوە ئەم پرسیارەیش کە ئەم گەشتیارە ئاسمانییە کردوویەتی وەڵامەکەی لە ئایەتێکی قورئانە پڕ لە زانستن و ناوازەکەی خوای گەورەدا هاتووە وەك فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾ فاطر: ٤١. واتە: بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگیر دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێڕەوی خۆیان لانەدەن، بەڕاستی ئەگەر لە ڕیڕەوی خۆیان لابدەن کێ هەیە جگە خوا ڕایانبگرێت بێگومان خوا لەسەر خۆی لێبووردەیە.



## مۆری خوایی لە کیمیا زانیدا دۆزرایەوە لەلایەن ئەندازیاری کیمیایی (وجیە بوردورلو):

ئەندازیاری کیمیایی (وجیە بوردورلو) بەڕێوەبەری کارگەی شەکری (بور) لە تورکیا هەستا بەکێشانی هێڵکارییەك لەنێوان ژمارەی گەردیلە و ژمارەی گروپ ( Group NO) دا شێوەی پەیدا بووە لەئەنجامی یەکتر بڕینی نێوان ژمارەی پرۆتۆنەکان لە ناوکی ژمارەی گەردیلەیی توخمەکان لەگەڵ شوێنی لە خشتەی خولی توخمەکاندا وشەی (الله) بوو بە دێڕێکی پان.



## تۆڕی جاڵجاڵۆكە موعجیزەیەكی زانستی گەورەی قورئانی ئاشكراكرد:

گۆڤاری (kosmos) ی ئەڵمانی لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٤دا وتەیەكی زانستی بڵاوكردەوە، لەڕاستیدا دۆزینەوەیەكی زانستی لەسەر جاڵجاڵۆكە پسپۆران دۆزیانەوە كە مێیەی جاڵجاڵۆكە نەك نێرەی هەڵدەستێت بە چنینی تۆڕی جاڵجاڵۆكە نێرە بەم ئیشە هەڵناستێت. قورئانیش پێش چواردە سەدە باسی فێڵی كافرەكان دەكات و كە هاوشێوەن: ﴿ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ﴿٤١﴾ ﴾العنكبوت: ٤١.

بڕوانە وشەی (ٱلْعَنكَبُوتِ) بەكاردێت بۆ نێرە و مێیە، لە هەمان كاتدا بۆ نموونە دەوترێت (نسجٱلْعَنكَبُوتِ) یان (نسجتٱلْعَنكَبُوتِ) بەلاّم لێرەدا قورئان باس لە مێیە دەكات، ئەمەش دیارە (تاء التأنيث) لە وشەی (اتخذت) هەرچەندە لە زمانی عەرەبی كاتی قسەكردن لەسەر جۆرێك لە زیندەوەران دەكرێت، بە شێوەی گشتی دەبێت بۆ ڕوونكردنەوەی سیفەتێك یان ڕەوشتێكی لەو جۆرە زاراوەی نێرە (ذكر) بەكاردەهێنرێت بۆ قسەكردن یان وەسفی ئەو جۆرە، ئەمەش مانای وایە قسەكردن یان وەسف كردن بەشێوەیەكی گشتی بە شێوەو و شەی مێینە (لتأنيث) بەتەواوی نابێت، تەنها بۆ پێویستییەك یان بۆلاخستن دەبێت. لێرەوە قورئان پێویستی بوو وەك بەڵگەیەك كە نێرەی جاڵجاڵۆكە تۆڕ ناچنێ، بەڵكو مێیەكەی تۆڕ دەچنێ بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە ئەم قورئانە سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار.

***



## موعجیزەی وردەکاری لە گەردوون دا:

لە سوورەتی (یس) ئایەتی (٤٠) خوای گەورە دەفەرموویت:﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ وەلە سوورەتی (الأنبیاء) دا (٣٣) دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

کەدەبینین هاوشێوەن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو تەوەرانە (الافلاك) دەبینین کەلە گۆڤارێك تەمووزی ساڵی ١٩٨٣ی زاینیدا دەڵێت: کاتێك زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێت زۆر بەووردی تەوەرەکەی خۆی دەگرێت، لەهەر (١٨میل) لەو هێڵە ڕاستەی جیادەبێت کەلەنێوان خاڵی سەرەتاو کۆتایی ئەم (١٨ملم) تەنهایە٢.٨میلە، ئەم تەوەرەیە بە شێوەیەك هاوسەنگە ئەگەر ئەم جیاوازییە ببینێت ببیت بە (٢.٥ملم) ئەوە هەمووان سەهۆڵ بەند دەبن، ئەگەر ببێت بە (٣.١ملم) ئەوە هەموویان دەبرژێن.



## دۆزینەوە ناودارەکەی زانایانی گەردوون ناسی ئەڵمانی ڕاستییەکی زۆر گەورەی قورئانی ئاشکرا کرد:

زانایانی گەردوون ناسی ئەڵمانی چەندەها وێنەی تەقینەوەکانی وەکی گەرمی سەر ڕووی خۆریان بەدەست کەوتووە، کەلەناویدا دیارە کەلەو تەقینەوەیەدا چەندەها بڵێسەی ئاگر بۆ ملیۆنەها کیلۆمەتر لە بۆشایی ئاسماندا بەرز دەبێتەوە، لەهەمووی سەیرتر کەزانایانی ئەڵمانی بینیان زۆربەی ئەو بڵێسە خۆرانە لەهەندێ لەشێوەکانیاندا زۆر بەی بە وشتری زەرد دەچن لە ڕۆیشتنیاندا، ڕەنگی بڵێسەی خۆر لەبنەڕەتدا زەردە ئەمەش چەندەها جار دووبارە دەبێتەوە ئەمەش ڕووی ئیعجازی تەعبیری سوورەتی(مرسلات) (٣١-٣٣)دیاری دەکات:

﴿ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِي مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِي بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾ المرسلات: ٣١-٣٣.

لەم ئایەتانەدا ئەم بڵێسانە دیاری دەکات کەزاڵبوونە بەسەر کافرەکاندا، ئەم بڵێسانە وەك کۆشکێکی گەورەیە لەبەرزی و گەورەییدا بە وشتری زەرد دەچن، ئەوەی ئاشکرایە کەئەم خۆرە دەبێتە سەرچاوەی ئازاردان لە ڕۆژی قیامەت دا، چونکە زۆر لە بوونەوەران نزیك دەبێتەوە، هەتا لە ئارەقەی خۆیاندا دەخنکێن، هەروەك لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە، (الله أکبر) لەو موعجیزە زانستییە گەورەیە بەڕاستی ئەوە گەورەترین موعجیزەیە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە نەخوێندەوار بووە چواردە سەدە پێش ئێستا چوزانێ کە بڵێسەی خۆر لە وشتری زەرد دەچێت خۆ تەلەسکۆبی فەزایی نەبوو بەڕاستی ئەوە بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەگومان و دوودڵیدان بەرامبەر ئەم قورئانە پیرۆزە، ئەگەر لەڕاستی ڕانەکەن تەنها ئەوەیان بەسە بۆ ئەوەی بگەنە دڵنیایی تەواو.




## موعجیزەیەکی زانستی گەورە دوای تەرخانکردنی (١٠٠)ملیار دۆلار هاتەدی:

بێباوەڕانی شاری مەککە هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێیان وت ئەگەر تۆ ڕاست دەکەی مانگمان بۆ بکە بەدووکەرت، بەڵێنی باوەڕهێنانیشیاندا ئەگەر ئەم کارەیان بۆ بکات. ئەو کاتە شەوی پانزەی عەرەبی بوو واتە مانگ تەواو وەك تۆپێك وابوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای لە خوای گەورە کرد کەپێی ببەخشێت و جبریل هات و فەرمووی ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) خوای گەورە سەلامت لێ دەکات و دەفەرمووێت هەرچی بتەوێت بۆت دەکەم، ئەوجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی بەرزکردەوەو بە ئاماژەی دەستی پیرۆزی مانگی کرد بە دوو بەش و بەشێکی بۆ سەر کێوی (صەفا) ئەوی تریشی بۆ سەر کێوی (قیعان) ی

بەرامبەری بێباوەڕەکان، ئەمەیان بەچاوی سەر بینی و وتیان موحەمەد جادووی لێکردین دواتر وتیان ئەگەر جادووی لە ئێمە کردبێت ئەوا ناتوانێت لەهەموو خەڵکی بکات، ئەبو جەهل وتی ئارام بگرن تاکو دەشتەکیەکان دێن، ئەگەر ئەوانیش بینیویانە ئەوا ڕاستە، ئەگەر نا ئەوا موحەممەد جادووی لە چاوەکانی ئێمە کردووە.. ئەوان هاتن وتیان بەڵێ لای ئێمەش مانگ بوو بە دووکەرت ئەبوجەهل و بێباوەڕان لەجیاتی باوەڕهێنانیان وتیان ئەمە جادوویەکی بەردەوامە ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند:

﴿ ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ۝٣ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ۝٤ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ۝٥ ﴾القمر: ١-٥.

واتە: ڕۆژی قیامەت نزیك بووەتەوە و مانگیش لەت بووەوە خۆ ئەگەر ئەوانە هەر موعجیزە و بەڵگەیەك ببینن پشت هەڵدەکەن و دەڵێن ئەمە جادوویەکی بەردەوامە، حەقیقەت و ڕاستی بە درۆ دەزانن، شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون لەکاتێکدا هەموو شتێك تەواو دەبێت و هەموو کارێك کۆتایی دێت و دنیا تەواو دەبێت و بەرپابوونی قیامەت لەنگەر دەگرێت. بێگومان ئەوەندە هەواڵی تیاچوونی ستەمکارانیان پێگەیشتووە تا داچڵەکێن و تێفکرن و لەچەوتی دەست هەڵگرن ئەو بەسەرهاتانە حیکمەت و پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە، بەڵام بۆ ئەوانە بێدارکردنەوە بێ سوودە وگوێ مەدەیە ناپوختی ئەوانە ڕۆژێك دێت کە بانگ بێژێك بانگ دەکات بۆ بارودۆخێکی زۆر ناخۆش و نالەبار.

لەیەکێك لە وانەکانی پرۆفیسۆر (دکتۆر زەغلول نەججار) لە زانکۆکانی بەریتانیا وتی بێگومان موعجیزەی کەرت بوونی مانگ لەسەر دەستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) ڕوویداوە، دواتر ئەو بەسەر هاتەی سەروەی باسکرد یەکێك لەو ئینگلیزانەی کە گرنگی بەئیسلام دەدا کە ئێستا سەرۆکی یەکێکە لە حیزبە ئیسلامییەکانە بەناوی (داود موسا) وتی: یەکێك لەبرادەرەکانم لێکۆڵینەوەیەکیان پێدابوو لەسەر وشەکانی

قورئان بەئینگلیزی، وتی کە کردمەوە سوورەتی (القمر) دەرچوو ئەوەم خوێندەوە کە دەفەرمووێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴾ بەگومانەوە وتم ئایا ڕاستە کە مانگ دووکەرت بووە؟ دواتر قورئانەکەم دابەیەك و جارێکیتر نەم کردەوە ڕۆژێك لەبەرامبەر تەلەفزیۆنی بەریتانی دانیشتبووم بۆ بینینی یەکێك لەبەرنامەکانی (BBC)، کەبێژەرەکە گفتوگۆی لەگەڵ سێ زانای ئەمریکی دەکرد، گلەیی ئەوەی دەکرد کە ئەمەریکا بە ملیار دۆلار لە پرۆژەکانی ئاسمانی تەرخان دەکات، کاتێك کەبە ملیۆنان کەس لەژێر سێبەری هەژاری و کەم دەرامەتیدا دەناڵێنن، زاناکانیش پۆزشیان دەهێنایەوە بەوەی ئەمە بۆ لایەنەکانی کشتووکاڵ و پیشەسازی سوودی هەیە، دواتر باسی یەکێك لەگەشتە ئاسمانییەکانیان کرد کەتێچووەکەی نزیکەی (١٠٠)ملیار دۆلار بووە. بێژەرەکە پرسیاری کرد ئایا ئەمە تەنها بۆ ئەمە بووە کە ئاڵای ئەمەریکا لەسەر مانگەکە بچەقێنن؟

زاناکان ئەمەیان ڕەت کردەوە و وتیان بۆ ئەمە بووە لێکۆڵینەوەیان لەسەر خاکی مانگ کردووە، تاوەکو ڕووە لێکچووەکانی لەگەڵ خاك و خۆڵی زەوی ببیننەوە، لەناکاو شتێکی یەکجار سەیرمان بینی بریتی بوو لەوەی کەبەردێك لەشێوەیەکی تواوە و وەکو پشت بێندێك ناوەڕاستی مانگی گرتووە، لەسەرروویەوە تاوەکو بنەکەی، ئەمە شتێکی زۆر سەیر بوو ئەم زانیاریانەمان بۆ زەوی ناسەکان هێنا ئەوانیش سەریان سوڕماو وتیان ئەمە نابێت وابێت تەنها ئەگەر لە ڕۆژێکدا مانگ بووبێت بە دووکەرت لەئەنجامی بەیەك کەوتنەوەیدا ئەم پشت بەندە بەردین درووست بوو بێت.

دەڵێ لەکاتێکدا کە گوێ بیستی ئەمە بووم لەشوێنی خۆمەوە ڕاچڵەکام و وتم ئەمە موعجیزەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش چواردە سەدە لەناو جەرگەی دەشتیدا ڕوویداوە و، ئێستە وا لەئەمریکییەکان دەکات کە ملیارەها دۆلار تەرخان بکەن تاکو ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیە بسەلمێنن. کەواتە ئەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام ڕاست و درووستە بەڵێ دیسان سوورەتی (القمر) بووە هۆکارێك کەبەتەواوی ئەم ئاینە پیرۆزە لەباوەش بگرێتەوە.



## ٢٢٢ دەركەوتنی موعجیزەیەكی زانستی گەورە دەربارەی كێشی قورسایی هەورەكان:

زانایان بینیان كە كێشی هەورەكان دەگاتە (٣٠٠٠٠٠) تەن، وە هەندی جار لەمەش تێدەپەڕێت (هەوری بەناو ( camulo – nimbus) لەم جۆرەیە ئەوەی شایانی باسە ئایەتی (٥٧) سورەتی الاعراف باسی ئەوەی كردووە: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ الأعراف: ٥٧.

واتە : خوا زاتێكە بایەكان دەنێرێ بە موژدەدەر پێش بارانی ڕەحمەتی پەروەردگار هەتا كاتێ هەوری قورسی باراناوی هەڵدەگرن دەینێرین بۆ وڵاتێكی مردوو وشكی بێ گیان، جا بەو هەورە باران دەبارێنێ بە هۆی ئەوەوە هەر بەو وێنەیە مردووەكان لە زەوی دەردەهێنین زیندوویان دەكەینەوە تا ئێوە بیربكەنەوە .



## ٢٢٣ باراندنی باران بەپێوەر یەكێكە لە موعجیزە درەوشاوەكانی قورئان :

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ ﴾ الزخرف: ١١.

لەم ئایەتەدا خوای گەورە باس لە باران بارین دەكات بە ژمارەو بەقەدەر لێرەوە باس لەو بابەتە دەكەین لە دوو ئاستدا:

یەكەمیان: لە خێرایی هاتنە خوارەوەی باران زاناكان هەستان بە پێوانەی خێرایی گەیشتنی دڵۆپەی باران لەبەرزایی (١٢٠٠م) بەرزایی هەورەكان لە بۆشاییدا، بینیان كەهەر دڵۆپێك دەگاتە سەر زەوی بە خێرایی (٥٥٨كم) كاتژمێر، بەڵام لە ڕاستیدا بە

خێرایی (٨-١٠کم) کاتژمێر دەکەوێتە سەر زەوی ئەمەش بەهۆی باو لێك خشانی لەگەڵ هەوا کە ئەم دوو هۆکارانە خێرایی کەوتنە خوارەوی دڵۆپەکە کەم دەکەن، ئەگەر هاتوو بەرگری هەوا و با نەبووایە خێرایی کەوتنەخوارەوەی دڵۆپەکە، ئەگەر هاتوو بەرگری هەواو با نەبووایە خێرایی کەوتنەخوارەوەی بنەڕەتیەکە یەکسان دەبوو بەکەوتنەخوارەوەی (١کگم) لەبەرزایی (١٥سم) بۆ هەر دڵۆپێك، بۆ زانیاریش هەندێك هەور لەبەرزایی (١٠٠٠٠م)دا دەبێت لەم بارە کەوتنە خوارەوەی هەر دڵۆپە ئاوێك یەکسان دەبێت بەکەوتنە خوارەوەی (١کگم) لەبەرزایی (١١٠سم)، بڕوانە ئەم هاوسەنگی و تەقدیرە.

دووەمیان: پسپۆران بینیان کە هەڵم بوونی ئاو لەیەك چرکەدا لەڕووی زەویدا دەگاتە (١٦ملیۆن) تەن، ئەم ژمارەیە هەمان ژمارەی ئەو بارانەیە کەدەکەوێتە سەر زەوی لەهەمان چرکەدا (سبحان الله) بەڕاستی ئەم قورئانە پڕیەتی لە ئیعجازی زانستی ناودار.



## ٢٢٤ شێوازی دروست بوونی بارانی سازگار:

لە سوورەتی الواقعه ئایەتی (٦٨-٧٠) ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ واتە: جا پێم بڵێن ئەو ئاوەی کەدەیخۆنەوە ئایا ئێوە لەهەورەوە دەیبارێنن یان ئێمە دەیبارێنین، ئەگەر بمانویستایە دەمانکرد بە ئاوێکی زۆر سوێری تاڵ ئیتر بۆ سوپاسی خوا ناکەن، بەڵێ خوای گەورە باس لە ئاوی شیرین و سازگار دەکات کەلە ئاسمانەوە دەنێردرێتە سەر زەوی. هەروەها ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (المرسلات) دەفەرموویت: ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ ﴾ واتە: وەلەناویدا شاخانی بەرزی لەنگەرداکوتاومان داناوە وە ئاوی شیرینمان پێ نۆشین.



ئەوەی ئاشکرایە سەرچاوەی ئاوی باران کرداری بەهەڵم بوونە لە٪۹۷ی ئەم هەڵمە لە ئۆقیانوسە سوێرەکانەوە دێت ئایا چۆن بارانی سازگارو شیرین دەبێت؟ هۆی ئەمەش یاسایەکە خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە ئەویش کاتێك ئاو بەهەڵم دەبێت چ لە ئۆقیانووسەکان و زۆنگاوەکان و کانیاوەکان، چ لەقوڕبێت ماددە بیانیەکانی ناو ئاوەکان لەگەڵ خۆیدا ناگوازێتەوە، دەباسەیری ئایەتی (٤٨)ی سوورەتی (الفرقان) بکەین بزانین چی دەفەرمووێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ ﴾ واتە: خوا زاتێکە باکان دەنێرێ بەمژدەدەر پێش ڕەحمەتی خۆی باران بارین وە لەئاسمانەوە باراندوومانە ئاوێکی پاکۆکەر و پاك و خاوێن.

##  ٢٢٥ دۆزینەوەی شاری ئور موعجیزەیەکی گەورەی دەرخست:

دۆزینەوەی شاری (ئور) لەعێراق ئاشکرای کرد کەخەڵکی وادی ڕافیدەین لەزەمانی کۆنەوە مانگ و خۆر و ئەستێرەیان بەپیرۆز زانیوەو پەرستویانن، بەتایبەت خوای مانگ کەناوی (سن) بووەو پەیکەریان لەبەرد بۆ تاشیوەو لەسەر بەرد وێنەیان بۆ کێشاوە. کەوێنەکەش وەك دۆزراوەتەوە بریتی بووە لەپیاوێکی ڕیش درێژ کە مانگ لە شێوەی هیلالدا لەسەر دەستیەتی، ئەم بت پەرستیەش چەند هەزار ساڵی خایاند پاش هاتنی پێغەمبەر ئیبراهیم چەند هەزار ساڵ پێش پێغەمبەر بووە. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکوێ زانی گەلەکەی ئیبراهیم چییان پەرستووە؟ ئینجا دۆزینەوەکان لەم دوواییەدا پاش (١٤٠٠ساڵ) شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستیەتی قورئان کەلەبارەی گەلی ئیبراهیمەوە دەفەرمووێت: ئەستێرە و مانگ و خۆریان پەرستووە: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا

رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ الأنعام: ٧٤-٧٨.

واته: بیربكەرەوە كاتێك كە ئیبراهیم وتی بە ئازەری باوكی ئایا تۆ بتانێك دەكەیتە پەرستراوی خۆت؟ بەڕاستی من تۆو گەلەكەت لە گومڕاییەكی تەواو ئاشكرادا دەبینم ئەو شێوەیە نیشانی ئیبراهیممان دا دەسەلآت و خاوەنیەتی خوا بۆ ئاسمانەكان و زەوی بۆ ئەوەی لەڕیزی باوەڕدارە ڕاستەقینەكاندا بێت، كاتێك شەوی بەسەرداهات ئەستێرەیەكی بینی وتی ئەمە پەروەردگاری منە بەلآم كاتێك كە ئاوابوو وتی سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم ڕێنوێنیم نەكات بێگومان لە كۆمەڵی گومڕایان دەبم، ئینجا كاتێك خۆری بینی هەڵهات وتی ئەمە پەروەردگاری منە ئەمە گەورەترە لەوان، جاكاتێك خۆریش ئاوا بوو وتی ئەی گەلەكەم بەڕاستی من بەریم لەهەرشتێك كەئێوە دەیكەن بەهاوبەش بۆ خوا.

یان بۆ گەلی (سبأ) دەفەرمووێت: كەخۆریان پەرستووە و دۆزینەوەكانی سەردەمیش لەیەمەن ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن یان بۆ گەلی نوح قورئان دەفەرمووێت پێنج بتیان پەرستووە و ناوی هەر پێنجیشیان دەبات ﴿ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا ﴿٢٣﴾ ﴾نوح:٢٣، واتە: وتیان دەست هەڵ نەگرن لە بت و خواكانتان دەست هەڵنەگرن لە پەرستنی وەد و سوواع و یەغووث یەعوق ونەسر.

***



## ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی ڕاستیەکی گەورەی قورئانی بەبەڵگەوە ئاشکرا کرد:

قورئانی پیرۆز داوا لە دایکان دەکات شیری خۆیان بدەن بە منداڵەکانیان. ئاشکرایە کە شیر دانی سرووشتی زۆربەسودە بۆ چاك پێگەیشتنی منداڵ و دروست بوونی بەرگری تەواو لە لەشیدا. ماوەی شیر دانەکەش قورئان دیاری دەکات بە دوو ساڵ، ئەگەر دایکێك بیەوێ شیری تەواو بدات بە منداڵەکەی هەر وەك دەفەرمووێت:

﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ ﴾ البقرة: ٢٣٣.

لەئایەتەکەدا فەرمان دەدات بە دایکان کە دووساڵی تەواو شیربدەن ئەگەر بیانەوێت شیری تەواو بدەن ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە، ئەگینا کێ چواردە سەدە لەمەوبەر توانیویەتی باسی ماوەی شیردانی تەواو و چاك بکات کەمنداڵ تیایدا لەشی بەرگری تەواو پەیدا دەکات، ئەوەتا لەم دواییەدا پاش هەزاران لێکۆڵینەوە و خەرجکردنی ملیۆنەها دۆلار ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی گەیشتە ئەو دەرئەنجامە.



## سوڕی مانگانە و پەیوەندی لەگەڵ نەخۆشییەکان:

قورئانی پیرۆز هەرچەندە ئیعجازی زانستی لێوەدەربهێنرێت هەر زیاتر دەکات و لێی کەم نابێتەوە، ڕۆژلەدوای ڕۆژ ڕاستی ئەم قورئانە پیرۆزە دیار دەکەوێت و ناحەزانیش لەسەرشۆڕی زیاتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە. ئەگەر سەیرێکی ئەو کەسانە بکەین کەبەهۆی ئیعجازی زانستی و پزیشکی و لە قورئانی پیرۆزەوە موسڵمان بوون ئەوە دەبینین هەموویان ئەو کەسانەن کە پلەی زانستی بەرزیان هەیە یاخو ڕۆشنبیرو لێکۆڵەری بەتوانابوونە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەئەوان زیاتر لەهەموو کەسێك کار بەعەقڵیان دەکەن و بیردەکەنەوە و بەدوای ڕاستییەکاندا دەگەڕێن، ئەمەش تەواویەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ

نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت: ٤٣. واته: ئەم نموونانە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵك تەنها زانا وشارەزاكان تێی دەگەن وتێی دەفكرن، جوت نەبوون لەگەڵ ئافرەتان لە كاتی سوڕی مانگانەیاندا باسی ئەو بابەتەیە دەبێت مرۆڤ خۆی دوور بگرێت تاپارێزراوبێت لەزۆرێك لەنەخۆشییەكان.

دكتۆر(محی الدين طالوالحلبی) لەوبارەوە دەڵێت پێویستە جوتبوون ڕوونەدات لەگەڵ ئافرەتان لەناو سوڕی مانگانەیاندا، چونكە ئەم كارە لەوكاتەدا سەردەكێشێت بۆ نەزیف بوون ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونكە دەمارەكانی ڕەحمی ئافرەتان لەوكاتانەدا لەبارنیە، چونكە دیوارەكەی ئاسانە كەناتەواوی تێدابكەوێت كەدەبێتە هۆكار بۆ هەوكردنێكی – ئیلتیهاباتێكی گەورە كەسەردەكێشێت بۆ هەوكردنی ڕەحم، ئەمە پیاوەكەش دەگرێتەوەو ئەندامی نێرینەی ئەویش دوچاری نەخۆشی دەبێتەوە.

دكتۆر (بار)دەڵێت ئەو ئازارانەی دوچاری ئافرەتان دەبێتەوە تەنها لەوە كورت ناكرێتەوە كە دژەتەنی كەم و لاواز دەبێت، بەڵكو لەگەڵ ئەوەدا جوت بوون لەگەڵ ئافرەتان لە حاڵەتی سوڕی مانگانەیاندا ئافرەتەكە دوچاری ئەوانەی خوارەوەش دەبێتەوە:

١– درێژبوونەوەی هەوكردن تاوەكو دیوارەكانی ڕەحم دەگرێتەوە قەپاتی دەكات، كە كاریگەری دەبێت بۆ پاڵنانی هێلكۆكە لە هێلكەدانەوە بۆ ناو ڕەحم بەنائاسایی ئەمەش سەردەكێشێت بۆ نەزۆكی یاخود سكپڕبوون لە دەرەوەی ڕەحم كە ترسناكترین شێوازی سكپڕبوونە

٢– هەوكردن درووست دەبێت و سەردەكێشێت بۆ میزڵدان ئەمەش وادەكا: دووچاری نەخۆشی گورچیلە ببێتەوە بەشێوەیەكی درێژخایەنی.

٣– ئەو خوێنە پیسەی فڕێی دەدات تەژیە لە میكرۆبات بەتایبەتی میكرۆبی سەیلات كەزۆر ترسناكە.

٤– ئافرەت لەوكاتانەدا دوچاری سك ئێشان و سەرئێشەو پشت ئێشە دەبێتەوە، تەنانەت هەندێكیان پێویستیان بەدەرزی هێوركەرەوە و سڕكەر هەیە، بۆیە

لەوحاڵەتانەدا ئارەزووی سێکسی ناکات بەپێچەوانەوە دووچاری ساردبوونەوەی سێکسی دەبێتەوە.

٥- جوت بوون لەوکاتانەدا هەردوولایان دووچاری نەخۆشی پرۆستات دەکات بەتایبەتی پیاوەکە.

مامۆستایەکی ئافرەتی فەرەنسی کاسۆلیکی لەزانکۆی (سۆربۆن) وانەی پزیشکی دەوتەوەو، دوای لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژ لەسەر نەخۆشیەکانی بۆری میز و گورچیلە و نەخۆشیەکانی پێست، گەیشتە ئەو ڕاستییەی کەوا بەڵێ جوت بوون لەگەڵ ئافرەتێك کەلەسوڕی مانگانەدا بێت، ئەوا بکەرو ئافرەتەکە هەردووکیان دووچاری نەخۆشیەکانی بۆری میز و گورچیلە و نەخۆشیەکان پێست دەبنەوە، کاتێك ئەو مامۆستایە بەفیزەوە خەریکی ئاشکراکردنی لێکۆڵینەوەکەی بوو یەکێك لە خوێندکارە موسڵمانەکانی دەستی هەڵدەبڕێت و هەڵدەستێتەوە و دەڵێت مامۆستا قورئانەکەی ئێمە چواردە سەدە پێش تۆ باسی ئەوەی کردووە، مامۆستاکە بەسەرسوڕمانەوە وتی شتی وانابێت خوێندکارە موسڵمانەکە وتی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٢.

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی سوڕی مانگانەی ئافرەت پێیان بڵێ ئەوە ئازار و زەرەرە کەوابوو خۆتان بەدوور بگرن لەهاوسەرەکانتان کەلەو حاڵەتەدابن، نزیك مەکەونەوە تا پاك دەبنەوە جاکاتێك پاك و خاوێن بوونەوە خۆیان شوشت ئەوجا بچنەلایان بەو شێوەیەی کەخوا فەرمانی داوە و بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆش دەوێت. ئەوانەی ڕواڵەت و ناوەڕۆکیان پاکە.

مامۆستاکە وتی حەزدەکەم لەگەڵ زاناو پسپۆرە پزیشکیەکانی ئێوە بدوێم دوای ئەوەی مامۆستاکەبۆ زانکۆی ڕیاز لەسعودیە بانگهێشتکرا لەگەڵ چەند زانایەکی موسڵمان گفتوگۆی کردو پاشان موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و وتی: بەڵێ ئێوە

ڕاست دەکەن من زۆر دواکەوتم نەمزانی ئەم پەرتووکە بەم شێوەیە پڕە لەزانست ئێمە لەکلێسەکانمان هەر ئەوەیان پێ گوتووین کە گوایە پەرتووکی چیرۆکە هەڵبەستراوەکان زۆرن، ئەو زانایانەی هەڵخەڵەتێنراون بەم جۆرە وتە بێ نرخ و ناپاك و ڕق لەدڵانەی دوژمنداری قورئان دەکەن، سوپاس بۆتۆ خوای گەورە ئەم پەرتووکە پیرۆزەت کردووە بەخەزێنەیەکی نەبڕاوەی پڕلە زانست و زانیاری.



## پەیوەندی هەیە لەنێوان هەستی بیستن و دڵدا:

زاناکان دانیان ناوەبەوەی کەپەیوەندیەك لەنێوان هەستی بیستن و دڵدا هەیە ئەو دەنگەدەنگەی کەبەبەردەوامی مرۆڤ توشی دەبێت، کاریگەری لەسەر بەجێگەیاندنی کارەکانی دڵ هەیە ئەو دەنگە بەرزانەی بەبەردەوام هەندێك لەمرۆڤەکان لەناویدا دەژین کێشە لەهەستی بیستن درووست دەکات. ڕاچڵەکین لەخەو و دڵەڕاوکێ بەشێکن لەکاریگەریەکانی دەنگی بەرز، کەواتە کێشەکانی دڵ سەردەکێشن بۆ کێشە لەبیستندا (سبحان الله) بۆ ئەو خوایە زانایەی کە ئەم پەیووەندییەی پێ ڕاگەیاندووین: ﴿ وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ۝١٠٠ ﴾ الأعراف: ١٠٠. واتە: مۆرمان دەنا بەسەر دڵەکانیاندا جا ئەوان نابیستن سەیربکەن بە مۆرکردن لەسەر دڵەکانیان هەستی بیستنیان نەماوە، ئایا ئەمە ڕوونترین بەڵگەنیە کەئەم قورئانەپیرۆزە لەلایەن خوای زانا و دانا دابەزیوە؟ ئایا بەڵگەی زانستی و درووستی نیە لەسەر پەیامەکەی باشترین دروستکراوی خوای گەورە پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم).

***



## گوێچکە یەکەم ئەندامی لەشە لەدرووستکردندا:

لەیەکێك لەموعجیزەکانی قورئاندا ئەوەیە کەوا باس کراوە ئەرکەکانی لەش بەگەشەکردنی تەمەن گەشەدەکەن، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ ۖ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ یس: ٦٨. لەنزاکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یشدا هاتووە کەفەرمووی: (اللهم متعنا بأسماعنا و أبصارنا وقواتنا ما أحييتنا واجعله الوارث منا) زانایان فەرموویان مانای (وجعله وارث منا) ئەوەیە بەسەلامەتی بیان هێڵیەوە تاوەکو دەمرم هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتێك کڕنوشی دەبرد دەیفەرموو: (اللهم لك سجدت وبك أمنت ولك أسلمت سجد وجهي للذي خلقة وصوره وشق سمعه وبصره فتبارك الله أحسن الخالقين)

سەیرکەن وشەی بیستنی بەپێش وشەی بینین خستووە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زانستی کۆرپەلەی ئاشکرا کردووە بەیەك وشە، کەهیچ وشەیەك و دەربڕینێك لە درووستکردنی گوێچکەدا هێندەی ئەمە کورت و پڕمانانیە کەفەرمووی: (شق سمعه و بصره) کەگوێچکە لە سێ بەش پێك دێت: گوێی دەرەوە –ناوەڕاست–گوێی ناووە. گوێچکەی ناووە سەرەکییە لەبیستندا ئەویشە کەیەکەمجار دەست دەکات بە درووست بوون، کاتێك گوێچکە بەتەواوی درووست دەبێت پێش هاتنە دەرەوەی گوێچکەی ناوەوەش تەواو دەبێت لەلایەن ئەندازیارەوە تا کۆرپەلە دەگاتە نزیك هەفتەی بیست و دوو ناوەڕاستی ماوەی سك پڕییە، کاتێك لە گوێچکە ئەم هەستە تەواو بوەیە لەدوای لەدایك بوونەوە سوننەتە لەبن گوێچکەکانی منداڵەکەدا بانگ بدرێت، هەروەها لەم فەرموودەیەدا هاتووە کەپێشەوا ترمذی دەیگێڕێتەوە ( عن عبدالله أبي رافع عن أبية قال رأيت رسول الله_صلى الله علية وسلم_أذن في أذن الحسن بن علي حين ولدتة فاطمة بالصلاة) واتە: عبداللەی کوڕی ئەبی رافع لە باوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی بینیم کەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی نوێژیدا بە گوێی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی کاتێك فاتیمە ئەو کوڕەی بوو ڕەزای خوای گەورە لە هەموویان بێت.



## ههستی بیستن لهکاتی خهودا ئیعجازێکی گهورهی قورئانه:

لهم ئایهته پیرۆزانهدا خوای گهوره بیستن و خهوی بهیکهوه بهستووهتهوه: ١- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ ﴾ القصص:٧١ .

شهو و بیستنی بهیهکهوه بهستووهتهوه، وشهی (سرمداً) بهبهردهوامی، ٢- ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ﴾ الكهف:١١. چهند سالێك وامان کرد کهبخهون و نهبیستن لێرهشدا موعجیزهیهکی گهوره خۆی حهشارداوه نههێشتنی بیستن (المنع عن السمع) بهوه دهبێت کهدهماری بیستن ڕابگیرێت، ئهم دهمارهش دوو بهشی ههیه، یهکهم: بهرپرسه لهبیستن، دووهمیش لهڕاگرتنی تهوازنی لهش لهناوهوه و دهرهوهدا. بۆیه خوا نهیفهرمووه (فضربنا على سمعهم)بهڵکو فهرمووی: ( فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ ) بۆ ئهوهی ههموو گوێچکه بگرێتهوه – سبحان الله- قورئانی پیرۆز باسی ئهوهی کردووه که دهنگی بهرز بۆ گوێچکه و لهش زیان بهخشه ئهوهی بۆ گوێچکه زیانه فهرموویهتی: ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ ﴾ عبس:٣٣.

(الصاخه): ئهو دهنگهیه یان ئهو قیژهیه کهوا گوێچکه کهڕدهکات لهبهر ئهوهشه کهناو لهقیامهت نراوه (الصاخه)، ئهمه یهکهم بهڵگهنامهی زانستییه کهوا ئاشکرای کردبێت دهنگی بهرز گوێچکه کهڕدهکات، بهڵام زیانهکانی بۆ لهش ئهمهیه سهیری ئهم موعجیزهیه بکهن دهنگی بهرز تهنها زیانی بۆ گوێچکه نیه بهڵکو بۆ ڕووبهری بیستن بهههمان شێوه لهسهر تێکڕای بهشهکانی لهش زیانی ههیه. خوای گهوره بهدهنگی بهرز چهند گهلێکی لهناوبردووه ههروهك فهرموویهتی: ﴿ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَـٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ یس:٢٩. ههروهها ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾ الأعراف:٧٨. بێگومان دهنگ بریتییه له بهشێك لهوزه بهشێوهیهك لهشێوهکان کاتێك ئهم وزهیهش له ئهندازهی درووستی خۆی زیادی کرد زیانی بۆ گوێچکه دهبێت

ئەوکاتیش تێکڕای بەشەکانی لەش زیانمەند دەبن، چونکە مرۆڤ دوچاری دڵتەنگی و دەمارگرژی و نەمانی یەکسانی لەش دەبێت کەڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر دڵ و لێدانەکانی دڵ زیاد دەبێت، خوێن بەرز دەبێتەوە، ئەوەش زیاتر ڕوون دەبێتەوە لەکاتی تەقینەوەی بۆمبێك کەسانێك مردوون بێ ئەوەی شوێنێکیان بریندار بووبێت، ئەوە کاریگەری دەنگەکەیە کە ئەوانی کوشتووە کەکاردەکاتە سەر ڕاوەستانی دەمارە سەرەکییەکان –شادەمار– تەقینەوەی ڕیخۆڵەکان و ڕاوەستانی دڵ لەلێدان، ئەوەی دەمێنێتەوە ڕێزلێنانی گوێچکەیە کاتێك خوا وەسفی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات بە (أذن الخير)، کاتێك دووڕووەکان ویستیان ئازاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەن وتیان: ئەو گوێ بیستی هەموو درۆ و فێڵێك و ناڕاستێك دەبێت، خوای گەورە بە وتەی ئەوانە وەلآمی دانەوە و فەرمووی ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾ التوبة: ٦١.

بەڵێ ئەوە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە پێشەوایەیە کە گوێچکەی چاکەی مەردوومە گوێ لە سروشی خوا دەگرێت و دواتریش بەخەڵك ڕادەگەیەنێت کە چاکەو بەرژەوەندی ئەوان لەوەدایە کە گوێڕایەڵبن.

یان ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ فصلت:٢٦.

واتە: بێباوەڕان دەیانوت: گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەن بە گاڵتەو هەرا و هوریا لەو سەردەمەدا ئەو ڕاگەیاندنەی بەدەست ناحەزانەوەیە ئەو ڕۆڵ دەبینێت.

***



## ٢٣١ قورئان وەسفی خۆر دەكات بە چرا زانستی تازەی سەردەمیش بەبەڵگەوە ئەوە دەسەلمێنێت:

لەسەردەمی دابەزینی قورئاندا كەسێك لەسەر زەوی نەبوو كەڕاستی خۆر بزانێت بەڵام دروستكاری خۆر زۆر بەجوانی لەم ئایەتەدا باسی كردووە و دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ ﴾ النبأ:١٣. واتە: چرایەكی پرشنگدارمان بۆ فەراهەم هێناون ئەم ئایەتەش ئەوەمان پێدەڵێت كە خۆر بریتییە لە چرایەك بۆ سوتاندنی سوتەمەنی بۆ وەبەرهێنانی ڕووناكی و گەرمی، زانستی تازە دەڵێت: ئەمەش ئەم كارەیە كە خۆر پێی هەڵدەستێ خۆر بە سوتاندنی گازی (هایدرۆجین) هەمان كردار دەكات و گەرمییەكەی دەگاتە زیاتر لە (١٥ملیۆن) پلەی سەدی، –سبحان الله– كەواتە ڕووناكی و گەرمی بەرهەم دەهێنێت لەبەر ئەمەش ناوبردنی خۆر بە (چرا) باشترین وشەی دەربڕینە لەڕووی زانستییەوە.



## ٢٣٢ ڕەنگەكانی ئاگر و گەرمییەكەی و دەركەوتنی نهێنییەكی گەورەی قورئان:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِذَا أُلْقُوا فِيهَا سَمِعُوا لَهَا شَهِيقًا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَاعْتَرَفُوا بِذَنبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَابِ السَّعِيرِ ﴿١١﴾ ﴾ الملك:٧–١١. واتە: هەروەها بۆ ئەوانەش كە باوەڕیان بە پەروەردگاریان نییە سزا و ئازاری دۆزەخ ئامادەیە، ئای كە چارەنوس و سەرئەنجامێكی زۆر ناسۆر و ناخۆشە كاتێك فڕێ دەدرێنەناوی دەنگێكی ناساز و ناخۆش و لوورەیەك لە دۆزەخەوە دەبیستن، لەكاتێكدا قوڵپ دەدات و

دەكولێت لەداخی خوانەناسان خەریكە پاچە پارچە ببێت و لێك ببێتەوە، هەر جارێك دەستەو تاقمێك فڕێ دەدرێتەناوی، پاسەوانی دۆزەخ لێیان دەپرسێت باشە ترسێنەرێكتان بۆ نەهات تالەم سەرئەنجامە ئاگادارتان بكاتەوە؟

لەوەلاّمدا بەكەساسی دەڵێن: با بەڵێ لەڕاستیدا ترسێنەرمان بۆهات بەلاّم ئێمە بڕوامان پێنەكردن و وتمان: خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە ئێوە تەنها لەگومڕایی گەورەدا گیرتان خواردووە و هیچیتر، ئینجا دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە و بیر و هۆشمان بەكاربهێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ، ئەوسا ئیتر بەناچاری و خەجاڵەتییەوە دان بەگوناه و تاوانی خۆیاندا دەنێن. جابا نیشتەجێكانی دۆزەخ لەوەولاترچن.

ڕەنگی سووری ئاگر بریتییە لەنزمی پلەی ئاگرەكە بەهەزاران پلە بەڵام ئاگری دۆزەخ ڕەشێكی تاریكە كەئەوەش بەڵگەیە لەسەر پلەیەكی یەكجار بەرزی ئاگرەكە خوایەگیان دەبێت چەند گەرم بێت؟ ئەوەی لەهەمووی جێگای سەرسوڕمان بێت ئەوەیە كەوا دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە، ئەگەر لە قورئانیش بگەڕێین دەبینین كەوا حەوت جار وشەی ڕەنگی ڕەش باسكراوە واتە: بەژمارەی دەرگاكانی دۆزەخ بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە.




## زانستی تازە ڕاستییەكی قورئانی ئاشكراكرد دەربارەی ئەوەی كە گیاو سەوزەواتیش هێزی ڕزگاركردنی هەیە:

ئێستا زانایان ئاشكرایان كردووە كەوا سەوزە و گیا و گوڵەكان بەهەندێك لە زیندەوەرە گەورەكان خۆیان لە زیندەوەرە بچوكە زیانبەخشەكان دەپارێزن چۆن؟ ئەم سەوزەیە ماددەیەكی كیمیایی دەردەكات كەوادەكات زیندەوەرە گەورەكان لەخۆی كۆدەكاتەوە بەم شێوەیە زیندەوەرە گەورەكان بچووكەكان دەخۆن و گیا و سەوزەكەش ڕزگاری دەبێتئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە گیا و سەوزەواتیش هێزی

ڕزگارکردنی هەیە و خوای گەورە باسی ئەمەشی کردووە کە چۆن ڕێگای ژیان و ڕزگاربوونی پیشانی هەمووشتێکداوەو دەفەرموویێت: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠ ﴾ طه: ٥٠. واتە: موسا وتی پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کەهەموو شتێکی بەتایبەتی ڕێك و پێك درووست کردووە پاشان ڕێنموونی کردووە تابەچاکی دەوری خۆی ببینێت و لەخزمەتی ئادەمیزاد دا بێت سەیری وشەی (كُلَّ شَىۡءٍ ) بکەن ئایا هەموو شتێك ناگرێتەوە؟



## مێشکی دڵ لەقورئاندا باس کراوە زانستی تازەش بەبەڵگەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت:

کاتێك دەڕوانینە ئەم ئایەتەی قورئان: ﴿ وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ ۝١٧٩ ﴾ الأعراف: ١٧٩.

واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ درووست کردووە، چونکە ئەوانە دڵیان هەیە و کەچی هەقی پێ تێناگەن چاویشیان هەیە کەچی هەقی پێ نابینن گوێیان هەیە کەچی هەقی پێ نابیستن.

لێرەدا باس لە (٣ )ئەندامی گرنگ دەکات بێباوەڕان بەکاریان نەهێناون بۆ وەرگرتنی هەق و باسی کارەکانیان دەکات (لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا )، واتە: بەدڵەکانیان بیرناکەنەوە ( وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا ) بە چاوەکانیشیان نابینن (وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ ) بە گوێیەکانیشیان نابیستن.

خوای گەورە کەباسی دڵ دەکات لەو (٣) ئایەتەی قورئاندا زۆرترین ئەندامی لەش کەلەقورئاندا ناوی هاتبێت دڵە، لەهیچیاندا باسی کارەسەرەکیە فسیۆلۆجیەکەی ناکات کەبریتییە لەناردنی خوێن بەڵکو هەمیشە باس لەکارە عەقڵی و دەروونیەکان دەکات.

یەکێك لەو شتە نوێیانەی کەدۆزراوەتەوە لەکارەکانی دڵ زاراوەیەکە پێی دەوترێ مێشکی دڵ (Heart Brain) پێشتر وادەزانرا کە وشیاری (الوعی) تەنها لەمێشکەوە دەردەچێت، بەڵام لێکۆڵینەوە تازەکان ئەوەیان سەلماندووە کە وشیاری جگە لەمێشك لە لاشەشەوە سەرچاوەدەگرێت، دڵیش ڕۆڵی لەبەرچاوی هەیە لەوکارەدا، دڵ تەنها ئەوترۆمپایە نیە کەخوێن پاڵپێوە دەنێت، زانایان دۆزیویانەتەوە کە دڵ سیستەمێکی ئاڵۆزی هەیە و مێشکی خۆی هەیە توێژینەوەکان دەریانخستووە کە دڵ ئەندامێکی هەستیار و سەنتەرێکی پێشکەوتووە بۆ دەرککردن و چارەسەرکردنی زانیارییەکانی. ئەم سیستەمە دەمارییەی کەلەدڵدایە کەپێی دەوترێت مێشکی دڵ، توانای فێربوون و بیرهاتنەوە و بڕیاردانی هەیە بێ گەڕانەوە بۆ مێشك، واتە توێکڵی مێشك. هەروەها دۆزاوەتەوە کەبەردەوام ئەو ئاماژانەی کەلەدڵەوە دەردەچێت بەرەو مێشك کاردەکاتە سەر کاری سەنتەرە بەرزەکان لەدەرك پێکردن و سۆز و مەعریفە جگە لەوتۆڕە دەمارییەی کەدڵ دەیبەستێتەوە بەمێشك و تەواوی لەش.

دڵ زانیاری دەگەیەنێتە مێشك و هەموو لەش لە ڕێگای کارلێکی بوارێکی (ئیلیکترۆمەگنێتیك). دڵ بەهێزترین و بەرفراوانترین ڕیتمی موگناتیسی درووست دەکات. بەبەراوردکردنی (ئیلیکترۆمەگنێتیك) ەی کەمێشك دروست دەکات ئەوەی دڵ شەش جار گەورەترو فراوانترەو دەچێتەناو هەموو خانەکانی لەش. هەروەها ڕەگەزی موگناتیسی دڵ (٥٠٠٠جار) بەهێزترە لەوانەی بواری موگناتیسی مێشك و دەتوانرێت لەدووری چەند مەترێکەوە بەدی بکرێت لەڕێی ئامێری (magnetomeue) هەستیارەوە، دڵ بەبەردەوامی بەدوای یەکدا ترپەی (ئیلیکترۆمەگنێتیك) دروست دەکات و ماوەی نێوان ترپەکان جیاوازن لە خێرایی و ئاڵوگۆڕی دڵ کەهەمیشە بوارێکی ڕیتمی دروست دەکات. کلریگەریەکی بەهێزی هەیە لەسەر هەموو کردارەکانی لەش بەشێوەیەکی سرووشتی ڕیتمەکانی مێشك هاوکاتە لەگەڵ ئەوانەی دڵ.

## ٢٣٥ موعجیزەی خەو و دەرکەوتنی نهێنییەکی زانستی تازە:

لەلێکۆڵینەوەیەکی نوێ دا کەلە گۆڤاری: (Nature Neuros cience) دا بڵاوبووەتەوە، زانایان بۆیان دەرکەوتووە کەتەنها خەو لەکاتی شەودا بۆ مرۆڤ بەس نیە، بەڵکو پێویستە لەکاتی ڕۆژیشدا بۆ ماوەیەکی کەم بۆنموونە نزیکەی نیو کاتژمێر بخەوێت، چونکە مێشك هیلاك دەبێت و توانستی کەم دەبێتەوە. کەواتە پێویستی بەکەمێك پشووە بۆ ئەوەی زانیاریەکان ڕێك بخاتەوە و جێگیریان بکات.

زانایان دەڵێن دیاردەی خەو موعجیزەیەکی شایەنی بیرلێکردنەوەیە، چونکە یەکێکە لەدیاردە ئاڵۆزەکان، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایە جەختی کردووەتەوە کەخەو نیشانەو موعجیزەیەکە کەپێویستە بیری لێ بکەینەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الروم: ٢٣. واتە: یەکێکیتر لە نیشانەو بەڵگەکانی خەوتنتانە بە شەو و بە ڕۆژ لەکاتی بێداریشدا هەوڵ و کۆششتانە بۆ بەهرە وەرگرتن لەبەخششەکانی خوا، بەڕاستی لەم دیاردەیەدا بەڵگە ونیشانە بۆ کەسانێك هەیە کەدەبیستن و تێدەگەن.

## ٢٣٦ زانست بانگی مرۆڤ دەکات بۆ ئیسلام بوون:

جارێك مامۆستایەکی منداڵناسی (علم الأجنة) لە زانکۆی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا هەستا وتی: زانیاری وای سەلماندووە منداڵ لە سکی دایکیدا لە قۆناغی یەکەم دەست پێ دەکات خاو و شلە، بەڵام من بۆم دەرکەوتووە لە نیوەی سەدەی بیستەم لەپێش ئەوەی ببێ بە گۆشت ڕەقە، ئەو مامۆستایە بەو دۆزینەوەیە زۆر کەیف خۆش بوو، وایدەزانی کەس ئەو قسەیەی نەوتووە، بەڵام لە هەمان پۆلی ئەو زانکۆیەدا قوتابیەکی مسوڵمانی پاکستانی هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی مامۆستا وائەزانی ئەو زانیاریەکی تازەت داهێناوە؟ بەڵام قورئانی پیرۆز کە بەرنامەی ژیانی

مرۆڤ مسوڵمانە هەزار و چوار سەد ساڵ زیاتر پێش، ئەو تاقیکردنەوەی تۆ باسی ئەوەی فەرمووە. زانا بەریتانیایەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: کەی شتی وابووە ئایە بەڕاستیتە؟ قوتابیە مسوڵمانەکە وتی: بەڵێ بەڕاستمە. تۆ دەڵێی تازە بۆم دەرکەوتووە منداڵ لەناو منداڵانی دایکیدا لە قۆناغی یەکەم بەڕەقی دەست پێدەکات.

مامۆستاکە وتی: باشە تۆ چی دەڵێی؟

قوتابیەکە وتی: ئەو قسەیەی تۆ کە تازە بۆت دەرکەوتووە، ئەو قورئانەی کە بۆ پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هاتووە و ڕێبازی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی لەسەر دامەزراوە زۆر لەپێش تۆ فەرموویەتی و باسی کردووە..

مامۆستاکە وتی: دە شتێکم بۆ بڵێ؟ قوتابیە مسوڵمانە پاکستانیەکە وتی: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةً فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمًا﴾(المؤمنون: ١٤). واتە: دوای ئەوەی کە تۆوەکەمان کرد بە خوێن پارە و خوێن پارەکەشمان کرد بە گۆشتپارە و ئەو گۆشتپارەشمان کرد بە ئێسقانی لەشی مرۆڤ و دوایی ئەو ئێسقانەمان بە گۆشت داپۆشی.

دوایی زانا بەریتانیەکە بەشێوەیەکی شەرمەزاری بە قوتابیەکەی وت: بۆ دەستکەوتن و ڕاستی ئەو ئایەتە لەناو قورئان و بەرنامەی مسوڵمانان بەیەك دەگەینەوە، لەدوایی مامۆستای بەریتانی لەگەڵ مسوڵمانە پاکستانیەکە دانیشتن و دەستیان بە وتوێژ کرد و قورئانی پیرۆزیان هێنایە مەیدانی گۆڕەپان و، قوتابی مسوڵمان لە سورەتی (المؤمنون) ئایەتەکەی خوێندەوە، مامۆستاکەش چەند جارێك ئەو ئایەتەی بە قوتابیەکە دووبارە کردەوە، لە کۆتاییدا مامۆستای بەریتانی وتی: (أشهد ان لا إله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله) خۆی لە دڵەڕاوکێ ڕزگارکرد و مسوڵمان بوو.





## ٢٣٧ کۆنگرەکەی پاریس موعجیزەیەکی گەورەی قورئانی دەرخست:

لە کۆنگرەی پاریسی دووەمدا کەلە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٧) دا بە ئامادەبوونی (٥٠٠) وڵات گیرا، بانگەوازی بەپەلەیان لەپێناو گەڕانەوە بۆ ژینگەی خاوێن ئاڕاستەکرد، دووپاتیان کردەوە کە پیسبوون ووشکانی و ئاو و ڕووبارەکانی گرتووەتەوە تەنانەت مرۆڤ و ڕووەك و ئاژەڵیش، هەروەها مرۆڤ لەم پیس بوونە بەرپرسە لەڕێی بەرهەمهێنانە پیسکەرە ترسناکەکانی ژینگەوە. هەروەها ئەوە خرایە ڕوو کەدەتوانرێت ڕێوشوێنی گونجاو بۆ وەستاندنی ئەم پیس بوونەی ئاوو هەوا بگیرێتەبەر سەرسوڕهێن ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز باسی ئەم دیاردەیەشی کردووە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الروم:٤١، واتە:خراپە بەڵاو شێوان و دەرد لە وشکانی و زەوی و دەریادا دەرکەوتووە بەهۆی ئەو خراپانەی کەخەڵکی کردوویانە بۆ ئەوەی تۆڵەی هەندێ لەو خراپانەی کردوویانە پێیان بچەژێ بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە لە خراپەکاری. ئایا ئەم ئایەتە بەڵگەنیە لەسەر ئەوەی قورئانی پیرۆز فەرمانمان پێدەکات بۆ پاراستنی ژینگە.



## ٢٣٨ دۆزینەوە تازەکان هاوڕان لەگەڵ قورئان دەربارەی ڕاگرتنی باڵندەکان لە ئاسماندا:

ماوەیەکی زۆرە زانایان شوێن باڵندەکان کەوتوون و چاودێریان دەکەن، سەریان سوڕماوە لەو هونەرەی لەکاتی فڕیندا بەکاری دەهێنن، باڵندەکان بۆ وادەدانانی ماوەکان ڕێکخستن لەنێوان جوڵەی هەردوو باڵیاندا بۆ زامنکردنی فڕین نیشتنەوەیە سەرکەوتوویی تەقەمەنی زۆر ئاڵۆز بەکاردەهێنن، کرداری زۆر لەدەماغیاندا بەڕێوە

دەچێت باڵندە لەفڕینیدا پشت دەبەستێت بەباڵکردنەوەو هێنانەوەیەکی، ئەم سرووشتی فڕینەش بەبێ فێربوون بۆ درووست دەبێت و پێشتر بەرمەجەکراوە تاکو ئەو کردارانە بەهێمنی ئەنجام بدات خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَٰنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ ﴾ الملك:١٩. واتە: ئایا سەیری باڵندەکان ناکەن بەژوورسەریانەوە بەباڵکراوەیی و هێنانەوەیەك ڕای نەگرتوون بەو ئاسمانەوە خوانەبێ کە ئەو بەهەموو شتێك بینایە.

(سبحان الله) لێکۆڵینەوە تازەکانی زانایان دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئانی پیرۆز بەڕاست ئەوەش موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە خوای گەورە هۆکاری جۆراو جۆری بۆ فڕینی باڵندە دەستەبەرکردووە، هەوا بۆ هەڵگرتنیان و باڵەکانیان و دەماغێکیش کە ملیۆنەها خانەی لەخۆ گرتووە و ڕێنمایی باڵندە دەکات بۆ ئەنجامدانی کارەکانی بە ئارامی، زانایان توانیان لاسایی باڵندەکان بکەنەوە و لەدرووستکردنی فڕۆکەدا کەڵکیان لێوەرگرت خوای گەورەش دەفەرموویێت: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ النحل:٧٩.

واتە: ئایا ئەوان سەرنجی باڵندەیان نەداوە؟ کەچۆن لەهەوای ئاسماندا ڕاهێنراون بێجگە لەخوا کێ ڕایان دەگرێ بەڕاستی لەو ڕاگیرکردنەدا چەند نیشانەو بەڵگەهەیە بۆ ئەوانەی باوەڕدێنن.

***

## دیاردەی سەراب لە قورئان و زانستی تازەی سەردەمدا:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَـٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾ النور: ٣٩. بۆچونی ڕاڤەکارانی قورئان لەبارەی ئەم دیاردەیەوە ئەوەیە لە کتێبی (صحيح مسلم بشرح الإمام النووي في كتاب الإيمان: باب معرفة طريق الرؤية) لەفەرموودەی (٣٨،٢٠٣) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (فيحشرون إلى النار كأنها سراب يحطم بعضها بعضا) ئیمامی نەوەوی دەڵێت (السراب) لەبیابان و زەویە تەخت و ئاسۆییەکاندا بەتایبەت لەنیوەڕۆیاندا و لەکاتی گەرمای زۆردا هەیە.

بریتییە لەو ڕۆشناییەی کەمرۆڤ وەك ئاو دێتە بەرچاوی کەسی تینو بەئاو دەیداتە قەڵەم تادەگاتە ئەو جێگایە بەڵام هیچی تێدا نادۆزێتەوە، دیاردەی سەراب ئەوا پێناسەکراوە سەراب فێڵکردنێکە لەچاو (خدعه بصريه)، لەئەنجامی بارودۆخی کەش و هەوای دەوروبەردا بەرزبوونەوەی زۆری پلەی گەرما تەخت و گۆڕانکاری لەهاوکۆلکەی شکاندنەوەدا فەراهەم دێت، ئەو زەویە بەشێوەیەك دەگەشێتەوە وەك ئەوەی لێدێت کەئاوی لەسەر هەبێت، وێنەی خەیاڵی ئەو تەنانە دەداتەوە کەلەسەری هەن هەروەك لەسەر ئاوێنەیەکی گەورەدانرابن.

وشەی (السراب) لای عەرەب بەمانای ئاوێکی ڕۆیشتوو دێت. زانایانی گەورەی موسڵمان دەستپێشخەربوون لە ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیە و دەتوانرێت زانای بەناوبانگ (حسن ابن الهيثم البصري) و کتێبە بەناوبانگەکەی لەم بارەیەوە (المناضر في البحريان) بەپێشەنگی زانایانی لێکۆڵەرەوەی ئەم بابەتە هەژماربکرێن، ڕاڤەی ڕوودانی سەراب کاتێك چینەکانی ژێرەوەی هەوا سارددەبن و لەهەمان کاتدا چینەکانی سەرەوەی گەرمن، هەرچەندە ڕووەو سەرەوە بڕۆین چینەکانی هەوا گەرمتردەبن، بەمەش چڕی هەوا کەمدەکات و هاوکۆلکەی شکاندنەوەکەشی کەمدەکات ئەو تیشکە ڕووناکییەی کەلەو کەشتییەوە دەردەچێت لەجێگایەکەوە دەردەچێت کەهاوکۆلکەی

شکانەوەی زۆرە و بۆ چینێك دەڕوات کەهاوکۆلکەی شکانەوەی کەمە، هەربۆیە دوور لەجێگای ستوونی خۆیەوە تیشکەکە دەشکێنێتەوە شکاندنەوەی ئەو تیشکە ڕووناکیە لەچینە هەواکانی دوور لەجێی ستوونی خۆیەوە بەردەوام دەبیت، تاگۆشەی خواربوونەوە لەیەکێك لەچینەکاندا دەگاتە ئاستێك زیاتر دەبێت لەگۆشەی یاساغ (Critical anble) ی خودی، ئەو چینەو بەمەش تیشکەکە کەمدەکاتەوە بەشێوەی دانەوەی تەواو کە ڕێڕەوێکی چەماوەیی بەرەوخوار دەگرێتەبەر، کاتێك وێنەکە دەگاتە چاو وای دەبینێت لەسەر هەمان ڕێڕەوی ڕووناکییە بەڵام وێنەی کەشتیەکە بەسەرەو خواری دەبینێت، هەروەك ئەوەی بەئاسماندا هەڵواسرابێت قورئانی پیرۆز بەدەربڕینێکی زۆر وورد و زانستی جوان باس لەدیاردەی سەراب دەکات، بەتەواوی چونیەکە لەگەڵ بۆچوونی زانایان و پسپۆرانی ئەو بوارە هەروەك چۆن وەسفی ئەم دیاردەیە لەفەرموودەکانی پێغەمبەری سەروەرمان (صلی الله علیه وسلم) هاتووە.

**سیفەت و مەرجەکانی دیاردەی سەراب لەڕووی زانستیەوە:**

١- شوێنێکی گونجاو بۆ سەرهەڵدانی

٢- فێڵێکە لەچاودەکرێت فریودانی چاوەو هۆکارەکانی گەرمای زۆرە

٣- سەراب زۆر لەئاو دەچێت

٤- پێویستی بەهەوایەکی جوڵاو هەیە

٥- چەندێك لێی نزیك بکەویتەوە ئەوەندە لێمان دووردەکەوێتەوە

خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرمووێت: ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ ۗ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾ النور: ٣٩. واتە: ئەوانەی کەرێبازی کوفریان گرتووەتەبەر، کردەوەکانیان وەك تراویلکەو سەرابێك وایە لەبیابانێکدا بریسکە بداتەوە، کەسێکی تینو وابزانێت ئاوە بەتاڵوکە بۆی بچێت هەتا کاتێك گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە، ئەوسا کاتێك بەخۆی دەزانێت ژیانی کۆتاییە و قیامەت بەرپابووە خوایش ئامادەیە لەلایدا،

بەگوێرەی کردەوەی محاسەبەی دەکات و لێی دەپرسێتەوە، خواش بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات.

* لەبارەی فەرموودەکانی خوای گەورەوە (كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ) ئەمە بەو مانایە دێت کە سەراب لەزەویەکی تەختدا نەبێت دەرناکەوێت، یاخود چی هەیە لەزەویەکی تەخت ئاسانتر کە سەراب بەبێ بوونی ئەو نایەتە بوون.

* هەروەها فەرموودەی (يَحْسَبُهُ) بەلگەیەلەسەر ئەوەی کە ئاو بوونی نیە سەراب خۆی فێلێکەو لە چاو دەکرێت.

* (ٱلظَّمْـَٔانُ) بریتییە لەوەی کەتینوێتی زۆری بۆدەهێنێت کەواتە لەکەش و هەوایەکی گەرمدایە، ئەمەش مەرجی دووەمە موعجیزەی سەرنج ڕاکێش لێرەدا کەلای کەسانی پسپۆر هیچ گفتووگۆی لەسەرنیە، بریتی یە لەبەراوردکردنی سەراب بە ئاو نەك بە ئاوێن وەکو زانایانی ڕۆژئاوا باسی لێوە دەکەن و جیاوازی نێوان دانەوەی ئاو و ئاوێنەش لای هەموان ئاشکرایە، چونکە سەراب بەهۆی تەوژم و ڕەوتێکی هەواوە نەبێت درووست نابێت، ئەم جولەیەش شەپۆلێك درووست دەکات زۆر لەئاو دەچێت کەئەمەش مەرجی سێیەم و چوارەمە هاوکێشەی فیزیایی سەراب لە ناواخنی: (حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا) دانراوەو لەم چەند وشانەی خوا ئەوە هەلدەهێنجین کەهەتا نزیك بینەوە لەسەرابەکە ئەو زیاتر لێمان دوور دەکەوێتەوە، بەو واتایەی کەدووری نێوان چاوی بینەر و سەرابەکە دووریەکی جێگیرە و ناگۆڕێت کەئەمەش مەرجی پێنجەمە (سبحان الله).

***



## لێکۆڵینەوە زانستییە تازەکان سوودەکانی فێربوونی زانست و زانیاری ئاشکرادەکات:

لێکۆڵینەوەیەکی نوێی زانستی جەخت لەسەر گرنگی زانست و فێربوون و ئەو سوودە پزیشکی و دەروونییە بێئەژمارانەی ئەو مرۆڤانە دەکاتەوە، کەبەردەوام زانست و زانیاریان لە زیادبووندایە، لێکۆڵینەوەیەکی نوێ دەری خستووە ئەو کەسانەی خوێندەوارن و بەردەوام هەوڵی زیادکردنی زانست و زانیاری خۆیان دەدەن، کەمتر دوچاری خەمۆکی دەبن، هەروەها زۆرتر دەسکەوت بەدەست دەهێنن و چێژ لەتەندروستییەکی باشتر دەبینن. لێکۆڵەرەوان دەڵێن: فێرکردن یارمەتی مرۆڤ دەدات لەبەڕێوەبردنی ژیانیدا بەشێوەیەکی باشتر و چاکتر، جگە لەوەش یارمەتی دەدات بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەو گرفتەکاندا کە ڕۆژانە دوچاریان دەبێتەوە بۆنموونە بەتاڵی و تەلاّق و مردنی نزیکان و دۆستان و هاوڕێیان، هەروەها ئەو لێهاتووییانەی مرۆڤ لەسەرو بەندی خوێندندا فێریان دەبێت یارمەتی دەدەن تاتێبگات کە پێویستی بە لێهاتوویی زۆرتر هەیە.

هەروەها یارمەتی دەدات لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی لێهاتووییەکانی کەسانی دی پرۆفیسۆر (جۆن پاینەر) بەڕێوەبەری مەڵبەندی لێکۆڵینەوەکان لەپەیمانگای فێرکردنی بەریتانیا دەڵێت: لێکۆڵەرەوان لەم لێکۆڵینەوەدا ویستیان ئەو سوودە نائابوورییانە بۆ فێربوون دەربخەن، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە زۆر گرنگە کەهەموو تاکێکی کۆمەڵگە هانبدەیت لەسەر فێربوون و داواکردنی زانست لەبەر ئەوەی چەندین سوودی تری هەیە کە فێرخواز بەدەستی دەهێنێت، لەڕێگەی فێربوونەوە هەمیشە فێرخواز خاوەنی توانایەکی زیاترە بۆ چارەسەری کێشە و گرفتەکان، ئەوانەی کەهەستان بەو لێکۆڵینەوانە دەڵێن: پێویستە هەلی زیاتر برەخسێنرێت بۆ زۆرینەی خەڵکی و گرنگییەکی زیاتر بدرێت بەبڵاوکردنەوەی زانست لەنێوان خەڵکیدا، ئەمەش هۆکاری یارمەتیدەرە بۆ گەشەپێدان بەرەوپێشبردنی ئاستی کۆمەلأیەتی و

هاوکاریکردنیان بۆ ژیان و گوزەرانێکی باشتر. لێکۆڵینەوەکانی پێشوو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەبەردەوام بوونی مرۆڤ لەسەر فێربوون و بەدەست هێنانی زانیاری لە زوو پیربوون دەیپارێزێت، لەگەڵ ئەوەشدا واله مرۆڤ دەکات بە تەندروستی و جەستەیەکی چالاك و دەروون بەرزییەوە بژی. لێکۆڵینەوە زانستییەکە جەخت لەسەر گرنگی زانست و خوێندنەوە دەکاتەوە هەموو ڕۆژێك زانایان سوودی زیاتر و تازەتر سەبارەت بە زانست دەدۆزنەوە. پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کاتێك بیردەکەینەوە لەپەیامی پیرۆزی ئیسلام دەبینین یەکەم وشەی ئەم قورئانە پیرۆزە بە وشەی (إقرأ) دەستی پێکردووە خوای گەورە لەسەرەتای دابەزاندنی یەکەم ئایەتی قورئانی پیرۆزەوە دەفەرموێت:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق: ١.

واتە: ئەی موحەمەد(صلی الله علیه وسلم) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی درووست کردووە ئەم وشەیە ئاماژەیەکە ئیسلام ئاینی زانست و فێربوونە، ئەگەر لە وشەکانی قورئان وردبینەوە دەبینین وشەی زانست و وشە لێوەرگیراوەکانی زیاتر لە (٥٠٠)جار لە قورئاندا هاتووە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر گرنگیدانی ئیسلام بەزانست و زانیاری. پێغەمبەری خۆشەویستیش (صلی الله علیه وسلم) داواکردن و داخوازی و فێربوونی زانست بەپێویست دەزانێت لەسەر شانی هەموو موسڵمانێکی پیاو و ئافرەت، هەروەکو دەفەرموێت: (طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة) ئەوەش کەلێکۆڵەرەوان ئەمڕۆ بانگهێشتی بۆ دەکەن پێویستی ڕەخساندنی هەلی زیاترە بۆ فێربوون لەکاتێکدا ئیسلام پێش چواردە سەدە لەمەوبەر ئەم بانگەوازەی کردووە ئەم ڕاستییەش شایەتیدانە لەسەر گەورەیی و بەتوانایی ئەم ئاینە و ڕاستی و درووستی پەیامی پیرۆزی ئیسلام خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾ الزمر:٩. واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڵێ ئایا ئەو کەسانەی دەزانن و شارەزان وەکو ئەو کەسانەوان کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟ بەڕاستی تەنها خاوەن بیروهۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سوودوەردەگرن و تێدەگەن.



## جیاوازی نێوان نێرو مێ دەرکەوتنی موعجیزەیەکی زانستی گەورەی قورئان:

ساڵانێکی زۆرە کۆمەڵگاکانی سەردەم ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەگەڕانەوە بۆ ئاینی ڕاستەقینە دوورن و پەیوەندییان بە ئاسمانەوە نەماوە، لە هەوڵداندابوون مرۆڤەکان بهێننە سەر ئەو بارەی کە جیاوازی نێوان نێر و مێ کارێکی بێ بنەمایە و نەریت و باوی کۆمەڵایەتییە، جا بەهۆکاری سیاسی بێت یان ناسیاسی ئەم بیرە لەقۆناغەکانی پەروەردەدا لە مرۆڤەکاندا چێنراوە.

لەواقیعی ئەمڕۆشماندا دەرئەنجامی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەبینین بۆ نموونەئەم کۆمەڵگایانەی هاودەم تێکەڵبوونی نێر و مێ لەقۆناغەکانی فێربووندا دەسەپێنن و نایانەوێت لە پێگەیاندنی کوڕان و کچانداجیاکاری بکەن و سەربازگری ئافرەت لەڕیزەکانی پێشەوەی سوپادا دەکەن ڕاستە ئافرەت یان ڕەگەزی مێ نیوە کۆمەڵگایە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (النساء شقائق الرجال) واتە: ئافرەتان لایەکی پیاوانن گومانی تێدانییە قورئان و سووننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەرك و مافی ڕەگەزی مێیینەیان دیاری کردووە هەر ئەوەش قورئان و سووننەت ڕوونیان کردووەتەوە هەموو ئەو جیاوازی و ناکۆکیەی لەم بابەتەدا هەیە ناهێڵێت و هەموو کێشەو ناکۆکیەکان بنبڕدەکات. لەبەر ئەوەی خوای گەورە کە بڕیاری لەسەر ئەم کارە داوە سەرەتا خۆی ئافرەتی دروست کردووە و هەرخۆشی لاکەی تری مرۆڤی دروست کردووە کە نێرینەیە بێگومان خوای گەورە تایبەتمەندی هەردووکیان باشتر دەزانێت. بۆیە ناکرێت و نابێت ئەمڕۆ یان سبەی کەسێك بێت و بانگەشەی ئەوەبکات و خۆی دەربخات کە گوایە مافی زەوت کراوی ئافرەتان دەگەڕێنێتەوە و، جیاوازی نێوان نێر و مێ لەلای زانستی تازەی سەردەم لێکۆڵینەوە زانستییەکان جیاوازی نێوان پیاو و ئافرەتیان جێگیر کردووە، لەگەڵ ئەوەی ئەو دوو

تۆوە کەهەردوو کۆرپەلەی نێر و مێیان لیٚ درووست دەبێت لە(٤٧) کرۆمۆسۆمدا لەیەکدەچن و تەنها لەیەك کرۆمۆسۆمیاندا جیاوازن بەلاٌم ئەم یەك بەشە لە(٤٨)بەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی جیاوازییەکی گەورەی نێوان پیاو و ئافرەت لەبوار و چالاکییە جیاجیاکاندا، ئیتر ئەو جیاوازییە گەورە و فراوانەی نێوان نێر و میٚ لە دیمەنی دەرەوە و لە پێکهاتەی ناوەوە لە هۆکارە سایکۆلۆجییەکاندا دەردەکەوێت.

دکتۆر(الکیس کاریل) دەڵێت: ئەو جیاوازییە سەربەخۆیانەی نێوان پیاو و ئافرەت تەنها لە شێوەی ئەندامی زاوزێی هەریەکەیان و شێوەی منداڵدان و هەڵدانی مەمکەکانی و جیاوازیە ڕووکەشەکاندا نیە، بەڵکو ئەو جیاوازیانەی نێوان نێر و میٚ بۆ هۆیەکی زۆر قوڵتر دەگەڕێتەوە ئەویش غەرق بوون و داپۆشرانی هەموو کۆئەندامی زاوزێیە بەو ماددە کیمیاییانەی کەڕژێنەکانی زاوزیٚ دەریدەدەن، هەرجۆرێك لەو ماددە کیمیاییانە لەنێرینەو مێینەدا لە سرووشت و پێکهاتە و تایبەتمەندییەکاندا و جیاوازیان هەیە، لە ڕاستیدا پیاو و ئافرەت زۆر لەیەکتری جیاوازن هەموو خانەیەك لە خانەکانی لەشی ئافرەت و هەر کۆئەندامێکی ڕەگەزی مێینە، بەتایبەتیش کۆئەندامی چەقە دەماری ئافرەت سرووشتی ڕەگەزی میٚ هەڵدەگرێت.

ڕۆڵی پیاو لە کرداری زۆربووندا کوورت و کاتی و دیاری کراوە لە کاتێکدا ڕەحمی ئافرەت (٩) مانگ درێژە دەکێشێت و لەو ماوەیەشدا ئافرەت دەچێتە ژێر باری ئەو بوونەوەرەی کە هەڵیدەگرێت و بەردەوامیش کاریگەری لە حاڵەتی فیسۆلۆژی ئافرەت دەکات، هیچ ئافرەتێکیش ناگاتە گەشەی تەواوی تاجارێك یان زیاتر منداڵی نەبێت خۆ ئەگەر ئافرەتێك منداڵی نەبێت ئەوە لەهاوسەنگی کەم دەبێتەوە، تا ڕادەیەك کەسێکی تورەدەبێت دکتۆر (تیۆ درواىك) دەڵێت: ماوەی (٥٤)ساڵە کار لەسەر شیکردنەوەی دەروونی مرۆڤەکان دەکەم پێم وایە ئێستا دەتوانم بریاری ئەوە بدەم لەچیدا پیاوان و ئافرەتان لەیەکتر جیاوازن خواستی دەروونی و پەرۆشی لە ئافرەتدا گەورەترو زیاترە وەك لە پیاودا، لەوانەیە هەندێك بڕوایان وابێت کەپەرۆشی زیاتری ئافرەت شتێکی ئەوتۆی گرنگ نەبێت تا ئاوڕی لیٚ بدرێتەوە، بەلاٌم جێگیربووە کەپەرۆشی و خواستی

دەروونی ئافرەت هاوەڵدەبێت لەگەڵ جۆش خواردنی سەخت و گۆڕانکاری دەروونی و لاشەی پێکەوە، ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هاوسەنگی بیروڕاو ووردی بڕیاردان هەیە لەحاڵەتی زۆر بوونیشدا کە بۆ ئافرەت ماوەیەکی درێژ نۆ مانگ دەبێت و، لەم ماوەیەشدا پەرۆشی و سۆزەکانی ئافرەت لەنێوان کۆرپەکەی و تاکەکانی تر کەکاروباری ژیانیان لەگەڵ بەسەر دەبات دابەش دەبێت.

هەروەها شیکردنەوەی دەروونی ئەوەشی چەسپاندووە کە پیاوان زیاتر ئامادەییان بۆ داننان بەهەڵەکاندا هەیە وەك لە ئافرەتان، لەکاتێکدا دان پیانان بەهەڵەکردن کاریگەری گەورەی لەسەر نەخشەی کارکردن لە ژیاندا هەیە، جیاوازی نێوان نێرو مێ هەر لەوەندەدا کورت ناهێنێت و ئەم باسە تێدەپەڕێت بۆ هەڵس و کەوتی هەردوو ڕەگەز، لەکارکردنیاندا تاقیکردنەوەکان بەتایبەت لەم دواییانەدا کاتێك ئافرەت بەشداری زیاتری لە کارکردندا کرد، ئەوەی چەسپاند کەهەندێك کار هەن ئافرەتان لەپیاوان باشتر جێبەجێیان دەکەن، بەتایبەت ئەو کارانەی کەپێویستی بە کاتی درێژو ئارامی هەیە کاری تریش هەن ئافرەتان نایان توانن، ئەگەر ئافرەتان ئەوکارانە بەئەنجام بگەیەنن ئەوا بەرهەمی کاریان کەمتر دەبێت بە بەراورد لەگەل پیاوان.

ئەگەر هەمان کار ئەنجام بدەن پێشکەوتنێك لەساڵی(٢٠٠١) دا ڕوویدا، خێزانی سەرۆکی ئەمەریکای پێشوو (بیل کلینتۆن) هیلاری کە ئافرەتێکی لیبراڵە و زۆر بایەخ بەکارو بارو بەها ئاینیەکان نادات، لەگەڵ سیناتۆرێکی تردا پرۆژە یاسایەکیان دانا کە ڕێبدرێت بەدامەزراندنی دەزگای فێربوونی جیا کە نێر و مێ تێکەڵ نەبن، بەکۆی ڕاش یاساکە پەسەند کراو لەسەری ڕازی بوون. لەو مێژووەوە ژمارەی ئەو دەزگایانەی فێربوون کە نێر و مێ تیایاندا جیان سێ ئەوەندە زیادیان کردووە. هەروەها جەماوەری ئەم فێربوونە لەدەوڵەتانی تری وەك بەریتانیا، ئیرلەندا، ئوسترالیاو نیوزلونداشدا لەپەرەسەندندایە یەکێکی تر لە جیاوازییەکانی نێوان پیاو و ئافرەت جیاوای لە سیستەم و ڕێکخستنی مێشکی هەریەك لە پیاو و ئافرەتە، لێکۆڵینەوە زانستییەکانی بیست ساڵی ڕابردوو ئاماژەدەکەن کەلای چەپی مێشکی پیاو تایبەتە بە

گفتووگۆ و ئاخاوتن و لای ڕاستیشی تایبەتمەندە بەبیرکردنەوە و خەیاڵکردن، لەئەنجامی ئەم بەش بوونەی دەماخی پیاو ئەگەر خوێن مەیین یان هەر گرفتێکی تر لای چەپی مێشکی پیاودا ڕوویدات ئەوا زۆر جار توانای قسەکردنی پیاو پەك دەخات، بەڵام ئەگەر گرفتەکە لای ڕاستی مێشکی پیاودا ڕوویدات ئەوا توانای قسەکردنی دەمێنێت و ئەو توانایەی لەکار ناخات ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێت کەلای چەپی مێشکی پیاو بۆ قسەوگفتووگۆ کردن زۆر گرنگە، لەکاتێکدا لای ڕاستی ئەو گرنگییەی بۆ ئاخاوتن نیە بەڵام ئایا ئەم جیابوونەوە و بەش بوونەی مێشکی پیاو لەلای ئافرەتیش هەر بەهەمان شێوەیە؟

سیستمی مێشك لە ئافرەتدا جیاوازە لەهی پیاو لەبەر ئەوەی ئەو جیابوونەوەی لەمێشکی پیاودا بینراوە پێشتر باسمان کرد لەدەماخی ئافرەتدا بوونی نیە و، ئەرکەکانی مێشك لەلای ئافرەتدا بەهەموو مێشکدا بڵاوبووەتەوە واتە:ئەگەر خووێن مەیین لەلای ڕاستی یان لەلای چەپی مێشکی ئافرەتدا ڕوویدات، هەردوو حاڵەتەکە توانای قسەکردن لەلای ئافرەت بەڕێژەیەکی زۆر کەم دەکاتەوە، هۆکەشی ئەوەیە کە ئافرەت لەکاتی قسەکردندا هەردوولای دەماخی بەکاردەهێنێت نەك تەنها یەك لا وەك ئەو حاڵەتەی لەلای پیاو ڕوودەدات.

هەروەها جیاوازییەکی تر لە گەشەکردنی بەشەکانی مێشکی هەردوو ڕەگەزدا هەیە کاتێك خانەکانی ئاخاوتن لە ئافرەتدا بەڕێژەو تێکرای گەورەتر پێدەگەن و گەشەدەکەن خوای گەورە ڕێزی زۆری لەئافرەت گرتووە و ڕێزی مرۆڤ بوون و مافی ژیانێکی پڕ ڕێز و پیرۆزی بۆ گەڕاندەوە.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە لەو هاوسەنگی یەی بەرنامەی خوای گەورە کەلەگەڵ جیاوازی کردن لەنێوان نێر و مێ دا لەهەمان کاتدا هەر خاوەن مافێك مافی خۆی پێدراوە ئەوەتا زانایانی سەردەمیش گەیشتوونەتە هەمان ئەنجام و ڕوونیان کردووەتەوە وئەو ڕاستییەیان چەسپاند کە ئەگەر بمانەوێت کۆمەڵگا بە حاڵەتە نموونەییەکەی بگەیەنین دەبێت جیاوازی لەنێوان ڕەگەزی نێر و مێ لەبەرچاو بگیرێت



به پێچەوانەشەوە یەکسان کردنی نێر و مێ خۆگێلکردن و لەبیرخۆبردنەوەی جیاوازی نێوان نێر و مێیە، بەسە بۆ ئەوەی چەندان نەخۆشی مەترسیدار لەنێوان کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا درووست بکات بەجۆرێك زەرەر و خراپیەکی زۆر لە کۆمەڵگاکاندا پەیدا دەبێت و بەپلەی یەکەمیش زیاتر بەسەر ئافرەتدا دەشکێتەوەو، چارەسەر کردنی ئەو کێشانەش پێویستیان بەکاتێکی زۆر هەیە لەوانەیە ماوەی ژیانی چەندین نەوە بخایەنێت. بۆیە گەڕانەوە بۆ بەرنامەیەکی ڕاست و چەسپاو کەزۆرێك لە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانمان بۆ بگەڕێنێتەوە و کاتی زۆرمان بۆ کورت بکاتەوە و بەرنامەیەکی ئاوا ڕاست و درووست پێویستە جێی بایەخی مرۆڤەکان بێت و بەملکەچییەوە بۆی بگەڕێنەوە خوای پەروەردگار پێش زیاتر لە چواردە سەدە فەرموویەتی:﴿وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾ زانستی ئەمڕۆش دوای ئەم هەموو ساڵە هات و شاهێدی دا کەقورئانی پیرۆز ڕاستەو لەلایەن خوای گەورەوە بۆ مرۆڤەکان ڕەوانە کراوە.

##  پێکەنین و گریانی کۆرپەلە لە قورئان و زانستی نوێدا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾ النجم:٤٣. واتە: هەر ئەو خوایەیە کەتوانای پێکەنین و گریانی پێ بەخشیووە زانایان تا ئێستا باوەڕیان وابوو ئەو دەربڕینانەی کەلەسەر ڕووی ساوا دەردەکەوێت وەك زەردەخەنە و پێکەنین، هۆکەی ئەوەیە منداڵی ساوا چاو لەدەربڕینەکانی دایکی دەکاتەوە، ئەم تیۆرە لەئارادابوو. هەروەها باوەڕوابوو کە منداڵ هەتا چەند هەفتەیەك دوای لەدایك بوونی زەردەخەنەو پێکەنین ناکات، بەڵام بەبەکارهێنانی تەکنیکی وێنەگرتنی سەروو دەنگی سێ دووری و چواردووری زانایان تێبینی دەربڕینی مرۆیی ڕاستەقینەیان لەسەر ڕووی کۆرپەلەکرد، هەروەها سەریان لەوە سوڕما کەبینیان کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیدا دەمێك دەگری و دەمێك پێدەکەنێت ئەم هەستانە پێویستە ئەو پرسیارە بوروژێنێت

کە ئەگەر کۆرپەلە لەمنداڵدانی دایکیدا هێشتا نەڕووناکی بینیوەو نەدایکی بینیوە پێبکەنێت یان بگری، کەواتە ئەی کێ ئەو کۆرپەلەیەی فێری زەردەخەنە یان گریان کرد؟ زاناکان ئەم پرسیارە دەکەن.

دکتۆر (ستوارت کامپبل) دەڵێت: من ناتوانم وەڵام بدەمەوە بەڵام بەفیعلی گۆشەکانی دەم دەکرێنەوە و شەویلگەکان دەجولێن، لەو باوەڕەدام ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ژینگەی شڵەژان لەمنداڵداندا، بەڵام دەبینین وەڵامی ئەمە لەقورئانی پیرۆزدا لەم ئایەتە پیرۆزە دەبینین: ( وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ) واتە: ئەوە ئەو خوایە بەدیهێنەرەیە کەلەسکی دایکیدا توانای پێکەنین و توانای گریانی بەخشیووە بە کۆرپەلە.



## چۆنیەتی درووست بوونی ئێسکی مرۆڤ:

بێگومان ڕوون بۆتەوە کە کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا لەئەنجامی پیتاندنی هێلکە بەسپێرمی نێرە درووست دەبێت، پاش چەند هەفتەیەك لەگەشەی کۆرپەلەکە ئینجا ئیسك دەست دەکات بەوەرگرتنی شێوەی خۆی، پاشان وورده وورده ئەم ئێسکە بەگۆشت دادەپۆشرێت. لە ڕاستیدا ئەم کردارە زۆر گران و ئاڵۆزە چونکە هەرگیز گۆشت ناتوانێت پێش درووست بوونی ئێسك شێوەی تەواوی خۆی وەربگرێت، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ ﴿٢٥٩﴾﴾ البقرة:٢٥٩. واتە: ئایا تۆ سەیرناکەیت کەوا ئێمە چۆن ئێسك درووست دەکەین و پاشان گۆشت دەکەین بەبەریدا واتە: یەکەم جار ئێسك درووست دەبێت و پاشان گۆشت و ماسولکەی بەبەردا دەکرێت، جا ئەگەر ئەمڕۆ لەهەرچی دکتۆرە بپرسین دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێن ئەو خانانەی کە ئێسکی کۆرپەیان لێ درووست دەبێت پێش ئەو خانانە درووست دەبن کە دەگۆڕێن بۆ ماسولکە و گۆشت.



## دامەزراوەی زانستی و دەروونناسی ئەمریکی ڕاستیەکی گەورەی ئاشکراکرد دەربارەی زیکر و یادی خوای گەورە:

زانایەك دەڵێت: یەکێك لەو شتانەی کە زۆر سەرنجی ڕادەکێشام ئەوەبوو ئەو ئەو کەسانەی یادی خوا دەکەن ئەوانەی کە هەمیشە دەمیان پاراوە بە یادی خوا زۆر ئارام و ڕازین، بەڕاستی ئەم دیاردەی تەسبیحات و ئارامی و ڕەزامەندییە بۆم گرێ نەدەدران پێکەوە، بەڵام کاتێك گەیشتم بە خزمەت ئایەتێك لە قورئان ئەم نهێنیەی بۆ ئاشکرا کردم کە تەسبیحات کردن هۆکاری ئەو ئارامییەی دەروونە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ﴾طه: ١٣٠). واتە: لەسەرئەوەی بەتۆی دەڵێن ئارام بگرە و بە سوپاسگوزاری تەسبیحاتی پەروەردگارت بکە پێش هەڵهاتنی خۆر و دوای ئاوابوونی لەناو شەو و لێوارەکانی ڕۆژیشدا بەڵکو ڕازی ببی.

هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾﴾الحجر. واتە: بێگومان ئێمە دەزانین تۆ دڵگران دەبیت بەوەی ئەوان بەتۆی دەڵێن دەسا تۆش بە سوپاسگوزاری پەروەردگارت تەسبیحات بکە و لەکڕنوشبەران بە. کەواتە پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی دەروون ئارام و ئاسودە دەکات بە کانیاوی تەسبیحات لە ئایەتێکی تردا ئارامی دڵانی بەستۆتەوە بە یادی خوا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾الرعد: ٢٨). واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە دڵیان بە یادی خوا ئارام ئەبێت ئاگاداربە بە یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.

خوێنەری بەڕێز: جا با بزانین زانستی تازەی سەردەم دەربارەی زیکر و یادی خوا چی دەڵێت و چۆن باسی سودەکانی ئاشکرا دەکات، دامەزراوەی زانستی دەروونناسی

ئەمریکی ئەوەی پشتڕاستکردۆتەوە لەکاتی یادکردنی خوای گەورە هەندێك خانەکانی مێشك و ئەنزیمەکان گۆڕانکاری زۆریان تیادا ڕوودەدات، لە کاتی یادکردنی خوادا چالاك دەبن، بەوەش هەستەوەرەکانی تایبەت بە سیستەمی کارکردنی لەش لە هەر گۆڕانکارییەکی نائاسایی ئاگاداردەکاتەوە و سیستەمەکە ڕێکدەخاتەوە. هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوە زانستییەکان باوەڕبوون بە خوای گەورە و یادکردنەوەی لەلایەن مرۆڤەکان دەبێتە هۆی بەخشینی ئارامی و دڵخۆشی و تەندروستیەکی باش.



## کاریگەری زەنجەفیل لەسەر کەم کردنەوەی کێش:

لە توێژینەوەیەکی نوێدا دەرکەوتووە کە زەنجەفیل کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەکەم کردنەوەی کێش، چونکە مرۆڤ کاتێك نان دەخوات لەگەڵ کەمێك زەنجەفیل زووتر هەست بەتێربوون دەکات. هەروەها ماددەی تیایە کەبەرەنگاری بەکتریا و ڤایرۆس دەکات. لەبەرئەوە بە دژە هەوکردنێکی چاك دادەنرێت لەتوێژینەوەیەکی تردا دەرکەوتووە کەزەنجەفیل کۆئەندامی هەرس چالاك دەکات، کۆلێژی ماریماند هەستاوە بەتوێژینەوەیەك کە سەلماندیان زەنجەفیل چارەسەری دڵ تێکچوون و هێڵنجدان دەکات و هەڵدەسێت بە کەمکردنەوەی ئازاری هەوکردنی جومگەکان و کەم کردنەوەی کولسترۆڵی زیان بەخش.

هەروەها ئێستا تووێژینەوەی تر دەکرێت بۆ زانینی سوودی زەنجەفیل بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی دڵ و شێرپەنجە و لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوەدەکەنەوە کەخواردنی کەمێك لەم ماددەیە سوود بەخشە هەروەها ئامۆژگاری دەکەن کەزەنجەفیل بکرێتە ناوهەموو خواردنە گەرمەکان بەتایبەتی چای سەوز بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی دڵ و ڕێگرتن لەبڵاوبۆنەوە و زیادکردنی خانە شێرپەنجەییەکان پاك و بێگەردی بۆ خوا کەلەقورئانی پیرۆزدا باسی ئەم ماددەیەی کردووە و دەفەرموێت: ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ ﴾ الإنسان: ١٧. واتە: لەبەهەشت لەپەرداخێك شەرابی پاکیان پێ نۆشدەکرێت کەزەنجەفیلی تێکەڵاوە.



## دۆزینەوەیەکی نوێ دەربارەی بەیکداچوونی شەو و ڕۆژ:

زانایان ئەوەیان دۆزیوەتەوە کەبەیەکداچوونی شەو و ڕۆژ کردەوەیەکی زۆر ئاڵۆزە، بۆیە بۆلێکۆڵینەوە لەم کردە سەرسوڕهێنەرە کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن، بەڵام ئەوەیان بۆ ئاشکرابووە کە شەو دەچێتە ناو ڕۆژەوە و ڕۆژیش دەچێتە ناو شەوەوە ئەم کردەیەش لەماوەی (٢٤) کاتژمێر و بێ وەستان ڕوودەدات. قورئانی پیرۆز ئەم دیاردەیەی وەسف کردووە و خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٦١﴾ ﴾ الحج:٦١، پرسیارەکە ئەوەیە کێ چواردە سەدە لەمەوپێش دەیزانی کەشەو و ڕۆژ لە باری بەناویەکداچوونی بەردەوام دان؟ هەروەها ئەم کردەیە ئایەتێکە لەئایەتەکانی خوای گەورە و شایەنی بیرلێکردنەوەیە.



## تونێلە ڕەشەکان لە قورئان و زانستی تازەدا:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴿١٦﴾ ﴾ التکویر:١٥-١٦، واتە: بەو ئەستێرە گەڕۆکانەی دەگەڕێنەوە سوڕاوەکانی خۆشاراوەکان، لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا بەسێ وشە چوار وەسفی ووردی تونێلە ڕەشەکان هاتووە (چوونەوەیەك، خۆشاردنەوە، ڕۆشتن بەخێرایی، ماڵینی ئاسمان)، (الخنس) لەزمانی عەرەبیدا بەواتای (اللإنقباض والإستخفاء) دێت، واتە: شتێك بچێتەوە یەك و خۆی بشارێتەوە بەکارهێنانی ئەم وشەیە دووسیفەتی تونێلە ڕەشەکان لەخۆدەگرێت:

١- چونەوەیەك و پەستاوتن زاناکان دەڵێن تونێلە ڕەشەکان لەئەنجامی چونەوەیەك و پەستاوتنی ئەستێرەیەکی زەبەلاح درووست دەبێت.

٢- خۆشاردنەوە لەئەنجامی چوونەوەیەك كە ئەستێرەكە چڕییەكەی زیاد دەكات، بەجۆرێك هەموو شتێك بە ڕووناكیشەوە كێش دەكات بەوەش دیارنامێنێت و خۆی دەشارێتەوە، چونكە ڕێ بەدەرچوونی فۆتۆناتی ڕووناكی نادات.

( ٱلْجَوَارِ ) واتە: گەڕۆك و ڕۆشتن زاناكان دەلێن تونێلە ڕەشەكان لەچینی خۆیان ناوەستن بەڵكو بەخێراییەكی وۆر لە جوڵەدان بەجۆرێك لەچركەیەكدا هەزاران كیلۆمەتر دەبڕن.

( ٱلْكُنَّسِ ) واتە: ماڵەر یان گسكدەر، تونێلە ڕەشەكان بەهۆی چڕبوونەوەی ئەستێرەكە هەموو تەنەكانی دەوروبەری دەماڵێت وەكو گسكی كارەبایی هەڵیان دەلوشێت. پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار كاتێك بە كورت ترین دەربڕین و ووردترین وەسفی زانستی ئەم كونەڕەشانە دەكات، ئەمەش دەیسەلمێنێت ئەم ووشانە خاوەنەكەی خوای زاناو كاربەجێیە.



## ٢٤٨ زانستی نوێ ڕاستی یەكی گەورەی قورئانی ئاشكراكرد دەربارەی كشانی گەردوون:

كشانی گەردوون لەڕووی زانستییەوە بابەتێكی نوێیە لەسەدەی بیستەوە دەركی پێكراوە و، بۆ زاناكان ڕوون بۆتەوە كە گەردوون لەوەتەی دروست بووە تائێستا بەردەوام لەكشانێكی خێرادایە. سەرەتا بابزانین قورئان چۆن باس لەو كشانە دەكات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْي۟دٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الذاریات:٤٧، بەواتای ئێمە ئاسمانمان دروست كردووە بەهێزی خۆمان، وەهەر ئێمەش فراوان كارین بۆیە جا بابزانین زانستی تازە چی دەڵێت؟




لەم بارەیەوە: لەساڵی (١٩٢٩)دا زانای گەردوونی ئەمریكی (ئەدوین هابل) لەپەیمانگای كالیفۆرنیا لە ڕێگای تەلەسكۆبێكەوە ئەوەی بینی كە مەجەڕەكان

لەیەکتری دووردەکەونەوە بەخێراییەکی زۆر گەورە، بێگومان ئەم دوورکەتنەوەیەش لەئەنجامی کشانی گەردوونەوە دەبێت، هەر لەهەمان ساڵدا زانا (هابل) لەگەڵ زانایەکی تردا (همسن) تیۆرێکیان دانا بەناوی ( تیۆری فراوان بوونی گەردوونی)، کەتێیدا یاسای دوورکوتنەوەی مەجەرەکان لەمەجەرەکەمان و لەمەجەرەکانی تر روونکراوەتەوە.

لەو یاسایەوە توانرا تەمەنی نزیکەیی گەردوون دیاری بکرێت زانا (هابل) زانا (ئانیشتاینی) بانگهێشت کرد لە ئەڵمانیاوە بۆ ئەمریکا، تا ئەو فراوانبوونە ببینێت لەرێگەی تەلەسکۆبەکەیەوە. لیژنەی نۆبل رۆژی ( ٣شەممەی ٢٠١١/١٠/٤) ناوی براوەکانی خەلاتی نۆبڵی فیزیایی راگەیاند بۆ ساڵی ( ٢٠١١) کە بەهاکەی (١,٤٥ملیۆن) دۆلاری ئەمریکیە، ئەوانیش ٣ زانای ئەمریکی بوون کە (سۆل بیرلماتری) بەرەگەز ئەمریکی لەزانکۆی بێرکلی کەنیوەی خەلاتەکەی بەردەکەوێت، وەلەنیوەکەی تریشدا (بریان شمیتی)ئەمریکی بەرەگەز ئوسترالی و(ئادام ریس) ئەمریکی بەشداردەبن.

شمیت لەزانکۆی نیشتیمانی ئوسترالی کاردەکات، ریس لەپەیمانگای زانستە فەزاییەکانی سەر بەزانکۆی (جۆن هۆبکنز) ی ئەمریکی کاردەکات، بەپێی لیژنەی خەلاتەکان لەئەکادیمیەی زانستی شاهانە لەسوید، ئەو سێ زانایە رۆڵی گرنگیان دیوە لەلێکۆڵینەوەی دەیان ئەستێرەی تەقیو کە بەسۆپەر نۆڤا دەناسرێن. هاورێ لەگەڵ دۆزینەوەی تێکرایی فراوان بوونی گەردوون. بەپێی تەلەسکۆبی فەزایی هابل بەپێی وتەی تیمێکی گەردووناسی جیهانی گەردوون لەکشانێکی بەردەوامی زۆرخێرادایە و بگرە لەجارانیش خێراتر.

تیمێك لە روانگەی (لیدن) بەسەرپەرشتی گەردووناس (سکراباك) لە لێکۆڵینەوەیەکیاندا رووپێوی زیاد لە ( ٤٤٦هەزار ) مەجەرەیان کردووە، بەیارمەتی تەلەسکۆبی فەزایی هابڵ، کە (٥٧٥) وێنەی مەجەرەکانی بۆ گرتوون، بە پێشکەوتوترین و ووردترین کامێرا هابڵ زیاد لە (١٠٠٠) کاتژمێر سەرقاڵی تێبینی تۆمارکردن بووە لەسەر ئەو مەجەرانە، هاورێ لەگەڵ زانیاریەکانی هابڵ ئەو تیمە

زانیاریان لە شەبەنگی ڕووناکی ئەو تەلەسکۆبەوانەوە وەرگرتووە کەلەسەر زەوین بۆ زیاتر لە (١٤٩هەزار) مەجەڕە، زاناکان بەپشت بەستن بەبیرکاری زۆر بەرزوو ئاڵۆز لەمیانەی شیکردنەوەی ئەو زانیاریانە بۆیان دەرکەوتووە کەگەردوون وا لە کشانێکی بەردەوام و خێرا بەهۆی ئەوەی پێی دەڵێن ووزەی ڕەش.



## ٢٤٩ لێکۆڵینەوەکەی پرۆفیسۆر (گۆرینگەر) و دۆزینەوەیەکی زانستی نوێ:

لەدیمانەیەکی ڤیدیۆییدا (شێخ عەبدولمەجید زندانی) لەگەڵ پرۆفیسۆر (جی-سی گۆرینگەر)دا دەڵێت: ئەوە پرۆفیسۆر جی-سی گۆرینگەرە، مامۆستای کۆلێجی پزیشکی بەشی توێکاریە لەزانکۆی (جۆرج تاون) لە واشنتۆنی پایتەختی ئەمریکا، شێخ عەبدولمەجید زندانی دەڵێت: پێم وت: ئایا هیچ زاراوەیەك هەیە بۆ قۆناغەکانی کۆرپەلەزانی وترابێت وەك ئەو زاراوانەی کەلە قورئانی پیرۆزداهاتوون؟

وتی: نەخێر. وتمان: ڕات چیە بۆ ئەو زاراوانەی کەهەموو قۆناغەکانی کۆرپەلەی گرتووەتەوە؟

دوای وتووێژێکی زۆر توێژینەوەیەکی لە کۆنگرەی پزیشکی هەشتەمی سعوودی پێشکەش کرد سەبارەت بەو قۆناغانەی کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتوون، کەچەند مرۆڤایەتی لێیان بێ ئاگابوو.

هەروەها سەبارەت بەگشتگیری و ووردی ئەو زاراوانەی قورئانی پیرۆز کەبەکاریهێناوە بۆ کۆرپەلە بەدەستەواژەی کورت و دەربڕینی پوخت ڕاستییەکی زۆر لەخۆ دەگرن، پرۆفیسۆر لەکۆنگرەکەدا ڕای خۆی وت: بێگومان ئەمە وەسفی گەشەکردنی مرۆڤایەتیە هەر لەپێکهاتنی نوتفەی تێکەڵاوە هەتا دەبێتە بارستەیەکی ئەندامی، لێکۆڵینەوەکەی پرۆفیسۆر گۆرینگەر سەریکێشا بۆ دۆزینەوەیەکی زانستی نوێ کەئەو گومانەی گاورەکان بەردەوام دەیوروژێنن دەڕەوێنێتەوە گاورەکان دەڵێن



عیسا (سەلامی خوای لێبێت) لەدایکەوە دروست بووە ئەی باوکی کوا؟ ئەم گومانە بڵاودەکەنەوە نازانن درووستکراوی تر هەیە بەبێ باوک قورئانی پیرۆز وەڵامیان دەداتەوە و نموونەی ئادەمیان بۆ دێنێتەوە خوای پەروەردگار دەفەرموویێت:

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾آل عمران:٥٩، واتە: بەڕاستی نموونەی دروستبوونی عیسا لەلایەن خواوە: وەك نموونەی ئادەم وایە کەلەخاك دروستی کردوو لەوەو دوا فەرمانی داو پێی وت: ببە بەمرۆڤ ئەویش بوو، ئێمە سێ جۆر درووستکراو دەبینین، ئادەم درووستکراوێکە بەبێ باوك و دایك، حەوا درووستکراوێکە بەبێ دایك، عیسا (سەلامی خوای لەسەربێت) درووستکراوێکە بەبێ باوك، ئەوەی توانیویەتی ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) بەبێ دایك و باوك دروست بکات بە توانایە عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) بەبێ باوك درووست بکات. لەگەڵ ئەوەشدا گاورەکان بەردەوام دەمەقاڵەیانە ویستی خوای پەروەردگاریش وایە بەڵگە لەدوای بەڵگەیان بۆدەربخات.

**ئەی گاورەکان بۆچی لەسەر ئەمە گومانتان هەیە؟**

دەڵێن: لەبەر ئەوەی هەرگیز درووستکراوێك نابینین بەبێ باوك یان بەبێ دایك بێت، لەکاتێکدا زانست دەریخستووە ئێستا هەندێك لەو زیندەوەر و بوونەوەرانەی نەوە دەخەنەوە بەبێ پیتاندنی نێرینە لەدایك دەبن. بۆنموونە هەنگ: هەموو نێرینەکانی بریتی یە لە هێلکەی نەپیتێنراو بە ئاوی نێرینە و ئەو هێلکەیەی بەئاوی نێرینەش دەپیتێنرێت دەبێتە مێیەی کارکەر، بەڵام نێرینەکان تەنیا لەهێلکەی شاژن بەبێ تۆوی نێرینە درووست دەبن و لەسەر ئەوەش نموونەی دیکە زۆرن، تەنانەت ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی زانستیەوە مرۆڤ گەیشتووەتە ئەوەی هەندێك هێلکەی زیندەوەر بتروکێنێت و گەشەبکەن بەبێ پێویست بوونی پیتاندنی نێرینە، ئەوەش پرۆفیسۆر (گۆرینگەر) باسی ئەو ڕاستییە زانستیە دەکات کەوەك ڕۆژی ڕووناك موعجیزەی ئەم قورئانە پیرۆزە ئاشکرا دەکات، ئەگەر ئەمە بەجۆرێکی تر بابەتەکە باس بکەین هێلکەی نەپیتراوی زۆرێك لە زیندەوەرە وشکاوەکیەکان و شیردەرە بچووکەکان



دەتوانرێن بەهۆکاری میکانیکی وەك دەرزی لێدان، یان بەهۆکاری ماددی وەك بزواندنی گەرمی، یان بەهۆکاری کیمیایی و بەکارهێنانی ماددەی کیمیایی جیاواز چالاك بکرێن، کەئەم جۆرە گەشەکردنەی کۆرپەلەش بە سرووشتی دادەنرێت کەواتە گومانی گاورەکان لەکوێدایە؟

دەڵێن: ئەستەمە دروستکراوێك هەبێت تەنها لە دایکەوە بێت و باوکی نەبێت، ئەم بەڵگەیەش پێشکەش دەکرێت تا ببێتە پێوانە بۆ بەراوردکردنەکانی دواتر ئیتر ئەم شك و گومانە بۆ؟ خوای پەروەردگار وەڵامی بنبڕ و پێویستی داونەتەوە نموونەی ئادەمی هێناوەتەوە کە باوەڕیان پێیەتی و باوك و دایکیشی نیە، ئێوە سەرتان دەرناچێت لەدروستکراوێك تەنیا لەدایکەوە بێت و باوکی نەبێت، بەڵام خوای گەورە نموونەی دروستکراوێکتان پیشان دەدات کە باوك و دایکی نیە و باوەڕیشتان پێیەتی کە ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾آل عمران:٥٩، ویستی خوای گەورەش وایە پێشکەوتنی زانستی بەڵگەی ترمان لەسەر ئەم ڕاستیەی قورئان پێشکەش بکات، بەو جۆرە ئەو کتێبە پیرۆزە و ئایەتەکانی ڕۆشنتردەبنەوەو نەوە دوای نەوە گەورە زانایان زیاتر لەو کتێبە تێدەگەن چونکە ئیعجازە سەرسوڕهێنەرەکانی تەواو نابن.



## ٢٥٠ دەرکەوتنی موعجیزەیەکی زانستی نوێ دەربارەی شێوەی پێکهاتەی زەوی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ ﴾النازعات:٣٠، (الدحیه) : مانای هێلکەی (نەعامە)، ئایەتە پیرۆزەکە شێوەی پێکهاتەی زەوی بەوێنەی هێلکەی نەعامە باس دەکات، ئەوەش سەلمێنراوە بەشێوەی زانستی بەهۆی مانگی دەستکردەوە کە وێنەی زەوی گرتووە، لەدووری هەزاران کیلۆمەتر لەم ئایەتەدا خوای



پەروەردگار دەربارەی چۆنیەتی دروست بوونی زەوی کەوەك (دَحَىٰهَآ ) ی لیّ هاتووە دەدویّت، لێرەدا هەتا لەم وشەیە تێنەگەین مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە نازانین.

پاش هەوڵدان و گەڕان بەدوای واتای ئەم وشەیە ئەوە ئاشکرا بووە لە ولاّتی سعوودیە لەشوێنێك لەمەككە ئەم وشەیە بەكاردێنن بۆ هێلكەی ئاژەڵێك بەناوی (نەعامە)، ئەمەش گەورەترین موعجیزەیە كە زەوی بەشێوەی هێلكە ئاماژەی بۆكراوە ئەمەش پێش هەزارەها ساڵ كەچی زانستی گەردوونی سەردەم تازە دانی بەم ڕاستیە ناوە و دەڵیّ زەوی شێوەی هێلكەییە، خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ غافر:٨١، واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە كام لەنیشانەكانی خوا دان پیانانێن.



## دەركەوتنی نهێنیەكی زانستی دەربارەی خۆر و مانگ:

خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ فصلت:٣٧. وشەی ( خَلَقَهُنَّ ) ئاماژەیە بۆ زۆری ڕۆژ و مانگ ئەوەش زانست سەلماندوویەتی زانستی تازە ئەوەی سەلماندووە كە جگە لەو خۆر و مانگە چەندەها خۆر و مانگی تر هەن، بەڕاستی ئەوەش یەكێكە لە موعجیزە هەرە گەورەكانی قورئان، چونكە لەكاتی دابەزینی قورئان تا چەند ساڵێكیش پێش ئەو دۆزینەوە گەورەیە هیچ كەسێك نەیدەزانی جگە لەو مانگ و خۆرە كەدەبینرێت كە مانگ و خۆری تر هەبن، بەلاّم قورئان كە خاوەنەكەی خوای گەورەیە پێش چواردە سەدە ئەو ڕاستیەی باس كردووە، زانایانی گەردوون ئەوەیان دوزیوەتەوە كەخۆر زیاترن لە (١٠٠ملیۆن) خۆر، هەروەها زانستی نویّ ئەوەی سەلماندووە كە خۆر كۆتایی پیّ دێت، ئەوەش قورئانی پیرۆز چواردە سەدە پێش ئێستا ئەوەی فەرمووە: ﴿ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ ﴾ القیامة:٩ .



## لەناو لەشی مرۆڤدا بەردەوام درووستبوونەوەی نوێ ڕوودەدات:

خوای گەورە لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ . ﴿ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٥﴾ ﴾ ق:١٥. واتە: ئەی مرۆڤ ئێوەمان درووست کردووە بەردەوام لە ناوپۆشاکی دروست بوونەوەی نوێ دان. واتە مرۆڤ لەناولەشیدا بەردەوام درووست بوونەوەی نوێ ڕوودەدات، ئەمە لەوسەردەمەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی موسڵمانەکان باوەڕی تەواویان پێ بوویێ، بێ ئەوەی لایەنە زانستیەکەی لێکبدەنەوە چونکە موسڵمانی ڕاستەقینە بوون کەچی زانستی نوێ لەم سەردەمە گەورەترین موعجیزەی دەرخست ئەوەش ئەوەیە: مرۆڤ لە ناو خوێندا دوو خڕۆکەی هەیە: خڕۆکەی سوور وسپی پاش لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوت خڕۆکە سوورەکان تەمەنێکی دیاریکراویان هەیە کە (١٢٠) ڕۆژە، لە پاش ئەوە ماوەیە دەمرن و خڕۆکەی سووری نوێ درووست دەبن، ئەم کردارە بەردەوام دووبارە دەبێتەوە تاکو ئەو مرۆڤە لەژیاندا بێت.



## قورئان بەرلە ١٤سەدە باسی ئامێری ئیستنساخی کردووە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الجاثية: ٢٩. واتە: ئەمە پەڕاوەکەمانە بەڕاستی لەسەرتان دەدوێ، بەڕاستی ئێمە وەك خۆی نوسیومانەتەوە وێنەمان گرتووە، ئەوەی کە ئێوە دەتان کرد کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاندە سەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئامێرێك نەبوو ناوی (استنساخ) بێت، بەلاَم لەسەردەمی ئێستا ئامێرێك پەیدا بووە بەناوی (استنساخ) کەهەرچی شتێك بتەوێ وەکو خۆی دەتوانی لەبەری بگریتەوە ئەمەش گەورەترین موعجیزەیە لەلایەن خوای گەورەوە کە ناردوویەتی بۆ بەندەکانی .



## ٢٥٤ بای زەردی ووشك باران نابارێنێت:

خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ الروم:٥١. واتە: سوێند بە خوا ئەگەر بایەکی تووندی زەرد بنێرین جا ئەو هەورە یان کشتوکاڵیە یان دەبینین بەزەرد بوویی لەپاش ئەو زیانە هەر ناشوکری دەکەن. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بە بایەکی زەردی وشك دەکات کە وەکو سزا لێرەدا بەکارهاتووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بای زەرد هەڵمی ئاوی تێدا نیە و وشکە، زانستی سەردەم وەکو هەموو جارێك دەست لە سەر چۆك بەرامبەر ئەم فەرموودە خواییە ڕادەوەستێت دەڵێ بایەك ئەگەر ڕەنگی زەرد بێت واتە تۆز و خۆڵی پێوەیە، لەسەر وشکانی هاتووە نەوەك لەسەر دەریا بۆیە باران نابارێنێت، چونکە هەڵمی ئاوی تێدا نیە .



## ٢٥٥ پێوانەی کردەوەکان لە ڕوانگەی قورئان و زانستی تازەدا:

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الانبیاء:٤٧. واتە: ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری کە کردەوەی پێ دەکێشرێ لە ڕۆژی قیامەتدا، ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێت با قورسی کردەوەکەی بەقەد تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین، بەسە ئێمە واتە: خوای گەورە ژمێریاری کردەوەی بەندەکان بین، لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بۆ پێوانەی کردەوەکان کراوە بەرلەوەی زانستی مرۆیی پێش بکەوێت، جێگەی سەرسوڕمان بوو شتێ نەبینرێ و دەستی لێ نەدرێ کەچی بپێورێت. پاش ئەوەی خوای گەورە زانستی زیاتری بە مرۆڤ بەخشی بینیان زۆر شت هەیە نابینرێ و دەپێورێ.



## ٢٥٦ زانستی نوێی پزیشکی ڕاستییەکی گەورەی ئاشکرا کرد لەبارەی درووست بوونی شیر:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ النحل:٦٦ ، واتە: بەڕاستی لە ئاژەڵ و ماڵاتیشدا بۆ ئێوە پەندوەرگرتن هەیە لەوەی لەناو سکی دایە بە ئێوەی دەنۆشین لەنێوان سروان و خوێندا شیرێکی پاکی بێ خەوشی ڕەوان بۆ نۆشەرانی، (دکتۆر مۆریس بۆکای)کە دکتۆرێکی فەڕەنسیە لە کتێبی قورئان و زانستی نوێ دا دەڵێ: هەندێ مادده کەلەناوەڕۆکەکانی گەدەوە دێت جۆگەی خوێن هەڵدەستێ بەگواستنەوەیان بۆ ئەندامەکانی لەش، خوێنیش لەلایەن خۆیەوە ئەو هەموو ماددانە بۆ هەموو ئەندامانی لەش دەگوازێتەوە، ڕژێنە شیردەرەکانی بەرهەم هێنەری شیر لەنێوان ئەو هەموو ئەندامانەدان واتە: کەوتۆتە نێوانیانەوە.



## ٢٥٧ گوێ پەیوەندی هەیە بەنوستنەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِي ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ﴾ الكهف:١١، ئینجا ئێمە دوعاکەیانمان گیراکرد و پەردەمان دا بەسەر گوێیاندا لەئەشکەوتدا چەند ساڵ خەومان لێ خستن. لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە دەفەرمووێ لەئەشکەوت دامان بەسەر گوێچکەکانیاندا چەندین ساڵ خەوتن ئەوە ئاماژەیە بەوەی گوێ پەیوەندی هەیە بەنوستنەوە. زانایان لێکۆڵینەوەیان کردوو گەیشتنە ئەنجامێك کە مرۆڤ خەوی لێ ناکەوێ، تاکو یەکجاری گوێی خەوی لێ نەکەوێ واتە: یەکەمجار گوێی ئەخەوێ پاشان چاوی خەوی لێ دەکەوێ، بۆیە ئەگەر یەکێك بخەوێ بەدەنگەدەنگ هەڵدەستێ لەخەو بەڵام بەدەست بەهێواشی چاوەکانی



بکەیتەوە هەڵناستێ لەخەو هەر بۆیە مرۆڤ لەشوێنی دەنگەدەنگ خەوی لێ ناکەوێ، چونکە گوێی ناتوانێ خەوی لێ بکەوێ ئەم ڕاستییە زانایان و دکتۆرەکان لەدوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆیان دەرکەوت، کەچی بەر لە چواردە سەدە قورئان باسی لێوە کردووە بەڕاستی ئەم قورئانە پڕیەتی لە ئیعجازی زانستی ناوازە.



## ٢٥٨ کاتێك زەوی دەسوڕێتەوە چیاکان دەڕۆن بەنێو هەورەکاندا:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾ النمل:٨٨.ج

واتە: ئەو کێو و چیایانە دەبینی وادەزانی دامەزراون لەشوێنی خۆیاندا کاتێ فووکرا بەشەیپوردا چیاکان وەك ڕۆیشتنی هەور دەڕۆن، ئەمە دروستکراوی ئەو خوایە یە کەهەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێك و پێکی دروستکردووە، بەڕاستی خوا ئاگادارە بەهەر کردەوەیەك ئێوە دەیکەن، خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمووێ: ئێوە وادەزانن ئەو چیایانەی ئێوە دەیبینن ڕاوەستاون؟ لەکاتێکدا ئەوانە دەڕۆن بەنێو هەورەکاندا، خوای گەورە زانستی تازە ئەوەی ئاشکراکردووە کەکاتێك زەوی دەسوڕێتەوە چیاکانیش دەڕۆن بەنێو هەورەکاندا.

***




## ئیعجازی زانستی دەربارەی چوونی شەو بۆناو ڕۆژ و ڕۆژیش بۆ ناو شەو:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۖ وَتُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَتُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّۖ وَتَرۡزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٢٧﴾ ﴾آل عمران:٢٧، واتە: شەو دەکەین بەناو ڕۆژدا وە ڕۆژ دەکەین بەناو شەودا، وە زیندوو دەردێنی لەمردوو وە مردوو دەردێنی لە زیندوو، وە ڕۆزی دەدەیت بەهەرکەسێ کەبتەوێ بەبێ شومار. لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کەشەو دەچێتە نێو ڕۆژەوە و ڕۆژیش دەچێتە نێو شەوەوە، دوای ئەوەی زانستی جوگرافیا و گەردوونناسی پێشکەوت توانرا وێنەی زەوی لەئاسمان بەتەواوی بگیرێ، بینرا کاتێك تیشکی ڕۆژ لەلایەکی زەوی دەدرێت لایەکەی تر ئەو تیشکەی بەرناکەوێ، واتە لەیەك کاتدا لایەکی زەوی دەبێت بەڕۆژ و لایەکەی تری دەبێت بەشەو، واتە: شەو دەچێتە نێو ڕۆژەوە و ڕۆژیش دەچێتە نێو شەوەوە تەواو وەك ئەوەی لەو ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆکراوە...هتد.




## ئیعجازێکی زانستی تازە دەربارەی زەیتی زەیتون:

دۆزینەوەیەکی زانستی گرنگ و نوێ کەپێش چەند ساڵێك لەمەوبەر لەلایەن زاناکانەوە ئاشکرابووە، ئەویش ئەوەیە کەتێبینی ئەوەیانکرد کەلاشەی مرۆڤ چەند شەپۆلێکی کارەبایی دەردەکات، دوای گەڕان و بەردەوام بوون گەیشتنە ئەنجامی ئەوەی کەهەموو تەنەکانی دەووروبەرمان شەپۆلی کارەبایی دەردەکەن بەشێوەی لەرەلەر، مەبەست لە شەپۆلەکان یان لەرەلەرەکان لەناو تەنەکاندا بەشێوەیەکی دیاریکراوە، هەموو یەکێك لەئێمە چاك دەزانین کەتەنەکانی دەووروبەرمان لەگەردیلە درووست بوون، ئەو گەردیلانەش هەمیشە جوڵەیین و لەئەنجامی جوڵەکانیان بوارێکی کارۆ موگناتیسی دروست دەکەن ئەمەش ئەو بوارە زانستییە نوێیەیە کەزاناکان دۆزیویانەتەوە و ئێمەش باسی لێ دەکەین.

لەتاقیکردنەوەیەکدا دکتۆر (ڕۆیاڵ ڕیفی) بۆی دەرکەوت کەهەموو خواردەمەنیەکان خاوەنی لەرەیەکی موگناتیسین کەدەتوانرێت هەژمار بکرێت، بەڵام ڕۆنی زەیت لەچاو ڕووەکەکانی ترو تەنانەت مرۆڤیشدا خاوەنی بەرزترین لەرەی موگناتیسییە، چونکە دەرکەوتووە لەرەی موگناتیسیەکانی جەستەی مرۆڤ دەکاتە کەمتر لە (٦٠)لەرە لە چرکەیەکدا، لەرەی گژوگیا وشکەکانیش دەگاتە (٢٠) لەرە لەچرکەیەکدا، هەندێك خۆراك و گژوگیاش هەیە هیچ لەرەیەکیان نیە.

ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو بۆ دکتۆر (ڕۆیاڵ) ئەوەبوو کەبۆی دەرکەوت بەرزترین لەرە لەڕۆنی زەیتی زەیتون دایە، کەلەرەکانی لە چرکەیەکدا دەگاتە(٣٢٠)لەرە و لەرەکانیش لەشێوەی لەرەی ئەو ڕووناکیە دەچێت کەڕۆژانە دەیانبینین بەڵام چاوی ئێمە ناتوانێت هەست بەشەپۆلی ئەو ڕووناکیانەبکات و نایانبینین، چونکە مرۆڤ تا سنوورێکی دیاری کراو توانای بیستن و بینینی هەیە لەرە بەرزەکان یان زۆر نزمەکان تەنها بە ئامێر دەتوانرێت هەژمار بکرێت، چونکە بە چاو نابینرێن، ئەوەی شایەنی تێڕامانە کەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ﴿٣٥﴾ ﴾ النور:٣٥، واتە خوا نوری ئاسمانەکان و زەویە نور و ڕووناکی بەخشە پێیان نموونەی نور و ڕووناکیەکەی وەك تاقێك وایە چرایەکی تێدا بێت، شوشەکەش وەك هەسارەیەکی گەش و پرشنگدار وابێت و داگرسابێت بەڕۆنی درەختی موبارەك و بەفەڕی زەیتون ڕووی نەلە ڕۆژ هەڵات و نەلە ڕۆژئاوابێت لەشوێنێکدا بێت بەیانیان و ئێوارە خۆر بدات ڕۆنەکەشی.

***

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ۝٧ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ۝٨ قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ۝٩ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ۝١٠ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ۝١١ ﴾ الملك:٧-١١، واتە: هەروەها بۆ ئەوانەش کەباوەڕیان بەپەروەردگاریان نیە سزا و ئازاری دۆزەخ ئامادەیە، ئای کە چارەنووس و سەرئەنجامێکی زۆر ناسۆر و ناخۆشە کاتێك فڕێ دەدرێنە ناوی، دەنگێکی ناساز و ناخۆش و لوورەیەك لە دۆزەخەوە دەبیستن، لەکاتێکدا قوڵپ دەدات و دەکوڵێت لەداخی خوانەناسان خەریکە پارچە پارچە ببێت و لێك ببێتەوە، هەرجارێك دەستەو تاقمێك فڕێ دەدرێتە ناوی، پاسەوانی دۆزەخ لێیان دەپرسێت باشە ترسێنەرێکتا بۆ نەهات تا لەم سەر ئەنجامە ئاگادارتان بکات؟ لەوەڵامدا بەکەساسیەوە دەڵێن بەڵێ لەڕاستیدا ترسێنەرمان بۆهات بەڵام ئێمە بڕوامان پێنەکردن و وتمان: خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە ئێوە تەنها لەگومڕایی گەورەدا گیرتان خواردووە و هیچیتر، ئینجا دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە و بیر و هۆشمان بەکاربهێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ ئەوسا ئیتر بەناچاری و خەجاڵەتییەوە دان بەگوناه و تاوانی خۆیاندا دەنێن جابا نیشتەجێکانی دۆزەخ لەوەولاترچن.

ڕەنگی سووری ئاگر بریتییە لەنزمی پلەی ئاگرەکە بەهەزاران پلە بەلام ئاگری دۆزەخ ڕەشێکی تاریکە کەئەوەش بەڵگەیە لەسەر پلەیەکی یەکجار بەرزی ئاگرەکە، خوایەگیان ئاخۆ دەبێت چەند گەرم بێت؟ ئەوەی کە جێگای سەرنج و سەرسوڕمانە موعجیزەیەکی یەکجار گەورە و درەوشاوەیە کەوا دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە ئەگەر لە قورئانیش وردبینەوە دەبینین کەوا حەوت جار وشەی ڕەنگی ڕەش باسکراوە واتە: هەروەك ژمارەی دەرگاکانی دۆزەخ بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەی ئەم قورئانە پیرۆزەیە.



## ٢٦٢ موعجیزەیەکی مەزنی زمانەوانی لە قورئانی پیرۆزدا:

موعجیزەیەکی تایبەتی زمانەوانی قورئانی پیرۆز دەخەینە ڕوو، لەنێوان دوو وشەی قورئانی پیرۆز کەئەویش جیاوازی نێوان وشەی (الزوج) و (امرأە) ئەم دوو وشەیە زۆر لەقورئانی پیرۆزدا هاتوون، بەڵام لەماناکادا موعجیزەیەکی زمانەوانی مەزنیان هەڵگرتووە، بەر لەوەی باسی ئیعجازە مەزنەکە بکەین دەبێ لەمانای ئەم وشانە تێبگەین کەلە ڕووکاریاندا هەردووك بەمانای هاوسەری ژیانەوە دێن، بەڵام لە ناوەڕۆکیان قورئانی پیرۆز لە ئیعجازێکی زمانەوانیەوە جیاوازی هەردووکمان فێردەکات بەم شێوەیەی خوارەوە: ئایا چ کاتێك دەوترێت (زوج) وە چ کاتێك دەوترێت (امرأە)؟ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کاتێك وورد دەبینەوە دەبینین کەوا جیاوازیان هەیە: وشەی (زوج) کاتێك دەوترێت کەوا ئەگەر هاتوو لەنێوان ژن و پیاوەکەدا بەشێوەیەکی تەواو ژن و مێردایەتیان لەنێواندا هەبێت، جیاوازی لە ئاین و بیرو ڕایاندا نەبێت. بەڵام وشەی (امرأە) کاتێك دەوترێت ئەگەر لەنێوان ژن و پیاوەکەدا جیاوازی لە ئاین و بیروڕاو ڕەگەزدا هەبێت، ئەگەر جیاوازی لەنێوان ئەم دوانەدا هەبوو ئەوا قورئان بە وشەی (امرأە) دەری دەبڕێت نموونەی ئەمە وەکو:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الروم:٢١، واتە: یەکێك لەنیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کەهەر لەخۆتان هاوسەری بۆ درووست کردوون بۆئەوەی ئارامبن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئالەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگەیە بۆ کەسانێك کەبیر دەکەنەوە و تێدەفکرن. لێرەدا خوای گەورە وشەی (زوج) ی بەکارهێناوە چونکە باسی خۆشەویستی و بەزەیی دەکات لەنێوان ژن و مێردەکەدا، کەواتە تێنەگەیشتن و جیاوازییەك لێرەدا نیە بۆیە ئەم وشەیەی بەکارهێناوە هەروەها دەفەرمووێت:



﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان:٧٤، واته: ئەوانەش کە دەڵێن پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کەببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ البقرة:٣٥. واته: ئینجا وتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەر و نیشتەجێ بن لەهەرکوێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێرو تەسەلی، بەڵام نزیکی ئەم درەختەمەکەون درەختێکی دیاری کراو بۆ تاقیکردنەوە لێیان قەدەغەکرا ئەگینا دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە. لەم ئایەتەپیرۆزەدا خوای گەورە لەبەر ئەوەی دایکەحەواو ئادەم تەواو لەگەڵ یەکتر لەڕەگەزی مرۆڤایەتی و ئاینیەوە یەك ڕێگابوون بۆیە وشەی (زەوج)ی بەکارهێناوە، کەواتە بەم دەربڕینەبێت خوای گەورە دایکە حەوای بەخێزانی ئادەم ناوبردووەو نەیفەرمووە: (أسکن أنت وأمرتك).

هەروەها دەفەرمووێت: (النبی أولی بالمؤمنین من أنفسهم وأزواجة أمهاتهم) واته: پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم) نزیکترە بەئیمانداران لەخودی خۆیان، واته: دەبێت لەخۆیان زیاتر خۆشیان بوێت و فەرمانەکانی لەسەرو فەرمان و داخوازی خۆیانەوە بێت، خێزانەکانیش دایکیانن دایکی ئیماندارانن لەبەرئەوەی خێزانەکانی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لەئاین و ڕەگەزی مرۆڤایەتی و هەڵسوکەوتەوە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاوڕێگاو تەبابوونە، بۆیە خوای گەورە نەیفەرمووە: (ونسائه أمهاتهم) ئەگەر هاتوو ئەم ڕێکەوتن و هاوڕێگاییەویەك ئاینی و تەباییە لەنێوان ژن و مێردەکەدا نەبوو، ئەوا خوای گەورە لەجیاتی وشەی زەوج (أمرأه) دەریبڕیووە نموونەی ئەم دەربڕینە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ التحريم: ١٠. واتە:خوا نموونەی هێناوەتەوە بەژنی نوح و لوت بۆ ئەوانەی کەبێباوەڕبوون کە ئەو دوو ئافرەتە هاوسەری دووبەندەی پاك و چاکی ئێمە بوون، کەچی خیانەتیان لێ کردن، باوەڕیان پێیان نەبوو غەیبەتیان دەکردن، گاڵتەیان پێ دەکردن، ئیتر ئەو پێغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن، لەقیامەتدا بەو ژنانە دەوترێت بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا کەدەچنە ناوی.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چونکە خێزانەکانی (نوح و لوت)هەردووکیان لەگەڵیاندا لەئاینەوە جیاوازبوونەوەو لەگەڵ مێردەکانیان تەبانەبوون بۆیە لەجیاتی وشەی (زوج) بە (إمرأ) ناویان هاتووە واتە: خوای گەورە نەیفەرمووە (زوج نوح) و (زوج لوط) هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ ﴾ التحریم:١١. واتە: هەروەها خوا نموونەی هێناوەتەوە بەهاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە، کاتێك وتی : پەروەردگارە لای خۆت لەبەهەشتداماڵێکم بۆ درووست بکە تابەردەوام بەدیدارت شادببم و لەدەست فیرعەون و کارو کردەوەی ڕزگارم بکەو، لەدەست ئەم قەومە ستەمکارەش دەربازم بکە.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چونکە خێزانی فیرعەون موسڵمان بوو فیرعەونیش بێباوەڕبوو، بۆیە لەجیاتی وشەی (زوج) (أمرأه) ی بۆ بەکارهاتووە، هەروەها لەئیعجازە ڕەوانبێژیەکانی قورئانی پیرۆزدا ئەوە هاتووە کەوا خێزانی زەکەریا (سەلامی خوای لێ بێ) چونکە نەزۆك بووە بەم هۆیەشەوە جیاوازیەك لەنێوانیان درووست بووە بۆیە خوای گەورە وشەی (أمرأه)ی بەکارهێناوە نەوەك (زوج)صدق الله

﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِي عَاقِرًا فَهَبْ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ ﴾ واته: بەڕاستی من لەوەترساوم کەخزم و خوێشان و عەشرەت دوای مردنم سەرگەردان بن، چونکە کەسێکی وایان تیادا بەدی ناکەم کەشایستەی گەیاندنی پەیامەکەت بێت، خۆت دەزانیت خێزانەکەشم مندالّی نابێت، بۆیە داواکارم لەبەخششی خۆت بەهرەوەرم بکە و مندالّێکم پێ ببەخشیت کەبتوانێت جێگەی من بگرێتەوە.

لێرەدا لەئاینەوە یەکن بەلاّم ژن و مێردایەتیەکە بەتەواوی نەهاتۆتەدی واتە: کەم و کوڕیەك هەبووە لەبەر ئەم جیاوازیەو کەموکوڕیە کەلەنێوانیاندا هەبووە و ئەویش نەبوونی توانای مندالّ بوون بووە لەلایەن خێزانەکەی زەکەریاوە (سەلامی خوای لێ بێ)، بۆیە وشەی (أمرأه) بۆ بەکارهاتووە و نەیفەرمووە (وزوجتی عاقرا).

ئەوەی کەلێرەدا زۆر سەیرە ئەوەیە کەوا دوای ئەوەی زەکەریا (سەلامی خوای لەسەربێ) نزای ئەوەی کرد خوای گەورە مندالّێکی پێ ببەخشێت، خوای گەورەش نزاکەی گیراکردو یەحیای سەلامی خوای لەسەربێ پێ بەخشی. کەواتە لێرەدا ئەو جیاوازیەی لەنێوانیاندا هەبوو بەلەدایکبوونی یەحیا سەلامی خوای لەسەر بێ نەما، بۆیە دوای لەدایك بوونەکە خوای گەورە وشەی (أمرأه) لابردو وشەی (زوج)ی بەکارهێنا:

﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ الأنبياء:٨٩-٩٠. واتە: یادی زەکەریاش بکەرەوە کاتێك هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی: پەروەردگارا من بەتەنهایی مەهێڵەرەوە نەوەیەکی چاك و پاکم پێ ببەخشە، تۆیش چاکترین زاتێکی لەپاش من و هەموو مردوویەك دەمێنیتەوە، ئینجا ئێمە نزاکەیمان گیراکردوو یەحیامان پێ بەخشی هاوسەرەکەیشمان بۆ چاك کرد کەمندالّی ببێ، چونکە بەڕاستی ئەوانە چالاك و گرجوگۆڵ بوون لەئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکداو، نزای بەکوڵیاندەکرد

بەئومێدو بەهەشتی ڕەحمەتی ئێمەو لەدۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسان و ئەوان هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە. خوێنەری بەڕێز: بڕوانە کاتێك منداڵەکە بوو دوای ئەوە خوای گەورە نەیفەرمووە (وأصلحناله (أمرأە) بەڵکو وشەی (زوج)ی بەکارهێناوە، چونکە جیاوازیەکە کەنەزۆکی بوو نەما لێرەوە ئەوەمان زانی کە ئەم دوو وشەی (زوج) و (أمرأە) (لفاظ مترادف) نین، ئائەوەیە ڕەوانبێژی قورئانی پیرۆز کەهۆنەر و زانا زمان زانەکان لەبەرامبەریدا دەستەو ئەژنۆ وەستاون.



## لێکۆڵینەوەی توێژەرە کەنەدییەکان دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئانی پیرۆز:

لە هەواڵێکی زانستی کە لە پێگەی (BBC)دا هاتووە توێژەران پەیوەندییەکی پتەویان لەنێوان بەخشین و بەختەوەری بەدیکردووە، توێژەرە کەنەدییەکان پێیان وایە کۆکردنەوەی مەبلەغێکی زۆر لە داهات بەختەوەری بۆ مرۆڤ دەستەبەر ناکات، بەڵکو هەستکردن بە بەختەوەری لە ڕێگەی بەخشینەوە دەبێت. گروپێکی توێژەر لە زانکۆی (بریتش کۆلۆمبیا) ڕایانگەیاند بەخشینی هەر بڕێك لە داهات هەتا ئەگەر تەنها (٥) دۆلاریش بێت بەختەوەری دەخاتە دەروون، ئەوان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەخشین زۆر پێویستە هەتا ئەگەر بڕێکی کەمیش بێت و ئەوەش ئەو ڕاستییەیە کە پێغەمبەر ﷺ پێش لێکۆڵینەوەی ئەو زانایانە چواردە سەدە زیاترە فەرموویەتی: (اتقوا النار ولو بشق تمرة) واتە: خۆت لە ئاگر بپارێزە ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت.

هەروەها قورئانی پیرۆزیش زۆر بە جوانی جەختی لەسەر دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ الطلاق: ٧. واتە: جا ئەوەی دەوڵەمەندە با بە گوێرەی دەوڵەمەندییەکەی بەخشندە بێت، ئەوەیش کە کەمدەست و هەژارە با لەوە ببەخشێت کە خوا پێی بەخشیووە، چونکە خوا بە گوێرەی دارایی هەر کەسێك داوای بەخشندەیی دەکات، دڵنیاش بن کە خوا دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت.

هەر لەو توێژینەوەدا کە لە گۆڤاری (العلوم) (The science) بڵاوکراوەتەوە هاتووە ئەو کارمەندانەی کە بەشێك لەو بژێوییەی دەستەبەری دەکەن دەیبەخشن زۆر بەختەوەرن لەچاو ئەوانەی ئەم کارە ئەنجام نادەن، توێژەران هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لەسەر (٦٣٠) کەس داوایان لێکرا ئاستی بەختەوەرییان مەزەندە بکەن. دەسکەوتی ساڵانەیان و پوختەی بەخشینەکانیان لە هەر مانگێك و ئەو پێویستیانەی کە بۆ خۆیان و بۆ کەسانی تر دەیکڕن، پرۆفیسۆر (ئیلیزابێت دان) کە سەرۆکایەتی ئەم گروپەی دەکرد، دەڵێ: دەمانەوێ بیردۆزەکەمان تاقیبکەینەوە کە بەخشینی ماڵ لەلایەن خەڵك بە هەمان ڕێژەی بەدەستهێنانی ماڵەکانیان گرنگە (سبحان الله) زانایانی سەردەمی تازە هەمان ئەو وتانە پشتڕاست دەکەنەوە کە قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە چواردە سەدە جەختی لەسەر کردوونەتەوە.



## ٢٦٤ سوودەکانی گەشبینی لەژێر تیشکی قورئان و زانستی نوێدا:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر جەخت لەوە دەکاتەوە کە مرۆڤەکان پێویستە گەشبین بن، لەو بارەوە زۆر ئایەت هەن لە قورئان، بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ (يونس: ٥٨). واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشادو شادومان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوا (کە قورئان و بەرنامەی خوای گەورەیە)، کەوا بوو با هەر بەوە دڵخۆش بن و هەر ئەوەش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوەو کەڵەکەی دەکەن.

لە ئایەتێکی تردا یەعقوب پێغەمبەر باوکی یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوایان لەسەر بێت) نایابترین نموونەیە لە گەشبینی کە براکانی یوسف پیلانیان دانا دژی (یوسف) و دووریان خستەوە لە باوکی، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەموو ئەو ساڵە دوورو درێژانە گەشبین بوو بەرامبەر ئومێدی خوای گەورە، کە لە کۆتاییدا شادبۆوە بە کوڕە

خۆشەویستەکەی (یوسف سەلامی خوای لەسەر بێت) وەك خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ (یوسف: ٨٧) واتە: یەعقوب (علیه السلام) فەرمانی بە کوڕەکانی کرد فەرمووی: کوڕەکانم بچنەوەو گوێ هەڵخەن بۆ (یوسف) و براکەی لە سۆز و میهرەبانی خواش نائومێد مەبن، چونکە بەڕاستی کەس نائومێد نابێت لە سۆز و میهرەبانی خوا جگە لە کەسانی خوانەناس و بێباوەڕ.

توێژەرە ئەمریکییەکان لە لێکۆڵینەوەیەك کە نوێترینیانە دەڵێن: ئەوانەی کە ناودەبرێن و ناسراون بە گەشبین تەمەنێکی درێژتر دەژین، هەروەها کەسانی زۆر تەندروستن بە بەراورد لەگەڵ کەسانی ڕەشبین کە لەوانەیە ڕەشبینی هۆکارێکی تر بێت بۆ بێزاری.

توێژەرەکان لە زانکۆی (بیتسبۆرگ) توێژینەوەیان لە تێکڕای مردن و ژینگەی تەندروستی درێژخایەن لەنێوان بەشداربووان لە لێکۆڵینەوەی (دەستپێشخەری لە تەندروستی ئافرەتان) کرد، کە زیاتر لە سەد هەزار ئافرەتی لەخۆگرتبوو کە تەمەنیان لە نێوان پەنجا ساڵان و زیاتر بوو، لە ساڵی (١٩٩٤) ئەو ئافرەتانەی بە گەشبین ناسراون پێشبینی ڕوودانی کردەی تەندروستی باش دەکەن، ئەگەری مردنیان ١٤٪ کەمترە بۆ هەر هۆکارێك بە بەراورد لەگەڵ ڕەشبینەکان و ئەگەری مردنیان بە نەخۆشییەکانی دڵ ٣٠٪ کەمترە، پاش هەشت ساڵ لە چاودێری کردنی ئەو توێژینەوەیە، هەروەها گەشبینەکان ئەگەری تووشبوونیان بە بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و شەکرەو ڕووکردنە جگەرەکێشان کەمترە سوودە تەندروستییەکانی گەشبینی:

١- گەشبینی بەشێکە لە ئیمان.

٢- گەشبینی دەزگای بەرگری لەش دژی هەموو نەخۆشییەکان بەرزدەکاتەوە.

٣- گەشبینی یارمەتی مرۆڤ دەدات کە بەتوانا بێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستە دژوارەکان و دانی بڕیاری دروست.

٤- دەبێتە هۆی خۆشویستن لای خەڵك، چونكە مرۆڤ بە شێوەیەكی سروشتی مەیلیان لای كەسی گەشبینە.

٥- گەشبینی حەسانەوەیە بۆ كاری دەماغ، ئەگەر دانیشتیت و دە سەعات بیربكەیتەوە لە گەشبینی ئەوا وزەی دەماغت بەفیڕۆی دەدات، زۆر كەمترە لەوەی كە دانیشتن و تەنها پێنج خولەك بە ڕەشبینی بیربكەیتەوە، بەڕاستی ئەم ئاینە پاكەی ئیسلام كە هاتووە بەو ڕێنماییە پێشكەوتووانە هەق وایە مرۆڤەكان تێكڕا بیكەنە بەرنامەی ژیانیان، هەر كەسێك وێڵە بەدوای زانست و پێشكەوتن و ڕۆشنبیری تەنها بە شوێنكەوتنی بەرنامەی ئیسلام ئەو هیوایەتەی دێتەدی، چونكە ئاینێكە لێوان لێوە لە زانست كە تەكنەلۆجیای سەردەم وەك ڕۆژی ڕووناك ڕاستی و دروستی سەلماندووە.

##  جێگیری دەروونی هاوسەران لە ڕوانگەی قورئان و زانستدا:

توێژەران جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە هاوسەرداری نابەختەوەر ئافرەت تووشی چەند زیانێكی تەندروستی دەكات. زانا ئەمریكییەكان وتیان: ئافرەت زیاتر تووشی زیان و ئازاری لاشەیی دەبنەوە لە ڕێگای فشاری دەروونی هاوسەرەكانیان بە پشتبەستن بە لێكۆڵینەوەیەكی نوێ لە كۆمەڵەی ئەمریكی بۆ نەخۆشییەكانی جەستە لە شیكاگۆ، ڕایگەیاند ئافرەتانی تەمەن ناوەڕاست نەك پیاوەكان ئەگەری زیاتریان هەیە بۆ توشبوون بە كێشە دەروونییەكان لە پەیوەندییە كوێرەوەرییەكانی هاوسەرداری، وەك بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و زیادبوونی چەوری لە دەوروبەری سك زۆر هۆكاری تر دەبنە هۆی كێشەی دڵ و شەكرە.

دكتۆر (نیساگولدبیرگ) كە پزیشكی دڵ و بەڕێوەبەری پرۆگرامی ئافرەتە لە زانكۆی نیویۆرك دەڵێ: پەیوەندی هاوسەری خراپ تەنها كاریگەری نابێ لەسەر بەختەوەری بەڵكو كاریگەری لەسەر دروستی ئافرەتەكانیش دەبێ. لەو لێكۆڵینەوەیە كە توێژەران لە زانكۆی یوتا ٢٧٦ كەسیان وەك سەمپل لە هاوسەران وەریانگرتووە بۆ

زانینی ئەوەی کە ڕاڕایی دەبێتە هۆکاری سەرەکی هاوسەرداری نابەختەوەرو زیانبەخش بە تەندروستی، لەبەرئەوەی کۆمەڵناس و دەروونناسان هەوڵدەدەن کە ئامۆژگاری پێشکەش ئەو پیاوانە بکەن تا زیاتر گرنگی بە ئافرەتان بدەن لەپێناو ژیانی هاوسەرداری بەختەوەر و تەندروست. لە زۆر لە توێژینەوەکان دەرکەوتووە کە خێزانداری جێگرو پڕ لە سۆز و میهرەبانی دەبێتە هۆکاری زیادبوونی توانای بەرگری لە هاوسەران.

خوێنەری بەڕێز: ئەو وتەی توێژە بیانییەکان تازە بۆیان دەرکەوتووە قورئان و فەرموودەکان پێش زیاتر لە چواردە سەدە جەختیان لەسەر کردۆتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (النساء: ١٩) واتە: هاوژینیان بە جوانی لەگەڵ ببەنە سەر خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزاربوون ئەوە دوور نییەو دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکاتە خێروبێری زۆرو بێ سنور، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (استوصوا بالنساء خیراً) ئامۆژگاریتان دەکەم کە لەگەڵ ئافرەتدا باشبن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی فەرمووە بە پیاو کە گرنگی بە ئافرەت بدەن و باشبن لەگەڵیان، چونکە دەزانێ ئافرەت ناسکترە لە پیاو پێویستی بە گرنگی و چاودێری هەیە. بەڕاستی ئافرەتان کە دەیانەوێت بە تەواوی بە مافەکانیان شادبن تەنهاو تەنها بە پابەندبوونیان بە بەرنامە پاکەکەی ئیسلام ئەو ئاواتەیان دێتەدی، ئەگینا بەرنامە دەستکردەکانی دەستی مرۆڤ جگە لەماڵوێران کردنی ئافرەت و جێبەجێکردنی مەرامی گڵاوی خۆیان هیچیان لە هەگبەدا نییە بۆ ئافرەتان.

***



## ڕۆژنامەی تایمزی بەریتانی دۆزینەوەیەكی نوێی بڵاوكردەوە دەربارەی مێروولە:

ڕۆژنامەی تایمزی بەریتانی لە بەرواری ٢٠٠٩/٢/٦ دا بابەتێكی بڵاوكردەوە كە زانستێكی نوێیان دۆزیوەتەوەو، پەیوەندی بە تایبەتمەندی ئاڵوگۆڕكردنی قسەكردن لە جیهانی مێروولە هەیە، دۆزینەوەكە ڕوونی كردۆتەوە كە زمانی مێروولە زۆر پێشكەوتووە، بە ڕادەیەك زیاتر لەوەی كە ئەوان پێشتر پێشبینیان كردبوو بەرەو پێشچوونی تەكنەلۆژیاو ئامێرەكانی لێكۆڵینەوەش زیاتر یارمەتیدەربوون بۆ ئەوەی زانایان ئاسانتر لەو بوارە بكۆڵنەوە.

بۆ دۆزینەوەی شێوازی گفتوگۆكردنی مێروولە لەگەڵ یەكتر ئەویش لە ڕێگای دانانی مایكرۆفۆن و سەماعەی بچوك و ورد لە هێلانەی مێروولەكان، پاش ئەو لێكۆڵینەوەیە بۆیان دەركەوت كە (مێروولەی شاژن) خاوەنی فەرمان دەركردنە بەسەر مێروولەكانی تردا، بەهۆی وەرگرتنی دەنگی (شاژنەكە) لە ڕێگەی سەماعەكانەوە بۆیان دەركەوت كاتێك كە مێروولەی شاژن فەرمان دەردەكات، تێكڕای مێروولەكان كاردانەوەیان بۆ فەرمانە كە هەیە و هەموویان كۆدەبنەوە بە شێوەیەكی ڕێكوپێك و ڕیزدەبن و، ددانەكانیان جیڕدەكەنەوەو خۆیان ئامادەدەكەن بۆ هەر ڕووداوێكی نەخوازراو، ئەو هەواڵە بە دۆزینەوەیەكی زانستی لەقەڵەم دەدرێت.

بەڵام پێش چەندین سەدە پێش لێكۆڵینەوەی ڕۆژنامەی تایمز قورئانی پیرۆز وەك موعجیزەیەكی زانستی باسی ئەوەی فەرمووە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ﴾ (النمل: ١٨) واتە: هەتا گەیشتنە دۆڵی مێروولە، مێروولە مێچكەیەك هاواری كردو وتی: ئەهای مێروولەینە بچنە ماڵ و كون و كەلەبەرەكانتانەوە نەوەكو سولەیمان و سەربازانی پێشێلتان بكەن لە كاتێكدا هەستتان پێنەكەن.



## ئاماژەکردنی قورئان بۆ زمانی باڵندەکان:

لە هەواڵێکی نوێدا لە بەرواری ٢٠١٥/٦/٢٩ لێکۆڵینەوە زانستییەکان گەیشتنە ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەر کە زانایان ئەنجامیاندا، ئەویش لەسەر توانای پەیوەندی و زمانێکی تایبەت بوو لەنێوان ئەو جۆرە باڵندانە، بەپێی لێکۆڵینەوەیەك کە زانکۆی ئەکستری بەریتانی و زیورخی سویسری پشتڕاستی کردۆتەوە ئەو دەنگەی باڵندەی (الكستناء الملكي) دەریدەکات کە لە سویسرا دەژی، وەکو ژاوەژاوێکی بێمانا دەردەکەوت، بەڵام بەو شێوەیە نییە بەڵکو کۆمەڵە دەنگێکی ڕێکخراوی نەپچڕاوە کە باڵندەکان لە ڕێگەی ڕێکخستنیانەوە چەندەها پەیام دەگەیەنن بە باڵندەکانی چواردەوری هەمان جۆری خۆیان.

ماڵپەڕی (ساینس دەیلی) کە هەواڵەکەی بڵاوکردۆتەوە لە لێکۆڵەر (سابرین ئنگستر) لە زانکۆی (زیوریخ)ەوە دەیگوازێتەوە، کە هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ڕابردوودا ئەنجام دراوە لەسەر جۆرە جیاوازەکانی باڵندەکان، نەیسەلماندووە کە ئەو دەنگە جیاوازانەی کە باڵندەکان دەریدەکەن هیچ مەبەست و مانایەکی هەبووبێت، بە پێچەوانەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەم دواییانەدا ئەنجام درا لەسەر ئەو باڵندە سەرسوڕهێنەرە، سەلماندنیان کە دەنگە شێوە جیاوازە ڕێکخراوەکانی ئەو باڵندانە مانایەکی ڕوونی هەیەو چەندەها پەیام دەگەیەنێت بە بێچووەکانی و چواردەورەکەی.

(سابرین ئنگستر) دڵنیا دەکاتەوە کە ئەو باڵندەیە گەنجینەیەکی بەردەست و پێشکەوتووی هەیە لە دەنگەکانداو توانای شیکارکردنی دەنگەکانی هەیە بۆ پارچە دەنگی دیاریکراو، کە هەریەکە ئامانجێکی هەیە لە کاتی جریواندنیداو توانای ئەوەی هەیە هەموو دەنگێك بە پیتێکی (ئەلف و بێی زمان) بچوێنێت بە شێوەیەك بە ڕێکخستنی جیاوازی دەنگەکان ماناکەی دەگۆڕێت.

دکتۆر (ئاندی ڕاسل) لە زانکۆی (ئەکستر) کە هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوەی دەنگەکان، زیاتر لە دە ساڵ و بەشدارە لە دەرخستنی تایبەتمەندییە

سەرسوڕهێنەرەکانی دەنگی ئەو باڵندەیە، باسی چۆنیەتی ڕێکخستنی زمانەکانی ئەو باڵندەیە دەکات و دەڵێت: لە کاتی شیکارکردنی دەنگەکاندا دۆزیویانەتەوە کە دوو دەنگی دەستنیشانکراو دەردەکات (س و ع). بۆ نموونە بە شێوەیەکی ڕێکخراو دەری دەبڕێت لە کاتی هەڵسوکەوتە جیاوازەکانیدا، دکتۆر (ئاندی ڕاسل) پشتڕاستی دەکاتەوە کە زانایان بە ڕوونی تێبینی ئەوەیان کردووە کە ئەم باڵندەیە لە کاتی فڕینیدا ئەم دوو دەنگە بەدوای یەکدا دەردەکات (س و ع)، لە کاتی خواردن پێدانی بێچووەکانی دەنگی (ع–س–ع) بەدوای یەکدا دەردەکات.

لە کاتی لێکۆڵینەوەکەدا هەستان بە تۆمارکردنی ئەم دوو دەنگە بینییان لە کاتی دەربڕینی دەنگی (س–ع) ئەو باڵندەیەی گوێی لەو دەنگەیە سەیری ئاسمان دەکات، وەکو ئاماژەیەك بۆ بوونی باڵندەی تر لە سەروویەوە یان چاوەڕوانی گەشتنی بکات و کاتێك دەنگی (ع–س–ع) دەردەکات، ئەو باڵندەیەی گوێی لێیە چاوەڕوانی گەشتنی خۆراك دەکات، زانایانی سەرپەرشتیاری لێکۆڵینەوەکە دەڵێن ئەمە یەکەمجارە لە مێژووی لێکۆڵینەوەی زانستی کە بیسەلمێنێت ئەم دیاردەیە (دیاردەی ڕێکخستنی پارچە دەنگەکان بە شێوەیەك کە ماناو پەیامی جیاواز ببەخشێت)، بوونی هەیە لەلای دروستکراوێکی تر جگە لە مرۆڤەکان، ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنەرە.

خوێنەری بەڕێز ئینجا با بزانین قورئانی پیرۆز وەك موعجیزیەك چۆن باسی ئەم دیاردەیەشی کردووە. چیرۆکی ( پێغەمبەر سولەیمان) (علیه السلام) لەگەڵ باڵندەی پەپو (هدهد) چۆن وتووێژی لەگەڵ کردووە و لە زمانەکەی تێگەشتووە ئاماژە بۆ کردنی قورئان بۆ زمانی باڵندە زۆر پێش ئاماژەکردنی زانایان کەوتووە بە چەندین سەدە، وەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾ (النمل: ١٦)، ئەم ئایەتە پیرۆزە کە لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا (سولەیمانە) (علیه السلام) لە ئایەتی ﴿مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ﴾ بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە باڵندە توانای تایبەت بە قسەو زمانی تایبەتی خۆیان هەیە

گفتوگۆی پێدەکەن، دەشتوانرێت لێی تێبگەیت بە ڕێگای فێرکردن (علمنا منطق الطیر)، ئەوەش مانای وایە زانایان دەتوانن فێری زمانی باڵندە ببن ئەگەر لێکۆڵینەوەو هەوڵی لەگەڵ بدەن، لێرەدا ڕێککەوتنێکی تەواو هەیە لەنێوان ڕاستییە زانستییەکەو ئاماژە قورئانییەکە.

##  قورئان و زانستی نوێ هاوڕان لە بارەی هەست و سۆزی ئاژەڵان:

زانایان دانیان بەو ڕاستییەدا نا کە ئاژەڵەکان خاوەنی هەست و سۆز و بیرو هۆشن توانای وەبیرهاتنەوەی یادگاری و ڕووداوەکانی ڕابردوویان هەیە، هەروەها سۆزو بەزەیی و خۆشەویستییان خەمبار دەبن و دووچاری خەمۆکی دەبن، خاوەنی بەهاو سیفاتی دادپەروەرین و هەست بە ستەم دەکەن ئەوان کۆمەڵگایەکی پەیوەست بە خۆیانن، دوای زیاترە لە (٢٥٠٠) توێژینەوەی زانستی دواجار زانایان نەیانتوانی خۆیان لەو ڕاستییە لابدەن دەوازەیەکیان شك نەبرد بۆ هەڵهاتن، ناچار دانیاننا بەو ڕاستیەدا کە ئاژەڵەکان خاوەن هەست و سۆز و بیرو هۆشن ئاژەڵەکان ئازاریان پێدەگات و هەست بە شتەکانی دەوروبەریان دەکەن و بیرەوەریان هەیە و خاوەنی سیفەتی ڕقلێبوونن و سیفەتی خۆشەویستین، ژیانیان هاوشێوەی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە ئەوە ئەو ڕاستییەیە کە پرۆفیسۆر (Marc Bekoff) لە زانکۆی (colorado) لە ڕێگەی کۆمەڵێك کتێب و ژمارەیەك وتارەوە کە پێشکەشی کرد دوای (٣٠) ساڵ لە ئەزمون لەگەڵ ئاژەڵەکان جەختی کردەوە کە زۆرینەی بوونەوەرەکان کە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، خاوەنی هەست و سۆزن و خۆشەویستی و ڕقلێبوونەوەن.

زۆرێك لە ئاژەڵەکان هاوڕێکانی خۆیان دەناسن و دەتوانن لەوانی دیکە جیایان بکەنەوە، لەبەرئەوە زانایان بە باشی دەزانن کە ئەم ئاژەڵانە بە بوونەوەری نامرۆیی ناوببرێن، چونکە ناونانی ئەو بوونەوەرانە بە ئاژەڵ لە ڕووی زانستییەوە ناوێکی وردو پڕ مانا نییە، قورئانی پیرۆز بە هیچ شێوەیەك زاراوەی ئاژەڵی بۆ ئەو بوونەوەرانە

بەکارنەهێناوە بەڵکو بە ئوممەت ناوی بردوون، هەر ئەوەشە کە ئەمڕۆ زانایان دوای توێژینەوەگەلێکی زانستی کە ماندووبوون و ماوەیەکی زۆری ویستووە دانیان پیادا هێناوە، ئەو ڕاستییە زانستییەی کە زانایانی سەدەی بیست و یەك پێی گەیشتوون ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لە سەدەی حەوت و پێش چواردە سەدە لەپێش ئێستا فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ﴾ (الأنعام: ٣٨) واتە: هیچ گەڕۆکێکی گیانلەبەر نییە لە زەویدا، هیچ باڵندەیەك نییە کە دەفڕێ بە هەردوو باڵەکەی مەگەر ئومەتانێکن وەك ئێوە هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە، لەم کتێبەدا (لوح المحفوظ) یان قورئان دا پاشان ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.

##  ئەستێرەکان هۆکارن بۆ ڕێنیشاندانی کەشتییەکانی ئاسمان:

ئەستێرە پرتکەرە تیشکدەرەکان ئەستێرەی مردوون گۆڕاون و بوون بە چەکوشی گەردوونی، ئەو ئەستێرانە دادەنرێن بە تازەترین هۆکاری ئاڕاستەو ڕێدەرکردن لە بۆشایی ئاسماندا، چونکە بە وردییەکی سەرسوڕهێن دەسوڕێنەوەو تیشکی سینی ڕێکوپێك پەخش دەکەن، کە هەڵە ناکەن و بەوەش لە کاژێرە گەردییەکانیش وردترو لەپێشترن، توێژەران دەڵێن کاتەکانی دەرچوونی تیشك زۆر وردن بە شێوەیەك دەتوانرێت بەکاربهێنرێن بۆ گەشتکردن بە ئاسماندا، چونکە کەشتییەکانی ئاسمان دەتوانن زۆر بە وردی بەکارهێنانی سیستمی دیاریکردنی شوێنگەی ئەستێرەکان (GPS) شوێنەکانیان دیاریبکەن لە شێوەیەك کە ڕێژەی هەڵەکردن لەو دیاریکردنەدا لە پێنج کیلۆمەتر زیاتر نابێت لە هەر شوێنێکی مەجەرەکەدا، ئەو ئەستێرانە هۆکارێکن بۆ ڕێنیشاندان و کات و ئاڕاستەو شوێن دیاریکردن.

سوپاس بۆ خوای گەورە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو ئاڕاستەیەش کردووە وەك موعجیزەیەکی زانست و ناوازە دەفەرمویّت: ﴿وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ﴾ (النحل: ١٦) واتە: هەروەها نیشانەی زۆری دابینکردووە بەهۆی ئەستێرەکانیشەوە خەڵکی رێی خۆیان دەربکەن، بە ڕاستی جێگای سەرسوڕمانە ئاخۆ مولحیدەکان پاش دەرکەوتنی ئەو هەموو موعجیزە زانستییانەی قورئانی پیرۆز تاکەی لە بیابانی سەرگەردانی دا دەسوڕێنەوە؟




## موعجیزەی بەرزەخی نێوان دوو دەریا بووە هۆکاری موسڵمانبوونی زانایەکی ڕووسی:

موعجیزاتی قورئان زیاتر بڕواداران بەرەو دڵنیایی دەبات بۆیە باسکردن و خستنەڕووی ئەو موعجیزاتانەش پێویستییەکی ئەم سەردەمەن و مایەی هیدایەتی خەڵکانێکی زۆرن لە هەموو چین و توێژێك، بۆ نموونە: دکتۆر عەبدولمەجید زەندانی دەڵێت: لە کۆنگرەی زانستی ئیعجازی قورئاندا لە هۆڵی (غورباتشۆف) لە مۆسکۆی پایتەختی ڕووسیا ژمارەیەکی زۆر لە زانایان لە هەموو بوارێکدا ئامادەبوون، زۆر باسی چڕوپڕ لە کۆنگرەکەدا خرانە بەرباس و لێکۆڵینەوە، دکتۆر دەڵێت: باسەکەی منیش لە سەر ئایەتی ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ۝١٩ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ﴾ بوو کە موعجیزەیەکی ئاشکرایە قورئان باس لە بەیەکگەیشتنی دوو دەریا دەکات کە لە نێوانیاندا بەرزەخێك هەیە، واتە: ناوچەیەك هەیە کە سیفاتەکانی ئاوەکەی و گیانلەبەرو ڕووەکانی ناوی جیاوازە لە سیفاتەکانی هەردوو دەریا، کە دیارە ئەم ڕاستییە کەس لە سەردەمەکانی پێشوودا نەیزانیوە، تەنها لەم سەدەی دوایدا زانایان پاش هەوڵ و تەقەلاو لێکۆڵینەوەی دەیەها ساڵ توانیان بگەنە ئەو ڕاستییەو بیدۆزنەوە، لە هۆڵەکەدا ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسی وتی: چوار ڕۆژە بەڵگەی زۆر ڕوون و ئاشکراو باسی چڕوپڕ پێشکەش دەکرێت ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە شایەتی هەق بدەین و بڵێین (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) وە بەوەش موسڵمان بوو.




## سوجدە مایەی ئارامی دەروونە:

مامۆستا (عبدالحلیم خفاجه) دەڵێت: پیاوێکی ئەڵمانی موسڵمانێك دەبینێت لە نوێژدا سوجدە دەبات زۆر سەری دەسوڕمێ لەم مەسەلەیە چاوەڕێ دەکات تا موسڵمانەکە لە نوێژەکەی دەبێتەوەو لێی دەپرسێ ئەوەی دەتکرد چی بوو؟ ئەویش وەڵامی دەداتەوەو بۆی باس دەکات کە ئەوەی کردم نوێژ بوو، ئەوەش کە سەرم لەسەر زەوی دانا ئەوە سوجدەم بۆ خوای گەورەی باڵادەست برد. کابرا زۆر دڵی گەشایەوە وتی: من بۆیە ئەوەندەم لا مەبەستە چونکە چەند ساڵە کە تووشی بارێکی دەروونی ناخۆش دەبم و دڵم تەنگ دەبێ ناوچەوانم دەخەمە سەر زەوی و لەو حاڵەتە ڕزگارم دەبێ و دڵ و دەروونم دەگەشێتەوە، ئینجا لەگەڵ ئەو موسڵمانەدا چوون بۆ مەرکەزی ئیسلامی لە شاری (میونخ) و پاش ئەوەی بە تێرو تەسەلی باسی ئیسلامیان بۆ کرد موسڵمان بوو.




## دۆزینەوەکەی زانایانی زانکۆی کۆلۆرادۆ دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئاندا:

لە بەرواری ٢٠١٥/١٢/١٠ دۆزیانەوە کە ژمارەیەکی بێشومار بەکتریا لەو گڵی دەوری مردوو دێنە دەرەوەو، هەر ڕۆژەو جۆری بەکتریاکان بەپێی شیبوونەوەی لاشەکە دەگۆڕدرێن و ڕۆژانە لاشەی مردووەکە کەمدەکات، جا زانایان بەو کەمکردنەوەو بە جۆری بەکتریاکان و دیراسەی گڵی دەوری مردووەکە ئەتوانن بەهۆی زانینی بڕی نایترۆجین و ترشی گڵەکەوە کاتی مردنەکە دیاری بکەن، ئەتوانن بزانن ئەو کەسە پێش ئەوەی بمرێت چی خواردووە، ئەو گڵەی دەوری لاشەی مردووەکە بەکرداری ڕێکوپێك و کارلێکی کیمیایی زۆر ورد چرکە بە چرکە لە ماددەکانی لاشەکە کەمدەکاتەوە بەبێ وەستان.

جا ئەو کردارو کارلێکە تەواوترین تەعبیر بۆی کەمکردنەوەیە کە ئەوەشە قورئان بەکاریهێناوەو ئێستاش زانست سەلماندوویەتی و ئەگەر دیقەت بگرن قورئان نافەرموێت زەوی لاشەکە دەخوات، بەڵکو دەفەرموێت لێی کەم دەکاتەوە کە ئەوە لەسەدا سەد تەواوە. قورئان دەفەرموێت: ﴿بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ۝ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ۖ ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ۝ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ﴾ (ق:٢-٤) واتە: بێباوەڕان سەریان سوڕماوە لەوەی کە پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ هاتووە لە خۆیان جا بێباوەڕان دەیانوت: ئەمە شتێکی سەیرە ئایا کاتێ مردین و بووین بە خۆڵ چۆن زیندوو دەبینەوە ئەوە گەڕانەوەیەکی دوورەو نابێ بێگومان ئێمە دەزانین زەوی چەندێ لە لاشەیان دەخوات هیچمان لێ ون نابێ پەراوێکیشمان لایە کە پارێزەری هەموو شتێکە.



## ٢٧٣ ئادەم و حەوا بە بەڵگەی زانستی نوێ:

هەموو ئایینە ئاسمانییەکان کاتێك باسی بنەڕەتی مرۆڤایەتیان دەکرد دەیانبردەوە سەر دوو کەس، کە باوك و دایکی مرۆڤایەتین ئەوانیش (ئادەم و حەوا)ن، چەند ساڵێك لەمەوپێش زانستی بۆماوەزانی هەڵسا بە لێکۆڵینەوەیەکی یەکجار مەزن و دوورو درێژو ئاڵۆز لەسەر ڕەچەڵەکی مرۆڤی زیرەك بۆ مرۆڤە نێرەکان لە ڕێگای پشکنینی (مایکرۆی) ئەنجامدرا لەسەر کرۆمۆسۆمی (Y)، لە چەند شوێنێکی جیاواز بۆ ڕەگەزی نێر لە وڵاتە جیاجیاکاندا، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی هەموو مرۆڤە نێرەکانی سەر زەوی ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ یەك باوك، واتە: درەختی (Y) کرۆمۆسۆمی هەموو نێرەکان ڕەگەکەی یەك کەسە ئەویش ( Y- chromosomal Addmcy- MRCA) واتە: (Y) کرۆمۆسۆم ئادەم.

هەروەها لە بەرامبەریشدا بۆ دۆزینەوەی ڕەچەڵەك و بنەڕەتی مرۆڤە (مێینەکان) پشکنین و لێکۆڵینەوە ئەنجامدرا، لە هێڵەکانی (مایتۆکۆندریا)ی خانەی ئافرەتان کە ئەوەش لە شوێنی جیاجیا لە وڵاتەکان ئەنجامدرا، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی ڕەچەڵەکی

هەموو مرۆڤە مێیەکانی سەرزەوی دەگەڕێتەوە سەر یەك کەس، واتە: درەختی (مایتۆکۆندریا)ی حەوای هەموو مێیەکان ڕەگەکەی یەك کەسی ئافرەتە ئەویش: (Mitochondrial Eve) واتە: مایتۆکۆندریای ئیڤ یان مایتۆکۆندریای حەوا، بێگومان هیچ کەسێك هەتا هیچ زانایەکیش ناتوانێ ئەم دۆزینەوە گرنگە ڕەت بکاتەوە، چونکە ئەوە بیردۆزێك نییە یان بیرۆکەیەك بێت وەکو (پەرەسەندن)، بەڵکو ئەوە تاقیکراوەتەوە لە تاقیگەی زانستی و بە بەڵگەی زانستی سەلمێنراوە.

هەتا (ناشناڵ جیۆگرافیك) کە گرنگترین و باوەڕپێکراوترین سەرچاوەی زانستییە، زۆر بە جوانی باسی ئەوە دەکات و دەڵێت ڕەچەڵەکی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی دەگەڕێتەوە سەر یەك پیاو و یەك ئافرەت، واتە: یەك دایەن و یەك باوان زانست پێشکەوتوو و لێکۆڵینەوەی کردو گومانی بێدینەکانی ڕەواندەوە دەربارەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ و بۆی سەلماندین کە ئەوەی هەزاران ساڵە ئایینە ئاسمانییەکان باسی دەکەن دەربارەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ کە (ئادەم و حەوان)، ڕاستەو ئەمڕۆ هیچ گومانێك نەماوە کە ئێمە هەموومان نەوەی یەك دایك و یەك باوکین. لە نوێترین توێژینەوەکاندا کە لە (ویکیپیدیا) ئاماژەی پێداوە دەڵێن مێژووی (ئادەم و حەوا) زۆر لە یەك نزیکن و لە یەك کات ژیاون.

دوو توێژینەوە لە ئەیلولی ساڵی (٢٠١٣) ئەنجامدرا بەپێی تەمەنە بچووکەکان بە ساڵانێکی زۆر لە ڕاستیدا ئاماژە بەوە دەکات، کە هەریەك لە ئادەم (Y) کرۆمۆسۆم و ئیڤ مایتۆکۆندریا لە یەك سەردەمدا ژیاون، لە لێکۆڵینەوەکەی زانکۆی (ستانفۆرد) کۆلیژی جینۆمی پزیشکی تەمەنی ئادەم و حەوا دیاریکراوە، وە بەپێی نوێترین توێژینەوە دەڵێت: حەوا لە دوای ئادەم دروستکراوە.

پاك و بێگەردی بۆ ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێش زیاتر لە چواردە سەدە پێش دۆزینەوە تازەکە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە حەوا لە دوای ئادەم دروست بووە، بەڕاستی دەبوو مولحیدەکان ئەگەر یەك تۆزقاڵ ویژدانیان هەبووایە دوای دەرکەوتنی ئەم موعجیزە زانستییە درەوشاوەی قورئان بە هەموو قەناعەتێکەوە شوێن ئیسلام بکەوتنایە خۆ موعجیزە لەوە گەورەتر دەبێ چی بێت؟



## لێکۆڵینەوەیەکی زانستی ڕاستییەکی قورئان دەردەخات:

لێکۆڵەرەوان دەریانخست کاتێك باران دەبارێت ڕووەك دەردێت، ڕووەکیش ماددەیەکی ڕەنگ سەوز (سەوزە پلاستید) دەردەکات کە لەو ماددە سەوزەوە بەروبووم و دانەوێڵەی لێدروست دەبێت، ئەم ڕاستییە زانستییە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوەو دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا﴾ (الانعام: ٩٩) واتە: ئەو خوایە زاتێکە کە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت و بەهۆیەوە چرۆو چەکەرەی هەموو شتێکی پێدەردەهێنین و شینی دەکەین، ئینجا ماددەیەکی سەوزی لێپەیدا دەکەین و لەو ماددە سەوزەوە دانەوێڵەی سەفتەکراوی لێدروست دەکەین.



## کۆنگرەی ئیسلامی لە مۆسکۆ گەورەترین موعجیزەی ئاشکرا کرد:

کۆنگرەی ئیسلامی لە ١٩٩٣/٦/١٣ لە مۆسکۆ گیرا، بانگهێشتی ئەکادیمیای زانستی ڕوسیشیان کرد ئامادەبوون لەوێ، (سبحان الله) پاش ئەوەی کە ئەم زانایانە لە هەر بوارێکدا باسی گەورەیی قورئانیان کرد، یەکێك لەو ڕووسیانە بەناوی (فلادمیر) موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، ئەوەی وەرگێڕانەکەی دەکرد لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی ڕووسی کابرایەکی ڕووسی بوو لە ڕادیۆی مۆسکۆ لە بەشی عەرەبی ئیشی دەکرد، ئەویش موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند. هەر لەو کۆنگرەیەدا باستی شتێکی تازەیان کرد کە دۆزراوەتەوە لە زانستی گەردوونناسیدا، ئەم زەویەی خۆمان دەسوڕێتەوە بە دەوری چەقی ئەم مەجەڕەدا دێتەوە شوێنی خۆی (٢٥٠) ملیۆن ساڵی پێئەچێ، خوای گەورە بە شێوازێکی ئاسان کە هەموو کەسێك تێیدەگات، بەڵام پڕ لە مانا، دەفەرموێت: ﴿كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾ واتە: ئەم خۆرە، ئەم مانگە ئەم هەسارانە هەمووی گرێژنەی تەوەرەی خۆی هەیە.



## ٢٧٦ دەرکەوتنی ڕاستییەکی زۆر گەورە دەربارەی ڕەگی چیاکان:

کۆمەڵێك موسڵمان چوو بوون بۆ لای زانایەکی یابانی ناوی (ستیودا) بوو، لێیان پرسی: چیاکان هەر ئەوەن کە ئەبینرێن یاخود بەشێکی لەژێر ئەرزدایە؟ وتی: بۆچی ئەم پرسیارە ئەکەن؟ وتیان: ئێمە زانای ئیسلامین و لە ئاینەکەماندا ئەم شتانە هەیە. وتی: ئێوە پیاوی ئاینن نابێ بچن بەلای زانستدا. ئیتر دەستیکرد بەم قسانە، یەکێك لەو موسڵمانەی کە لەناو ئەو کۆمەڵەدا بوو وتی: باشە ئەتڵەسی و وارشۆ بەرامبەر یەك ئەم هەموو چەکەیان کۆکردۆتەوە و لەژێر زەویدا شاردوویانەتەوەو لە بۆشاییدا دایانناوە، هۆکارەکەی چییە؟ ئیتر کابرا قسەی نەما.

وتیان ئێمە تەنها ئەو پرسیارەت لێدەکەین وەڵامان بدەرەوە ئایا چیاکان ڕەگیان هەیە؟ وتی: بەڵێ، ئیتر وێنەی پیشان دا، فیلمی پیشان دان، ئایا چیاکانی سەر وشکانی بێ یان چیاکانی ناو دەریا هەمووی ڕەگی هەیە، تازە دۆزراوەتەوە لە ڕێگەی تیشکەوە وێنەی شاخەکە ئەگیرێ تەماشا ئەکەی چەندی بە دەرەوەیە ئەوەندەشی لەناو زەویەکەدایە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا﴾ (النبأ:٧) ڕەگمان بۆ داناوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ﴾ (النحل: ١٥) واتە: خوا لە زەویدا چەند شاخێکی دامەزراوی داناوە بۆ ئەوەی تاسە و لەنگەرتان پێنەکات.

کابرا سەری سوڕما کە قورئان باسی ئەمانە دەکات. لێیان پرسی: ئایا ڕۆڵی هەیە بۆ جێگیرکردنی توێژی سەرەوەی زەوی؟ وتی: نازانین! بەڵام لەم دواییانەدا زانایەکی گەورە لە ئەمریکا سەرۆکی ئەکادیمیای زانستی ئەمریکی ناوی (فرانك پرێسە)، ئەم زانایە زانایەکی زۆر گەورەی جیۆلۆجی و ڕاوێژکاری (کارتەر) بوو بۆ کاروباری زانستی، کتێبێکی نووسیوە بەناوی زەوی (earth) لە لاپەڕە (٤٨٨)دا دەڵێ: هەموو شاخێ لە ناوەوە ڕەگێکی هەیە شاخێکی ڕاگرتووە بۆ قووڵاییەکی زۆر چووەتە ژێر زەوییەوە وێنەکەی دەرخستووە، لە لاپەڕە (٤٣٥)دا ئەڵێ: ئەرکی چیاکان ئەوەیە کە ڕووی



زەوی ڕابگرن و نەیەڵن بترازێ، قورئانیش ڕێك وائەفەرموێت. لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیە بکاتە مایەی بەرچاو ڕۆشنی و شادومانییەکی زۆر گەورە بۆ بڕواداران، بەهانە بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو بێدینانەی کە ئەم قورئانە ڕەتدەکەنەوە، خوای گەورە چەند جوانی فەرمووە: ﴿وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ﴾ (غافر: ٨١) واتە: خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خودا دانپیانانێن.

## ٢٧٧ ئێسك کارگەی بەرهەمهێنانی خوێنە:

قورئانی پیرۆز سەدان ساڵ پێش زانست کەوتووە لە دانپێدانانی زیندوویەتی ئێسك و بایەخی گەورەی ئێسك لە ئەرکەکانی مرۆڤدا، لە سورەتی (مریەم)دا زەکەریا (سەلامی خوای لەسەر بێت) هاناو هاواری بۆ خوای گەورە برد کە منداڵێکی پێببەخشێت ئەگەرچی هاوسەرەکەشی منداڵی نەدەبوو و ئێسکەکانیش لاوازبوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّي وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ (مریم: ٤) واتە: پەروەردگارا بەڕاستی من ئێسکەکانم لاوازبوون و قژی سەرم هەر هەمووی سپێتی دایگرتووە، بەڵام من هەرگیز لە دوعاو پاڕانەوەم لە زاتی تۆ نائومێد نەبووم و دەستت نەناوە بە ڕوومەوە. لەم ئایەتە پیرۆزەدا قورئان باس لە پەیوەندی بەرهەمهێنانی منداڵ دەکات بە ئێسکەکانەوە، لەم دواییانەدا زانست سەلماندی کە ئێسکەکان کارو ئەرکی گرنگیان هەیە بە جۆرێك کە ژیانی مرۆڤی لەسەر وەستاوە. ئێسك هەموو ئەوەی تێدایە کە لەش پێویستی پێیەتی وەك: (فۆسفۆرو کالیسیۆم) کرداری دابەشکردنیان ڕێکدەخات بە شێوەیەك کە لێدانەکانی دڵ و جوڵەی ماسولکەکان دەپارێزێ.



هەروەها ئێسکەکان بە درێژایی ژیانی مرۆڤ و بەبێ پچڕان خرۆکە سور و سپییەکان بەرهەمدێنن، وەك زانست سەلماندوویەتی کە حاڵەتی ئێسکەکان ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر ئەندامی دەمار، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ دەچنە نێو توانای مرۆڤەوە بۆ بەرهەمهێنانی منداڵ، ئەوەش ئەو ڕاستییە کە قورئانی پیرۆز پێش زیاتر لە چواردە سەدە ئاماژەی پێکردووە.



## ٢٧٨ دۆزینەوەیەکی زانستی نوێ دەربارەی خولگەی خۆر:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ (یس:٣٨) واتە: خۆریش بەرەو بنکەی خۆی لە گەڕاندایەو دەڕوا ئەو بڕیاردراوی خوای زاڵی کاربەجێیەخۆر خولگەی تایبەت بە خۆی هەیەو لەسەر ئەو خولگەیە بە خێراییەکی گەورە لە جوڵەیەکی بەردەوام و بەپێی دووری و سوڕە تەواوەکانی کۆمەڵە ئەستێرەکان لە ماوەی دیاریکراو و جێگیردا دەبێت، کە خوای گەورە دایناوە لە سەدەی حەڤدەدا زانا (کیپلەر) گەیشتە ئەوەی کە خولگەی هەسارەکان گۆیی تەواو نین بەڵکو هێلکەیین، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەشدا زانا (کارینگتۆن) لەمیانەی بەدواداچوونی بۆ پەڵە ڕەشەکانی ڕووی خۆر ئەوەی سەلماند کە خۆر بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

هەروەها زانست بەرەوپێش چوو تا ئەوەی ئێستا جێگیر بووەو بۆتە ڕاستییەکی زانستی کە زەوی و هەموو تەنە ئاسمانییەکانی تر لە جوڵەیەکی بەردەوامدان لە خولگەی دیاریکراو بە خۆیان و لە کاتی دیاریکراو بە خۆیان دەبڕن.

دەریشکەوتووە کە خۆر دەکەوێتە سێیەکی دەرەوەی مەجەڕەی ڕێگای شیری خۆر خولگەی خۆی دەبڕێت و لەگەڵیا هەموو هەسارەکانی بە دەوری ناوەندی ئەو مەجەڕەدا دەخولێنەوە لە ماوەی (٢٥٠) ملیۆن ساڵ جارێك، بەڵام قورئانی پیرۆز لەپێش ١٠ سەدە لەوەو پێش دەریخستووە کە هەسارەکان لە جوڵەدان و هەر تەنێکی ئاسمانی خولگەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە لە سووڕی تایبەت بە خۆی دەبڕێت.



ئا بەو جۆرە مانای تەواوی (لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا) دەردەکەوێت ئەو تەنە ئاسمانییە لەسەر خولگەی خۆی یەك سورِ تەواو دەکات و دەگاتەوە ئەو شوێنەی لێوەی دەستیکردووە بە جوڵە. لە ئایەتەکانی قورئاندا باس لە مانگیش دەکات کە ئەویش خولگەی خۆی هەیەو بە تایبەتی و ئەوەش گشتگیر دەکات بۆ هەموو تەنە ئاسمانییەکان لەو ئایەتەدا کە باس لە جوڵەی بەردەوامی خۆر دەکات لەسەر خولگەیەکی دیاریکراو، ئەوانە هەموو نەزاندرابوون لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا پێش چواردە سەدە لەمەوپێش، بەڵام دۆزینەوە زانستییەکانی ئەم سەردەمە ئەو ڕاستییانەی بە ڕوونی دەرخست و جەختی لەسەر ڕاستیەتی ئەو دیاردە گەردوونیانە کردووە.

## ٢٧٩ ئاشکرابوونی حەوت نهێنی زۆر گەورە لە سوورەتی (المائدە):

بڕوانە بۆ ئەم ئایەتە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (المائدة: ٣)
لەسەر ئەم ئایەتە حەوت نموونە دەخەینە ڕوو:

تابلۆی یەکەم: دکتۆر (بسام نهاد جرار) دەڵێت: بەشێك لەم ئایەتە لە کاتێکی تردا دابەزیوە ئەو دەربڕینە قورئانیەی کە لە دوای وشەی (فسق)ەوە دێت و بە هەردوو وشەی (الیوم یئس) دەست پێدەکات و بە وشەی (دیناً) کۆتایی دێت لە کاتێکی جیاواز لە کاتی بەشەکەی تری ئایەتەکە دابەزیوە بە کورتی دەربڕینی قورئانی ﴿الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾ لە ڕۆژی عەرەفە دا کە نۆهەم ڕۆژی مانگی (ذوالحجة)یە لە ساڵی (١٠)ی کۆچی دا لە حەجیماڵئاوایی دا دابەزیوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی پەیوەندی ئەم

ئایەتەو دەستەواژەی (الیوم أکملت) بە ژمارە (١٩)ەوە بەم جۆرەیە: بەشێك لە ئایەتەکە ئەم دەستەواژەیە ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ ئەم دەستەواژەیە لە (٩) وشە پێکدێت کە زنجیرەکانیان بەڕیز لە سوورەتەکەدا یەك لە دوای یەك بەم جۆرەیە کە لێرەدا کۆیان دەکەینەوە (١٠٦+ ١٠٧+ ١٠٨+ ١٠٩+ ١١٠+ ١١١+ ١١٢+ ١١٣+١١٤) =٩٩٠ ئەم ژمارەیە کۆی ئەمانەیە: (٩+ جوممەلی ذو الحجة+ ١٠+ جوممەلی هجری)= ٩٩٠ جوممەلی ذو الحجة = ٧٥٣ جوممەلی هجری = ٢١٨ کەواتە بەم جۆرەی لێدێت: ٩+ ٧٥٣+ ١٠+ ٢١٨ =٩٩٠ ئەمەش ئەو ڕۆژەیە کە فەرمایشتی خودا ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ﴾ی تێدا دابەزیوە زنجیرەی وشەی ﴿وَٱخۡشَوۡنِ﴾= ١١٤ ئەمەش ژمارەی سوورەتەکانی قورئانە وتمان ژمارە (١٩) بە یەکێك لە بناغە گرنگەکانی ئیعجازی ژمارەیی دادەنرێت ژمارە (١٩) لە ئایەتی (٣٠)ی سورەتی (المدثر) دا هاتووە درێژەی ڕوونکردنەوەی حیکمەتی هاتنی ژمارە (١٩) دەکەوێتە ئایەتی (٣١)ەوە ئینجا ئایا پەیوەندی ژمارە (١٩) چییە بە ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ﴾ەوە؟ تەرتیبی وشەکانی ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِ﴾= ٩٩٠ لە دوایەوە ڕاستەوخۆ تەرتیب و زنجیرەی وشەی (الیوم) دێت کە لە دەستەواژەی (الیوم أکملت)دا هاتووە بەم جۆرەی لێدێت کە لەگەڵ ئەوەی پێشوودا زنجیرەکەی کۆبکەینەوە ٩٩٠+ ١١٥= ١١٠٥ ئەمەش بریتییە لە حیسابی جوممەلی (تسعە عشر) ئەگەر وشەی (أکملت)مان خستە پاڵ دەبینین کە ١١٠٥+زنجیرەی (أکملت) = ١١٠٥+١١٦ =١٢٢١ ئەمەش بریتیە لە حیسابی جوممەلی (علیها تسعە عشر).

تابلۆی دووەم: ئایەتی (٣) چەند نهێنییەکی تێدایە بەڵام لێرەدا باسەکەمان لەسەر پەیوەندی ئەم ئایەتە بە وشەکانی حەجەوە لە قورئاندا کورت دەکەینەوە لەسەر ڕووناکی ئەوەی کە بە ڕاستی ڕاگەیاندنی تەواو نائومێدبوونی بێباوەڕان هاوکاتە لەگەڵ ڕاگەیاندنی کامڵ بوونی ئاین کە ئیسلامە کە هەردووکیشیان لە حەجدا ڕاگەیەنران بەڵکو لە ڕۆژی (عەرەف)ەشدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێت: (الحج

عرفه) دووجار وشەی (اليوم) لە ئایەتەکەدا هاتووە مەبەست لە وشەی (اليوم)ی یەکەم ڕۆژی عەرەفەیە هەروەها مەبەست لە وشەی (اليوم)ی دووەمیش هەر ڕۆژی عەرەفەیە وشەی (عەرەفە) بە حیسابی جوممەل = ع+ر+ف+ة= ٧٠+٢٠٠+ ٨٠+٥=٣٥٥ کە یەکسانیشە بە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی قەمەری پڕ ئنجا ئەگەر لە ئایەتەکە ڕابمێنین دەبینین کە کۆی زنجیرەی وشەکانی دەستەواژەی قورئانی ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ﴾ لە ئایەتەکەدا دەکاتە (٣٥٥) ئەمەش زنجیرەی وشەکان دەگرێتەوە لە (اليوم)ی یەکەمەوە بۆ کۆتایی (اليوم)ی دووەم واتە لەو وشەیەی کە واتای (عرفه) دەگەیەنێت بۆ ئەو وشەیەی تریان کە ئەویش واتای (عرفه) دەگەیەنێت لێرەدا زنجیرەی وشەکانی دەستەواژە قورئانییەکە لە ئایەتەکەیاندا کە پەیوەندی بە عەرەفەوە هەیە دەخەینەڕوو:

﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ﴾

٣١ ٣٢ ٣٣ ٣٤ ٣٥ ٣٦ ٣٧ ٣٨ ٣٩ ٤٠

سەرجەمی زنجیرەی وشەکانی ئەم دەربڕینە قورئانیە = ٣١+٣٢+٣٣+٣٤+٣٥+٣٦+٣٧+٣٨+٣٩+٤٠=٣٥٥ کە یەکسانە بە حیسابی جوممەلی وشەی (عرفه) هەروەها یەکسانیشە بە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵێکی قەمەری پڕ ڕۆژی (عرفه) ئەو ڕۆژەیە کە ئەم دەربڕینە قورئانیەی تێدا دابەزی واتە: ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ﴾.

تابلۆی سێیەم: لەبەر ڕۆشنایی نموونەی دووەمدا مامۆستا نوعمان سەرگەتی لە کتێبی تابلۆ ناوازەکان دا دەڵێت: هەروەك لە دەستەواژە قورئانیەکەدا لە وشەی (اليوم)ی یەکەمەوە کە مەبەست لە (عرفه)یە بۆ وشەی (اليوم) دووەم کە مەبەست لە (عرفه)یە کۆی زنجیرەی ئەم وشانەی ئایەتەکە = ٣٥٥ بە هەمان شێوە لە ژماردنی ڕۆژەکانی ساڵە قەمەرییەکاندا هەر لە ڕۆژی (عرفه) بۆ ڕۆژی عەرەفەیەکی تری ساڵەکەی دوای ئەو کۆی ژمارەی ڕۆژەکان = ٣٥٥ ڕۆژ لە زۆربەی جاردا کە ساڵە

قەمەرییەکان بە دوای یەکدا دێن بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم نموونەیە دەڵێین: بۆ نموونە ئەمڕۆ ڕۆژی (عرفه) بێت لە ئەمڕۆوە ڕۆژەکان بژمێرین تا ڕۆژی (عرفه)ی ساڵی داهاتوو ئەوا لە دوای ڕۆژی عەرەفەی ئەمڕۆوە ڕۆژەکان تا عەرەفەیەکی تر تەواو دەبێت دەکاتە (٣٥٤) ڕۆژ لە زۆربەی ساڵە قەمەرییەکاندا کەواتە ڕۆژی عەرەفە یەکەم ئەمڕۆ لەگەڵ ژمارەی (٣٥٤)دا سەرجەمیان دەکاتە (٣٥٥) لە زۆربەی ساڵە قەمەرییەکاندا ڕۆژی یەکەم لە ژماردندا عەرەفە +٣٥٤ = ٣٥٤+١ =٣٥٥ ڕۆژ لە زۆربەی ساڵە قەمەرییەکاندا ئەم نموونەیە تەواوکەری نموونەی دووەمە و دەرخەری نهێنی ئەو وتەیەیە کە دەڵێت حیسابی جوممەلی وشەی (عەرەفە) = ٣٥٥.

تابلۆی چوارەم: ئایەتەکە لە ڕۆژی عەرەفەدا هاتۆتە خوارەوە بەشێکی ئایەتەکە باسی ڕۆژی عەرەفە دەکات ڕۆژی عەرەفە ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی مانگی ذولحیجە مانگی ذولحیجە لە هەندێك ساڵدا (٢٩) ڕۆژە لەو ساڵانەدا کە مانای ذولحیجە (٣٠) ڕۆژە ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵە قەمەرییەکان (٣٥٥) ڕۆژ دەبێت هێندەی جوممەلی وشەی عەرەفە لەم جۆرە ساڵانەدا لە دوای ڕۆژی عەرەفەی مانگی ذولحیجە تەنها (٢١) ڕۆژ دەمێنێتەوە بۆ تەواوبوونی مانگی ذولحیجە هەروەها تەنها (٢١) ڕۆژ دەمێنێتەوە بۆ تەواوبوونی ساڵە قەمەرییەکە واتە: ساڵە هیجرییەکە بە هەمان شێوە لە دوای وشەی (اليوم)ی دووەمەوە کە مەبەست پێی ڕۆژی عەرەفەیە بە (٢١) وشە ئایەتەکەی سوورەتی (المائدة) تەواو دەبێت و کۆتایی دێت هەروەها هەروەك لە دوای ڕۆژی عەرەفەوە ساڵە کۆچییەکە بە (٢١) ڕۆژ تەواو دەبێت کۆتایی دێت بە هەمان شێوە لە دوای وشەی (اليوم)ی دووەمی ئایەتەکەوەیە (٢١) وشە ئایەتەکە کۆتایی دێت (سبحان الله) لەو موعجیزە گەورەیە.

تابلۆی پێنجەم: ئایەتی (٣) ی سوورەتی (المائدة) دوا ئایەتە کە لە حەجی ماڵئاواییدا هاتبێتە خوارەوە قورئان بە (١١٤) سوورەت تەواو دەبێت هەر لە سەرەتای سوورەتی (المائدة)ەوە ئەگەر (١١٤) وشە بژمێرین کە ئەوەندەی ژمارەی گشت

سوورەتەکانی قورئانن ئەوا دەبینین ڕاستەوخۆ دەستەواژەیەکی نوێ دێتە پێشەوە کە لە ڕووی واتاوە تا ڕادەیەك جیاوازە لە دەستەواژەکانی پێش خۆی کە ئەویش بریتییە لە ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ واتە: ئەمڕۆ کە عەرەفەیە ئاین و بەرنامەکەتانم بۆ کۆتایی گەیاند و ناز و نیعمەتی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامە و دین و ئاینتان.

تابلۆی شەشەم: دووجار وشەی (الیوم) لە ئایەتی (٣)ی سورەتی (المائده)دا هاتووە کە مەبەست پێی ڕۆژی عەرەفەیە ئەگەر هەر لە سەرەتای ئایەتەکەوە کە وشەی (الیوم)ی تێدا هاتووە پیتەکان بژمێرین تا کۆتایی وشەی (الیوم)ی یەکەم دەبینین کە ژمارەیان (١٤٧) پیتە هەروەها ژمارەی پیتەکان لە سەرەتای ئایەتەکەوە تا کۆتایی وشەی (الیوم)ی دووەم دەکاتە ١٨٧ پیت ئەگەر هەردوو ئەنجامەکە کۆبکەینەوە ئەوا دەکاتە ١٤٧+١٨٧ =٣٣٤ کە ئەمەش زنجیرەی ڕۆژی عەرەفەیە لەناو ڕۆژەکانی ساڵی قەمەری دا چونکە ڕۆژی عەرەفە (٣٣٤)هەمین ڕۆژی ساڵی قەمەرییە (الله أكبر) لەو وردەکاری و زانیارییە پایەدارانە کە لە قورئانی پیرۆزدا هەن.

تابلۆی حەوتەم: لە ئایەتی (١) سورەتی (المائدة)دا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ واتە: بۆتان حەڵاڵ کراوە گۆشتی مەڕ و بزن و گا و مانگا. کەچی لێرەدا تەنها باسی ئەو چەشنەیان دەکات چونکە بە زۆری هەر ئەو چەشنەیان لەبەردەستدان و سەردەبڕدرێن بۆیە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ واتە: خواردنی گۆشتی ئەو گیاندارانە دروستە تەنها ئەوانەیان نەبێت کە گۆشتیان حەرام کراوە کە لەمەولا بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە مەبەست لە ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەو (١١) جۆر و بەشە خۆراکە ئاژەڵییەیە کە حەرام کراوە و باسەکەی لە ئایەتی (٣)ی سوورەتی (المائدة)دا هاتووە کە هاتنە خوارەوەکەی لەپاش ئایەتی (١، ٢)ەوەیە وشەی (إلا) ئامرازی (إستثناء) واتە: بێجگەیە (مستثنی) کە بریتیە لە وشەی

(ما) که (موصوله)یه واتاکەی بە ﴿يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ تەواو دەبێت (مستثنى) واتە: لێدەرکراو یان جیاکراوە ژمارەی پیتەکانی ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾=١١ پیت هێندە یازدە بەشە حەرامکراوەکەی ئایەتی (٣) بە دەربڕینێکی تر یازدە بەشە خواردنە حەرامکراوەکەی ئایەتی (٣) بریتییە لەمانە:

١. الميتة ٢. الدم ٣. لحم الخنزير ٤. ما أهل لغير الله ٥. المنخنقة ٦. الموقوذة ٧. المتردية ٨. النطيحة ٩. ما أكل السبع الا ما ذكيتم ١٠. ما ذبح على النصب ١١. أن تستقسموا بالأزلام

## ٢٨٠ زانستی تازە نهێنییەکانی بالآپۆشی ئاشکرا دەکات:

لێکۆڵینەوەیەکی نوێ جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو ئافرەتەی بالآپۆشەو بەردەوام پابەندە پێوەی لە باشترین حاڵەتی دەروونیدایە، ئەوەی پەیوەندی بە ڕوانینی ئەرێنی بۆ خودی خۆی هەیە بەراورد بەو ئافرەتەی کە بالآپۆش نییە. ئەو لێکۆڵینەوەیە زانکۆی (west minister) لەمیانەی خوێندنەوەیەکی زانستیدا ئاشکرای دەکات کە لە گۆڤارێکی بەریتانی لە بواری دەروونناسیدا بڵاوبۆتەوە ئەویش ڕاپرسییەکە لە سەدان کچی بالآپۆش و نابالآپۆش کراوە، لێکۆڵەران لەو لێکۆڵینەوەیە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی ئافرەتی بالآپۆش هەست بە متمانەبەخۆبوون و دڵنیایی و ڕێزگرتنێکی خودیی زۆر ئەکات، هەروەها بالآپۆشی دەبێتە هۆکاری دوورخستنەوەی ئافرەتان لە شێرپەنجەی پێست. زۆر لە لێکۆڵینەوە دەربارەی بڵاوبوونەوەی شێرپەنجەی پێست کراوە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی ئافرەت بڕێکی زۆری تیشکی سەروبنەوشەیی بەردەکەوێت، کە لە خۆرەوە دێت لەبەرئەوە دکتۆرەکان ئامۆژگاری ئەوە دەکەن ئافرەتان ئەندامەکانی لەشیان داپۆشن بۆ پاراستنیان لەو نەخۆشییە ترسناکە، لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا کە لە ساڵی (٢٠١٥) ئەنجامدرا دەرکەوتووە

بەرکەوتنی تیشکی خۆر زیانبەخشترە بۆ ئافرەتی پێگەیشتوو زیاتر لە منداڵ، واتە: پێویستە ئافرەت دوای پێگەیشتنی واتە: (باڵغبوونی) زیاتر ئاگادار بێت و پەلە بکات لە پابەندبوون بە باڵاپۆشی و خۆدەرنەخستنی لەش و لاری بێجگە لە دەستەکان و دەموچاوی هەر بەو شێوەیەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر دا ﷺ هاتووە ئەوەش بەڵگەی ڕوونی پێغەمبەرایەتییە لە سەدەی بیست و یەکدا، ئەوەی لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە بەم شێوەیە:

Exposure to the sun during a dulthood might cause ) more no melanoma skin cancer than exposure during (childhood a new study suggests

واتە: بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی نوێ بێت بەرکەوتنی تیشکی خۆر لەلایەن ئافرەتەوە لە کاتی باڵغبووندا دەبێتە هۆی دروستبوونی پەلەی شێرپەنجەیی زیاتر لە پێستدا وەك لە بەرکەوتنی لە کاتی منداڵیدا پێش باڵغبوونی، ئەوەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە پێویستە ئافرەت خۆی بپارێزێت لە تیشکی خۆر بە تایبەتی ئافرەتی سەرو ١٥ ساڵ.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ داوا لە ئافرەتان دەکەن کە خۆیان داپۆشن و حیجاب بکەن، زانستی تازەی سەردەمیش دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ ئایەت و فەرموودەکان. کەواتە: پێویستە ئەو ئافرەتانە کە تا ئێستا باڵاپۆش نین زوو فریای خۆیان بکەون و تەوبە بکەن، چونکە حیجاب و خۆداپۆشین فەرمانی خوای گەورەیەو ئافرەت دووردەخاتەوە لەو هەموو نەخۆشی و مەترسیانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە خوای گەورە لە قورئانە پڕ لە زانست و ناوازەکەی دا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ (النور: ٣١) واتە: جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە وەك دەم و چاو و دەست با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن.

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ ئەو خوایەی کە هەتا ڕەوڕەوەی ڕۆژگار بەرەو پێشەوە بڕوات ڕاستی و دروستی موعجیزەی قورئانەکەی وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ هەموو خەڵکی جیهان دەدرەوشێتەوە.

***



## نوێژ مەترسی توشبوون بە نەخۆشی زەهایمەر کەمدەکاتەوە:

بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە لە ڕۆژنامەی ( هائارتس ) ئیسرائیلی بڵاوکراوەتەوە، دەرکەوتوە کە نوێژی موسوڵمانان مەترسی توشبوون بە نەخۆشی زەهایمە\

د"\ر کەمدەکاتەوە، ڕۆژنامەکە کە بەناوبانگترین ڕۆژنامەی ئیسرائیلییە بڵاوی کردووەتەوە کە لە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکی هاوبەشی ئەمریکی – ئیسرائیلی ئەوە دەرکەوتوە ئەو نوێژەی موسوڵمانان ئەنجامی دەدەن، مەترسی توشبون بە نەخۆشی زەهایمەر بە ڕێژەی ٥٠٪ کەم دەکاتەوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیەش لە لایەن لێکۆڵەرەوە ئیسرائیلیەکانی سەربە نەخۆشخانەکانی (شیفا) و (هلل یافا) و زانکۆی تەلئەبیب و زانکۆی کلیندا ئەنجامدراوە، بە پێی لێکۆڵینەوەکەش ئەو نوێژەی موسوڵمانان ئەنجامی دەدەن، کاریگەریی زۆری بەسەر فێربوون لە لە دامەزراوە پەروەردەییەکان هەیەو، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی مەترسی توشبوون بە نەخۆشی ( لاوازی– الذاکرة) کە بەزەهایمەر ناسراوە کەم بێتەوە، لای ئەوانەی نوێژ ئەنجام دەدەن.

لەم بارەوە پرۆفیسۆرێکی ئیسرائیلی بەناوی رەفکا ئینزلبرچ دەڵێ: کەسی نوێژکەر لەمیانەی نوێژکردنەوە ڕێژەیەکی زۆر لە چالاکی ڕۆشنبیری و فیکری بەرهەم دەهێنێت، ئەمەش وادەکات کە مەترسی توشبوون بە نەخۆشی زەهایمەر کەمبێتەوە، شایانی باسە ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ٨٩٢ کەس ئەنجامدراوە کە تەمەنیان لە سەروی ٦٥ساڵی بووەو خەڵکی ( وادی عارە) ی نێو ناوچەی ( هێڵی سەوز) بوون.





## ٢ لێکۆڵینەوەیەك دەیسەلمێنێت کە نوێژ چارەسەری هەستیاری دەکات:

ئەگەر تا ئێستا ئەوەمان زانیبێت کە نوێژ مرۆڤ لە بەدڕەوشتی و کاری خراپە دوور دەخاتەوە، ئەوە لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی ئەو ڕاستیەی دەرخستوە کە نوێژکردن هەستیاری پێش لە مرۆڤ دوور بخاتەوە، ئەمەش ئەوەی کەنوێژ دەبێتە هۆی بەهێزکردنی ئامێری بەرگری مرۆڤ لە دژی نەخۆشی هەستیاری، لە ئەسکەندەریە مامۆستای کۆلێژی پزیشکی سەر بە زانکۆی (طنطا) ئەنجامدراوە، ئەم پزیشکە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیدا ئەوەی ئاشکرا کردووە کە ڕکوع و سوجدەکان و وەستانی ناو نوێژ دەبنە هۆی ئەوەی کە غوددەی تایبەت بە دەرهاویشتنی ماددەی (کۆرتیزۆن) لە لەشدا هاوسەنگ بێت، ئەمەش وا دەکات مرۆڤی نوێژکەر هێمن و ئارام بێتەوە و فشاری خوێنیشی لەگەڵدا دابەزێت و لێدانی دڵیش ئاسایی بێتەوە، ئەگەر ئەو نوێژکەرەش نەخۆشی هەستیاری هەبێت ئەوە بەهۆی ئەوە بەهۆی نوێژکردنەوە چارەسەر دەبێت. شایانی وتنە کە ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕۆژنامەی (الأهرام) ی میسریدا بڵاوکراوەتەوە.



## ٣ گرنگی دڵ و دەرکەوتنی چەند ڕاستیەکی زانستی:

هەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ تازە دەبنەوە، هەیانە لە ٤٨سەعاتداو هەیانە لە هەفتەیەکدا و هەشیانە بە ماوەی زۆر درێژ. زانایان دەڵێن لە پێنج ساڵدا هەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ تازە دەبنەوەو و دەگۆڕێن تەنها خانەکانی مێشك نەبێت، زانیاری تێدا خەزن دەبێت و دڵیش بە هەمان شێوە خانەی عەصەبی دەوری داوە کە پێنج سەد ئەوەندەی خانەکانی مێشك توانایان هەیە و ڕێنمایی مێشك لە دڵەوە وەردەگرێت، ئەمەش ڕەحمی خوایە ئەگەر ئەو خانانە تازەبوونایەتەوە کارەسات

ڕوویدەدا، چونکە ئێستا زانایان بۆیان سەلماوە کە دڵ تەنها کاری پاڵپێوەنانی خوێن نیە بەڵکو بەهۆی خانەی عەصەبیە هەستیارەکانیەوە کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر مێشك. لە جیهاندا نزیکەی (٧٣) نەشتەرگەری چاندنی دڵ کراوە، پاش چاندنی دڵی حاڵی کەسەکە تەواو گۆڕدراوە و بووە بە کەسێکی تر، کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە ئەو سیفات و هەڵسوکەوت و حەزو ئارەزووە تازەیەی دەیبێت هی ئەو کەسەیە کە مردووە و دڵەکەی وەرگیراوە.

ڕۆژنامەی دەیلی مەیلی ٩-٤-٢٠٠٨ دا وتارێکی گرنگی بڵاوکردەوە لەبارەی چاندنی دڵەوە ڕۆژنامەکە دەڵێ: (کلیر) ئافرەتێکی تەمەن ( ٤٧ )ساڵەو لەبەر ئەوەی دڵی ناساغ بوو دڵ و سی کوڕێکی هەژدەساڵیان بۆ زەرع کرد کە بەڕووداوێك کۆچی دوایی کردبوو، هەر دوای چاك بوونەوەو هەستانەوەی (کلیر) وتی: هەست دەکەم ئەوەی لە سنگمدایە دڵێکی ترەو کۆمەڵێ گۆڕانکاری بەسەر حەزو ئارەزووەکانمدا هاتووە، بۆ نمونە حەزی لە مریشك نەبوو کەچی دواتر حەزی پێدەکرد! ئەوە بێجگە لەوەی کە کوڕانە هەڵسوکەوتی دەکرد و مەیلی بەلای ئافرەتاندا زیاتر بوو، تا ئەوەی وەك ئافرەتێك مەیلی بەلای پیاواندا هەبێت.

پرۆفیسۆر ( گاری سچوات ) جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو چل هەزار دەمارە خانەیەی لە دڵدایە، ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لەسەر هەڵسوکەوت و کارو کردەوەی مرۆڤ و ڕێنمایی مێشك دەکەن لە کارەکانیاندا، ئەمەش بەڕاستی موعجیزەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر کە پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت: (آلا ان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله ) واتە: لەناو لاشەدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بوو تەواوی لاشە ئیصلاح و چاك دەبێت.

❋❋❋



## ٤ زانایەکی فەلەکی بیانی داندەنێت بەوەی کە موحەممەد نێردراوی خوایە:

پرۆفیسۆر زەغلول نەجار دەڵێت: لەگەڵ زانایەکی فەلەکی بیانیدا گفتوگۆم دەکرد ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرم ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ باسکرد کە دەفەرمووێت: (سئل رسول الله (صلی الله علیه وسلم ): هذه المغارب أین تغرب، وهذه المطالع أین تطلع؟ فقال: هي علی رأسها لا تبرج ولاتزول، تغرب عن قوم وتطلع علی قوم، وتغرب عن قوم وتطلع، فقوم یقولون غربت ، وقوم یقولون طلعت ) مسند

واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کە ئەو رۆژئاوابوونە بۆ کوێ ئاوا دەبێت، ئەم خۆرهەڵاتنە لەکوێوە هەڵدێ؟ پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەمووی: ئەوە بەرێ و شوێنی خۆی لە گەلێك ئاوا دەبێ و لای گەلێکیش هەڵدێ، کۆمەڵێك دەڵێن ئاوابوو کۆمەڵێکیش دەڵێن هەڵهات، زانا فەلەکیەکە وتی: ئەگەر موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) تەنها ئەمەی فەرمووبێ بەڵگەیە کەنێردراوی خوایەو خوا فێری کردووە، بەڕاستی لەسەردەمێکدا کە مرۆڤایەتی لە تاریکیدا دەژیا خەڵکی بت و دارو بەرد یا خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیان دەپەرست زۆر گرنگە ئاوا باس لە خۆرهەڵاتن و ئاوابوون بکات و بەشێوەیەکیش وەڵام بداتەوە کە تێی بگەن.



## ٥ حیجامە و دۆزینەوە نایابەکەی زانای ئەمریکی ( رۆبرت فورشخوت ):

پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) باسی گەورەیی حیجامە دەکات و دەفەرمووێت: ( ان أمثل ما تداویتم به الحجامة والقسط ...) رواه البخاري. هەرچەندە بە تاقیکردنەوەو بەکارهێنان لە کۆنەوە سەلماوە کە حیجامە سوودی هەیە بۆ سەرئێشەو کۆمەڵێ حاڵاتی تر، بەڵام زانای ئەمریکی (رۆبرت فورشخوت) کە خەڵاتی نۆبڵی لە



پزیشکیدا له ساڵی ١٩٩٨ وەرگرت، سەلماندی کە لەش لەکاتی ڕووشان و بریندار بووندا ماددەیەکی زۆر گرنگ دەردەدات کە ( ئۆکسیدی نیتریك )ە، کە ئەمە ماددەیەکی موعجیزەیە و کاریگەری بەهێزی هەیە لەسەر فراوانکردنی بۆریە تەسکەکانی خوێن و دابەزاندنی فشاری بەرزی خوێن و کەمکردنەوەی ئازار و بەهێزکردنی خانەکان کە دژی ڤایرۆسن، ئەم پیاوە لە تەمەنی ٩٣ ساڵیدا دنیای بەجێهێشت لێکۆڵینەوەی نایاب و گرنگی هەیە.



## ٦ له مەریخ خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا دەبێت:

زانا گەردونیەکان ڕایانگەیاند کە هەسارەی مەریخ لەچەند هەفتەی ڕابردوودا لە جوڵەکەیدا بە ئاڕاستەی خۆرهەڵات هێواش بۆتەوە، تا لە ڕۆژی ٤ شەممە ٣٠ تەمموزی ساڵی ٢٠١٤ لە جوڵە دەکەوێت بە ئاڕاستەی لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات، پاش ئەوە لە دوو مانگی ئاب و ئەیلول و تاکۆتایی ئەیلول مەریخ دەستی کردووە بە جووڵە بەڵام ئەمجارەیان بە ئاراستەی خۆر هەڵات بەرەو خۆرئاوا، واتە بە پێچەوانەی جوڵەی ئاسایی خۆی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە ئێستادا لەسەر مەریخ خۆر لە خۆرئاواوەی هەڵدێت و لە خۆرهەڵاتی سەر ئەو هەسارەیە ئاوا دەبێت، ئەوەش دیاردەیەکی سەیرە و بە (retrograde motion) دەناسرێتەوە، بەپێی لێکۆڵینەوەی زانا گەردوونیەکان ئەو دیاردەیە بەلای کەمەوە یەك جار بەسەر هەموو هەسارەکاندا دێت و لەنێویشیاندا هەسارەکەی خۆمان کە زەویە کە ئەو دیاردەیەی لەڕێدایەو، ڕۆژێك دێت کە ئێمە لێی بێگاین تیایدا خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵدێت و لە خۆر ئاواوە ئاوا دەبێت. زاناکانی شەریعەش دەفەرموون ئەو ڕۆژە دێت بە سەر زەویدا لە بەڕۆژی ( الطلوع) ی دادەنێت و تیایدا خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵدێت و لە خۆر ئاواوە ئاوا دەبێت ئەو دیاردەیە یەك جار ڕوو دەدات و دوای ئەوە زەوی دەگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.

له فەرموودەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دا ئاماژە بەو دیاردەیە گەردوونیە کراوەو دانراوە بە یەکێك لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی یان نزیکبوونەوەی ئەو ڕۆژە، بۆ نمونە ئەم فەرموودەیە کە دەفەرمووێت: ( عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ) رواه بخاري و مسلم. واتە: قیامەت هەڵناسێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت. بەڕاستی بە تەنها ئەم موعجیزە گەورەیە شایانی ئەوەیە کە تێکڕای مولحیدانی جیهان بێنێتە ناو بازنەی ئیسلام ئەگینا پێش چواردە سەدە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن توانی باس لەو دیاردە گەردوونیە بکات، ئەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاست و درووستی پەیامی ئەم پێشەوا ئازیزە.



## ٧ لێکۆڵینەوەی پزیشکی ئیعجازی فەرموودەیەکی دەرخست:

ئەی پێغەمبەری پایەدار ڕۆژ بە ڕۆژ سەعات بە سەعات، زیاتر ڕاستی پەیامە پیرۆزەکەت بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرا دەبێت، لە ڕێنماییەکانتدا زیاتر لە چواردە سەدە لەوەوبەر فەرمووتە: (ما أسكَرَ كثيرُهُ، فقليلُهُ حرامٌ) رواه أبوداود، واتە ئەوەی زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش و مەست و بێئاگا بکات کەمەکەشی حەرامە. مادده بێهۆشکەرەکان لە ئیسلامدا تا دوا پلە دژایەتی کراوە کە لە لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکیدا ساڵی (٢٠١٦) ڕایگەیاند کە مەی یەکێکە لە حەوت هۆکارە مەترسیدارەکەی مردن لە جیهاندا و چەند زیاتر بخورێتەوە زیانەکانی زیاتر ئەبێت و سەلامەتی تەواو لەوەدایە کە بە هیچ جۆرێك و بە هیچ بڕێك با کەمیش بێت نەخورێتەوە.

***



## زانستی تازە ڕاستیەکی گەورەی ئاشکرا کرد لە بارەی هەست کردنی دارو درەخت:

لە دوا لێکۆڵینەوەی هەندێ لە زانایانی ڕووەکناسی ئەمریکی، بۆیان دەرکەوت کەوا گوڵ و سەوزەو درەختەکانیش دەتوانن هەست بە ئازار چەشتن بکەن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ماددەیەکی هێورکەرەوە دەردەدات و خۆی ئارام دەکاتەوە، ئەم کۆمەڵە زانایە سەریان سوڕما کاتێك بۆیان دەرکەوت کە ئەمانە کاتێك نەخۆش دەکەون ماددەیەك دەردەکەن هاووێنەی ماددەی (ئەسپرین)، بە هۆی ئەم ماددەیەوە سیستەمی دژە بەرگری خۆیان بەهێز دەکەن و بەرگری لەکرمە زیان بەخشەکان و شتی تریش دەکەن. بەپێی ئەم لێکۆڵینەوە دەرکەوتوە کە جوتیار و خاوەن سەوزاییەکان زۆر جار پێویستیان بە چاودێری تەندروستی ڕوەکەکان نابێت، ئەگینا دەبوو هەموو ڕۆژو هەموو کاتژمێرێك لێکۆڵینەوە لە سەوزەو میوەجات و ڕوەکەکان کرابایە نەوەك نەخۆش بکەون و تێك بچن.

زاناکان دەڵێن ئەم ماددەیەی گوڵ و ڕووەك و سەوزاییەکان دەری دەکەن ناوی (میثیل سالیسلیت )ە، لێکۆڵەرەکان ئەوەیان دووپات کردوەتەوە کەوا ئەم ڕووەکانەی کاتێك ئەم ماددەیە دەردەکەن سەوزەکانی تەنیشتیان هەستی پێدەکەن!

خوێنەرانی خۆشەویست ئەوەی سەیرە لێرەدا ئەوەیە کەوا وەکو هەموو بابەتەکانی تر پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئاماژەی بەم حاڵەتە کردووە. لەم فەرموودەیەدا هاتووە کەوا دەردەکەوێت درەختەکان و سەوزاییەکانیش هەست بە ئازار چەشتن دەکەن: (عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) أنه قال : أن النبي ( صلى الله عليه وسلم ) يخطب على جذع فلما اتخذ المنبر ذهب الى المنبر فحن الجذع فأتاه فاحتضنه فسكت فقال لو لم أحتضنه لحن الى يوم القيامة )

واتە: پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لەسەر سەکۆ دارێك خوتبەی دەدا کاتێك مینبەری بۆ دروست کرا چووە سەر مینبەرەکەی لەم کاتەدا دارخورمایەکە دەستی بە

نوزەو ناڵە کردبەهۆی ئەوەی سەروەرمان ئەوی جێهێشت، دواتر گەڕایەوە لای دارخورمایەکەو هێنای لەسەر مینبەرەکە لە ژێر پێیەکانی داینا ئەو کات دارەکە بێدەنگ بوو، ئەوجا پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی: ئەگەر وام نەکردبایە تا ڕۆژی قیامەت ناڵەی دەکردو دەنوزایەوە، ئەو کەسانەی ئاشنا نین و دورن لە پەیامەکەی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە ئەگەر خۆیان نەخەڵەتێنن و ڕانەکەن لە بەڵگە زانستیەکان ئەم موعجیزە زانستیە گەورەیان بەسە بۆ ئەوەی گومان و دوودڵی لەناو دڵەکانیان ڕابماڵێت و بیانگەیەنێتە کەناری دڵنیایی و هاتنە ناو بازنەی ئاینە ڕاست و پڕ لە زانست و زانیاریەکەی ئیسلام.



## ٩ زانستی سەردەم ئەندامە تارماییەکانی خەرمانەی ڕۆشنی دۆزیەوە و گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا بوو:

ئەو لێکۆڵینەوانەکە زاناکان ئەنجامیاندا سەلماندیان خەرمانە لە دەوری لەشی زیندوودا بوونی هەیە، ئەمەش بە هۆی شێوازی تایبەت لە وێنە گرتن سەلمێنرا، یەکێك لە زاناکانی ئەمریکی ناسراو ئەویش (elleen garret) ئەلرین کاریت وتی: کە چەندین ئەڵقەی ووزە لە دەوری لەشی مردووی نوێ دا هەیە.

لە لایەکی تر یەکێك لە زانا فیسیۆلۆجیەکانی ڕووس ئەویش ( دکتۆر کینادی سیرکییف )، هەستا بە دروست کردنی ئامێرێك بۆ سەلماندنی ئەم دیاردەیە، ئەم ئامێرەی لە تەنیش لاشەیەکی تازە مردوودا دانا، لە ناکاو ئامێرەکە دەستی کرد بە پێوانی شەپۆلی دەرچوو لە دڵ و دەماخی مردووەکە، ئەو زانایانەی کە ئەم دیاردەیەی بینی زانا ( والتر کلینر )ە، کە بەهۆی شوشەی ڕەنگاوڕەنگەوە لە نەخۆشخانە خەرمانەی ڕۆشنی بینی لە دەوری لەشی مرۆڤی زیندوو بە پانیٚ (١٥سم)، ئەمەش لە ساڵی ( ١٩١١) بوو.



(کلینر) تەئکیدی کرد کەوا پانی و شێوەی ئەم خەرمانەیە پابەندە بەسەر تەندرووستی لەش، ئەمەش بە گوێرەی نیشان کردنی هەندێك نەخۆش و کەم و کورتی لە لەشدا پاش ( کلینر) (Oscar baenal) پسپۆڕ لە زیندەوەرزانی لە زانکۆی (کمبردج ) هاتووە و هەوڵی دا بۆ دانانی ڕوون کردنەوەیەکی فیزیایی بۆ ئەم خەرمانە ڕۆشناییانەو وتی: باشترین ڕێگا بۆ بینینی ئەو خەرمانە ڕۆشناییانە ئەمەیە یەکەمجار دەبێت تەماشای گیراوەی ( دی سیانیت یان بێتاسیانۆ ٦ل)ـی دڵۆپێنراو لە ڕەژووی بەردینە بکەین بۆ ماوەیەکی گونجاو، هەتا چاو هەستیاربێت بۆ بینینی خەرمانەی ڕۆشن و بۆ ئاسانکردنەوەی بینینی خەرمانە، ئینجا چاویلکە درووست دەکرێت لە خانەی شێوە هاوێنە وە لە هەر خانەیەك گیراوەی ماددەی ( تری ئەتانۆلامین) هەیە.

( باکنیال ) بینی کە جووڵەی هەواش کار لە خارمانە ناکات و نایجولێنیّ، بەڵام کاتێك کە موگناتیس لە نزیك پێستی ئەو کەسە دادەنرێت ئەوە موگناتیسەکە خەرمانەکە ڕادەکێشێت بۆ خۆی، هێزی خەرمانەکە لە ناوچە تیژەکان یان باریکەکان وەك لووت و پەنجەکان......هتد.

(کریلیان) سەلماندی کە ئەو خەرمانەیەی لە دەوری دەستی مرۆڤی نەخۆشدا هەیە شێوەی تینی جیاوازە، لەگەڵ خەرمانەی دەوری دەستی مرۆڤی لەشساغ بەم شێوەیە دەتوانین بوونی نەخۆشی لە لەشی مرۆڤدا بدۆزینەوە بەهۆی ئەم خەرمانەیە.

زانا کریلیان و هاوسەرەکەی بۆ ماوەی ٢٥ساڵ کاریان کرد بۆ ئەوەی ئەم ئامێرە دروست بکەن، زۆر گەشتیاران سەردانی تاقیگەی کریلیان دەکردو ئەوانیش فیزیاناس و کیمیاناس و پزیشکەکان و زیندەوەرناس بوون، جگە لە پسپۆڕانی ئەلیکترۆنیەکان و لێپرسراوە حوکومیەکان لێکۆڵینەوە تیۆریەکان بەردەوام بوو تا ساڵی ( ١٩٦٤)، ئینجا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان بڵاوکرایەوە پاش ساڵی ١٩٦٤، ئەمەش زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر زیندەوەرزانی.

( کریلیان ) هەستا بۆ نیشان کردنی شوێنەکانی دەرزی هەستیار و گرنگ بۆ چارەسەر کردن بە ژەنین بەدەرزی بەهۆی تێبینی کردنی خەرمانە لە ناوچەکان و

شێوەی خەرمانە، بەم شێوەیە توانی بەسەرکەوتوانە بگاتە ئەنجامی ئەوەی کە هەڵم کردن یان جیاوازی لەناوچەکانی دیاری کراودا. ئێستاش ئامێری (کریلیان) نزیکەی لە هەموو تاقیگەکانی جیهان بەکاردەهێنرێت بۆ دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بەهۆی شەپۆلە دەنگیەکان.

جا بابزانین ئاخۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باسی ئەم دیاردەیەی کردووە؟ بەڵێ بەڵێ بەدڵنیایی ئەوەی باس کردووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) باسی ڕۆشنایی (نور)دەکات کە لە مرۆڤ دەردەچێت کاتی نوێژکردن و دەست نوێژ هەڵگرتن. لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت ( الوضوء نور والصلاة نور )، واتە: دەست نوێژ ڕۆشناییە و نوێژ ڕۆشناییە. (ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە).

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوە ڕوون دەکاتەوە موسوڵمانان ڕۆژی قیامەت جیاوازن لە میللەتەکانی تر، ئەویش بەو ڕۆشناییەی کە لێیان دەردەچێت دەفەرموێت: ( ان أمتي يأتون يوم القيامة غرا محجلين من أثر الوضوء فمن استطاع أن يطيل غرته فاليفعل ) رواه البخاری.

واتە: ئوممەتم ڕۆژ قیامەت دێن ناوچەوانیان بریقەدار دەبێت بەهۆی دەستنوێژ، هەرچەند دەتوانن با شوێنی دەستنوێژ درێژ بکەنەوە. زانایان دەڵێن ڕۆشنایی بە شوێنی دەستنوێژەکان دەوترێت، ( تعجيل ) ئەو سپیایەتیەیە کە دەردەچێت و دەووری دەست و پێ دەدات. هەزاران درووود بۆ تۆ ئەی پێغەمبەرەکەی خوا کە موعجیزەی فەرموودە پیرۆزەکانت لەسەدەی زانست و تەکنەلۆجیادا بۆ هەموو خەڵکی جیهان ئاشکرا دەبن.

***



## زانستی نویٚ هاوڕایە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ که هێزی کێشی زەوی شەوان کەم دەبێت:

زانستی تازە دەڵێت:

هێزی بواری موگناتیسی زەوی لەنیوە شەوەوە بەلاوازی دەست پێدەکات، ئینجا بە هێواشی زیاد دەبێت تا کاتی خۆرهەڵهاتن، ئینجا دەست پیٚ دەکات بۆ کەم بوونەوە لە خۆرئاواوە هەتا نیوە شەو. بۆیە هێزی کێشی زەوی شەوان کەم دەبێت، سەفەرکردن لەشەودا ئاسان و نەرم و نیانتر دەبێت ئەم نەرم و نیانییە لەفەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) دەبینین، باسی ئەو بابەتەی کردووە بەچەندەها سەدە پێش زانستی نویٚ دەفەرموویٚت: ( عليكم بالدلجة فإن الأرض تطوي باليل) رواه أبو داود باسناد صحيح. (معنى الدلجة: السير بالليل ) واتە: شەو بەڕێکەون چونکە زەوی بەشەو دەپێچرێتەوە.

توخوا ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بەس نیە کە تێکڕای مولحیدەکانی دنیا بگەیەنێتە کەناری دڵنیایی، سوێند بەخوای گەورە ئەگەر ئەو دوور لە دینانە لە بەڵگە زانستیەکان ڕانەکەن تەنها ئەوەیان بەسە، باشە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) چۆن چواردە سەدە بەر لە ئێستا زانی کە باسی ئەو دیاردەیە بکات، زانستی تازەش پاش چەندەها دیراسات و لێکۆڵینەوە جا ئەو جار گەیشتنە ئەم ڕاستیە گەورەیە، بەڵیٚ خوای گەورە کە زاناو ئاگادارە بە هەموو وردەکاریەکانی بوونەوەر، ئەوەی بەوەحی بە پێغەمبەرە ئازیزەکەی ڕاگەیاندووە تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕاست و درووستی پەیامەکەی.

***



## ١١ دۆزینەوە زانستیەکان لە خزمەتی فەرموودەی پێغەمبەردایە دەربارەی فیترەتی منداڵ:

لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیدا لە ساڵی (٢٠١١) زانایان دەریانخست کە منداڵ لە تەمەنی (١٠) مانگیەوە توانای جیاکردنەوەی چاکە و خراپەی لە یەکتری هەیە، هەروەها دەتوانێت شتە ڕاستەکان بناسێتەوە، تەنانەت توانای ناسینەوە و جیاکردنەوەی زۆر شتی تر و فێربوونی بە خێرایی هەیە، لەبەرئەوە زاناکان دەڵێن مێشکی منالّ لەسەرەتاوە بە جۆرێك پرۆگرامکراوە کە شتە ڕاستەکان ئەنجام بدات، کەواتە زانست ئەو ڕاستیە ڕوون دەکاتەوە کە هەموو کۆرپەیەك کاتێك لەدایك دەبێت لەسەرەتای ژیانیەوە ئامادە دەبێت بۆ بەجێهێنانی کاری چاکە بەڵام چوار دەورەکەی دەیگۆڕێت و ناڕاستەی دەکات بەرەو کاری خراپە، یاخود چاکە ئەم ڕاستیە زانستیەش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێش چەندین سەدە ڕایگەیاندووە کە فەرموویەتی (كل مولود يولد على الفطرة) رواه البخاري، واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت و وشەی فیترەت بە واتای شتەکان یاخود کارە ڕاستەکان و تەواوەکان دێت.



## ١٢ دەستنوێژ و ڕۆڵە کاریگەرەکەی لە کەمکردنەوەی تورەیی:

ئەم توێژینەوەیە لەلایەن: دکتۆر وەهیب دخیل الله، وە دکتۆرهەهدی محمد و اروی بغدادی و انغام ابولین و سعد الحصيدي و ابتهال ئەنجامدراوە، ڕێگە و شێوازی توێژینەوە ئەم توێژینەوەیە لەسەر (١٢) کەسی ئاسایی ئەنجامدراوە، بەپێی توێژینەوەکان پەیوەندی ئاشکرا هەیە لەنێوان تورەیی و نەخۆشی دڵ و بۆریەکانی خوێن و بەرزی فشاری خوێن و مردنی لەناکاو بەهۆی نەوبەی دڵەوە، هەروەها توێژینەوەکان ئاماژە بە پەیوەندی نێوان لایەنی دەروونی و ئەگەری زیاد پەککەوتن لە

نەخۆشانی ڕۆماتیزم و گرانی کۆنترۆڵ کردنی شەکرەی خوێن لەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە و، هەروەها هەلی ژیان لەوانەی نەخۆشی شێرپەنجەی مەمکیان هەیە و خراپبوونی نیشانەکانی نەخۆشی ڕەبۆ و، هەوکردنی بەشی سەرەوەی کۆئەندامی هەناسە و هەوکردنی ڕیخۆڵەکاندا هەیە.

ڕۆڵی دەستنوێژ لە کاریگەریە خراپەکانی توڕەبوون لە فەرموودەیەکدا کە ئەبودادود و ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: توڕەیی لە شەیتانەوەیە و شەیتانیش لە ئاگر دروستکراوە و ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە، ئەگەر یەکێکتان توڕەبوو با دەست نوێژ بگرێت.

لە فەرموودەیەکی تردا کە ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٧٨٢) لە ئەبو زەڕەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموویین: ئەگەر یەکێکتان توڕەبوو بەپێوەبوو با دانیشێت ئەگەر توڕەییەکەی ڕۆیشت دەنا با ڕاکشێت شێوازی تاقیکردنەوەکەیە و شێوەیە بوو دوازدە خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی کە تەمەنیان لەنێوان (١٨ — ٢٢) ساڵان دەبێت ماوەی سێ کاتژمێر لە چاوەڕوانی تاقیکردنەوەکاندا بوون و زانیاریان دراوەتێ کە هیچ نەخۆن و لێدانی دڵ و فشاری خوێنیان لەڕشێی ئامێرێکی ئەلکترۆنیەوە دەپێورا پاشتر بڕێك خوێنیان لێ وەرگیرا بۆ زانینی ئاستی پشکنینەکان پاشان سیناریۆیەکی وەهمیان بۆ داڕێژرا کە دزیان کردبوو داوایان لێ کرا بەردەوام بن لە بەرگریکردن لە خۆیان بۆ سەلماندنی بێتاوانیان و پێیان ڕاگەیەندرا کە دواتر لەڕێی ڤیدیۆوە ئاستی ڕەوانبێژی و بەرگریتان تاقیدەکرێتەوە پاشان لێدانی دڵ و فشاری خوێنیان دەپێورا و بۆ جاری دووەم خوێنیان لێوەرگیرا بۆ زاهینی ئاستی پشکنینەکان ڕاستەوخۆ پاش کارەکەیان پاشان بۆ جاری سێیەم خوێن لە شەش کەسیان وەرگیرا پاش ئەوەی دەستنوێژیان گرت پاشان لە خولەکی ١١٥ و ١٢٠ دوو جاری تر خوێن لە هەموویان وەرگیرایەوە ئەوانەی دەست نوێژیان گرتبوو ئەوانەشی بێ دەستنوێژ بوون لەو ماوەیەدا داوایان لێکرا پێوەری (سبیلبیرگر) پڕبکەنەوە کە

پێوەرێکی تایبەتە بە تورەیی و لە هەشت بەند پێکدێت ئەنجامی توێژینەوەکە ئەوەبوو:

یەکەم: زیادبوونی لێدانی دڵ و بەرزبوونەوەی فشاری خوێن گرژبوون و خاوبوونی دڵ فشاری بەرز و نزم لە سەرجەم بەشداربواندا پاش تۆمەتبارکردنیان بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕۆڵی دەستنوێژ دەردەکەوێت لە کەمبوونەوەی لێدانی دڵ و فشاری خوێنی نزم و بەرز بۆ ئاستی ئاسایی خۆی.

دووەم: زیادبوونێکی ئاشکرای ئاستی شەکر و کۆلیسترۆڵی گشتی و چەوری سیانی و کۆلیسترۆڵی کەمە چڕی ئەم زیادبوونە پاش دوو سەعات گەڕاوەتەوە باری ئاسایی لە سەرجەم بەشداربواندا.

سێیەم: بەرزبوونەوەی ئاستی کۆرتیزۆل لە سەرجەم بەشداربواندا لەسەرەتادا پاشان دابەزینی خێرای لەوانەی دەستنوێژیان گرتووە و مانەوەی بە بەرزی لەوانەی دەستنوێژیان نەگرتووە بەرزبوەتەوە لە ئاستی ئاسایی تێبینی نەکردنی هیچ گۆڕانکاریەك لە ماوەی مەینی خوێن لە هەردوو گروپەکەدا کورتەی توێژینەوەکە بەو شێوەیە بوو تورەیی دەبێتە هۆی زیادبوونی چالاکی دڵ و بەرزبوونەوەی فشاری خوێن و ئاستی شەکری خوێن و کۆلیسترۆڵی گشتی و ئینتەرلیوکین و بەهۆی دەستنوێژەوە کەمیان کردووە یان گەڕاونەتەوە باری ئاساییان بۆیە ئەم توێژینەوەیە پێشنیار دەکات بە دەست نوێژگرتن پاش تورەبوون چونکە سودێکی زۆری هەیە بۆ پاراستنی تاکەکان لە کاریگەریە مەترسیدارەکانی تورەیی خوێنەری بەرێز هەرچی کە خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویانە بۆ سود و بەرژەوەندی مرۆڤە لەم دنیایە و وە هەم ڕۆژی دوایش.

***



## ١٣ به پێخاوسی ڕۆیشتن و سووده تەندروستیەکانی:

ڕۆیشتن سوودی باشی بۆ لەش، دەروون، هۆش، گیانی مرۆڤ هەیە، بۆیە پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) فەرمانی فەرمووە جاربەجارێ مرۆڤ بە پێخاوسی بڕوات ئەم بابەتەش بە شێوەیەکی کورت هەندێ لە سوودەکانی جارجارێ بە پێخاوسی ڕۆیشتن..

بەڵگەش فەرموودەی دروست و زانستی (رفلکسۆلۆجی) پەرچدانەوەو هەندێك زانستی تازەی بواری تەندروستی دەهێنینەوە.

پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کۆچی کرد بۆ میسر بۆ لای (فضالة ابن عبید) پێی وت من وەك میوان نەهاتوم بەڵکو من و تۆ پێکەوە فەرمودەیەکمان لە پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بیستوە ئومێدەوارم لەو بارەوە زانستێکتان لەلا دەست بکەوێت وتی: کامەیە؟ وتی: ئەو فەرمودەیەی کە ئاواو ئاوا بوو، وتی: دەتبینم سەریشت خۆڵاویە لە کاتێکدا ئەمیری سەرزەویت؟ وتی: پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) نەهی لە زۆر خۆشگوزەرانی لێدەکردین وتی: ئەی بۆچی پێڵاویشت لە پێدا نابینم؟ وتی: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێدەکردین جاربەجارێ بەپێخاوسی بڕۆین .

خوێنەری بەڕێز جا با بزانین زانستی تازە چی دەڵێت لەبارەی سوودەکانی بە پێخاوسی ڕۆیشتن:

یەکەم: کاریگەری بە پێخاوسی ڕۆیشتن لەسەر لەش:

پەستاوتنی بازنەکانی پەرچ دانەوە بۆ ماوەیەکی کەم لە پێکاندا لە کاتی بەپێخاوسی ڕۆیشتندا هانی ئەندامەکانی وەك جگەرو قۆڵۆن ( کە بەشێك لە ڕیخۆڵە گەورە ) و پێست و سیەکان دەدات بە کردەوەو فەرمانەکانی خۆیان هەستن و ئەو ژەهرانەی لە ناویاندایە دەریانهێنن و بیانکاتە دەرەوەی لەش، هەروەها دەتوانرێت بە پێی زانستی کاردانەوە نەخۆشی لە هەر ئەندامێکی لەش بدۆزرێتەوە ئەگەر ئەو ئەندامە نەخۆشیشی تێدا دەنەکەوتبێت ئەویش بە هۆی ئەو ئازارەی لە خاڵی

کاردانەوەی تایبەت بەو ئەندامەدا جیا لە خاڵەکانی تری قاچ پەیدا دەبێت، چونکە کرداری پەستاوتنی لەش بۆ سەر خاڵی پەرچ دانەوە هەڵدەستێت بە ناردنی شەپۆلێك لە چالاکی ئۆکسجین و خۆراك بەمەش هانی سوڕی خوێن و دەمارەکان دەدات، تا یارمەتی ئۆرگان یان ئەندامی توشبوو بدەن و خوێن لە مەیین یان ئەو خوێن تێزانەی تووشی بوە ڕزگار ی ببێت.

دووەم: کاریگەری بە پێخاوسی ڕۆیشتن لەسەر دەروون و ئەقڵ:

بە پێخاوسی ڕۆیشتن چالاکی و ووزەی پێویست بەلەش دەبەخشێت بۆ نمونە فیچقە کردنی خوێنێك کە هەڵگری ئۆکسجین وزە بێت بۆ خانەکانی لەش، ئەوە حاڵەتەکانی ماندووبونی درێژخایەن و تەممەڵی چارەسەر دەکات و هەموو جۆرە هەستکردنێکی خراپیش ڕادەماڵێت و هاوسەنگی فیکری و ئەندامیش بۆ لەش دەگەڕێنێتەوە، ئەمەش لە جێی خۆی یارمەتی بیر ڕۆشنی و زیاد کردنی توانای هوشیار بوونەوە دەدات، هەروەها یارمەتی نەهێشتنی پاڵەپەستۆی دەروونی دەدات کە بەرگری لەش دەڕمێنێت و بەوەش نەخۆشیە ئەندامیەکان ناهێڵێت.

سێیەم: بە پێخاوسی ڕۆیشتن و وزە:

زۆر جار خاڵەکانی پێ بە ئازارترن لەو بازنانەی کە لە دەستەکاندا یان لە ئەندامانی تری لەشدا هەن، ئەویش بە پێی یاسای هێزی ڕاکێشان بەهۆی زۆر ڕاوەستان ماددەیەی دیاریکراو لە پێیەکاندا دەنیشن و دەبنە هۆی داخستنی ڕێڕەوەکان یان تەوژمەکانی وزەی کارۆ موگناتیسی پەستاوتنی ئەم خاڵە ڕەق هەڵاتوانەش یارمەتی کردنەوەی بۆریەکان بۆ وزەی کارۆ موگناتیسی دەدات و بەهۆی کۆنتاکتی ڕاستەوخۆ لەگەڵ لەرەی وزەکان کە لە کانزا کانی ناو چەوو بەردەکان دەردەچێت ئەم وزانە لە خولگەی خۆیاندا بە شێوەیەکی سروشتی بەرێوە دەچن بەم شێوەیەی چالاکی دەگەڕێتەوە بۆ هەموو ئەو ئەندامانەی کە پەیوەندن بەم ڕێڕەوانەوە.

چوارەم: کاریگەری بەپێ خاوسی ڕۆیشتن لەسەر ڕۆح:

لایەنی روح گوێڕایەڵی و خواپەرستی بەهێز دەبێت بە پێخاوسی ڕۆیشتن وەك چۆن لە فەرموودەکە هات گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم)، بیرکردنەوەش لەو پاداشتەی خوای گەورە لە دنیاو لە دوارۆژدا بۆ ئەو کەسانەی ئامادە کردوە کە لەبەر خوای گەورە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) دەکەن، باوەڕو دڵنیایی بەهێزدەکات. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بزانین کە زانستی پەرچدانەوە توانای دیاری کراوی هەیە و ناتوانێت ببێتە هۆی وەستانی چارەسەرکردن بە دەرمان یان سازنەدانی نەشتەرگەری بۆیە بە پێخاوسی ڕۆیشتن توانای دیاری کراوەو نابێت زیادە ڕۆیی تێدا بکرێت. لێرەوە دەتوانین بڵێین هەروەك چۆن لە زانستی بەرپەرچدانەوەدا هاتووە چارەسەر جارجار بە پێخاوسی ڕۆیشتن بە چارەسەرێکی خۆ پاراستن و تەواوکاری دەدەنرێت ئەمەش بەڕوونی لە ئامۆژگاریەکانی هەندێ پزیشکی بواری پزیشکی تازە بۆ هەندێ حاڵەتی پزیشکی دا دەردەکەوێت وەك کاتی کەڕووکردنی پێکان یان ئەوەی پێی دەوترێت نەخۆشی پێی وەرزشەوانان یان دەوالی قاچەکان یان ئازاری ئەو قاچانەی کە بنی پێیان تەختەو کەوانی نیە.



## ١٤ زانستی تازە دۆزیەوە میزی کوڕی شیرە خۆرە ڕێژەیەکی بەکتریای کەمی تێدایە بەڵام هی مێینە زۆر زیاتری تێدایە

خوێنەری بەڕێز بڕوانە لەم موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لەم چەرخەی ئێستادا زانایان ئاشکرایان کردوە کە میزی منداڵی نێرینەی شیرەخۆر ڕێژەیەکی بەکتریای کەمی تێدایە، بەڵام هی مێینە زۆر زیاتری تێدایە بەرامبەر بە نێرینە ئەم ڕێژەیان بەم شێوەیە دیاری کردوە، لەهەر پشکێکی میزی نێرینەدا (٢) بەکتریا هەیە بەلأم لە مێینەدا (٤٢) بەکتریا هەیە، پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بەر لە چواردە سەدە درکی بەمە کردوە! أم قیس بنت محصن: ( أنها أتت بابن لها

صغير لم يأكل الطعام لاى النبي ( فبال على ثوبه فدعا بماء فنضحه ولم يغسله ) رواه بخاري ومسلم وأبوداود وأحمد.

٢- الغلام الرضيع ينضح و بول الجارية يغسل) رواه الامام أحمد.

٣- ما ينضح من بول الذكر و يغسل من بول الأنثى ) رواه أحمد و أبوداود.

ئیعجاز و ڕوونکردنەوە: فەرمایشتەکان دیارو ڕوونن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) پێمان ڕادەگەیەنێ کەوا میزی منداڵی شیرەخۆری نێرینە ئەگەر بەکراستەوە بوو تەنها ئاوی بەسەردا بڕشێنە شوشتنی ناوێ بەمەرجێك شیر بخوات، بەڵام هی مێینە واجبە بشۆردرێت، بەڕاستی کەسێکی دوور لە ئیسلام ئەگەر لەو پەڕی گومان و دودڵیدا بێت، دەبوو کە ئەو موعجیزە گەورەیەی بەرچاو دەکەوێت بەتەواوی ڕووبکاتە ئەو ئاینە بڕ لە زانست و زانیارییە و بەتەواوی دڵنیا بێت .



## ١٥ دۆزینەوەکەی زانای ئەڵمانی ( هانس سبیمان ) کە خەڵاتی نۆبڵی پێ وەرگرت:

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت: ( كل بني آدم يأكله التراب إلا عجب الذنب، منه خلق وفيه يركب) رواه مسلم

واتە: هەموو بەشێکی مرۆڤ زەوی دەیخوات و دەڕزێنێت تەنها بەشێکی ئێسك نەبێت کە هەرگیز زەوی ناتوانێت بیفەوتێنێت، لەو ئێسکەوە دروست بووە و هەر لەویشەوە زیندو دەبێتەوە، ئەویش بەشێکی ئێسکی کلێنچکەیە لە کۆمەڵێ تاقیکردنەوەی یەك لەدوای یەکدا زانای ئەڵمانی جولەکە ( هانس سبیمان) و قوتابخانە زانستییەکەی ساڵی ١٩٣١- ١٩٣٥ سەلماندی (عجب الذنب) الخيط و العقدة البدائيين. بەرپرسە لەدروست بوونی هەموو ئەندامەکانی لەشی کۆرپەلە، بۆیە ناونراوە بە ڕێخەری سەرەتایی ئەو زانایە هەستا بە بڕینی (کلینچکە) لە کۆمەڵێ گیانداری وشکاوەکی و زەرعی کرد لە (جنين) کۆرپەلەیەکی تردا بینی، کە بۆخۆی نەشونما دەکات بە جیا لەو کۆرپەلەیەی کە تیایدا

زەرع كراوە، هەروەها وردی كرد و ئینجا زەرعی كردەوە لە كۆرپەلەیەكی تردا، بە هەمان شێوە نەشونمای كردەوە و بە جیا لە كۆرپەلەیەكی تر دروست بۆی دەركەوت وردكردن كاری تێناكات.

ئینجا كوڵاندی و بۆی دەركەوت كوڵانیش كاری تێناكات لە ئەنجامی ئەم دۆزینەوە گرنگەدا لە ساڵی ١٩٣٥ دا خەڵاتی نۆبڵیان دایە، لە ساڵی ٢٠٠٣ دا دكتۆر عوسمان گەیلانی تاقیكردنەوەیەكی كرد لە یەمەن لەسەر پێنج كلێنچكەی مەڕ بەوەی كە بە دەمانچەی غاز بۆ ماوەی دە خولەك سوتاندنی تا تەواو بوون بە خەڵوز. پاشان دیراسەی كرد بۆی دەركەوت كە خانەكانیان زیندوون هیچیان لێنەهاتوە، هەروەها پرۆفیسۆر زەغلول نەججاردەڵێت: كە ئەم فەرموودەیەم بۆ چەند زانایەكی ڕۆژئاوا باس كرد وتیان بەڕاستی تەنها ئەم فەرمودەیە بەسە كە بەڵگە بێت لەسەر پێغەمبەریەتی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم). ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە كە وەك ڕۆژی ڕووناك لەسەردەمی زانست و تەكنەلۆجیادا ئاشكرابووە.



## ١٦ نیوەڕۆ خەو لە ڕوانگەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و زانستی نوێ:

لە ٢٠٠٧/٢/١٣ دا لێكۆڵینەوەیەكی بڵاوكردەوە بە ناوی (بنون لە نوسینگەكانتاندا تەندروستیتان باش دەبێت) و تیایدا (cnn) دەڵێت: نیوەڕۆیان سەرخەوێك بشكێنن لە نوسینگەكانتاندا مەترسی توش بوونتان بە نەخۆشیەكانی دڵ كەم دەبێتەوە، ئەم لێكۆڵینەوەیە لەسەر (٢٣٦٨١) كەس كرا لە یۆنان لە ماوەی شەش ساڵدا كە تەمەنی ئەو كەسانەی بەشداریان كرد لە ٢٠ ساڵەوە تا ٨٦ ساڵ دەبوو، (دیمیتریۆس) كە لێكۆڵەرە لە زانكۆی هارڤارد و زانكۆی ئەثیناو بەرپرسی ئەم لێكۆڵینەوەیەشە دەڵێت: ئامۆژگاریم بۆتان ئەوەیە ئەگەر دەتوانن ڕۆژانە سەرخەوێك بشكێنن و ئەم فرسەتە لەكیس خۆتان مەدەن. دیراسەكە دەڵێت:

ئەوانەی کەسێ ڕۆژی هەفتە ڕۆژی نیوسەعات نیوەڕۆیان بخەون کێشەی دڵ و نەخۆشیەکانی کەمتر تووش دەبن لەچاو ئەوانەی ئەو سەرخەو شکاندنەیان نیە، شایانی باسە کەهەندێ کۆمپانیا ڕێ دەدات بەو سەرخەو شکاندنە بۆ کارمەندەکانی لە کاتی پشووی نیوەڕۆیاندا، کە ئەمەش بۆتە هۆی زیادبوونی بەرهەمیان وەك کۆمپانیای ( یارد میتالۆ) ی ئەمریکی بۆ دابەش کردنی کانزاکان، پاش ئەم دیراسەیە بابگەڕێینەوە لای فەرموودەکانی سەروەرمان پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) کە پێش چواردە سەدە دەفەرموێت: ( قيلوا فإن الشياطين لا تقيل ) صحيح الجامع الصغير(٤٤٣١) کە بەڕاستی ئەمەش بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) لە خۆیەوە قسە ناکات خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝﴾النجم ٣-٤ واتە: لە هەواو هەوەسەوە قسە ناکات کە قورئان دەخوێنێت هەرچی دەیڵێ قورئانەو سروشت دەکرێ بۆی.



## گەورەترین زانای کۆرپەلەزانی کەنەدی بە هۆی موعجیزەیەکی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ) موسوڵمان بوو:

پرۆفیسۆر. (د. کیث مور) پرۆفیسۆرێکی کەنەدیەو یەکێکە لەو دوانزە پرۆفیسۆرەی کە بۆ هەرباسێك لە مەسەلەی کۆرپەلەزانیدا پرس بەوان دەکرێت. ویستی بە خەیاڵی خۆی ڕەخنە لە فەموودەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بگرێت لەو فەموودەیەی کە دەفەرموێت: کۆرپەلە دوای چل و دو شەوو لە ڕەحم دا دیاری دەبێت کە نێرە یان مێیە، زۆر بە وردی دیراسەی کردو بەپێشکەوتوترین ئامێر چاودێری کۆرپەلەی کرد لە ڕەحم دا لە شەوی دەیەم و بیستەم و سیەم و چل و چل شەوو یەك سەعات و دوو سەعات و .. هتد تا بۆی سەلما کە تا چل و دوو شەوەکە تەواو نەبێت ڕەگەزی کۆرپەلە دیاری نابێت، لە ئەنجامی ئەمەوە ئەویش موسوڵمان

بوو، له ته‌له‌فیزیۆنی كه‌نه‌دی چه‌ند وتارێكی له‌سه‌ر ئه‌م مه‌سه‌له‌یه پێشكه‌ش كردو ژماره‌یه‌ك قوتابیشی موسوڵمان بوون لێیان پرسی چۆن ده‌گونجێ تۆ بڕوات به عیسا هه‌یه‌و بڕواش به محمد بهێنی؟ ئه‌ویش وتی: (عیساو محمد ( سه‌لامی خوایان لێ بێ) له یه‌ك قوتابخانه‌وه هاتوون .



## زانای به‌ریتانی ( ریتشارد فرانسیس بیرتون ) به هۆی موعجیزه‌ی به‌رده‌ڕه‌شه‌كه موسوڵمان بوو:

به‌رده ڕه‌شه‌كه له ئاسمانه‌وه هاتووه: روى أبي كعب عن النبي ( صلى الله عليه وسلم) أنه قال (الحجر الأسود نزل به ملك من السماء )، واته: ڕیوایه‌ت كراوه له ئوبه‌ی كوڕی كه‌عبه‌وه كه پێغه‌مبه‌ر ( صلى الله عليه وسلم ) فه‌رمویه‌تی: به‌رده ڕه‌شه‌كه فریشته‌یه‌ك له ئاسمانه‌وه دایبه‌زاندوه.

و أخرج الامام أحمد في مسنده عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ( صلى الله علية وسلم ) قال: ( نزل الحجر الأسود من الجنة وهو أشد بياضا من اللبن، فسودته خطيا بني آدم ) واته: ئیمامی ئه‌حمه‌د هێناویه‌تی له موسنه‌ده‌كه‌یدا له عبدالله كوڕی هه‌بباسه‌وه ( ڕه‌زای خوایان لێبێت) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر( صلى الله عليه وسلم ) ده‌فه‌رموێت: به‌رده‌ڕه‌شه‌كه له به‌هه‌شتوه دابه‌زیوه، له كاتێكدا له چڕی شیر سپیتر بوو، به‌ڵام به هۆی گوناهی ئامیزاده‌كان ڕه‌شیان كرد.

كاتێك ڕۆژهه‌ڵات ناسه‌كان ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌یان خوێنده‌وه بۆ سه‌لماندی ئه‌و بابه‌ته كۆمه‌ڵه‌ی مه‌له‌كی جوگراف به‌ریتانی زابتێكی به‌ریتانیان به‌كرێ گرت، هات بۆ عه‌ره‌بستانی سعودی له‌سه‌ر شێوه‌ی حاجیه‌ك له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی نۆزده‌دا له ساڵی ( ۱۸۵۳) ی زایینی به مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی به‌شێك له به‌رده‌ڕه‌شه‌كه بدزێت و بگه‌ڕێته‌وه به‌ریتانیا، پاش دیراسه‌كردن بۆیان ده‌ركه‌وت ڕاسته ئه‌م به‌رده‌ڕه‌شه له‌به‌رده‌كانی ئاسمانه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شێوه‌ی له به‌ردی نیازك ده‌چێ، ئه‌و دۆزینه‌وه‌یه و لێكۆڵینه‌وه

لەو بەردە ڕەشە بووە هۆكاری موسوڵمان بوونی، چیرۆكی موسوڵمان بونەكەی تۆماركرد لە پەڕاوێكدا بە ناونیشانی رحلة الی مكة (ajourneyto mecca) ریتشارد فرانسیس بیترتون وەفاتی كرد لە ساڵی ١٨٩٠ زاینی.



## ١٩ زانایەكی ئەڵمانی بەناوی( شین) بەهۆی یەكێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) موسوڵمان بوو:

پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) لەسەدو بیست فەرموودەدا باس لە ( الطب التشریعي) دەكات كە هەندێكی تازە دۆزراونەتەوە، بۆ نمونە كە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: لە لاشەی مرۆڤدا سێ سەدو شەست جومگە هەیە و هەقە بە جوڵاندنی هەریەكەیان مرۆڤ خێرێك بكات، ئاخر ئەگەر خوا پێی ڕانەگەیاندبێ چواردە سەدە بەر لە ئێستا چۆن زانی ئەوەندە جومگە لە لاشەی مرۆڤدا بوونی هەیە، كە تاساڵی ١٩٩٧ زایینی لە گەڵ ئەو هەموو پێشكەوتنەی زانستی پزیشكیدا تەنها (٣٤٠) جومگە دۆزرابۆوە، تا زانایەكی ئەڵمانی بواری قورگ و لوت و گوێ بەناوی ( شین ) جومگەیەیكی ئاوێتەیی لە گوێی ناوەڕاستدا دۆزیەوەكە پێك هاتوە لە دە جومگەی بچوك، بەمەش ژمارەكە تەواو بوو ٣٤٠ لەگەڵ بیست جومگەی هەردوو گوێچكەدا دەكاتە ٣٦٠ جومگە، هەروەك پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) هەواڵی فەرمووە، كە ئەمایان بە زانا ئەڵمانیەكە وت، لە كۆتایی حەجی ساڵی ٢٠٠٢دا موسوڵمان بوو، سەردانی هەیئەی ئیعجازی زانستی قورئان و فەرمودەی كرد .

ئەوەی كە ئاشنا نیەو دوورە لە پەیامی ئەم ئاینە پاكە ئەگەر خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ و ڕانەكات لە بەڵگە زانستیەكان ئەم موعجیزەیە بەسە كە گومان و دوودڵی بەتەواوی لەناودڵی بەتەواوی ڕابماڵێت و بیگەیەنێتە كەناری دڵنیایی و هاتنە ناو بازنەی ئاینە پڕ لە زانیاریەكەی ئیسلام.



## ٢٠ دۆزینەوەی بنەمایەکی گرنگی تەندروستی لەلایەن زانستی نوێوە، لە فەرموودەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) باسکراوە:

لەنەخۆشخانەیەکی ئەڵمانی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ( صلى لله عليه وسلم) وەك حیکمەتێك هەڵواسراوە. دەفەرموێت ( ما ملأ بني آدم وعاء شرا من بطن، بحسب ابن آدم لقيمات يقمن صلبه فان كان لا محالة فثلث لشرابه وثلث لنفسه ) رواه ترمذي. واتە: خراپترین شتێ کە مرۆڤ پڕی بکات گەدەیەتی و ورگیەتی مرۆڤ چەند پارویەکی بەسە کە پشتی ڕاست بکاتەوە، ئەگەر هەردەشخوات و چار نیە ئەوا با یەك لەسەرسێی گەدەی بۆ خواردن و یەك لەسەر سێی بۆ خواردنەوەو یەك لەسەر سێی بەبەتاڵی بمێنێتەوە بۆ هەناسە.

ئەم فەرموودەیە مەگەر هەر لە دەمی پێغەمبەر ( صلى لله عليه وسلم) بێتە دەرەوە کە بنەمایەکی مەزن و مەسەلەیەکی گرنگە لە تەندروستیدا یەك لەسەر سێی موعجیزەیەو تازە دۆزراوەتەوە، گەدە کە بەتاڵ بوو هەوای تێچوو لەوێوە ئۆکسجین دەچێ بۆ خانەکان و وەك هەناسە وایە و زۆر گرنگە، ساڵی ١٩٩٩ زاینی لە ئەمریکا لێکۆڵینەوە کرا لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ چەند خواردنی پێویستە بۆ لاشەی کە تەندروستیەکی باشی بداتێ، بۆیان دەرکەوت کە مرۆڤ تەنها بە یەك لەسەر سێی پڕکردنی گەدەی دەژی. بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

***



## پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی بەیانی درۆزنی کردووە زانستی تازەش وەك ڕۆژی ڕووناك ئەم ڕاستییەی دەرخست:

بەیانی درۆزن چییە؟ بریتیە لە ڕەنگدانەوەی تیشکەکانی خۆر بە هۆی تۆزو خۆڵەوە کە نیو کاتژمێر بەر لە بەیانی داهاتن بەدیار دەکەوێت، زۆر کەس ئەگەر نەشارەزا بێت ئەم دیاردەیە ببنێت هەڵدەستێت نوێژی بەیانی دەکات، بەڵام لە ڕاستییدا سی خولەك دەمێنێت بۆ هاتنی کاتی نوێژی بەیانی، خوێنەری بەڕێز پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەر لە چواردە سەدە باسی ئەم دیاردەی کردووە کە ئەوەش بەڕاستی موعجیزەیەکی یەکجار گەورەیە، پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت: ( الفجر فجران، فجر يقال له ذنب السرحان، وهو الكاذب يذهب طويلا، ولا يذهب عرضا، والفجر الآخر يذهب عرضا ولا يذهب طويلا ).

واتە: بەیانی داهاتن دوو جۆری هەیە، بەیانیەك پێی دەوترێت کلکی گورگ کە بەیانیەکە درۆینەیەو وانیەو بەدرێژی دەڕوات، بەیانی ناڕوات ئەوەی تریشی بەیانی دەڕوات و بەدرێژی ناڕوات.

سەیر بکەن بەڕێزان پێغەمبەری پێشەوامان ( صلى الله عليه وسلم) جیاوازی ئەم دیاردەیە لە گەڵ بەیانی داهاتنی ڕاستەقینە دیاریکردووە بەڕاستی ئەمەش بەڵگەی ڕاستێتی پەیامەکەیەتی.

***



## ٢٢ دکتۆری جولەکە ( گولدمان ) بەهۆی یەکێك لە موعجیزەکانی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم ) موسوڵمان بوو:

کاتێك پزیشکێکی جولەکە بە ناوی ( گولدمان) سەرقاڵی ئەوەبوو رەخنە لە قورئان بگرێت، زۆر هەوڵی بۆدا نەیزانی لە چ لایەنێکەوە بۆ ئیسلام بچێت، دواتر فەرموودەیەکی پێغەمبەری ( صلی الله علیه وسلم ) بەرچاوکەوت کە باسی سوودەکانی خواردنی قەسپ دەکات، کە گوایە خواردنی حەوت دەنکە قەسپی مەدینە بەسە بۆ مرۆڤ لە ژەهراوی بوون. دکتۆرە جولەکەکە زۆر دڵخۆش بوو کە کەلێنێکی دۆزیەوە بۆ ئەوەی تانەو تەشەر لە ئیسلام بدات و وتی: ئەم فەرموودەیە وانیە و قەسپ هیچ کاریگەریەکی نیە بۆ دژە ژەهراوی بوون، دواتر هەر بۆ خۆی بڕیاری لێکۆڵینەوەیدا لەم بابەتەدا دوا ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی تەواو کردن بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت:

سوودەکانی قەسپ و خورما:

١- زۆرێك لەماددەی شەکری سوود بەخشی تێدایە کە بەرهەمهێنەری تواناییە بۆ مرۆڤ، بەتایبەت ماددەکانی (فرکتۆر) شەکری (جلوکون).

٢- زۆرێك لەو ڤیتامینانەی تێدایە کە مرۆڤ دەپارێزێ لە (بلاگدا)

٣- رێژەیەکی زۆری تێدایە لە ماددەی ( کالیسیۆم) کە هۆکارێکە بۆ دروست کردن و بەهێزکردنی ئێسکەکان.

٤- رێژەیەکی زۆری ئاسن و فسفۆری تێدایە

٥- ماددەی پرۆتینی سوود بەخشی بۆ مرۆڤ تێدایە.

٦- فسفۆر و ئاسن و کالسیۆمی تێدایە.

٧- دەوڵەمەندە بە هەریەك لە ڤیتامینەکانی: (B-D)

٨- بۆ پارێزکردن یاخود بەرۆژوبوون زۆرسوود بەخش و توانا بەخشە بە هۆی ئەوەی رێژەیەکی زۆری لەجۆری شەکری (فرکتۆز) ی تێدایە .

٩- بۆ خوریشك (حساسیە) زۆر سودبەخشە، بەهۆی بوونی ماددەی (زنك ) تیایدا.

١٠- بەهۆی بوونی ماددەی ئاسن تیایدا یارمەتیدەرە بۆ چارەسەری نەخۆشی دڵ و ئەنیما.

١١- دەکرێ بەکاربېرێت بۆ حاڵەتی ڕاوەستانی کلیەکانی مرۆڤ، چونکە ڕێژەیەکی زۆری ڤیتامینی (B١)،(B٢)،(B٣) ی تێدایە، ئەمە جیا لەوەی شەکری سەوزەواتیشی تێدایە.

١٢- ئێش و ئازارەکانی ترشەڵۆکی گەدەو سەرسوڕان چارەسەر دەکات، لەبەر بوونی کەمێك کە خوێی سروشتی و هەندێك لە ماددەی تری وەکو ( کارۆتین ).

١٣- ئاردی وشککراوەی قەسپ و دەنکە هاڕدراوەکانی چارەسەرن بۆ نەخۆشی ڕەبۆو هەناسە تەنگی.

ئەمانە ئەم ئەنجام و سوودانە بوون کە دکتۆرە جولەکەکە پێی گەیشت، ئەوجا گەیشتە ئەو ڕایەی کە ناتوانێت ڕەخنە لە باشترین دروستکراوی خوا بگرێت، تا ئێستا نزیکەی (١٢٠) لێکۆڵینەوە لەسەر قەسپ کراون هەموویان درکیان بەم سوودانە کردووە، دوای ئەوەی ئەم دکتۆرە جولەکەیە (گولدمان) هەوڵی ڕەخنە گرتنی لە فەموودەیەکی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) داو، لێکۆڵینەوەی خۆشی ئەم سوودانەی خواردنی ئەم میوەیەی بۆ دەرکەوت، ناچاربوو کەدان بەڕاستییەکان بنێ و موسوڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت.

دواتر پەرتوکێکی نووسی بەناوی ( ٧ دەنکە قەسپ بەسە بۆ مرۆڤ )، لەم پەرتووکەدا باسی ئەو کەسانە دەکات کە لە بواری دروست کردنی ( پاتری ) کاردەکەن دەڵێت: ئەم جۆرە کەسانە زۆر جار توشی ژەهراوی بوون دەبنەوە بەهۆی کێشەی ( کادمیام )، ماددیەکی گرنگە بۆ لەش و هۆکارە بۆ ڕاوەستانی کلیەکانی مرۆڤ بەهۆی ژەهراوی بوونەکەوە، دواتر دکتۆر (گولدمان ) دەڵێت: ئەگەر ئەم کەسانە ڕۆژانە ٧ دەنکە قەسپ بخۆن ئەوا لە مەترسی ژەهراوی بووونەکە پارێزراودەبن،

لێرەدا حیکمەتی ئەوکارەی پێغەمبەرمان ( صلى الله علیه وسلم ) بۆ بەدیاردەکەوێت کە ئایا بۆ کاتێك بەڕۆژو دەبوو ئێواران بە قەصپ و خورما ڕۆژوەکەی دەشکاند؟ پزیشکەکان ڕایان وایە کەوا کاتێك مرۆڤ بەڕۆژو دەبێت پشت دەبەستێت بەو شەکرەی کەلەناو جەرگیدا ئەمبار کراوە. ئەم شەکرەی لە پارشێوان مرۆڤ لە خواردنەکان وەریدەگرێت تەنها شەش کاتژمێر خۆی دەگرێت، دوای ئەوە سوود لە شەکرەکەی ناوجەرگی وەردەگرێت لێرەدا شەکری ناو جەرگی کەمدەکاتەوە، بۆیە ئەگەر ڕۆژوەوان ئێوارە ڕۆژوەکەی بە دەنکە قەسپێك بشکێنێت ئەوا ڕاستەوخۆ شیرنایەتی قەسپەکە بۆ جەرگ دەچێت و ئەم! شەکرەی کەمی کردبوو جێگای خۆی دەگرێتەوە ڕاستەوخۆ بۆ خانەکانی تری لەش دابەش دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر بە خواردنەکانی تر ڕۆژوەکەی بشکێنێت ئەوا دوو کاتژمێری تەواوی دەوێت تاکو ڕیخۆڵەکانی شەکرەکە هەڵدەمژن و جێگای خۆی بگرێتەوەو بەناو لەشدا دابەش ببێتەوە.

* پێغەمبەری خۆشەویست ( صلى الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: ( من وجد تمرا فليفطر عليه، ومن لا يجد فليفطر على الماء، فانه طهور ) رواه أبوداود (٢٣٥٥) الترمذي (٦٥٣) ابن ماجة (٦٩٩). واتە: کەسێك قەسپی هەبوو با ڕۆژوەکەی پێبشکێنێت ئەگەرنا با بەئاو بیشکێنێت، چونکە خاوێنەو خاوێنکەرەوەیە.

خوێنەری بەڕێز: تا ئێرە باسی ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو کە لە سەرقەسپ خورما! کرابوو، لێرە بابێین باسی ئەم فەرموودانە بکەین کە پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله علیه وسلم ) چواردە سەدە زیاتر بەرلە دکتۆر (گولدمان) ی تازە موسوڵمان و هاوپیشەکانیدا ئاماژە بەخواردنی حەوت دەنکە قەسپ و خورما دەکات.

* حدثنا مروان أخبرنا عامر بن سعد عن أبيه (رضي الله عنه ) قال النبي (صلى الله عليه وسلم ): ( من اصطبح كل يوم تمرات عجوة لم يضره سم ولا سحر ذلك اليوم الى الليل وقال غير سبع تمرات ) واتە: هەرکەسێك بەیانیان لەقەسپەکانی (عجوە) جۆرە قەسپێکی مەدینەیە بخوات، ژەهرو و جادووی ئەم شەوو ڕۆژە کاری تێناکات، کەسانی تر جگە

له سەعد دەڵێن: وتی ٧ دەنکە قەسپ بخوات، هەروەها دەفەرموێت: روی أبو نعيم و روی أبو داود ورواه الحاکم  و روی الإمام الترمذي، و روی في الإمام الذهبي لطب النبوي قال: ( من تصبح بسبع تمرات عجوة لايصيبه في هذا اليوم سم ولا سعر) صحيح البخاري، باب الطب، تحت عنوان: الدواء بالعجوة للسعر الحديث رقم ( ٥٣٢).

واتە: هەرکەسێك بەیانی بە حەوت دەنکە قەسپی (عجوه) بکاتەوە ئەوا ئەو ڕۆژە جادو و ژەهر کاری تێناکات.

* هەروەها دەفەرموێت: ( عن أبي هريرة قال: قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم) العجوة من الجنة وفيها شفاء من السم) واتە: قەسپی (عەجوە) لەبەهەشتەوەیە چارەسەرو شیفای ژەهری تێدایە. بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکی زانستیەو بەڵگەی ڕاستی پەیامی ئیسلامە، ئەوە لایەنی ژەهرەکە ڕوون بۆتەوە باشە ئەی بۆ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) باسی جادوو (سحر) دەکات؟ پەیوەندی جادوو خواردنی قەسپ لە چیدایە؟ هەندێك زانای بەریتانی کە لێکۆڵینەوەکانیان لە گۆڤاری (تليباسی) بڵاوکراوەتەوە ئامازەیان بەوەداوە کە خواردنی قەسپ هێلێکی ڕەنگی سەوز لە ناو لەشی مرۆڤ دروست دەکات کە ( ١٢ ) کاتژمێر دەخایەنێت، دواتر ئامازە بەوە دەکەن کەوا جادوو فێڵ کردنە لەچاو نەك گۆڕینی سروشت ئەمەش لەگەڵ ئەم ئایەتەی قورئان یەکدەگرێتەوە: ﴿ قَالَ أَلْقُواْ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ﴾ الاعراف:١١٦.

واتە: موسا وتی: دەئێوە دەست بەکاربن و دابیەزێنن جا کاتێك دایانبەزاند جادوویان لە چاوی خەڵکی کردو ویستیان بیانترسێنن و جادوویەکی زۆر گەورەیان پێش هێناو بەرپاکرد.

ئەوانە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کەوا چاو فێڵی لیّ دەکرێت توانای جادووکردن هەموو ڕەنگەکان دادەپۆشێت جگە لە ڕەنگی سەوز نەبێت، خواردنی قەسپ بەشێوەیەکی ڕۆژانە هێڵی سەوزی لەش بەهێز دەکات و جادوو کاری تێناکات.

بەڕاستی ئەوەش یەکێکە لە موعجیزە زانستیەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )

خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ النجم ٣-٤.

واتە: لەهەواو هەوەسەوە قسە ناکات کە قورئان دەخوێنێت هەرچی دەیڵێ قورئانەو سروشت دەکرێ بۆی. ! !



## ٢٣ دۆزینەوەی دەرمانێك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کە دکتۆرەکە ( براءة الاختراع ) ی لەسەر وەرگرت:

دکتۆر عبدالباسط محمد السيد کە مامۆستای ( الكيمياء الحيوية ) لە مەرکەزی قەومی بۆ لێکۆڵینەوە لە میسر، لە کۆنگرەی حەوتەمدا باسێکی تازەی زانستی پێشکەش کرد کە ( البراءة اختراع ) ی ئەمریکی و ئەورووپی لەسەر وەرگرت، باسەکە کە بریتی بوو لە دۆزینەوەی دەرمانێك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە چارەسەری نەخۆشی (التهاب الكبد الفايرس) دەکات. دکتۆر عبدالباسط لە باسەکەیدا وتی: پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت: (عليكم بالسنا والسنوت فان فيها شفاء من كل داء الا السام ) الترمذي (٢١٦٣). واتە: ئاگاتان لە لە ڕووەکی سەناو ڕووەکی سەنوت بێت کە چارەسەری نەخۆشیەکانن جگە لە مردن، شایانی باسە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) تەنها لەم فەرموودەیە و فەرموودەیەکی تردا باسی دوو ڕووەك دەکات بەیەکەوە، کاتێك دیراسەمان کرد بۆمان دەرکەوت کە ئەو دوو ڕووەکە ( سەناو سەنوت ) بەیەکەوە کاریگەری تەواویان دەبێت و یەکتری تەواودەکەن.

دکتۆر دەڵێت: سەرەتا هەریەکە لەو ڕووەکانەمان دا بە مشکی تاقیکردنەوە بۆ چوار هەفتەو هەموو پشکنینێکمان بۆ کردن، دەرکەوت کە هیچ زیانێکیان نیە، چونکە

ئەو ڕووەکانە لەلایەن مرۆڤیشەوە دەخورێن و بەکاردەهێنرێن، دەڵێ: پاشان بیست مەیمونی شەمپازیمان هێناو توشی نەخۆشی (التهاب الكبد الفايروسي) مان کردن و دەرمانێکمان دانێ، لە دوو ڕووەکەوە دروستمان کردبوو، پاش (٤٥) ڕۆژ شازدەیان چاك بوون و دووای دوو مانگی تریش دوانیان چاك بوون و لەبەرئەوەی دوانەکەی تریش لاساربوون و دەرمانەکەیان نەدەخوارد چاك بوونەوەیان دواکەوت. ئینجا لەسەر پەنجا مرۆڤی نەخۆش تاقیکرایەوە (٣٤) یان چاك بوونەوە لە ئەمریکا پشکنینیان بۆ کرا، دکتۆر عبدالباسط دەڵێ: دەرمانەکەمان سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بەدەستهێنا و بەمەش (براءة الاختراع ) یان پێدام، ئێستاش ڕێکەوتووم لەگەڵ کۆمپانیایەکی دەرمانی هۆڵەندی ئەمریکیدا کە ئەو دەرمانە بەرهەم بهێنن و بیخەنە بازاڕەوە و مەرجێکیشم لەسەر داناون کە دەبێ جێبەجێی بکەن، ئەویش ئەوەیە کە لەسەردەرمانەکە بنوسرێ: ( ئەم دەرمانە لە فەرموودەی محمد پێغەمبەرەوە (صلی الله عليه وسلم ) وەرگیراوە). الله أكبر لەو موعجیزە زانستیە گەورەیە، کەوەك ڕۆژی ڕووناك لەسەردەمی زانست و تەکنەلۆجیادا ئاشکرابووە، بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزەیە بەسە بۆ کەسانێك کە وێڵن بۆ دوای ڕاستیدا بۆ ئەوەی بگەن بە تەواوی دڵنیایی.

***



## ٢٤ توێژینەوەکەی (وارد پلۆنێت) و هاوکارەکانی موعجیزەیەکی زانستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) ئاشکرا دەکات:

پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم ) دەفەرموێت: ( لاتكرهوا مرضاكم على الطعام والشراب فان الله يطعمهم ويسقيهم ) رواه بان ماجه وصححه الباني.

واتە: زۆر لە نەخۆشەکانتان مەکەن بۆ خواردن و خواردنەوە خوای گەورە خواردن و خواردنەوەیان دەداتێ. ئەمەش بەو واتایە نایەت کە خواردن و خواردنەوە نەدەیت بە نەخۆش، بەڵکو دەبێت بە ئارەزووی خۆیان خواردن بخۆن و نابێت بەزۆر خواردنیان پێ بدرێت، ئینجا با بزانین بۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) پێمان دەڵێت زۆر لە نەخۆش مەکەن تا بخۆن .

لە ٢٦ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٦ زاییندا گرووپێك لێکۆڵەری زانستی بە سەرۆکایەتی ( وارد پلۆنێت) لە زانکۆی (بریتش کولۆمبیا لە کەنەدا)، دوای چەندین مانگ توێژینەوەو تاقیکردنەوە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیان بڵاوکردەوە، توێژینەوەکە بریتی بوو لە هێنانی چەندین جرج و بریندارکردنی درکە پەتکیان گۆڤاری (new scientist) پاشان جیاکردنەوەیان بۆ دوو کۆمەڵە، کۆمەڵی یەکەم تەنها رۆژنارۆژ خواردنیان دەدرایە، بەڵام کۆمەڵەی دووەم کەی بیان ویستایە دەیان خوارد، چونکە بەردەوام خواردنیان لەلا هەبوو، لەدوای دو مانگ چاودێری کردن توێژەرەوان بۆیان دەرکەوت، ئەو جرجانەی رۆژنارۆژێك خواردن وەردەگرن زووتر چاك دەبنەوە و باشتر دەتوانن کرداری سەرکەوتن بەسەر قادرمەدا ئەنجام بدەن بەبەراود بەوانەی رۆژانەو بەردەوام خواردن دەخۆن. هەروەها دوای پشکنینی برینی درکە پەتکی جرجەکان، ئەوە ئاشکرا بوو کە برینی ئەو جرجانەی رۆژنا رۆژ خواردن دەخۆن بە ٥٠٪ لەبرینی ئەوانەی کەی بیان ویستایە دەیان خوارد بچوکترە و، خانەکانیان کۆپی وەرگری ئەو ماددە کیمیاویانەیان زیاتر تێدایە کە یارمەتی گەشەی دەمارەکان دەدەن، هۆی زوو چاك بونەوەش بۆ کپکردنی سیستەمی بەرگری لەش دەگەڕێتەوە کەوا دەکات بەرگری خانەکان کەمتر بکەن، شوێنی برینداره چونکە ئەو بەرگریە خانە هەندێ جار شوێنی برینداریەکە بەشێوەیەك دادەپۆشێن کە دەبنە رێگر لەبەردەم دووبارە بوژانەوەی دەمارە زیانخواردوەکاندا، هەروەك ( وارد

پلۆنێت) سەرۆکی تیمەکە وتی: سنوردارکردنی وەرگرتنی گەرمۆکە وزە والەخانەکانی درکە پەتك دەکات کە هەستیارترین بەرامبەر ئەو پرۆتینانەی هانی گەشە دەدەن، دوای زانینی ئەنجامی توێژینەوەکە ( مێشێل فیهلینگ) نەشتەرگەری بواری ئێسك و دەمارەکان لە پەیمانگای توێژینەوەی (تۆرینتۆویستێر) لەکەنەدا وتی: ئەم توێژینەوەیە بەرەنگاری ئەو پرۆتۆکۆلە تەقلیدیانە دەبێتەوە کە بۆ کەسە ئێجگار نەخۆش و زامدارەکان دانراون، هەروەها (پلۆنێت) وتی: دۆزینەوەکە پێچەوانەی بۆچوونی باوی ئاشکرا کرد، چونکە کەسی نەخۆش بەشێوەیەکی گشتی بۆ زۆر خواردن هان دەدرێت تا خواردنەکە یارمەتی چاك بوونەوەیان بدات، لە کۆتاییدا ئەنجامی توێژینەوەکەی ( وارد پۆلێنت) و هاوکارەکانی ڕاستییەکی گەورەی ئاشکرا کرد، ئەویش ئیعجازێکی زانستی گەورەی فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: ( بەزۆر خواردن مەدەن بە نەخۆشەکانتان )، دیارە ئەمەش دوپات کردنەوەی نێردراوی محمدە (صلى الله عليه وسلم) لەلایەن پەروەردگاری بێ هاوتاوە ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ النجم ٣-٤.



## ٢٥ زەردەخەنەیەکی جوان کەشی نائارامی دووردەخاتەوە:

زانایان بۆیان دەرکەوت کە زەردەخەنە زانیاری زۆر لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت کە دەتوانێت کاربکاتە سەر هەستی نادیاری مرۆڤ، زەردەخەنە بەخششێکە کە دەتوانیت پێشکەش کەسانی تری بکەین، چونکە خۆشی دەخاتە دڵیانەوە، گەیاندنی زانیاری بە ئاسانی و زەردەخەنەیەکی جوانەوە کەشی نائارامی و شڵەژاوی دووردەخاتەوە، ئەمەیە کەپارە ناتوانێت بیکات، لێرەدا دەبینین زەردەخەنە لە پارە گرنگترە بۆیە بەکەمترین بەخشینێك کەبە کەسانی دیکەی دەکەیت زەردەخەنەیە، ئێستا زانیت بۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (تبسمك في وجه أخيك صدقة ) واتە: زەردەخەنەت بەڕووی براکەتدا خێرە.



## ٢٦ سوننەت و زانستی پزیشکی دەڵێن خواردن هەتا هەڵمی لێ هەڵسێت نابێ بخورێت:

خواردن بە گەرمی ئامادە دەکرێت، بەڵام ناکرێت چۆن لەسەر ئاگر دادەگیرێت ئاوا بخورێت، ئاشکرایە کە خواردن و خواردنەوەی گەرم دەبێتە هۆی دەم و پل سووتان. بەڵام هەر بەوەوە ناوەستێت بە تایبەت ئەگەر دوای خواردن خواردنەوەیەکی ساردی وەك سەهۆڵاو بخورێتەوە، کێشەی زۆر جدی تەندروستی لێ دەکەوێتەوە تا دەگات بە شێرپەنجە، بە تایبەت هی سورێنچك. خوێنەری بەڕێز ئەوەی باسکرا زانستی تازەی پزیشکی تازە ئەوەی بۆ دەرکەوتووە، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام پێش زیاتر لە چوار سەدە ئەو ڕاستییەی باسکردووە دەفەرموێت: (أبردوا الطعام الحار فإن الطعام الحار غير ذي بركة) واتە: خواردنی گەرم سارد بکەنەوە چونکە بەرەکەت لە خواردنی گەرمدا نییە.



## ٢٧ دیاردەی تیشکدانەوەی تەنی ڕەش:

کاتێك زاناکان لێکۆڵینەوەیان لە ئاگرو پەیوەندی ڕەنگەکەی بە پلەی گەرمیەوە کرد بۆیان دەرکەوت کە ئاگر سوورە بەڵام ئەگەر پلەی گەرمیەکەی بەرز بکەینەوە دەگۆڕێت بۆ ئاگری سپی ئەگەر زیاتر بەرزمان کردەوە دەبێت بە ڕەش، ئەم دیاردەیە زاناکان پێی دەڵێن دیاردەی تیشکدانەوەی تەنی ڕەش، سەرسوڕهێنەر ئەوەیە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئاماژەی بۆ ئەم دیاردەیە کردووەو واتە: دیاردەی گۆڕانی ڕەنگی ئاگر پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە بارەی ئاگری دۆزەخەوە دەفەرموێت: هەزارساڵ ئاگرەکەی داگیرساند هەتا سور بوو پاشان هەزار ساڵی تر داگیرساند هەتا سپی بوو پاشان هەزار ساڵی تر هەتا ڕەش بوو ئێستاش ڕەش و تاریکە. (رواه الترمذي )



## ٢٨ بەخشین کاریگەری گەورەی لەسەر دەروونی مرۆڤ هەیە:

لێکۆڵەرەکانی ئەمڕۆ ئەوە دوپات دەکەنەوە کە پێدانی شتێك لەپارە بە هەژاران کاریگەری دەروونی گەورەی لەسەر مرۆڤ هەیەو فێری لێبوردەیی دەکات و زیاتر دڵخۆشی دەکات، لێکۆڵینەوە پزیشکییەکان دووپاتی دەکەنەوە کە لێبوردیی و بەخشین تەمەنی مرۆڤ زیاد دەکەن؟؟!! سەیر نیە ئەگەر ببینین دواین لێکۆڵینەوە دەروونیەکان دەڵێن: بەخشین و لێبوردەیی توانستی دەزگای بەرگری و بەرهەڵستی لە نەخۆشییەکان زیاد دەکەن، ڕاستی فەرمووە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کە دەفەرموێت: (الصدقة برهان ).



## ٢٩ کوژاندنەوەی گڵۆپەکان لە شەودا لە ڕوانگەی فەرموودە و زانستی تازەدا:

لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی تازەدا دوپاتکراوەتەوە کە لە کاتی خەوتندا گڵۆپ بەداگیرساوی کاردەکاتە سەر زیندە چالاکیەکانی ناو مێشکی مرۆڤ و شڵەژان دروست دەکات و دەبێتە هۆی قەڵەوی، هەر لەبەرئەوە زاناکان ئامۆژگاری دەکەن بە کوژاندنەوەی گڵۆپەکان لە کاتی خەوتندا بۆ پارێزگاری کردن لە سەلامەتی لەش و مێشك. پاك و بێگەردی بۆ خوان ئەو ئامۆژگاریانەی زاناکان لەسەدەی بیست و یەکدا بەمە گەیشتون بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) چواردە سەدە لەمەو بەر ڕایگەیاندوە، پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە فەرموودەیەکی صەحیحدا دەفەرموێت: (إذا نمتم فاطفئوا سرجكم ) واتە: کاتێك دەخەون چراکانتان بکوژێننەوە، ئەم فەرموودەیە یەکێکە لە موعجیزە زانستییە گەورەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کە لە سەدەی زانست و تەکنەلۆجیادا وەك ڕۆژی ڕوناك ڕاست و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی ئەو ڕاستگۆیە دەسەلمێنێت.



## ٣٠ لێکۆڵینەوە پزیشکیەکان دەڵێن نوێژ چارەسەرە بۆ نەخۆشی:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کاتێك دڵی تەنگ بوایە لە شتێك خێرا نوێژی دەکردو دەیفەرموو ( إعلموا أن خير أعمالكم الصلاة) واتە: بزانن کە باشترینی کارەکانتان نوێژە. هەندێك پزیشك ئەوە دووپات دەکەنەوە کە نوێژ لە نەخۆشی دەتپارێزێت و چالاکی سووڕی خوێن نوێ دەکاتەوە و فشاری خوێن لە گشت جەستەدا رێك دەخاتەوە، هەروەها دەڵێت: ئەو کەسەی نوێژەکانی بەرێك و پێکی دەکات لە زۆر نەخۆشی بەدوور دەبێت وەك چەمانەوەی کۆڵەکەی پشت و باریك بوونی ئێسقان، نوێژ چالاکی و گورج و گۆڵی بۆ لەش دەگێڕێتەوەو کردە ناوەکیەکانی لەش رێك دەخات.



## ٣١ بڵاوبوونەوەی ئیسلام یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ):

ئامارەکان دەڵێن: ژمارەی موسوڵمانەکان گەیشتوەتە زیاتر لە یەك ملیارو نیو و لە هەموو وڵاتانی جیهاندا بڵاوبۆتەوە، هەروەها ئیسلام بە رێژەی ٢,٩٪ لە ساڵێکدا زیاد دەکات لە ساڵی ٢٠٢٥ دا ئاینی ئیسلام دەبێتە یەکەم ئاین لە جیهاندا!! ئەم راستیەیە کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) باسی کردووە کاتێك دەفەرموێت: ( سيبلغ هذا الأمر أي الإسلام ما بلغ الليل والنهار )، واتە: هەموو ناوچەیەك لەسەر ئەم زەویە کە شەو و رۆژی پێدەگات ئیسلامی پێدەگات، ئەمەیە بەراستی روویداوە بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

***



## نوێژی ئیستخارەو دەرکەوتنی موعجیزەیەکی زانستی ناوازە:

لێکۆڵەرەوان تازە دەریان خستوە ناوچەی بەپرسی مێشك لەبڕیاردان بریتیە لە پێشەسەر (الناصیە)، هەروەها دەریانخستوە ئەم ناوچەیە لە کاتی نوێژدا چالاك دەبێت، لەبەر ئەوە ئەگەر ویستت بڕیارێکی ڕاست و دروست بدەیت، پێویستە بە خشوعەوە نوێژ بکەیت پاشان بڕیارەکە بدەیت، ئەمە لە ڕووی زانستیەوە ئەوەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە پێغەمبەری پێشەوای مرۆڤایەتی لەمەشدا پێش زاناکان کەوتووە، بەوەی فەرمانی پێکردووین پێش بڕیاردانی کارێك نوێژی ئیستیخارە بکەین، ئایا کێ پێغەمبەری ئاگادار کردوە کە پێشە سەر لە کاتی نوێژو خشوعدا چالاك دەبێت، کە ئەوەش یارمەتی مرۆڤ دەدات بڕیاری سەرکەتووانە بدات؟ بێگومان خوای زاناو کاربەجێ پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) ئاگادارکردووە تاکو ببێتە موعجیزە و بەڵگەیەکی درەوشاوە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی، قورئانی پیرۆز نوێژ و خشوعی پەیوەست کردوە بەسەرکەوتنەوە وەك دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝﴾ المؤنون:١-٢.



## مانگە دەستکردەکان بە بەڵگەوە موعجیزەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) ئاشکرا دەکەن:

لە وێنەیەکدا کە بە مانگە دەستکردەکان لە ناوچەی بیابانی سعودیە گیراوە، تۆڕێکی گەورەی ڕووبار دەکەوتووە بە ڕەنگی ڕەش کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بووە بەدۆڵ و بەلمی بیاباندا ڕۆچووە. یەکێك لە دۆزینەوە گرنگەکانی ساڵی ٢٠١٢ ی زایینی دۆزینەوەی تۆڕێکی زۆر فراوانی ڕووبار و دەریاچە بوو لە ژێر لمی بیاباندا، پرۆفیسۆر ( Michael ptraglia) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەگەڵ تیمێك هەستان بەلێکۆڵینەوەیەك لە بیابانی نیمچە دوورگەی عەرەب، بینیان ئەم بیابانە وشك و برنگانە تۆڕێکی گەورەی ڕووبار لەژێرەکەیدا شاراوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کە ئەم شوێنە لە زوودا شوێنی ئاوەدانی و بێستان و دارستان بووە.

کورتەی لێکۆڵینەوەکە لە ٢٠١٢/٤/٢٦ دا بڵاوکرایەوە، لەمەوە زانایان دەریانخست کە چۆن لەڕابرووردا ئەم بیانە وشکانە رووبار و بێستان بوون لەداهاتوشدا هەربەو جۆرەیان لێدێتەوە، ئەمەش ئیعجازی گەورەترین پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم )ـی وەك ڕۆژی ڕووناك دەرخست کەدەفەرموێت: ( لا تقوم الساعة حتی تعود أرض العرب مروجا وأنهارا) رواه مسلم واتە: قیامەت هەڵناسێت هەتا زەوی عەرەب نەبێتەوە بەڕووبارو بێستان. وشەی (تعود) بەواتای ئەوەیە لە ڕابردوودا بەو جۆرە بووەو لە داهاتوشدا وای لێدێتەوە.

ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجە کێ ئەم دۆزینەوە زاستییەی ساڵی ٢٠١٢ ی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیاند؟ بەڕاستی تەنها ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیەی پێغەمبەرە( صلی الله علیه وسلم) شایانی ئەوەیە کە تێکڕایی مولحیدانی جیهان واز لە سەرکەشی بێنن و ڕێگای سەرفرازی و بەختەوەری بدۆزنەوە، ئەگینا چواردە سەدە لەمەوبەر پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) چۆن زانی باس لەو دیاردەیە بکات؟ بەڵێ خوای گەورە بە وەحی ئەوەی بەخۆشەویستەکەی ڕاگەیاندوە تا بەڵگە و بیانوو بەدەست بێباوەڕەکان نەهێڵێ.



## ٣٤ لەتبوونی مانگ بوە هۆی موسوڵمان بوونی پاشای هیند (جاكروانی فرمان )

مێژووی هیند ناوی پادشایەکی خۆی تۆمار کردووە بەناوی ( جاکروانی فرمان )، ئەم پادشایە ڕووداوی موعجیزەی لەتبوونی مانگ دەبینێت، یەکێك لە دەستنوسە مێژووییەکانی هیندیش بەم جۆرەی نوسیوە: پادشا ماجبار (مالایار) لە هیند (جاكروانی فرمان) لەتبوونی مانگی بینی، کە بەدەستی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم) ڕوویدا، کاتێك هەواڵ هات کە پێغەمبەرێك لە دوورگەی عەرەبی هاتووەو بەدەستی ئەو لەتبوونی مانگ ڕوویداوە، بۆیە بەپەرۆش بوو بۆ بینینی پێغەمبەر

(صلى الله عليه وسلم)، كوڕەکەی لەجێی خۆی داناو بەرەو دوورگەی عەرەب بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بەڕێکەوت. کاتێك پێغەمبەری بینی موسوڵمان بوو، لەسەر داوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ نیشتیمانی خۆی گەڕایەوە، لە(مینای ڤفار) وەفاتی کرد.

ئەم زانیاریانە لە دەست نوسێکی هیندی لە مەکتەبەی دائیرەی هیند لەلەندەن هەیە، ژمارەی (٢٨٠٧) ١٥٢–١٧٣ ی پێدراوە، حەمیدوڵا لە کتێبی موحەممەد رسول الله دەریهێناوە، لە کتێبەکانی فەرموودەش باسی ئەم پادشایە کراوە، لە موستەدرەکی حاکمدا هاتووە لە ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پاشان پاشای هیند دیاری زەنجەفیلی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) ناردو پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پارچە پارچە دەیدا بە هاوەڵان و پارچەیەکیش بەرمن کەوت.. مستدرك الحاكم ، كتاب الأطعمة ٤/١٥٠.

ئاشکرایە کە ئەم پادشایە بەگەیشتنی بە پێغەمبەرو باوەڕپێهێنانی مردنی لەسەر ئیمان بوو بە صەحابە.

***

## ٣٥ زەیتی زەیتون لە فەرموودەو زانستی نوێدا:

فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسسلم ) فەرمانمان پێدەکات بە خواردنی زەیتی زەیتوون و چەورکردنی جەستەمان بە ڕۆنی زەیتون، هەروەکو دەفەرموێت: (كلوا الزيت وادهنوا به فانه من شجرة مباركة ) رواه أحمد والترميذي و صححه الألباني.
واتە: لە ڕۆنی زەیتی زەیتون بخۆن و سەر و لەشتانی پێچەور بکەن، چونکە لە درەختێکی پیرۆزە.

مەبەست لە وشەی پیرۆز بریتی یە لە زۆری سوودو کەڵك، واتە: درەختی زەیتون سودو کەڵکی زۆری هەیە، دەرهێنانی ڕۆن لە درەختی زەیتون یەکێکە لە سوودەکانی ئەو درەختە جا با بزانین زانستی تازە لەو بارەوە چی دەڵێت:

زەیتی زەیتون بەباشترین ماددەی چەوری دادەنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی دڵ و ڕەق بوونی خوێبەرەکان، هەروەها کاریگەریەکی زۆرباشی هەیە بۆ پاراستنی لە ترشەڵۆك و برینی گەدە، هەروەها کاریگەری ئەرێنی هەیە لە نەخۆشی شەکرەدا، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی دەناڵێنن بەدەست قەڵەوی لەڕادە بەدەر، هەروەها زەیتی زەیتوون یارمەتی جەستە دەدات بۆ بەرگە گرتنی پەستانی دەروونی و ماندوبوون، زەیتی زەیتوون بەرگری جەستە لەدژی نەخۆشیەکان زیاد دەکات خوێنبەرەکان و هاتوچۆی خوێن، هەروەها بۆ هێوربوونەوەو چارەسەری قەبزی و ڕەوانکردنی میزوو لەناوبردنی بەردی زراو، بۆ نەخۆشی شەکرەش بەسوودە بە تێکەڵاوی شەربەتی لیمۆ زەیتی زەیتون و کۆلیسترۆڵ.

زەیتی زەیتوون لە ڤیتامین (ئی) پێك هاتووە کە ناسراوە بە دژە ئۆکسید سوودی تەندرووستی زەیتی زەیتوون لە دەوڵمەندی پێکهاتەکە لە دژی ئۆکسید بوون، هەروەها بۆ ترشەڵۆکی کە تەنها چەوری نین لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان ئەوەی دەرخستوەکە زەیتی زەیتوون ئاستی کۆڵسترۆڵی گورچیلەو کۆڵیسترۆڵی زیان بەخش کەم دەکاتەوە بەبێئەوەی هیچ کاریگەری لەسەر کۆڵیسترۆڵی سوود بەخش

بکات. سەرەڕای ئەوەی توانای هەیە جەستە لە ڕەقبوونی خوێبەرەکان بپارێزێت. لە زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتوە کەگونجاندێکی پێچەوانە هەیە لە نێوان خواردنی زەیتی زەیتوون و ڕوودانی زۆرێك لە وەرەمەکانی شێرپەنجەییەکان، ئەوەی بەدیکراوە لە لێکۆڵینەوەکاندا ئەوەیە کە پەیوەندیەکی پتەو هەیە لە نێوان خواردنی زەیتی زەیتون و دابەزاندنی ڕێژەی توشبون بە شێرپەنجەی مەمك و گەدەوە.

خواردنی زەیتی زەیتون مرۆڤ لە ژمارەیەکی زۆر لە نەخۆشی شێرپەنجە دەپارێزێت، وەکو شێرپەنجەی کۆڵۆن و منداڵدان و شێرپەنجەی هێلکەدان، سەرژمێری و لێکۆڵینەوەکان ئاماژەیان بەوە کردوە کە بەکارهێنانی زەیتی زەیتون لە خواردندا دەبێتە هۆی کەمبونەوەی ئەگەری توشبون بە شێرپەنجە بە ڕێژەی ٣٥٪، وڵاتی ئیسپانیا کەمترین ڕێژەی توشبونی نەخۆشی شێرپەنجەی مەمکی ئافرەتان تۆمارکراوە بەهۆی بەکارهێنانی زەیتی زەیتونەوە.

لێکۆڵینەوەکان لە نەخۆشیە درمەکان ئەوەیان دەرخستوە کە گونجاندنێکی پێچەوانە هەیە لە نێوان خواردنی زەیتی زەیتون و توشبوونی زۆرێك لە نەخۆشیە شێرپەنجەییەکان، زۆرینەی ئەو لێکۆڵینەوانە جەخت دەکەنەوە لەسەر پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان زەیتی زەیتون و کەمبونەوەی ڕێژەی توشبون بە نەخۆشی شێرپەنجەی مەمك و گەدە چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیکە سەلماندوویانە کە خواردنی زەیتی زەیتون و میوەو سەوزە مرۆڤ لە چەند جۆری شێرپەنجەی وەکو کۆڵۆن و شێرپەنجەی منداڵدان و هێلکەدان دەپارێزێت.

ڕووی ئیعجازی زانستی لە زەیتوندا: لەم ساڵانەی دواییدا توێژینەوەیە پزیشکی و کیمیاییە زیندەییەکان سەلماندوویانە و چەندین سوودیان لە زەیتی زەیتوندا ئاشکرا کردووە، لە کۆندا پزیشکەکان لەو بڕوایەدا بوون کە زەیتی زەیتون جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ زەیتەکانی دیکەدا، لە ڕووی زیان و سوودەوە سوودەکانی زەیتی زەیتون تەواوی لایەنە خۆراکی و چارەسەریەکانی لەخۆگرتوە ئێمە تێبینی دەکەین هەموو ڕۆژێك دۆزینەوەی زیاتری سوودەکان و پاراستن و چارەسەری زەیتی زەیتون دەردەکەوێت ئەوەش لەگەڵ ئەو هەواڵەدا کە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پێی داوین یەکدەگرێتەوە.



## لێکۆڵینەوەیەکی ئەڵمانی دەریخست باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر خەم دەڕەوێنێتەوە:

لە ئایینی ئیسلامدا باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە ئەرکەکانی ئیمان چونکە ئەرکەکانی ئیمان بریتین لە: باوەڕبوون بە خواو بە فریشتەکانی خواو بەو کتێبانەی کە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردووە و بە ڕۆژی دوایی و بە قەزاو قەدەر بە قەزاو قەدەر بە چاك و خراپیەوە.

ئەوەتە کاتێك لەبارەی باوەڕەوە پرسیار لە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کرا بەمشێوەیە وەڵامی داوەتەوە: ( أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه و اليوم الأخر وتؤمن بالقدر خيره وشره ) رواه البخاري ومسلم. واتە ئیمان ئەوەیە کە باوەڕت بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی هەبێت، هەروەها باوەڕیشت بە قەزاو قەدەر هەبێت بەچاك خراپیەوە، قەزاو قەدەر بە خێرو شەڕیەوە سودێکی زۆر بە مرۆڤەکان دەگەیەنێت. بەڵام ئەمە کاتێك کە بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی بین ئەگەرنا هیچمان بە هیچ نەکردووە.

بەم دواییەش لێکۆڵینەوەیەکی ئەڵمانی ئەوەی سەلماندوە کە باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر خەمەکانی مرۆڤ ناهێڵێت و دەیانڕەوێنێتەوە. ئەم لێکۆڵینەوە ئەڵمانیە لەسەر ( ٤٠٠ ) کەس ئەنجامدرابوو کە هاوسەری ژیانیان لەدەست دابوو، ئەم (٤٠٠) کەسە خرانە ژێر چاودێریەوە و بۆ ماوەیەکی زۆر چاودێری کران دواتر دەرکەوت کە ئەوانەی باوەڕیان بەوە هەبوو کە هۆی لەدەست دانی هاوسەرەکانیان قەدەری خوا بووە زۆر کەم خەمباریان پێوە دیار بووە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوانەی کە باوەڕیان بە بە قەدەری خوا نەبووە ئەوە زۆر خەمبارو دڵتەنگ بوون، بەڕاستی موجیزەیەکی گەورەیە، خوێنەری بەڕێز هەرچی کە خواو پێغەمبەری خوا پێی فەرمووین هەمووی مایەی خێروخۆشی و بەختەوەری مرۆڤە لە دونیاو دوارۆژدا.



## پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) لە چەندین فەموودەی پیرۆزیدا دەفەرمویێت: پرۆسەی هاوسەرگیری پێك بهێنرێت:

ئەمەش لەبەر ئەوەی هەم سوودی دونیاو هەمیش سوودی ئاخیرەتی تێدایە، ئەوەتە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم دەفەرمویێت: ( يامعشر الشباب من استطاع منكم الباءة فليتزوج فانه أغض للبصر و أحصن للفرج ومن لم يستطع فعليه بالصوم فانه له وجاء)، واتە: ئەی گەنجان هەرکەس لە ئێوە توانای هەیە باژن بێنێت چونکە ژن هێنان باشترین هۆکارە بۆ چاوپارێزی و داوێن پارێزی، هەرکەسێکیش ناتوانێت ئەوا بەرۆژو بێت چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان و دەیپارێزێت.

هەر لەبارەی هاوسەرگیریەوە لە صەحیحی مسلم دا هاتووە کە عثمان بن مظعون ویستی واز لە ژنهێنان بهێنێت، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) رێگەی پێنەدا، جا بێگومان پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) شتێك فێری مرۆڤەکان ناکات ئەگەر سوودی دونیاو قیامەتی تێدا نەبێت، تا ئێستاش چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامدراوە و چەندین سوودی پرۆسەی هاوسەرگیری ئاشکرا کراوە. لە لێکۆڵینەوەیەکی تازەشدا کەلە وڵاتی فەرەنسا لەبارەی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری ئەنجامدراوە ئەو راستییە دەرکەوتووە کە پێکهێنانی پرۆسەی هاوسەرگیری لە نێوان رەگەزی نێرومێ سودێکی پزیشکی گەورەی هەیە، چونکە ئەوانەی کە ئەو پرۆسەیە پێکدەهێنن تەندروستیان باش دەبێت و لە نەخۆشیەکانی دڵ بەدووردەبن، هەروەها ژیانی هاوسەرگیری کاریگەریەکی زۆر ئەرێنی و باشی هەیە بۆ سەر پارێزراوی کۆئەندامی هەناسەدان، لەبەر هەموو ئەمانە لێکۆڵینەوە فەرەنسیەکە داوا لە مرۆڤەکان دەکات لە پێناو تەندروستیەکی باشدا پرۆسەی هاوسەرگیری پێك بهێنن.



## ٣٨ لێکۆڵینەوەیەکی بەریتانی ڕاستی فەرموودەیەکی دەرخست:

لێکۆڵینەوەیەکی بەریتانی دەڵێت: تەوقەکردنی بەهێز تەمەنی مرۆڤ درێژ دەکات بێگومان گوناح و تاوان کاریگەری خراپیان لەسەر جەستەی مرۆڤەوە هەیە، جا ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی هەڵوەرینی گوناح و تاوان تەوقەکردنە. ئەوەتە پێغەمبەری خۆشەویستمان ( صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ( ان المؤمن اذا لقي المؤمن فسلم عليه و أخذ بيده فصافحه تناثرت خطاياهما يتناثر ورق الشجر ) رواه الطبراني.

واتە: کاتێك باوەڕدارێك گەیشتە باوەڕدارێك و سڵاوی لێکرد دەستی گرت و تەوقەی لەگەڵدا کرد ئەوا گوناحەکانی ئەم باوەڕدارانە هەڵدەوەرن هەروەك چۆن گەڵای درەخت هەڵدەوەرێت . لەڕووی جەستەییشەوە سودێکی زۆری هەیە وەك خۆنوێکرنەوەیەك وایە، لێکۆڵینەوەیەکی بەریتانیش ئەوەی دەرخستووە کە ئەو کەسانەی بە توندی و بەهێزەوە تەوقە لەگەڵ یەکتر دەکەن ئەوا تەمەنیان لەوانە درێژترە کە تەوقە ناکەن، هەروەها لێکۆڵەرە بەریتانیەکان لە لێکۆڵینەوەکەیاندا چەندین ڕێنمایی و ئامۆژگارییان بۆ ئەوانە خستوەتەڕوو کە حەز دەکەن تەمەنیان درێژ بێت، یەکێکیش لەوانە تەوقەکردنی بەهێزە لەگەڵ خزمان و هاوڕێیان و خەڵکانی دیکەدا.



## ٣٩ پاك كردنەوەی زمان و دەركەوتنی موعجیزەیەكی گەورە:

فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیعجازێکی زانستی تێدایە دەربارەی پزیشکی ددان، ئەو پەیامبەرە ئازیزە ڕێگەیەکمان فێردەکات کەبەهۆیەوە ددانەکانمان لەکلۆربوون و داخوران دەپارێزێت، هاوڕێ لەگەڵ پاراستنی بەشەکانی دیکەی ناودەم وەك زمان و لەو هەوکردنانەی توشی دەبن لەمیانەی کەڵەکەبوونی بەکتریای زۆر لەناودەمدا. لەئەبی بوردەوە دەگێڕنەوە لەباوکیەوە وتی: هاتم بۆ لای



پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینیم سیواك بەدەستیەوەیەو خەریکی سیواك کردنەو دەیوت: ئح ئح سیواکەکە لەدەمی پیرۆزی بوو وەك هێڵنج بدات. بۆخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە.

* هەروەها لە ئەبی بوردەوە لە ئەبی موساوە دەڵێت چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینیم لای سیواکەکە بەسەر زمانیەوەیەتی. ئەم فەرموودەیەش ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە.

* لەکتێبی (فتح الباری) شەرحی صەحیحی بوخاری ئیبن حەجەری عەسقەلانی هەروەها لەموسلیمیشدا هاتووە، کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سیواکی بەزمانیدا دەهێنا کە مەبەست پێی بەشی ناوەوەی زمانە، بەپێی ڕای ئیمامی ئەحمەد سوننەتە سیواك بۆ ناوەوەی زمان، بۆیە ئەودەنگە دروست دەبێت وەك دەنگی هێڵنجدان. لەو فەرموودەیەوە تێدەگەین کەسیواك بۆ زمانیش لەباری درێژی سوونەتە بەڵام بۆ ددان لەباری پانی. (فتح الباری) بەرگی یەکەم لاپەڕە:(٣٥٦).

بۆیە لێرەوە دەگەینە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سیواکەکەی لەسەر بەشی ناوەوەی زمانی چونکە لەوبارەدا ئەو حاڵەتە دەنگە (ئح ئح) درووست دەبێت لەڕووی زانستیەوە: دەتوانرێت بەچاو سەر ڕووی زمان ببینرێت کەپڕە لەدرزو چاڵ و چۆڵی بەوە سەر ڕووی زمان دەبێتە شوێنێك بۆکۆبوونەوەی پاشماوەی خۆراك تێیداو بۆگەنکردن و دەرچوونی بۆنێکی ناخۆش لەدەمەوە، بەپێی زانستی تازەش زمان بەتایبەتی بەشی پشتەوەی شوێنێکی زۆر لەبارە بۆکۆبوونەوەی هەمووجۆرە بەکتریایەکی زیانبەخش، بەڵام لەڕووی سەرەوەی بەشی پێشەوەی زمان کەمتر ئەوە ڕوودەدات، چونکە ئەو بەشەی زمان بەردەوام بەر ددان و مەڵاشو دەکەوێت و پاك دەبێتەوە، هەروەها دەمیلەکانی چێژکردن لەو ناوچەیەدان و بوونەتە هۆی درزەکان کەمتر قوڵبن و پاشماوەی خۆراك نەگرنەخۆیان. بوونی ئەو بەکتریا زیانبەخشانەش لەسەر زمان دەبێتە هۆی هەوکردنی زمان و ناودەم و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بەهەموو

لەشدا، پزیشکی تازە چی دەڵێت: لەماڵپەڕی (WWW.animated-teeth.com) کەیەکێکە لەماڵپەڕە زانستییە پسپۆڕەکان لەبواری نەخۆشیەکانی دەم و ددان لەبارەی چۆنیەتی پاك کردنەوەی زمان، دەڵێت: باشترین ڕێگەی پاککردنەوەو پاراستنی دەم و ددانە. دەڵێت: چەندین ڕێگە هەیە کەدەتوانرێت ناوچەی کۆتایی زمان پاك بکرێتەوە بەڵام هەموویان یەك ئامانجیان هەیە: کەبریتی یە لە داماڵین و لابردنی بەکتریاو پیسی لەسەر ڕووی زمان، کێشە لەوەدا نیە چ ڕێگەیەك دەگرێتەبەر بەڵام پێویستە لەسەرت کەناوچەی پشتەوەی ئەو سەری زمان پاك بکەیتەوە لات شتێکی سەیر نەبێت ئەگەر هەستت بەهێڵنجدان کرد، چونکە ئەوهەستە لەئەنجامی کاردانەوەیەکی سرووشتیەو پاش ماوەیەك نامێنێت، ئەوەی کەجێگەی سەرنج و تێڕامانەو موعجیزەیەکی زانستی ناوازەی گەورەیە دەردەکەوێت، فەرموودەکە پێش هەموو زانایان جەختی لەپاککردنەوەی دەم و زمان زۆر بەباشی کردووە بەجۆرێك هەست بەهێڵنجدان بکەیت، ئەم ڕێگەیەش زۆر پێویستە بۆ لابردنی هەر کاریگەریەکی بەکتریای زیانبەخش لەناودەمدا کەدەبنە هۆی چەندین جۆری هەوکردنی پووك و دەم.

بێگومان زانستی نوێ کاریگەری سیواکی لەپاراستنی ددان لەکلۆربوون و کلس گرتن دەرخستووە بۆیە چەندین فەرموودە دوپاتی دەکەنەوە کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەردەوام پارێزگاری لەسیواك کردووە. لێرەدا دەپرسین کێ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فێرکرد کە زمانی بەوشێوە پێشکەوتووە پاك بکاتەوە کەلەشێوازە زانستییەکان دەچێت؟ بێگومان ئەو خوایە فێری کردووە کە زانایە بەهەموو نهێنی و ئاشکرایە.

***



## زانستی تازە ئەوەی ئاشکرا کرد پێڵاو لەگەڵ خاوەنەکەی دا قسە دەکات:

دواین داهێنانی ساڵی (٢٠١٤)ی زاینی لەژێر ئەم ناونیشانەدا هاتووە: پێڵاوێکی زیرەك درووست کراوەو بە مانگە دەستکردەکانەوە بەستراوە ئەم پێڵاوە ئەو رێگا درووستەت نیشان دەدات کەدەبێت بیگریتەبەر، با پێکەوە لەو موعجیزە ناوازە و پێغەمبەرانەیە ووردبینەوە یەکێك لە داهێنانە سەرسوڕهێنەر و تازانە پێڵاوی زیرەکە کەلە ریزبەندیدا بە دووهەم داهێنان دادەنرێت لەدوای تەلەفۆنی زیرەکەوە، بەڵام ئاخۆ ئەرکی ئەم پێڵاوە چی بێت و لەبەرچی ئەم ناوەی پێ بەخشرابێت؟

ئەم پێڵاوە بۆ ئەو مەبەستە درووستکراوە کەهەواڵ بەخاوەنەکەی بدات لەبارەی ئاراستەکانەوە، بەتایبەتی لەکاتی گەشتکردندا بەجۆرێك لەرەلەری دیاری کراوی لێوە پەیدا دەبێت و لەرێگەی (جی پی ئیس)ەوە ئەو ئاراستەیە دەست نیشان دەکات کەدەبێت خاوەنەکەی بیگرێتەبەر ئەم پێڵاوانە پەیوەندی دەکەن بەمانگە دەستکردەکانەوەو تەکنیکی ئاراستەکردن لەمەودای دوورەوە بەکاردێنن، بەمۆبایل پێڵاوە زیرەکەکە زۆر شت بەخاوەنەکەی ڕادەگەیەنێت نموونەش بۆ ئەوە ئاراستە درووستەکانە هاوکات کۆمپانیاکان لەهەوڵی ئەوەدان کەزیاتر پەرەی پێ بدەن بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر بەخاوەنەکەی بدات هۆکارەکەشی بۆئەو تایبەتمەندیە دەگەڕێتەوە کەلەم پێڵاوەدا هەیە، کەدەتوانێت لەرێگەی بلوتوسەوە پەیوەندی بە مۆبایلەوەبکات و مرۆڤیش دەتوانێت هەر لەهەمان رێگەوە پەیوەندی پێوە بکاتەوە.

لەم دواییەدا کۆمپانیاکان هەڵساون بەپەرەپێدانی ژمارەیەکی زۆر لەپێڵاوە زیرەکەکان کەشتی ئەوتۆ ڕادەگەیەنن کەبەلای خاوەنەکانیانەوە گرنگن، بۆنموونە بۆ ئەو نەخۆشانەی کەتووشی لەدەستدانی یادەوەری بوون واتە: (ئەلزەهایمەر) ئاراستە درووستەکانیان نیشان دەدەن، بەوەش بەئاسانی رێگەکەیان بۆ دەدۆزرێتەوە ئەوانەش کەبینابیان لەدەستداوە دەتوانن سوودلەم پێڵاوە وەربگرن، بۆدۆزینەوەی

ڕێگاکەیان بەبێ هەڵەکردن ئەم بابەتە لەناوەڕاستی ساڵی(٢٠١٤) دا لە ئەنتەرنێت بڵاوکراوەتەوە بەناونیشانی: هێندە نابات پێڵاوە زیرەکەکە پێتدەڵێت بۆ کوێ بڕۆیت (Smart shoes will soon tell you where to go).

لێرەدا وەك ئەوەی پێڵاوەکە گفتوگۆبکات و هەواڵی گرنگ بدات بەخاوەنەکەی بەڵام ئەم قسەکردنە قسەکردنێکی ئاسایی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو بەشێوازێکی ئەلیکترۆنی قسەکردنەکە جێ بەجێ دەکات. ئاشکرایە ئەم داهێنانە بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئاسایی و باوو دیارە بەتایبەتی لەدوای ئەو پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەی کەلەبواری پەیوەندییەکان و تەکنەلۆجیای ژمارەییدا هاتەکایەوە، بەڵام ئایا چواردەسەدە لەمەوپێش هەرگیز بەخەیاڵی کەسدا دەهات کەداهێنانێکی لەم جۆرە بێتەکایەوە؟ بائێستا بچینە خزمەت فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە چی دەفەرموێت:؟ (والذي نفسي بيده لاتقوم الساعة حتى يكلم الرجل نعله) رواه ابن حبان. واتە: سوێند بەئەوەی گیانی منی بەدەستە قیامەت هەڵناسێت تا پیاو لەگەڵ پێڵاوەکانی خۆی قسە نەکات.

الله أكبر لەو موعجیزە زانستیە گەورەیە، ئەی مولحیدانی دنیا لەدوای دەرکەوتنی ئەم ڕاستییە گەورەیە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ سوێندبەخوا ئەو کەسانەی کەئاشنانین و دوورن لەپەیامەکەی ئەم پێغەمبەرە ئەگەرخۆیان نەخەڵەتێنن و ڕانەکەن لەبەڵگە زانستییەکان ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیەی پێغەمبەریان بەسە بۆئەوەی گومان و دوودڵی ناودڵەکانیان ڕابماڵێت و بیانگەیەنێتە کەناری دڵنیایی و هاتنە ناوبازنەی ئاینە ڕاست وپڕلەزانست و زانیاریەکەی ئیسلام.

***



## ٤١ شیری وشتر و چارەسەری نەخۆشی شەکرە:

وشتر دادەنرێت بەیەکێك لەوبوونەوەرانەی کە زانایانی تووشی سەرسوڕمان کردووە وشتر دەتوانێت لەگەڵ نارەحەتترین بارووددۆخدا خۆی بگونجێنێت، دەتوانێت بەرگەی پلەی گەرمی تا (٧٠) پلەی سەددی لەسەرووی سفرەوە بگرێت، وشتر دوو پێڵ (سنام) ی هەیە توانای بەرگەگرتنی سەرمای تا (٤٠)پلەی خوار سفرەوە هەیە، هەروەها وشتر دەتوانێت ئاوی سازگار و سوێریش بخواتەوە، توانای بەرگەگرتنی تینوێتی بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك هەیە، وشتر دەتوانێت لەبیاباندا بڕوات لەهەموو بارێکی تەپوتۆز و گەردەلوول و پلەی گەرمادا، لەلێکۆڵینەوەیەکی نوێی زانایاندا دەرکەوت کە شیری وشتر تەندرووستە بۆ خۆپاراستن و چارەسەری نەخۆشی شەکرە.

دکتۆر (marccel smits) دەڵێت: بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوەمان دۆزیوەتەوە کەخواردنەوەی شیری وشتر بە ڕێك و پێکی وا لە تووشبوان بەنەخۆشی شەکرە دەکات کەهەست بە باشبوون بکەن، بۆیە پزیشکانی ئەمڕۆ ڕێنمایی خواردنەوەی شیری وشتر دەکەن، چونکە شیرێکی تەندرووست و بەلەزەتە، شایەنی باسە پێشتریش گۆڤارە زانستییەکان لە ئەمەریکا ئەوەی خستە ڕوو کەجۆرێك لە دژە زیندەی دانسقە لەشیری وشتردا هەیە و ئەوەیان سەلماند کەشیری وشتر چارەسەری زۆربەی نەخۆشیە گرانەکانی تێدایە، هەر ئەمەشە وەك موعجیزەیەك پێغەمبەری خوا (صلی ألله علیه وسلم ) جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کاتێك ئاماژە بەشیری وشتر دەکات لەچارەسەرکردن و شیفادا.

***



## زانستی نویٚ موعجیزەیەکی پێغەمبەری ( صلى الله عليه وسلم)

### دەرخست سەبارەت بەنەخەوتن دوای نانخواردن:

خەوتن دوای خواردن دەبێتەهۆی درووست بوونی چەندین کێشەی تەندرووستی وەك قەڵەوی چونکە لەش ئەو وزەیە وەردەگرێت بەکاری ناهێنێت و لەلەشیدا دەمێنێتەوە، خەوتن دوای خواردن هەندێك جار دەبێتە هۆی دڵتێکچوون و سەرئێشە و تەمبەڵی و بێتاقەتی خواردنە کاربۆهیدراتیەکان پێویستیان بە (١بۆ٣) کاتژمێرە و خواردنی پرۆتینەکان پێویستیان بە (٣بۆ٥) کاتژمێرە بۆ هەرس کردنیان و خواردنی چەورییەکان پێویستی بە (٥بۆ٧) کاتژمێرە، بە پێچەوانەوە گەدە هیلاك دەبێت و تووشی بەدهەرسی و قەبزی دەکات پێغەمبەرمان (صلى ألله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (أذيبوطعامكم بذكرالله لا تنامو عنه فتقسط قلوبكم) رواه الطبراني والبيهقي. واتە: ئەو خواردنانەی دەیخۆن بیتوێننەوە بەیادی خوا و ئەنجامدانی نوێژ. نەکەن کە دوای خواردن بخەون چونکە دڵتان ڕەق دەبێت ئەم فەرموودە زۆر گرنگە تازە دۆزراوەتەوە کەپێویستە مرۆڤ لەسەدا پەنجای خواردنەکەی ڕۆژی بخوات لەژەمی بەیانیاندا، چونکە لەکاتی ئەو خواردنە بەدواوە مرۆڤ کاردەکات و ماندوودەبێت بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ کە ماوەکەی نزیکەی هەشت کاتژمێرە ئەو خواردنە لەلەشدا دەبێت بە ووزە و سەرف دەبێت.

پێویستە لەسەدا٢٥ی خواردنەکەی لەژەمی نیوەڕۆیاندا بخوات، لەسەدا پانزەی خواردنەکەی لە ژەمی ئێواراندا بخوات کاتێك کەدەفەرمووێت: (ولا تنامواعليه فتقسط قلوبكم) مەخەون دوای نانخواردن ڕاستەوخۆ. ئەم حاڵەتەش زانستی تازە دەیسەلمێنێت کە خەوتن دوای نانخواردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو چەوری و شیرینیەی کە دەخورێت لەکاتی نانخواردندا بنیشێت لەسەر خوێنبەرەکانی دڵ و، دەبێتە هۆی ڕەقبوونی خوێنبەرەکان، چونکە کاتێك کەدەخەویت جوڵەناکەیت بەمەش ئەو خواردنە کەڵەکەدەبێت لەلەشداو کۆدەبێتەوە کەئەمەش دەبێتە هۆی نەخۆشیەکانی دڵ و جەڵتەی دڵ، بەڵام کاتێك کەدوای نانخواردن کاری کرد ئەو خواردنە دەسوتێت لەئەنجامی ئەو جموجوڵەی کە دەکرێت.

زاناكان دەڵێن سنكەكوژێ دوای خواردنی ژەمێكی قورسی خواردن دێت كەبەدوایدا كەسەكە بۆ ماوەیەكی زۆر بخەوێت ئەوەی كەدەفەرمووێت: (أذيبو طعامكم بذكرالله والصلاة)، خواردنەكە بتوێننەوە بەیادی خواو نوێژ واتە: كاتێك مرۆڤ خواردن بخوات و یادی خوا بكات ئەوە ئاسانترە بۆكاری هەرس، چونكە دەروونی پەیوەندی هەیە بەكاری هەرسەوە باری دەروونی توند كاردەكاتە سەر درووست بوونی ڕووشان (قورحە)ی گەدە.



## ٤٣ لێكۆڵینەوەیەكی تازە لەخزمەت فەرموودەی پێغەمبەر (صلى ألله عليه وسلم) دایە:

هەموو ئەو شتانەی كە پێغەمبەر (صلى ألله عليه وسلم) باسی كردوون زانست پشتڕاستیان دەكاتەوە، ئەمڕۆ زانایان فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى ألله عليه وسلم) بۆ بەشكردنی خواردن دووبارە دەكەنەوە، پێغەمبەر (صلى ألله عليه وسلم) فەرمانی كردووە بە پێدانی خواردن بە دراوسێ و هەژار و كەمدەرامەتان دەفەرمووێت: (طعام الاثنين كافي الثلاثة وطعام ثلاثة كافي الرابعة) رواه البخاري، واتە: خواردنی دووان بەشی سیان دەكات خواردنی سیانیش بەشی چوار دەكات.

لێكۆڵینەوەیەكی بەریتانی نوێ كە ڕێكخراوێكی ناحكومی بەناوی بەرنامەی كار بۆ سەرچاوە پاشەڕۆییەكان دەڵێت: سێ یەكی ئەو خواردنەی كەمرۆڤ دەیكڕێت چارەنووسی بۆناوتەنەكەی پاشەڕۆكانە تەنها كۆمپانیای (تسكوی) بەریتانی گەورە كۆمپانیای بواری خواردنگا ساڵانە (٦٠٠٠) تەن لە پاشەڕۆی خۆراكی فڕێدەدات، لێكۆڵەر (دبفن نیچە) كە ئەندامی ڕێكخراوی خواردن و كشتوكاڵی فاوی سەر بە نەتەوەیەكگرتووەكانە دەڵێت: لەسەرمانە دەست بكەین بە هۆشیاركردنەوەی بەكاربەرەكان كەبەفیڕۆدانی ماددەی خۆراكی كێشەیەكی گەورەیە، لەهەموو ساڵێكدا ملیۆنان تەن خۆراك فڕێدەدرێتە تەنەكەی خۆڵەوە بەبێ سوودلێوەرگرتن.

ئەڵمانیا بەیەکەم دەوڵەتی ئەورووپی هەژماردەکرێت کە پێویستی کردووە لەسەر بەرهەم هێنەرانی ماددەی خۆراکی کەخۆیان ڕزگاربکەن لەپاشەڕۆ خۆراکیەکان، لەدوای ئەو فەڕەنسا دێت کەلەساڵی (٢٠١٢) یاسای خۆڕزگارکردنی لە پاشەڕۆی خواردن بەسەر شوێنەکانی فرۆشتنی خۆراکدا پێوست کردووە. شارەزایان ئاواتەخوازن ئەمە گەشەبکات و ببێتە شتێکی گشتی لەسەرجەم ولآتانی ئەورووپا، شارەزایانی خۆراك لە ئەمڕۆدا ئامۆژگاری خەڵك دەکەن بۆ ئەوەی پاشەڕۆی خواردن فڕێ نەدەن و هەوڵ بدەن سوودی لێ وەربگرنەوە یان بیدەن بەو کەسەی کە پێویستی پێیەتی، سەیرە هەمان ئاکۆژگاری پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) کە ئێستا لێکۆڵەران دووبارەی دەکەنەوە.

بەهەمان شێوە ماڵپەڕێکی ئەڵمانی دەستپێشخەری نیشان دەدات بۆ بەشکردنی خۆراك لەگەڵ کەسانی تردا لەجیاتی فڕێدانی. جا ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش چواردە سەدە ئەم پێشەنگییەی کردووە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چارەسەری بەفیڕۆدانی خۆراکی بەچەند وشەیەکی سادە کردووە و خەڵکیش لێیان وەرگرتووە و هەتا ئێستاش کاری پێدەکەن، کەواتە ئیسلام خۆشی و چاکەی تێدایە بۆ کەسانی تر و خواردنپێدانیان و ڕێزگرتنی میوان و خێرکردن بەنزیکەکان. هەروەها هاندانی تێدایە بۆ پارێزگاری ژینگە و دوورکەوتنەوە لە پیسکردنی بەفیڕۆدانی خۆراك سێیەکی پیسکردنی ژینگە پێکدەهێنێت، لەکاتی پارێزگاری کردن لەخۆراك بەپێی ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سێیەکی پیسکردنی ژینگەش کەم دەبێتەوە.

***

## ٤٤ مەرەگەی کدو و ئیعجازێکی ناوازە:

له فەرمووده‌یەکدا کەلە صەحیحی بوخاریدا هاتووه ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ بەرگدروویەك پێغەمبەری خۆشەویستی (صلی ألله علیه وسلم) بۆ خواردنێك بانگهێشت کرد، منیش لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووم ئەوەبوو بەرگدرووەکە نانێك و قاپە شلەیەکی لەبەردەم خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) دانا کە پارچە کدوی کولەکە و گۆشتی تێدابوو، جا بینیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) له قاپەکەدا له پارچە کدوەکان دەگەڕا.

ئەنەس (خوای لێ ڕازیبێت) دەڵێ: من هەر لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا کدوم خۆشدەوێت، ئەم فەرمووده پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) کدوی بەلاوە خۆش بووە و حەزی لێکردووە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرشتێکی خۆشویستبێ ئەوا نهێنیەکی مەزنی هەبووە. لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیە سوودە پزیشکییەکانی کدو لەزانستی نوێدا باسکراوە کدو ڕێژەی لە٩٤و٧٪ی ئاوە برێکی کەمیش لە شەکر و ریشاڵەکانی تێدایە، هەروەها لە ١٠٠گم کدو تەنها ٦٥ کالۆری دەدات و کەواتە خۆراکێکی باشە بۆ ئەوانەی کەدەیانەوێ جەستەیان لەکێشی زیادە ڕزگاربکەن، هەروەها کدو ماددەی سۆدیۆمی کەمە و ئەمەش بۆ توشبوانی نەخۆشی بەرزی فشاری خوێن گونجاوە، جگە لەمانەش کدو دەوڵەمەندە بە پۆتاسیۆم وێڕای ئەمانەش ماددەکانی کالیسیۆم و مەگنیسیۆم و فۆسفۆروئاسن و کبریت و کلۆر لە کدودا هەن. هەروەها کدو دەوڵەمەندە بە ڤیتامینەکان و لەسەروی هەمووشیانەوە ڤیتامین A. سەرباری هەموو ئەمانە کدو بۆ نەهێشتنی ژانەسەر باشە و هەرچۆنێك بەکار بهێنرێت سك نەرم وشل دەکاتەوە و بۆ قەبزی باشە.

هەروەها کدو نەرمترین و خێراترین خۆراکە لەڕووی کارلێکردنەوە، وێڕای ئەمانەش بەڵگەی نوێ هەن کە کدو بۆ خۆپاراستن لەنەخۆشی شێرپەنجە بەسوودە، ئەمەو

گۆڤاری (توێژینەوەکانی بیۆ کیمیاوی) لەساڵی ١٩٨٥دا لەپەیمانگای نیشتیمانی بۆ شێرپەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا توێژینەوەیەکی بڵاوکردەوەو، لەئاکامی توێژینەوەکەشدا ئەو ڕاستییە خرابووەڕوو کە کدو مرۆڤ لە شێرپەنجەی سییەکان دەپارێزێت. ئەم توێژینەوەیەش لەسەر بەشێك لە دانیشتوانی ویلایەتی (نیۆجێرس)ی ئەمریکا ئەنجام درابوو.

هەروەها کدو ڕێژەیەکی زۆر کەمی لە چەوری تێدایە کەئەویش بریتیە لە٢,٠٪و هەروەها بەڕێژەی ١,١٪پرۆتینی تێدایە، هەروەها کدو نەرم کەرەوەی گەدەیەو جگەری مرۆڤ چالاك دەکات و ڕێگرە لەبەردەم تووشبوون بە نەخۆشی زەردوویی، وێڕای ئەمانەش کدو ئارامکەرەوەی دەمارەکان و نەخۆشیە دەروونیەکانە و میزهێنەرە، بەرد و لم لادەبات و هەوکردنی گورچیلە ناهێڵێت، گورچیلەی مرۆڤیش چالاك دەکات و فەرمانەکانی بەهێزدەکات. هەروەها کدو تینوێتی دەشکێنێت و گەرمی و تا ناهێڵێت و بۆ نەخۆشیەکانی سنگ و کۆکەش زۆر بەسوودە. هەروەها پووك چالاك دەکات و ئازاری ددانەکانی مرۆڤیش کەم دەکاتەوە.. لە کۆتاییدا دەڵێین کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرچی کردبێت مایەی سەرنجەو سوود و کەڵك و موعجیزەی تێدایە، هەزاران درودی خوات لەسەر ئەی خۆشەویستی خوا، بەڕاستی ڕێنماییە تەندروستیەکانت و موعجیزە پایەدارەکانت وەك ڕۆژی ڕووناك لەڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆجیادا بۆ خەڵکی جیهان ئاشکرا دەبن.



## ٤٥ پ.د.ئەحمەد قازی خەڵاتی ڕۆناڵد ڕیگنی وەرگرت بە دۆزینەوەی دەرمانێك لە فەرموودە:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی ڕەشکە دەفەرموێت: (إن في الحبة السوداء شفاء من كل داء إلا السام السام الموت) رواه البخاري ومسلم والترمذي وإبن ماجة و إمام أحمد. عائیشە (خوالێی ڕازی بێ) دەڵێت: ومالسام؟ فەرمووی: الموت.

واتە: ڕەشکە دەرمانە بۆ هەموو دەردێك ئەم فەرموودەیە هاندەرێکە بۆ بەکار هێنانی ڕەشکە ئایە بۆ هەموو دەردێك کە ڕوو دەکاتە مرۆڤ چ بەشێك لە مرۆڤ دژ بەو نەخۆشیە دەوەستێت؟ چ شتێك لە مرۆڤدا بەرگری دەکات دەچێتە سەنگەری بەرامبەرەوە دژ بە هۆردووی نەخۆشی؟ تەنها ئامێری بەرگرییە بەم ئەرکە هەڵدەستێت کە پێك هاتووە لە خڕۆکە سپیەکانی ناو خوێن کە پێیان دەوترێت: ئیمیون سیستم (جهاز المناعە)، وە بریتیە لە چەند پۆل و جۆرێك لە خڕۆکەی سپی لەوانە: (فاگۆسایتەو لەمفۆسایتەو ناچرەڵ کیلەرز)، پرۆفیسۆرێکی موسڵمان بەناوی دکتۆر ئەحمەد قازی لەئەمریکا لەڕازی ئەم فەرموودەیە تێگەیشتووە کە پەیوەندیەك هەیە لەنێوان ڕەشکەو ئامێری بەرگری مرۆڤدا، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر مرۆڤێکی لەش ساغ و مرۆڤێکی تووش بوو بەنەخۆشی شێرپەنجە ئەنجامدا دوازدە مرۆڤی خۆبەخشی لەشساغی (فەحس)کرد دوو جۆر خڕۆکەی سپی وەرگرت لە خوێنیان:

١-پێی دەڵێن: (T LYMPHOCYTE)

١-پێی دەڵێن: (NATURAL KILERS)

واتە: بکوژانی سروشتی ئەوانە پەلاماری هەموو تەنێکی بێگانە دەدەن کە دێتە لەشەوە وەك میکرۆب، پارچەئاسن، تەنی زیندوو یان نازیندوو، هەموو بەیانیان و ئێوارانێکیش یەك غرام ڕەشکەی پێدەدان، بەیانیان کەوچکە چایەك و ئێواران کەوچکە چایەك، بەدان بیکرۆژن وقوتی بدەن پاش ماوەیەکی کەم دووبارە فەحصی کردنەوە بۆی دەرکەوت:

١-لەهەموویاندا (T-LYMPHOCYTE) بەڕێژەی لە٧٢٪زیادی کردووە

٢-هەروەها (NATURAL KILERS) بەڕێژەی ٧٣٪زیادی کردووە

بەم جۆرە دەرکەوت ڕەشکە ئامێری پاراستن لە مرۆڤی لەش ساغدا دەوروژێنێت و چالاکتری دەکات.

لەبەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەیدا هات هەندێك هەنگوینی تێکەڵ کرد لەگەڵ ڕەشکەکەدا و دای بەو مرۆڤانەی تووشی شێر پەنجە بوون، پاشان سیریشی پێدان بۆی دەرکەوت:

١-لەهەموویاندا (T-LYMPHOCYTE) بەڕێژەی ٢٠٠٪زیادی کردووە

٢-هەروەها (NATURAL KILLERS) بەڕێژەی ٣٠٠٪زیادی کردووە

بەم بۆنەیەوە لەساڵی ١٩٨٧دا خەلاّتی لەلایەن (ڕۆناڵد ریگن)ەوە وەرگرت، چونکە ڕۆناڵد ریگن خەلاّتی دانابوو بۆ هەر زانایەکی ئەمریکی کەدەرمانێك بدۆزێتەوە بۆ بەهێزکردن و چالاك کردنی ئامرازی بەرگری مرۆڤ بۆ بەرەنگاری لە نەخۆشی(الایدز) دژبەڤایرۆسی H.I.V.

دکتۆر دلاوەر لەلاپەڕە٧١ی کتێبەکەی(العلم و الأعجاز)ئاماژەدەکات بەگۆڤارێکی زانستی بەناوی (EXPERIMENTAL HEMATOLOGY) ژمارە(٢١)ساڵی ١٩٩٣، کە تیایدا هاتووە زانا ئەمریکیەکان بۆیان دەرکەوت لەم کاتەدا تەنها ڕەشکە دەتوانێت شێرپەنجە لەناوببات، بۆیە هاتن لەپەیمانگایەك کەتایبەتە بەلێکۆڵینەوە لەسەر شێرپەنجەلە ویلایەتی (نۆرب کارۆلینا). ئەم زانایە دەڵێت: پاڵفتەی ئەم ڕووەکە واتە:(ڕەشکە) کەبەلاتینی پێی دەڵێن (NIGELLASATIRA) بەکارمان هێناوەو گەیشتوینەتە ئەم سێ ئەنجامە:

١- هەموخڕۆکەیەکی ئامێری بەرگری مرۆڤ دەوروژێنیّ و چالاکی دەکات.

٢- هەموجۆرەکانی خڕۆکەی سپی لەلەشی مرۆڤ زیاد دەکات.

٣- بەشێوەیەکی پراکتیکی دەرکەوت لەماوەی سکپڕیداخانەی شێرپەنجەیی دەکوژێت و لەناوی دەبات. پاڵفتەی ڕەشکە تەنها شتێکە بتوانێت خانەی شێرپەنجەیی بکوژێت. خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چۆن پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: زانستی تازەش دەقاودەق هاوڕابوو لەگەڵی و ئەو ڕاستیە گەورەیەی بەبەڵگەوە سەلماند دەربارەی بەکارهێنانی ڕووەکی ڕەشکە.





## ڕێنماییەکی تەندروستی ناوازە لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم):

ڤیتامین(E)وسوودە تەندرووستیەکانی:

پسپۆڕانی بواری خۆپاراستن لەنەخۆشیەکان ئاماژەدەکەن بەزۆرخواردنی ئەو میوە و بەروبووم و سەوزەواتەی کەڕێژەیەکی بەرزی ڤیتامینەکانی دژەئۆکسانیان تێدایە وەك ڤیتامین (C،E،بیتاکارۆتین). یاخودبکرێتە ناوخۆراکەوە وای دەبینین کەپێویستە ڕێنمایی تاك بکرێت، بۆ زیاد کردنی ڕێژەی خۆراکی ڕۆژانەی لەو ڤیتامینانە بۆ زامنکردنی خۆپاراستن لەو نەخۆشیانەی لەئەنجامی زیادەڕەوی لە ئۆکساندندا دروست دەبن، سەبارەت بەبڕی ئەو ڤیتامین(E)ەش کەپسپۆڕان بەپێویستی ڕۆژانەی دەزانن هەروەك وتمان(١٠٠)یەکەی نێودەوڵەتیە، واتە(٣٣)ملگم ئەمەش لە٣٠٠٪ی ژەمەخۆراکی ڕۆژانەی(RDA)ئێستای تاکە لەم ڤیتامینە.

لەکتێبە کۆنەکاندا ئەوەباس کراوە کە ڤیتامین(E)پیری پێش وەخت دوادەخات، هەر لەهەمان سەرچاوەدا ئەوەباس کراوە کەزیادکردنی دژە ئۆکسانەکانی وەك ڤیتامین (E،C)بیتاکارۆتین لەخۆراکدا مەترسی ڕوودانی نەخۆشیەدرێژخایەنەکانی وەك دەردانی دڵەخوێن بەرەکان و چەند جۆرێکی ژێرپەنجە کەم دەکاتەوە. ڕۆڵی دژەئۆکسانەکانی وەك ڤیتامین(E) لەسەر نەخۆشیەکانی دڵەخوێنبەرەکان، ئەوانە ڕێگری دەکەن لە ئۆکسانی چەوریە پرۆتینەکەم چڕەکان واتە: لەوەی کە لەگەڵ ڕەگە ئۆکسجینە ئازادەکاندا یەکبگرن و بگۆڕێن بۆ(LDL)ی ئۆکسێنراو(LDL(oxidized، وە ئەو LDLە ئۆکسێنراوانەن کەدەبنە مەترسی تووشبوون بەجەڵدەی دڵ، لەبەر ئەوە ئەگەر ڕۆژانە (١٠٠)یەکەی نێودەوڵەتی لە ڤیتامین(E)بخورێت ئەوا لە٤٠٪لەڕێژەی مردووان بەنەخۆشی دڵەخوێنبەرەکان کەم دەبنەوە بەبەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەدا کەمتر لەوبڕە دەخۆن لەڤیتامین(E). لەگرنگترین ئەو سەرچاوانەی بەو ڤیتامینە دەوڵەمەندن زەیتی دەنکە گەنم لەگەڵ سۆسی ئارد، زۆرینەی سوودەکانی سۆس کەپێی جیادەکرێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو ڕێژەی زۆرەی ڤیتامین(E)و ئەو ڤیتامینانەی تر کەلەئاودا دەتوێنەوە.

لەكۆمەڵەی (B)ئەوەی جێگەی سەرنجەو وەك موعجیزەیەكی زانستی یەكجار گەورە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نانی سپی نەخواردووە لەوەتەی پەیامی بۆهات تا وەكو وەفاتی كرد. ئەوەتە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: (حدثني أبوحازم أنه سأل سهلاً: هل رأيتم في زمان (صلى الله عليه وسلم) النقي؟ قال: لا فهل كنتم تنخلون الشعير؟ قال: لا ولكن كنا ننفخ) صەحیحی بوخاری بەشی (فووكردن بەجۆدا) فەرموودەی ژمارە (٥٤١٠) واتە: ئەبو حەزم بۆی باس كردم كەلەسەهلی پرسیوە: ئایا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ئاردی سپیتان دیبوو؟ وتی:نەخێر.

وتی:ئەی جۆتان لەهێڵەك دەدا؟

وتی: نەخێر، بەڵام فوومان پێدادەكرد، مەبەستیش لەنانی سپی ئەو نانەیە كەلەئاردێك دروستكرابێت توێكڵی گەنمەكەی لێكرابێتەوە، واتە: سۆسەكەی بەڵام نانی بۆر ئەوەیە كەلەئاردی گەنمی تەواو دروستكرابێت بەبێ لادانی توێكڵەكەی، سۆس بەهۆی ئەو ڕێژەباشەی ڤیتامین (E)تیایدا سوودی زۆری هەیە بۆزۆر نەخۆشی، ئەوەیشی شایەنی باسە ئەوەیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێش چواردە سەدە نانی سپی لەخۆی حەرام كردووەو نانی بۆری پێ خۆش بووە. كەچی ئێستا گرنگی سۆس دەزانرێت لەلایەن زانستی تازەی سەردەم لەڕێگریكردنی نەخۆشیدا، وەك نەخۆشی خوێنبەرە تاجیەكان و خوێنبەرە گۆڵ دەوالی و كالۆچبوون گیران و چەندجۆرێكی شێرپەنجە.

هەروەها پزیشكی نەشتەرگەری (عبدالرزاق گەیلانی لەلاپەرە (١٨٢)ی ساڵی (١٩٩٦)ی كتێبەكەی( الحقائق الطبية في الاسلام) دا دەڵێت: كورتكردنەوەی خواردنی نان لەنانی سپیدا بێ ئەوەی ئاردی بۆری تێدابێت دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی ڕەگەزی توتیا(زینك) لەلەشدا، كەئەمەش دەبێتە هۆكاری پیری پێش وەخت، ڤیتامین(E)ئەو ڤیتامینەیە یارمەتی دووگیانی و منداڵبوون دەدات، لەبەرئەوە بە (Tocopherol) ناودەبرێت، لەحەفتاكاندا هەندێك لەنەخۆشخانەكانی ئەمریكا بەكاریان دەهێنا بۆ

چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی دڵ، جگە لەمانە کەمی ئەو ڤیتامینە لەزۆر حاڵەتدا دەبێتە هۆی شینبوونەوەی ماسولکەکان.

دکتۆر حەسان شەمسی پاشاش لەلاپەڕە (٥١)ی کتێبەکەی (کیف تتخلص من الامساك؟ چاپی ١٩٩٣ دەڵێت: سۆس مەزنترین چارەسەری سرووشتیە بۆ گیری (الامساك) خۆپاراستن لە گیری، ڕێگری دەکات لەتووشبوون بە مایەسیری و شینەدەمارو هەڵدڕانی گەدە گەدەپۆش و نەخۆشی (المرجلات) ئەمیش چەند بیرۆکەیەکە لەسەر ڕیخۆڵە ئەستوورە، لای بەساڵاچوان درووست دەبێت.

وەلەتوێژینەوەکەیدا کەلە (نیوجەرسی) ئەنجامدراوە بۆ توێژەران، دەرکەوتووە کەخواردنی ١٥گم سۆس ڕۆژانە بەتێکەڵکردنی لەگەڵ جۆرەکانی تری خواردندا وەك دانەوێڵە و شیر یان پەتاتە، بووەتە هۆی چاك بوونەوەی ٦٠٪ی حاڵەتەکان لە گیری (إمساك).

خوێنەری بەڕێز بڕوانە چواردە سەدە پێش ئێستا تاجی سەر و دکتۆری هەموو مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیه وسلم) چۆن گرنگی داوە بەسۆس و بەکاری هێناوە، زانستی تازەش وەك ڕۆژی ڕووناك ئەو ڕاستیەی ئاشکراکرد و دەقاودەق هاوڕابوو لەگەڵ ئەو موعجیزەگەورەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڕاستی کەسانی دوور لەدین ئەگەر لەبەڵگەزانستیەکان ڕانەکەن تەنها ئەو بەڵگە درەوشاوەیان بەسە بۆ ئەوەی گومانی ناو دڵەکانیان بڕەوێتەوە بگەنە کەناری دڵنیایی و حەقیقەت.

***



## ٤٧ ئاماژەکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکولاَندنی سیر و پیاز موعجیزەیەکی زانستی گەورەی ئاشکراکرد:

لەصەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (من أكلهما فليمتهما طبخا) رواه أحمد ومسلم وإبن ماجة والنسائي. واتە: هەرکەس سیر و پیازی خوارد با بەکولاَندن لێنان بۆنەکەیان بمرێنێت، چەند توێژینەوەیەکی زانسی نوێ کەپشتگیری فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات دەربارەی سیری لێنراو، ئەم تووێژینەوانە ئاماژەبەوە دەکەن کەقاژەکانی سیر هەریەکە لەماددەی ئەلیئین (Alliin) وئەنزیمە(Alliinase) یان تێدایە، بەجنین و وردکردنی ئەم سەلکە سیرانە ئەودوو ماددەیە (ئەلینین و ئەنزیم) تێکەڵ دەبن و دەگۆڕێن بۆ ئەلیسین بۆنەتیژەکەی سیر لەوماددەی دواییەوە پەیدا دەبێت، واتە: ئەلیسین. ئەم ئەلیسینەش ماددەیەکی کارایە ئۆکسێنەر و ناجێگیرە بەهۆی ئەو ناجێگیریەوە شی دەبێتەوە بۆ چەند ئاوێتەیەکی تر کە گۆگردیان تێدایە، بەم پێیە سیری کاڵ و ئامادەکراوەکانیشی لەڕووی کیمیایەوە جێگیرن و دەبنە هۆی درووست بوونی چەند شوێنەوارێکی لاوەکی، وەك شلۆقی و خلێسانەوەی گەدە و هەستەوەری، لەکاتی خواردنیدا بەکاڵی تازەیی.

لەبەرئەوە دەبێت بەکارهێنانی ئامادەکراوەکانی سیری کاڵ سنووردار بێت بەهۆی ئەو شلۆقی و شپرزەییانەی کەدرووستی دەکات، لە پەخشنامەی (Kyolicinformation)دا بابەتێك بلاَوکراوەتەوە لەسەر زیانەکانی سیری کاڵ، بەپشتبەستن بەچەند سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەبەخستنە بەرگەرمی سیر بەشێوەیەکی تەواو دەست بەسەر زۆر لەسیفاتە نەخوازراوەکانیدا دەگرێت. هەروەها ئەو پەخش نامەیە ئەوەی باسکردووە کەبەپێچەوانەی خواردەمەنیەکانی ترەوە سیر خستنەبەرگەرمی (محاملة الثوم بالحرارة) بۆ خۆی موعجیزەیەکە لەسیردا، چونکە ئەو گەرمیەی دەبێتە هۆی پێکهێنانی

زنجیرەیەك ئاوێتە تیایدا، کەلەبنچینەدا لەسیری کاڵدا نین و زۆربەسوودن لەدەقەئینگلیزیەکەدا وشەی پەرچوو(معجزە–Miraculous) هاتووە و دەڵێت: وەبەرهێنانی سیر واتە: (مامەڵەی گەرمی لەگەڵ سیر)، پەرچوویەکە لەخودی سیردا. لەڕاستیدا خوای پەروەردگار ڕاستی فەرمووە دەربارەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝﴾ النجم:٣–٤. واتە: قسە و گوفتاریشی لەئارەزوبازی و هەواو هەوەسەوە نیە، ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خوایە.

لەمەی سەرەوەتێبینیمان کردکەتوێژەرەوان مامەڵەی گەرمیان لەگەڵ سیردا بەموعجیزە داناوە، جا چۆن واناڵێن وشەکانی پێغەمبەری خوا (صلی ألله علیه وسلم﴾ موعجیزەن کە وتەی چوار سەدەپێش ئێستان کەچی دەڵێی ئەمڕۆ فەرموویەتی.

دکتۆر حەسان شەمسی پاشا لەکتێبەکەیدا بەناوی: (الاسرار الطبية في الثوم و البصل) لاپەرە ٥٠ساڵی١٩٩٤ باسی کردووە و دەڵێت: هەردوو توێژەر (ڤۆیگ و وۆڵف) توانیان ساڵی ١٩٨٦ماددەی ئەهوین جیابکەنەوە، ئەم وشەیەش لە(٥ز٨)وەرگیراوە کەبە(ئەهو)دەردەبڕێت، ماناکەیشی بەزمانی ئیسپانی واتە: سیر، ئەم ماددەیە خوێن تەڕدەکاتەوە و لەهاڕاوەی سیری ئامادەکراو بەڕێگایەکی تایبەتی دەردەهێنرێت. نووسەر هەر لەو دکتۆرە دەگوازێتەوە کەخواردنی هاڕاوەی سیری وشك و هەڵگیراو ئەو پوختانەی سیر لەڕێی توێژەرە ئەندامیەکانەوە ئامادەکراون، دەبێتەهۆی دابەزاندنی کۆلیسترۆڵە خوێندا کەمترین جورعەی پێویست بۆ باشکردنی تەڕی خوێن بە( ٣٠٠ملگم) لەهاڕاوەی سیر لەڕۆژێکدا خەملێنراوە، نزیکەی یەك گرام لە قاشە تەڕەکەی و کاریگەریەکەشی گەورەتر دەبێت دوای شەش کاتژمێر لەخواردنی جورعەیەکی پێك هاتوولە(١٢٠٠ملگم)لەو هاڕاوەیە کەبەنزیکی دەکاتە چوارگرام قاشە سیر بەتەڕی، جا ڕەنگە یەکێك بپرسێت ئەو ماددانە چین کەڕێگری لەکۆبوونەوەی پەڕەکانی خوێن دەکەن و خوێن تەڕدەکەنەوە؟ باشترین وەڵام بۆ ئەو پرسیارە ئەو ئەنجامەیە کەتوێژەر (ئێریك بلوك) پێیگەیشتووە و لەبابەتێکدا کەلەگۆڤاری (العلوم)ی ئەمریکیدا

له نیسانی ١٩٨٦دا بەناوی (کیمیای سیر و پیاز) بڵاوکراوەتەوە و دەڵێت: هەریەکەلە (ماهندراجەین) و (ڕافائیل ئەبیتز) (کاسترۆ) کەلەپەیمانگای فەنزوێلا بۆ توێژینەوەی زانستی لەکاراکاس کاردەکەن، سەرکەوتووبوون لەبەدەستهێنانی چەند دەرهێنراوێك لەسیر، کەبەشێوەیەکی تایبەت توانای ڕێگریکردنیان هەیە لەکۆبوونەوەی پەڕەکانی خوێن، ئەو ئاوێتەیەش کەزیاتر کاریگەری هەیە لەو دەرهێنراوانەدا(ئەهوین)ە.

خوێنەری بەڕێز بڕوانە چی لەسەر سیر بڵاوکراوەتەوە لەتۆڕی جیهانی ئینتەرنێتدا له لاپەڕە (١)ی (Carli facts and information)تیایدا هاتووە: خواردنی سیر بەبڕێکی زۆر لەگەڵ ژەمەخۆراکیەکاندا ڕەنگە دەووری هەبێت لەدەرکەوتنی کەمخوێنیدا لەبەرئەوەی پێویستە لەسەر ئەوانەی کەم خوێنن پوختەکراوەکانی سیر یان سیری لێنراو بخۆن نەك کاڵ، جا ئێستا دەپرسم: ئایا ئەمە هاوڕانیە لەگەڵ فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا (صلى ألله عليه وسلم) کەدەگەڕێتەوە بۆ پێش چواردەسەدە؟ بەڕاستی وەك ئەوە وایە فەرمایشتەکەی ئەومان بۆ بگوازێتەوە کەدەربارەی سیری لێنراو فەرموویەتی، کەواتە: لەژێر ڕۆشنایی مامەڵەی گەرمیدا خواردنی سیر بەبڕی زۆریش نابێتە هۆی تووشبوون بە ئەنیمیا(کەم خوینی) هەرلەو سەرچاوەی سەرەوەدا چەند سوودێکی سیر باس کراوە لەمانە:

١- کار لەسەر دابەزاندنی پرۆتیناتی چەوری کەم چڕی دەکات، کەبەکۆلیسترۆڵی زیانبەخش ناودەبرێت و مەترسیدارترین جۆرەکانی کۆلیسترۆڵە، نیشتنی لە خوێنبەرەکاندا دەبێتە هۆی تەسککردنەوە و ڕەقکردنیان.

٢- ناهێڵێت خوێن مەین ڕووبدات، ڕێگری دەکات لەکۆبوونەوەی پەڕەکەکانی ناوخوێن، بەم سیفەتە سیر باشترە لە ئیسپیرین بۆ ڕێگریکردن لەکۆبوونەوەی پەڕەکەکانی خوێن.

٣- ڕێگری دەکات لەوەی مادده درووستکەرەکانی شێرپەنجە هەڵسن بەگۆڕینی خانەسرووشتیەکان بۆ خانەی شێرپەنجەیی.

٤- هۆکارەجیاوازەکانی ڕێگرلەشێرپەنجە هاندەدات.

٥- ناهێڵێت کارلێکەکانی ئۆکسان و خوێیە کانزاییە قورسەکان زیان بەخانەکان بگەیەنن.

٦- کار لەسەر دابەزاندنی کلیسریداتی سیانی دەکات.

دوای وەرگرتنی ئەم زانیاریانە پێویستە سیروپیاز دوای کوڵاندن و لێنان بخورێن تا ئاوێتەکانی(دایسلفایدن) بەدەست بهێنرێت، کەبەشێوەیەکی سرووشتی لەو دوو ڕووەکەدا هەیە، بۆئەوەش خوێنەری بەڕێزیەی بەئاوێتەی ناو سیر ببات، ئەوە بریتیەلە (دای پرۆپینیل دایسلفاید)، ئەمیش ئەو ئاوێتانەیە کەبەرپرسن لەتام و بۆنی سیر، بەڵام ئاوێتەی بەرپرس لەتام و بۆنی پیاز بریتیەلە (دای بروبیل دایسلفاید) هەزاران درودی خوات لەسەر ئەی پێغەمبەری خۆشەویست کە موعجیزە زانستیە گەورەکانت لەسەدەی تازەی زانست و تەکنەلۆجیادا وەك ڕۆژی ڕووناك دەدرەوشێنەوە.



## بەرکارهێنانی بۆنی خۆش چارەسەری نەخۆشیە دەروونی و جەستەییەکان دەکات:

بۆنخۆشکردن و بۆنکردنی بۆنی خۆش و کاریگەر ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە کەبەردەوام بووە لەسەری و هانی میللەتەکەی داوە جێبەجێی بکەن. بوخاری و موسلیم لەئەبوسەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خوا هەقی بەسەر موسڵمانەوە هەیە کە حەوت ڕۆژ جارێ خۆی بشوات و ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو خۆی بۆنخۆش بکات. خوێنەری بەڕێز جا بابزانین زانستی تازە لەو بارەیەوە چی دەڵێت: بۆنکردنی بۆنەخۆشەکان وەك ڕیحان و میسك و بۆنەکانی تر دەبێتە هۆی وروژاندنی وەرگرە دەماریەکانی سیستمی کۆئەندامی لیمبك، کەکۆتاییەدەماریەکانی بۆنکردنی پێوەبەندە بەتوێژاڵی بۆنکردن لەمێشکدا کە بەهۆیەوە گەیەنەرە دەمارییەکان دەدات و بەشێوەیەکی کاریگەر کاردەکاتە

سەرفەرمانەکانی جەستە و ڕەفتار گەلێك گوازەرەوەی دەماری لە (لیمیك سستم) دەردەدرێت. گرنگترینیان (گلوتامێت) و (ئەسپرتەیت و گابا)(گامائەمینوبیوتاریك ئەسیدە) کەڕۆڵی هێورکەرەوەی هەیە و لەچارەسەری پەرکەمدا ڕۆڵی گرنگیان هەیە. هەروەها پێکهاتەکانی ئازارشکێن وەکو دینۆرفین و ئینکەفالین و پێکهاتەکانی دژەخەمۆکی وەکو: (مۆتۆئەماین)، (نۆرئەدرینالین)، (سیرۆتۆنین)، (دۆپامین) دەردەدات.

لەکاتی نەخۆشیە دەروونیەکان گۆڕانکاری بەسەر ئاستی (ئەسیتایل کۆلین)و (نۆرئپنفرین)و (دۆپامین)و (سیرۆتۆنین) دا دێت. لەهەمان کاتدا تێبینی ئەوەکراوە لەکاتی بۆنکردنی بۆنەخۆشەکاندا هەمان گۆڕانکاری بەسەر (لیمیك سستم)دا ڕوودەدات. بۆدەردانی گوازەرەوە دەماریەکان (لیمیك سستم) چیە؟ ناوچەیەکە لەمێشك کەلەکۆمەڵە ئەندامێك پێکهاتووە گەلێك فەرمان دەردەکات، گرنگترینیان لەبواری سۆزداری و ڕەفتار و فێربوون و بیرەوەری درێژخایەن و بۆنکردن و چێژوەرگرتن لەوشتانەی حەزبەکردنیان دەکەیت، لەئەنجامی هەڵمژینی بۆنی خۆشدا (لیمیك سستم) دەوروژێت و دەبێتەهۆی وروژاندنی ژێرلانکەڕژێن، ئەوەش کاردەکاتەسەر ڕژێنی ڕوخامی و لەبەشی دواوەی ڕژێنەکە پێکهاتەی (ئۆکسیتۆسین) دەردەدات و دەبێتەهۆی دەردانی لەهەر یەك لە چاو و هێلکەدان و گونەکان و پرۆستات و ڕژێنی سەر گورچیلە (ئۆکسیتۆسین)، بەهۆرمۆنی خەندە ناودەبرێت، ڕۆڵی هەیە لەباشترکردنی فەرمانە سێکسیەکان لەهەموو ئاستەکاندا.

هەروەها دەرکەوتووەکە (ئۆکسیتۆسین) دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی گرژی و پێکەوەبەستنی تاکەکان لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە، بۆیە ناودەبرێت بەهۆرمۆنی خۆشەویستی هۆرمۆنی باوەڕومتمانە هۆرمۆنی کەمکەرەوەی ترس.

توێژینەوەکان ئاماژە بەبەکارهێنانی (ئۆکسیتۆسین) دەکەن لەچارەسەری ئۆتیزم و چارەسەری خەمۆکی و ڕەفتاری توندوتیژی و باشترکردنی فرمانە هۆشمەندیەکان، بۆنکردنی ڕیحانە دەبێتە هۆی دەردانی ماددەی ئۆکسیتۆسین لەڕژێنی نوخامیدا و بۆیە دەشێت لەچارەسەر و ڕێگری لەخەمۆکیدا بەسوودبێت.

هەروەها دەرکەوتووە هەڵمژینی ستیرۆید کاریگەری هەیە لەسەر مەزاج و بیرەوەری و کۆئەندامی دەماری خۆیی بۆیە دەشێت بەسوودبێت بۆ ڕێگری لەهەندێ نەخۆشی وەك ئەلزەهایمەر و لەرزۆکی و نەخۆشیەکانی پیری و پوکانەوەی دەمارەکان.

ماددەی(ستیرۆید) لەمیسکدا هەیە جائەوەی جێگای سەرنجە و موعجیزەیە سوربوونی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) لەسەر بۆنخۆشکردن هەموو هەفتەیەك و ڕەتنەکردنەوەی و هاندانی موسڵمانان بۆ بەکارهێنانی بەڵگەیە لەسەر سوودەکەی، کەتازەبەتازە زانستی تازە ئەو هەموو سوودانەی بۆنی خۆشی بۆ ئاشکرا بووە، کەچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چواردەسەدە بەر لەئێستا ئاوا هانی موسڵمانانی داوە بۆ خۆ بۆنخۆشکردن و بەکارهێنانی بۆنی خۆش.

بەکارهێنانی ڕەیحان و بۆنەخۆشەکان دەبێتەهۆی دەردانی کۆمەڵە گوازەرەوەیەکی دەماری کەکاریگەری ئاشکرایانەی هەیە لەڕێگری و چارەسەری نەخۆشیەکانی خەمۆکی و ڕەفتاری شەڕەنگێزی و وەسواسی و دڵەڕاوکێ و ترس، کاریگەریان هەیە لەسەر توانای سێکسی و ڕێگری لەهەندێ نەخۆشی وەك ئەلزەهایمەر و لەرزۆکی و پوکانەوەی دەمارەکان، ئەوە ڕاستیەکە کەپێغەمبەری ئیسلام(صلى الله عليه وسلم) پێش زیاتر لەچواردەسەدە باسی کردووە کەلەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بوارێکی چارەسەر هەیە بەناوی (Aromatherapy) واتە: چارەسەرکردن بەبۆن. کەشێوازێکی چارەسەرە لەڕێی بەکارهێنانی بۆنەوە هەوڵدەدرێت لایەنی مەزاج و دەروونی و هەندێك لەنەخۆشیە جەستەییەکان چارەسەربکرێت... پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: لەدنیای ئێوەدا سێ شتم پێ خۆشە: بۆنی خۆش و ئافرەت و ڕووناکی و بیلبیلەی چاوم لەنوێژدایە.

***



## تاعون ودەرکەوتنی ئیعجازی زانستی لەفەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: (إذاسمعتم بالطاعون في أرض فلاتدخلوها وإذا وقع بأرض وأنتم فيها فلا تخرجوامنها) رواه الشيخان، واتە: ئەگەر بیستتان نەخۆشی تاعون بەنەخۆشی درم و کوشندە وتراوە لەناوچەیەك بلاوبوەوە، ئەوا مەچنە ئەو شوێنە، ئەگەر لەناوچەیەکیش بوون مەچنەدەرەوە.

ئەم فەرموودەیە زانیاریەکی سەرسوڕهێنەری تێدایە بەشی یەکەمی فەرموودەکە ئاشکرایە و زانراوە، ئەگەر تاعون لەشوێنێك بلاوبویەوە بۆئەوەی نەخۆشیەکە نەگوازرێتەوە خەڵك توش نەبێت نابێت بچنە ئەو شوێنە، بەلام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە بەشی دووەمی فەرموودەکەیە کەدەفەرموویێت: ئەگەر لەو شوێنەش بوون مەچنەدەرەوە؟ لەوانەیە کەسێك بلێت چۆن شتی وادەبێت؟ ئەگەر لەو ناوچەیە بم و ساغبم و هێشتا نەخۆشیەکەم توش نەبووبێت بۆچی خێرا نەچمەدەرەوەی شارەکە؟ ئایا چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی وادەکات کە ئەو شارە بەجێنەهێڵم؟ ئایا ئەوە خۆکوشتن نیە؟ ئەو گرفتە هاوەڵەکانی لە تاعونی عەمواسدا سەرسامکردبوو، کەتاعونێك بوو لە ولاتی شام لەسەردەمی ئیمامی عومەردا بلاوبووەوە، خەڵکێکی زۆر بەو تاعونە مردن، گەورەپیاوانی هاوەڵان لە کۆچەران و پشتیوانان کۆبونەوە لەسەر ئەوەی ئایا چی بکەن؟ ئایا برۆنە شامەوە یان خۆیان دووربگرن؟ هەبوو دەیوت چۆن لەقەدەری خوا رابکەین؟

هەتا عومەری کوڕی خەتتاب بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی دا و وتی: لەقەدەری خوا رادەکەین بۆ قەدەرێکی تری خوا، نەخۆشی قەدەرە و تەندروستیش قەدەرە ئێمە قەدەرە باشەکە هەڵدەبژێرین و ناچینەشام لەوێدا یەکێك لەهاوەڵان (خوالێیان رازی بێت) وتی: من زانیاریەکم لەپێغەمبەرەوە پێیەو ئەو فەرموودەیەی خوێندەوە کەنابێت بچینە ئەو شارەوە و نابێت کەسیش بێتەدەرەوە.

دکتۆر عەبدولمەجید زەنەدانی دەڵێت: ئەم پرسیارەمان بەرەو ڕووی زانایەکی دانیمارکی کردەوە بەناوی (جۆن هۆنۆڤەرلارسن) کەمامۆستای بەشی بەکتریایە لەنەخۆشخانەی (کیسی حوکومی کۆپنهاگن)، پێمان وت ئەگەر تۆ حاکم و بەرپرسی شارێك بی و ئەو شارە دووچاری نەخۆشییەکی کوشندەی ترسناك بێتەوە واتە: تاعون، تۆ چی دەکەیت؟ لەوەڵامدا وتی: سوپا و هێزی سەربازی دەهێنم گەمارۆ دەخەمە سەر شارەکە ناهێڵم کەس لەوشارە دەربچێت و ناشهێڵم کەسیشی لێ بێتە ژوورەوە، پێی وترا: کەس نەچێتە ناوی ئاشکرایە بەڵام بۆچی ناهێڵی کەس لێی دەرچێت؟ وتی: لێکۆڵینەوە زانستیە نوێیەکانی ئەم دواییە دەریان خستووە کاتێك تاعون لەناوچەیەك یان شارێك بلاّودەبێتەوە نزیکەی ٧٠بۆ٩٠٪ی خەڵکەکەی دەبنە هەڵگری میکرۆبەکە، بەڵام تەنیا ١٠بۆ٣٠٪ی خەڵکەکە نەخۆشیەکەی تیا دەردەکەوێت ئەوانی تر سەلامەتن، هەرچەندە میکرۆبەکەیان هەڵگرتووە بەڵام بەهۆی بەهێزی کۆئەندامی بەرگریان بەسەر میکرۆبەکە دا زاڵ دەبن، میکرۆبەکە لەلەشیاندا دەبیت بەڵام زیانیان پێ ناگەیەنێت، هەندێکیان کەمێك لەنەخۆشیەکەیان تیادەردەکەوێت بۆنموونە تەنها تای لێدێت و چاك دەبێتەوە.

کەواتە مانەوەی کەسەساغەکە لەو ناوچەیە ترسی نیە وەك بڵێی بەهۆی کۆئەندامی بەرگریەوە کوتراوە لەدژی نەخۆشیەکە، بەڵام کێشە گەورەکە لەوەدایە ئەگەر ئەو کەسە ساغەی کەهەڵگری میکرۆبەکەیە بچێتەدەرەوە بۆ شارێکی تر ئەو کاتە میکرۆبەکە دەباتە دەرەوە و لەشارەکانی تر بلاّوی دەکاتەوە، بەوەش ملیۆنانی تر لەناودەچن.

پرسیار لەدکتۆر (جۆهان نۆڤەر)کرایەوە: ئایا ئەو ئابلۆقەیەی دەخرێتەسەر ئەو ناوچەیە تاچەند بەردەوام دەبێت؟ دکتۆر(جۆن هۆنۆڤەر) وتی: هەتا ئەو کاتەی میکرۆبەکە سیفاتی خۆی دەگۆڕێت و زیانی نامێنێت، تایبەتمەندی بۆماوەیی تازەی تێدا درووست دەبێت تایبەتمەندیە دوژمنکاریەکەی تێدانامێنێت.




## درۆکردن زیان به خانەکانی مێشك دەگەیەنێت:

درۆکردن زیان به خانەکانی مێشك دەگەیەنێت: هەتا ڕەوڕەوەی ڕۆژگار بەرەو پێش بڕوات زیاتر ڕاستی و دروستی پەیامە پیرۆزەکەی ئیسلام بۆ هەموو خەڵکی دونیا ئاشکرا دەبێت. دکتۆر وەلید فتێحی دەڵێت: زانایان بەهۆی فەسحی موگناتیسی مێشکەوە گەشتونەتە ئەوەی کە درۆکردن زیان بە خانەکانی مێشك دەگەیەنێت، (سبحان الله) لە گەورەیی ئەم ئاینە پیرۆزە ئیسلام کە چەندەها سەدە پێش دۆزینەوەی ئەو زانایانە درۆ بە سەرچاوەی هەموو خراپەیەك دەزانێت پێغەمبەری پایەدار (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: بڕوادار درۆ ناکات، لە کاتێکدا ڕەنگە گوناهی گەورەشی لە دەست بقەومێ.




## سوودە تەندرووستیەکانی زوو لەخەو هەستان:

لێکۆڵینەوەیەکی زانستی نوێ دەریخستووە کەزوو لەخەوهەستان پێش خۆر هەڵاتن تەمەن درێژدەکات و چالاکی خانەکان زیاددەکات و تێگەیشتن و توانای ژیری باشتر دەکات. زانایان دەڵێن: نوستن بۆ ماوەی ٦ کاتژمێر لە(١٠)ی شەوەوە تا (٤)ی بەیانی بەرامبەر (١٢) کاتژمێر نوستنی ڕۆژە، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێکردووین بەیانیان بۆ نوێژی بەیانی زوو هەستین.

***



## باشترین سیستەم بۆکەم کردنەوەی کێش و ئاشکرابوونی ئیعجازێکی زانستی ناوازە:

بۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کردووە بەڕۆژوو گرتنی دووڕۆژ لەهەفتەیەکدا؟ ئایا زانست سوودەکانی ئەم سیستەمە دەسەلمێنێت؟ لێکۆڵەران ئەوەیان سەلماندووە کە شوێنکەوتنی سیستەمێکی توند بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەماوەی هەفتەیەکدا بەکاریگەرترین ڕێگادادەنرێت بۆ کەمکردنەوەی کێش و کەم کردنەوەی مەترسی تووشبوون بەشێرپەنجەی مەمك، هەروەها دەبێتە هۆی خۆپاراستن لەپاڵەپەستۆی خوێن و شەکرە و کۆلیسترۆڵ.. کەهەموویان پەیوەندیان بەکێشی زیادەوە هەیە، یەکێك لەسوونەتەکانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەڕۆژووبوونی دوو ڕۆژە لەهەفتەیەکدا (دوشەممەو پێنج شەممە) پەیڕەوکردنی ئەم سوونەتەش سوودی پزیشکی جۆراوجۆری لێدەرکەوتووە پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە موعجیزەکانی پێغەمبەرە پایەدارەکەی لەڕۆژگاری تازەی زانست و تەکنەلۆجیادا وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ هەموو خەڵکی جیهان دەدرەوشێنەوە.



## دەرکەوتنی موعجیزەیەکی زانستی لەفەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی نەخۆشی گولی:

سەبارەت بەخۆپاراستن لەنەخۆشی درم و گوازراوە لەفەرموودویەکی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتووە: (فِرَ مِنَ المجذومِ فرارك من الأسد) رواه البخاري. واتە: ڕابکە لەدەست ئەو کەسەی کەتووشی نەخۆشی گولی بووە وەك ئەوەی کەلەدەست شێر ڕادەکەیت. بێگومان ئەو ڕاکردنە بەمەبەستی خۆپاراستن و تووش نەبوونە بەم نەخۆشیە خەتەرناکە کەنەخۆشی گولیە، چونکە زانستی نوێ دوای سەدەی هەژدەیەم ئەوەی دۆزیەوە کەئەم نەخۆشیە درم و گوازراوەیە و میکرۆبە تووشکەرەکەی

لەیەکێکی نەخۆشەوە دەگوازرێتەوە بۆ کەسێکی لەش ساغ، ئەو نەخۆشیە دووجۆری سەرەکی هەیە: جۆری یەکەمی گولی کەجۆری شێرییە زۆر باوترە لەجۆرەکەی ترلەگەڵ ڕوودانی ئەو گۆڕانکاریانەی کەباسکران لەو جۆرەیاندا دەم و چاوی نەخۆشەکە مووی پێوە نامێنێت ئاوساوی و پەڵەی لێ پەیدادەبێت، ڕووخساری مرۆڤی گول بەهۆی گۆڕانکاریەکان و تێکدانەکانی میکرۆبی نەخۆشیەکەوە وەکوشێری لێ دێت.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: لەمرۆڤی گول ڕابکە وەك چۆن لەشێر ڕادەکەیت. واتە: مرۆڤی گول وەك شێروایە وەك لەسەرەوە ڕوون کراوەتەوە، ئەوکەسەی تووشی نەخۆشی گولی دەبێت دەم و چاوی وەك شێوەی شێری لێدێت، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە، چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەژیانیدا مرۆڤی گولی نەدیوە تەنانەت لەهەموو ژیانیدا یەك جار مرۆڤێکی گول هات بۆ موسڵمان بوون و پەیماندان.

ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتەوە کەکاتێك وەفدی هۆزی ثقیف هاتن بۆ موسڵمان بوون و پەیماندان ئەوەبوو یەکێکی گولیان لەگەڵ بوو، پێغەمبەر یەکێکی نارد بۆلای کەپێی بڵێت: بگەڕێوە ئەوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسڵمانیەتی و پەیمانی لێوەرگرتیت و پێویست ناکات بچیت بۆلای. کەواتە لەو فەرموودەیەوە گرنگی خۆپاراستن دەردەکەوێت لەتووش نەبوون بەنەخۆشی، دەتوانین بڵێین ئەو فەرموودەیە یەکەم بنەمای ڕاست و زانستیانەیە بۆ زانستێکی زۆر گرنگ کەلە ڕۆژگاری ئەمرۆدا زۆر گرنگی پێ دراوە و بەرەوپێش چووە کە ئەویش زانستی خۆپارێزی پزیشکیە.

***



## ئیعجازی زانستی فەرموودەیەك لەبارەی نەخۆشی تاعون:

وەسف کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ نەخۆشی تاعون بەر لەچواردە سەدە دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ زانستی تازە:

لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە: (عن عائشة أم المؤمنين أنها قالت النبي (صلى الله عليه وسلم) الطعن عرفناه فما الطاعون؟ قال (صلى الله عليه وسلم) غدة كغدة البعير تخرج من العراق أو الإبط) رواه البخاري. واتە: دایکی ئیمانداران (عائیشە) لە پێغەمبەری پرسی تاعون چیە؟ ئەویش فەرمووی: گرێیەکە وەك گرێی لەشی وشتر لەناوچەی بەرمووسڵدان یان بن هەنگڵ و بن باڵی مرۆڤ دەردەچێت، بەڕاستی موعجیزەیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش چواردە سەدە لەمەوپێش بەوشێوە وردە وەسفی نەخۆشی تاعوونی کردووە، بەتایبەتی کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەژیانیدا نەخۆشی تاعونی نەدیوە و لەهەموو دورگەی عەرەبیشدا نەناسراوە، بەڵگەشمان پرسیاری عائیشەیە لەو بارەوە جا بابزانین زانستی نوێ لەبارەی تاعون چی دەڵێت؟

دەڵێت: هۆکاری ئەو نەخۆشیە بەکتریایەکی چیلکەیی ووردە تیرەکەی یەك ونیو مایکرۆمەترە ناسراوە بە(Yersinia pestis)، ئەو میکرۆبە بەهۆی کێچ کەلەسەر لەشی قرتێنەرەکانی وەك مشك و جرج دەژی بۆمرۆڤ دەگوێزرێتەوە، کاتێك ئەم کێچانە مرۆڤ دەگەزن میکرۆبەکە بۆ مرۆڤ دەگوێزنەوە، میکرۆبەکە دەچێتە ناوسیستمی لیمفی مرۆڤەوە و ئەگەر گەستنەکە لەبەشی خوارەوەی لەشدا بێت لیمفە گرێکانی بەرمووسڵدان ناوچەی نێوان ڕان و خوارووی سك دەئاوسێن، ئەگەر بەشی سەرەوەی لەش بێت لیمفە گرێکانی بن باڵ دەئاوسێن.

***



## ٥٥ چوارچێوەی جولەكەكانی ئەسفەهان و بەڵگەیەكی گەورەیە لە هەواڵە ڕاستەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

لەفەرموودەیەكدا كەهەردوو پێشەوا بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردووە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (على أنقاب المدينة ملائكة لا يدخلها الطاعون ولا الدجال) واتە: لەسەر دەروازەكانی مەدینە فریشتەهەن كەبەرگری دەكەن و بەهۆیانەوە تاعون و دەجال ناچنە ناو مەدینەوە. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەكی تری سوونەتە لەبواری غەیب و جیهانی نادیاردا، چونكە چواردە سەدە بەسەر پەیامەكەی پێغەمبەری خاتەمدا (صلی الله علیه وسلم) تێپەڕیووە و نەخۆشی تاعونیش بەزۆرێك لەشار و گوندەكانی جیهاندا بڵاوبۆتەوە، بەڵام ئەو نەخۆشیە بەهیچ شێوەیەك نەچۆتەناو مەدینەوە.

بەشەكەی تری فەرموودەكە بریتیە لەوەستانی مەدینەی مونەوەرە بەڕووی (مەسیحی دەجال)دا لەگەڵ باسی حەوت دەروازەكەی چونەژوورەوە بۆ مەدینە، ڕای پەسەندوبەهێز لەسەر ئەوەیە كە دەجال جولەكەبێت، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەیەكدا كەپێشەوا موسلیم ڕیوایەتی كردووە دەفەرموێت: (يتبع الدجال من يهود أصبهان سبعون ألف عليهم طيالس) كۆی (طیلسان)ە و بە(تەیلەسان) یان (تەیلەسون) دەخوێندرێتەوە، لەبنەڕەتدا وشەیەكی عەجەمیە و بە عەرەبی كراوە لەكتێبی (معيار اللغه) شدا بەمانای جل وبەرگێكی چنراو هاتووە، كەنادروێت بەسەر شاندا دەدرێت و لەش دادەپۆشێت. ڕای بەهێزیش لەسەر ئەسبەهان یان ئەسفەهان ئەوەیە كەمەبەست لەناوچەی ئەسفەهان بێت كەدەكەوێتە ناوەڕاستی ئێرانی ئێستاوە، ژمارەی ئەو جولەكانەی كەلە ئێران ماونەتەوە لەهەر سێ هەرێمی ئەسفەهان و تاران و هەمەداندا دەژین نزیكەی(٣٥)هەزار كەس دەبن (پێگەی الفتن والملاحم).

بەپشت بەستن بەسەرچاوە سەحیح و درووستەكانی ئەهلی سوونەت و جەماعەتیش ئەوە چەسپاوەكە (مەسیحی دەجال) بەزەویدا دەگەڕێت هەرچەندە كە



ناتوانێت بچێتەناو (مەککەی پیرۆز) یان (مەدینەی پیرۆز) بەڵام ڕووداوەکان لەدەوری ئەو دووشارە دەسوڕێنەوە، کەئەوەش لەوانەیە بەهۆی ئەوەبێت کەبیروڕای جولەکەکان وایە مەدینە دەکەوێتە چوارچێوەی مەملەکەتی ئیسرائیلەوە، هەروەك بانگەشەی ئەوە دەکەن و باسی مێژووی تیرە جوولەکەکانی ناوی دەکەن وەك بەنو قورەیزەو قەینوقاع و ئەوانی تر.. موعجیزەکە لەوبارەوە ئەوەیە چۆن پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زانیویەتی لەئەسفەهان جولەکەی لێیە؟ لەسەردەمێکدا کەهۆکارەکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن نەبووە، چۆن زانیویەتی کە جولەکەکان لەئەسفەهان دەمێننەوە هەتا کاتی دەرکەوتنی (دەجال) لەکاتێکدا کەزۆرێك لە جولەکەکانی جیهان کۆچیان بۆ ئیسرائیل کردووە، ئەی بۆچی جولەکەکانی ئەسفەهان مانەوە و نەچوون بۆ ئیسرائیل؟

چۆن ئەو جل و بەرگەیان (تەیلەسان)ی زانیوە کەپیاوە ئاینیەکانیان لەبەری دەکەن و وەسفی ئەم پۆشاکەی بۆ هاوەڵان کردووە؟ ئەی چۆن زانی ئەم جل و بەرگە پۆشاکی فەرمی پیاوانی ئاینی جولەکە دەبێت تا هاتنی ڕۆژی دوایی؟ بەڵێ ئەو زانیاریانەی لە خواوە بۆ هاتووە تاکو ببێتە گەورەترین بەڵگە و موعجیزە لە سەر ڕاستگۆیی و ڕاست و درووستی پەیامە پیرۆزەکەی.



## ٥٦ ئاشکرابوونی موعجیزەیەکی زانستی گەورە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی مێش:

لەساڵی(١٩٨٧)دا ڕاگری کۆلێژی زانست لەزانکۆی (ملك عبدالعزيز)کە ناوی دکتۆر (نبیه باعیشی)یە لەتاقیگەیەکی ئەو زانکۆیەدا ئەم تاقیکردنەوەی کردووە:

هەنگاوی یەکەم: مێشیان هێناوە لەبۆشاییەکدا ئابڵۆقەدراوە و ژێرەکەی ئاوی پاکژکراوە تا ووردە ووردە ماندووبووە کەوتۆتە ئاوەکەوە، پاشان مێشەکەیان فڕێ داوەو دە دڵۆپەئاویان دەرهێناوە و هەردڵۆپەی خراوەتە شوشەیەکەوە و پێی دەوترێت (ئاگار)، شوێنێکی تایبەتە بۆ میکرۆبەکان کەتیایدا بەشێوەیەکی خێرا

نەشونما دەکەن، کەقەپاغێکی پاکژکراوی هەیەو دادەخرێت و دەخرێتە (حضانة) یەکەوە، ئەم کارە پێی دەوترێت (عملیە زرع المکروب) کرداری چاندنی میکرۆب، کەبەئامێری نەشونماکردنی میکرۆب (جهازحضانة) –INCUBATOR– دەکرێت خودی کردارەکەش پێی دەوترێت (INCUBATION) کەلەناوەندی چاندنی میکرۆبدا دەکرێت کەپێی دەوترێت (MEDIA) پاش ماوەیەك نموونەکان دەهێنن هەر هەنگاوە بەجیایە:

١- ئەو نموونانەی کەمێشەکە نقووم نەکراوە هەر (١٠) نموونەکە جۆرەها ڕەنگە لەسەوز و سورو شین و قاوەیی هتد.. کەنیشانەی ئەوەیە دەیەها میکرۆب لەوئاوەدا هەبووە بەهۆی میکرۆباتی مێشەکەوە.

٢- کەمێشەکە نقووم کراوە زۆر جیاوازە لەحاڵەتی یەکەم، چونکە میکرۆبەکان زۆر کەمترن.

٣- دیسان زۆر کەمترن.

٤- تاکەتاکە میکرۆبی تێدایە کەئەوەش ترشەلۆکی ناوگەدە لەناوی دەبات.

جاخوێنەری بەڕێز: بڕوانە کە دکتۆرو تاجی سەری مرۆڤایەتی پێغەمبەری پایەدار، بەرلە چواردە سەدە وەك موعجیزەیەکی زانستی گەورە باسی لەودیاردەیەش کردووە و دەفەرموویێت: (إذا وقع الذباب في شراب أحدكم فليخمسه كله ثم ينتزعه، فإن في أحدى جنا حيه داء وفي الأخرى شفاء) رواه البخاري والدارمي و إبن ماجة و أحمد. واتە: ئەگەر مێش کەوتە ناو شلەمەنیەکانتانەوە نوقمی بکەن، یەکێك لەباڵەکانی دەردی تیایە و ئەوی دیکەشیان شیفا.

❊❊❊



## ٥٧ حیجامە بووە هۆكاری چارەسەری شاژنی بەریتانیا:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چواردە سەدە لەمەوپێش لەفەرموودەیەكدا فەرموویەتی: (عليكم بالحجامة) رواه النسائي، واتە: سوود لە حیجامە كەڵەشاخ گرتن وەربگرن. هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست چەندین جار حیجامەی كردووە و هەقی بەو كەسەش داوە كە حیجامەكەی بۆكردووە. جاحیجامە سودێكی یەكجار زۆری هەیە و زانایان و پسپۆرانی بواری تەندروستی لەزۆرێك لە ولاَتان بەتایبەتیش لە ولاَتانی ئەمریكا و ئەڵمانیا و چین و سووریا زۆرگرنگی بەحیجامە دەدەن. شاژنی بەریتانیا ئەلیزابیث توشی نەخۆشی(هیمۆفیلیا)بوو، هیمۆفیلیا نەخۆشیەكە كەمرۆڤ تووشی خوێنبەربوون دەكات و خوێنەكەشی ناگیرسێتەوە، ئەو نەخۆشیەش لەزانستی پزیشكیدا تائێستا دەرمانی تەواوی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بۆیە لەسووریاوە پزیشكی پسپۆریان بۆ شاژنی بەریتانیا بردو ئەم پزیشكەش حیجامەی بۆ شاژن كردو چاك بۆوە.



## ٥٨ گوێگرتن لەقورئانی پیرۆز یارمەتیدەرە لەهێمن كردنەوەی باری تێكچوونی دەروونی:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (ماجتمع قوم في بيت من بيوت ألله تعالى يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم إلانزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة وذكرهم الله فيمن عنده) رواه مسلم. واتە: هەندێ لێكۆڵینەوەی تازە كەلەسەر هەندی كەسی خۆبەخش ئەنجام دراوە لەولاَتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، دەری خستووە كە گوێگرتن لەقورئانی پیرۆز دەبێتە هۆی گۆڕانكاری فسیۆلۆجی و خۆنەویست لەمرۆڤدا، یارمەتیدەرە لەهێمن كردنەوەی باری تێكچوونی دەروونی. لێكۆڵەرەوەكان دەریان خستووە كەگوێگرتن لەقورئان ئارام كەرەوەی لە٩٧٪ی ئەو

حاڵەتانەیە کەتاقیکردنەوەکانیان لەسەر ئەنجام دراوە، لەکاتێکدا کەسیان زمانی عەرەبی نازانن. تاقیکردنەوەکان دەریانخستووە لەکاتی گوێگرتنی قورئاندا پلەی پێوەری نەخشەی مێشکیان لەخێرایی (١٢-١٣)لەخولەکێکدا دابەزیوە بۆپلەی هێواشی(٨-١٠)، کەئەمەیان حاڵەتی ئارامی تەواوی دەروونە، لێکۆڵەرەوەکان تێبینی ئەوەیان کردووە ئەو خۆبەخشانەی کەزمانی عەرەبی نازانن لەکاتی گوێگرتن لەقورئان هەستیان بەئارامیەکی قوڵ کردووە کەئەمەش یەکێکە لەموعجیزەکانی قورئان.



## مەی دەرمان نیە بەڵکو دەردە:

جاران هەندێ کەس دەیانووت مەی کەمێکی هیچ زیانێکی نیە، تا دکتۆرە سارالویس لەزانکۆی بریستۆل و کۆمەڵێك لێکۆڵەری تر سەلماندیان خواردنەوەی کەمێکی مەی زیانبەخشە و کاریگەری بۆدەیەها ڕۆژ دەمێنێت لەسەر لەش، ڕەنگە ئەوەش هۆیەکەی ئەوەبێت کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: ئەوەی مەی بخواتەوە تاچل ڕۆژ نوێژی وەرناگیرێت. هەروەها دەفەرمووێت: (إن الله لم يجعل شفاء كم فيما حرم عليكم) صحيح ابن حبان، واتە: خوا چارەسەری ئێوەی نەخستووەتە ئەو شتانەوە کەلەسەری حەرام کردوون.

وقدسئل الرسول الكريم (صلى الله علية وسلم)عن التداوي بالخمر فقال: (إنه ليس بدواء ولكنه داء).

دکتۆرەکانی جەمعیەی بەریتانی دڵ جەخت دەکەنە سەرئەوەی کەهەرگیز مەی دەرمان نیە. ئەوەش هەمان فەرموودەی پێغەمبەرەو لەسەدەی بیست و یەکدا ئەوان بۆیان دەردەکەوێ ئەمەش دەقی قسەکەیانە: ( However alcohol should not be used as amedicine and those who are teetotal do not need to start consuming alcohol to benefit their heart health).



## ٦٠ وەزارەتی تەندرووستی نەمسا هاوڕایە لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی زیانەکانی (تاتۆ)

تیمەکانی سەربەوەزارەتی تەندرووستی نەمسا هەڵمەتێکی گەورەیان لەپێناو هۆشیارکردنەوە و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لەمەترسیەکانی(تاتۆ)دەست پێکرد، ئەو هەڵمەتەش سەرجەم شوێنەکانی ولاّتی گرتەوە لەمیانی ئەم هەڵمەتەشدا مەترسیەکانی (تاتۆ)بۆخەڵکی بەگشتی و بۆگەنجان بەتایبەتی ڕوونکرایەوە هەروەها تیمەکانی سەر بەوەزارەتی تەندرووستی نەمسا پوختەی چەندین ڕاپۆرتی پزیشکیان لەبارەی زیانەکانی (تاتۆ)بەخەڵك ڕاگەیاند کە(تاتۆ)دەبێتە هۆی تووشبوون بەچەندین نەخۆشی و لەسەرووی هەمووشیانەوە (تاتۆ) مەترسی گواستنەوەی ڤایرۆسی ئایدزی لێدەکرێت.

هەروەها ڕوونیشیان کردەوە کە(تاتۆ)دەبێتە هۆی هەوکردنی جگەر و تووشبوون بەهەستیاری و ئازاری گورچیلەکان شایەنی باسە لەئاینی پیرۆزی ئیسلامیشدا جەستە کوتین و(تاتۆ)و ئەو جۆرە شتانە حەرام کراوە، ئەوەتە پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) لەفەرموودەیەکدا کەبوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، وەك موعجیزەیەکی زانستی ئاماژەی بەوەکردووە کەنەفرەتی خوا لەسەر ئەو کەسەدەبێت کەجەستەی خەڵکی دەکوتێت و نەفرەتی خوا بەسەر ئەو کەسەش دەکەوێت کەجەستەی بۆ دەکوترێت: قال الرسول (صلى الله عليه وسلم) (لعن الله الواشمات والموتشمات) متفق عليه، بەڕاستی هەرچی خوا و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە زانستی تازە وەك ڕۆژی ڕووناك ڕاستیەکانیان دەسەلمێنێت و بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکانە لەژیانی دونیا و هەروەها قیامەتیش.

***




## دکتۆر (ڕۆبرت بینسوون) سەرۆکی پەیمانگای دیکۆنیس لەئەمریکا ڕاستیەکی گەورەی دەرخست دەربارەی نوێژ:

لەئەمریکا کۆنفرانسێکی پزیشکی بەسترا بەسەرۆکایەتی دکتۆر ڕۆبرت بینسون مامۆستا لەزانکۆی هارڤارد و سەرۆکی پەیمانگای دیکۆنیس بۆ لێکۆڵینەوەی عەقڵ و لەش لەشاری (بوسطن) ناوبرا و پوختەی کۆنگرەکەی بەم جۆرە ڕاگەیاند: ئەوەی تازەیەو ئێمە لەم کۆنفرانسەیا پێی گەیشتووین ئەوەیەکە کاتێ مرۆڤ بەجۆرێکی تایبەت بیردەکاتەوەو نوێژ و دووعاو نزا دووبارە دەکاتەوە، گۆڕانکاری سایکۆلۆجی لەناو لەشدا پەیدا دەبێت و بەرەو چاك بوونەوە هێمنی دەبات، نوێژ بەشێکە لەخاوبوونەوە و پشوودان و یارمەتی چاك بوونەوە دەدات، لەکاتێکدا کەلەسەدا شەست تالە سەدا نەوەدی ئەوانەی سەر لەعەیادەی پزیشکەکان دەدەن نەخۆشیەکانیان پەیوەندی بە دڵەڕاوکێ و باری دەروونیەوە هەیە، کەئەمەش کەمتر دەرمان چارەسەری دەکات ئەوانەی کەبڕواداری ڕاستن بڕواکەیان کاریگەرە باشی دەبێت لەسەر نەخۆشی پەستانی خوێن و نەخۆشیەکانی دڵ و شێرپەنجە و ئایدز دەبێ، ئەوە لەیاد نەکرێت کەخوای بالآدەست یارمەتیدەرە بۆ چاك بوونەوە لە نەخۆشیەکان.




## دکتۆر(رودات) و (کینیپ کیودیل) ڕاستییەکی گەورەی تازەیان دەرخست دەربارەی سیواك:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەفەرموودەیەکی صەحیحدا دەفەرمووێت: (السواك مطهرة للفم مرضات للرب) واتە: سیواك دەم و ددان پاك دەکاتەوە و مایەی ڕەزامەندی خوایە، پاش ١٤٠٠ساڵ زیاتر دیراسات کرا لەسەر سیواك بۆ زانایان دەرکەوت کەسیواك موادی تێدایە بۆ چارەسەری ئیلتیهابی پووك. دکتۆر (رودات)

بەڕێوەبەری پەیمانگای زانستی(جراثیم والأوبئة) لەزانکۆی (روستوك) ی ئەڵمانی ماددەیەکی تێدا دۆزیەوە کەدژی بۆنکردنی ناودەمە. هەروەها دکتۆر (کینیپ کیودیل) ماددەیەکی تێدا دۆزرایەوە کەنایەڵێ ددان کلۆر ببێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (لولا ان أشق علی أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة) رواه الامام أحمد. واتە: ئەگەر گران و ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتم ئەوا فەرمانم پێدەدان کەلەکاتی هەموو نوێژەکاندا سیواك بکەن.



## زانایەکی جوولەکە دان دەنێت بەڕاستییەتی موعجیزەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

لەپەیمانگای ئەلبێرت ئەنیشتاین زانایەکی جوولەکە وتی: موحەممەد چی زانیوە لەکاری ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ (فسیۆلۆجی) دکتۆر عبدالباسط محمد کەزانایەکی گەورەی میسرییە ئەڵێ لەسەر تەلەفزیۆنی کەنەدی وەڵامم دایەوە و ئەم فەرموودەیەم بە نموونە هێنایەوە کەدەفەرمووێت: (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعي له سائر الجسد بالسهر والحمى) رواه مسلم.

دکتۆر دەڵێ: وتم ئایا پێش١٤٠٠ساڵ ئاواباسی ئەندامەکانی لەش بکات موعجیزە نیە؟ زانا جوولەکەکە وتی: بەڵێ ئەوە بنەمای زانستی فسیۆلۆجیە ئینجا وتی: ئەو فەرموودەیە لەکوێدایە؟ وتم: بڕۆ سەیری ئەو دەست خەتەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکە کەلەوڵاتی سویدە و ناوی (الصحیفه الصادقه)یە کەلەسەرەتای ئیسلامەوە نوسراوە تەوە و تەرجومەش کراوە تا ڕاستیەکانت بۆ دەربکەوێت.

## ٦٤ ئەو منداڵانەی مەلەدەكەن زیرەك دەبن:

پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) لەفەرموودەیەكدا دەفەرمووێت: (علموا أبناءكم السباحة والرماية) صحيح الجامع الصغير، واتە: منداڵەكانتان فێری مەلەوانی و ڕم هاوێشتن بكەن. دیارە پێغەمبەری خۆشەویست لەخۆیەوە قسەناكات و ئەوەی كەدەیلێت هەمووی سرووش(وەحی)خوایە خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرمووێت:﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ النجم(٣-٤)، واتە: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەهەواو هەوەسەوە لە خۆڕا قسەناكات بەڵكو هەرچی كە ئەو دەیلێت سرووش و وەحیە.

دوای ئەم هەموو سەدەیە ڕۆژبەڕۆژ سوودەكانی وەرزش بەگشتی و مەلەوانی بەتایبەتی دەردەكەوێت لە دوالێكۆڵینەوەشدا كەلەسەر مەلەوانیەوە ئەنجامدراوە دەركەوتووە مەلەوانی سوودێكی زۆر بە منداڵان دەگەیەنێت، لەم بارەوە ئاژانسی هەواڵی ئوسترالیا بڵاویكردەوە كەكۆمەڵێك لێكۆڵەر لەزانكۆی (كوینزلاند) لێكۆڵینەوەیەكیان لەسەر ١٠٠٠٠منداڵ ئەنجامداوە و ئەو ڕاستیەیان بۆ دەركەوتووە كەئەو منداڵانەی مەلەدەزانن زیاتر باوەڕیان بەخۆیان هەیە، هەروەها لێكۆڵینەوەكە ئەوەشی خستۆتە ڕوو كەئەو منداڵانەی مەلەدەزانن لەخوێندندا زیرەكن و بەتوانان، شایەنی باسە لە وڵاتی ئوسترالیا گرنگیەكی یەكجار زۆر بەوەرزشی مەلەكردن دەدرێت، ئوسترالیەكان هەر لە منداڵیەوە فێری مەلەوانی دەكرێن هەر بۆیە كەدەبینین لەیاریەكانی ئۆلۆمپیاد و پاڵەوانیەتی دیكەدا ئوسترالیەكان هەمیشە لەمەلەوانی ئەنجامی باش بەدەست دەهێنن، هەزاران دروودی خوات لەسەربێ ئەی پێغەمبەری ئازیز بەڕاستی موعجیزەی فەرموودە پیرۆزەكاتن لەڕۆژگاری زانست و تەكنەلۆجیادا وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ خەڵكی جیهان ئاشكرادەبن.

## ٦٥ لێکۆڵینەوە تازەکان سوودەکانی خەتەنەکردن ئاشکرادەکەن:

ئەوەی لەدینی پیرۆزی ئیسلام ڕێگەی پێدرابێت بێگومان پڕیەتی لە سوودوقازانج بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، چونکە سەرچاوەی ڕێگە پێدان لەئاینی پاکی ئیسلامدا قورئانی کەلامی خوا و فەرموودەپیرۆزەکانی خۆشەویستمانە (صلى الله عليه وسلم)، بۆیە ئەم دووانەش لەخێروخۆشی و ڕاستی و چاکە زیاتریان بۆ مرۆڤایەتی پێ نیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەفەرموودەیەکدا دەفەرمووێت: (**الفطرة خمس: الختان، والاستحداد، وقص الشارب، وتقليم الأظفار، ونتف الأبط**) رواه البخاري.

کەواتە: لەو پێنج شتەی کەلە فیترەتەوەن یەکێکیان بریتیە لەخەتەنەکردن، جابابزانین زانستی نوێ لەبارەی خەتەنەکردنی ڕەگەزی نێرینەوە بەچی گەیشتووە؟ پزیشکێکی ئوسترالی بەناوی (ئەلێکس وداك) لەمیانی چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (زەمیدیکاڵ جۆرناڵ ئۆف ئوسترالیا)ی ڕاگەیاند کەبڕینی ئەو پارچە چەرمەی سەر ئەندامی نێرینەی مرۆڤ، دەبێتە مایەی کۆتایی هاتنی ڤایرۆسی ئایدز، چونکە بەهۆی ئەم پارچە چەرمەوە لەڕێگەی کرداری سێکسیەوە ڤایرۆس دەگوازرێتەوە، واتە: ئەوەی ڤایرۆسی ئایدز دەگوازێتەوە ئەو پارچە چەرمەیە کەبەسەری ئەندامی نێرینەوەیە.

ئەم پزیشکە ئوسترالیە کە لەنەخۆشخانەی (سانت فینسنت) دکتۆرە ڕاشیگەیاند کە پزیشکان لەبارەی خەتەنە کردنەوە تا ئێستا بەهەڵەدا چوون، کەگوایە مەترسی هەیە، نەخێر هیچ مەترسی نیە بەڵکوسوودی زۆریشی هەیە، بۆیە داوای لەوەزارەتی تەندرووستی ئوسترالی کرد کەلەمەودوا پشتگیری لەخەتەنەکردن بکات.

لێکۆڵینەوەیەکی بەشی قەلاچۆکردنی ئایدزی سەربەنەتەوە یەکگرتووەکان لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنی جیهانیدا بڵاوکرایەوە، لێکۆڵینەوەکە زۆر گرنگ بوو دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە بەو شێوەیەیە: بەشی قەلاچۆکردنی ئایدزی سەر بەنەتەوەیەکگرتووەکان لێکۆڵینەوەیەکی لەباشووری

ئەفریقا ئەنجامداوە و، لەئاکامی لێکۆڵینەوەکەشدا گەیشتۆتە ئەو ڕاستیەی کەخەتەنەکردنی پیاوان و کوڕان بەشێوەیەکی بەرچاو بۆتە چارەسەری نەخۆشی ئایدز، لەوبارەوە (میشێل بیە) کەبەڕێوەبەری جێبەجێکاری لێکۆڵینەوەکەیە دەڵێ: لەمیانی لێکۆڵینەوەکەماندا دەرکەوتووە کەبەهۆی بلاوکردنەوەی خەتەنەکردنی ڕەگەزی نێرینە لەباشووری ئەفریقیا، ڤایرۆسی ئایدز بەڕێژەی لە ٥٥٪دابەزیووە، هەروەها ڕێژەی تووشبووان لەنێو ڕەگەزی نێردا بەڕێژەی ٧٦٪کەمی کردووە، کەئەوەش ڕێژەیەکی بەرزە لێکۆڵینەوەکەی بەشی قەلاچۆکردنی ئایدزی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان داوای ئەوە دەکات هەرچی زووە پەلەبکرێت لەبلاوکردنەوەی خەتەنەکردنی نێرینە و ئامۆژگاری خێزانە ئەفریقیەکانیش دەکات کەمنداڵەکانیان خەتەنەبکەن، هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوەکەی بەشی قەلاچۆکردنی ئایدز دەرکەوتووە کەخەتەنەکردنی نێرینە هیچ زیانێکی نیە، بەڵکو سوودێکی زۆریشی هەیە، ئەوەش هەم لەلایەنی پارێزگاریکردن و بەرگریکردن لە ڤایرۆسی ئایدز و وەلەپرۆسەی سێکسی سوود بەپیاوان دەگەیەنێت.




## کۆمەڵێك دکتۆری بیانی موعجیزەیەکی پێغەمبەریان ئاشکراکرد لەبارەی گڵ و خۆڵ:

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: ئەگەر سەگ دەمی خستە قاپێکەوە جارێك بەگڵ و شەش جاریش بەئاو بیشۆن ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ڤایرۆس و میکرۆب هەیە لەلیکی سەگەکەدا کە بەگڵەکە پاك دەبێتەوە، لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموویێت: (جعلت لي الأرض مسجدا وطهورا) واتە: زەویم بۆ کراوە بەمزگەوت لەکوێدا بێت نوێژدەکەم و، هەروەها خاك و زەویشم بۆ کراوە بە پاککەرەوە. باشە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت چۆن زانی گڵ پاك و پاك کەرەوەشە؟

گۆڤاری (العالم الجديد) لەساڵی ٢٠٠٦دا لێكۆڵینەوەی زانا (جۆن وانگ)ی بڵاوكردەوە كەلەتاقیگەكانی شاری نیوجرسی كردبووی لەئەمریكا لەسەر گڵ، كەدەتوانرێت (ئەنتی بایۆتیكی) لێ دەربهێنرێت، هەروەها دكتۆرە (لیندا ولیامز) جەخت دەكاتەوە سەرئەوەی كەلەگڵدا زیاتر لەماددەیەكی پاككەرەوە هەیە، تاقیكردنەوەكانیش سەلمانیان كەقوڕ دەتوانێت موستەعمەرەیەكی كامیلی جراثیم لە(٢٤)كاتژمێردا لەناوبەرێت، كەئەگەر ئەو قوڕەنەبێت لەو ماوەیەدا (٤٥)قات زیاد دەكات!

دكتۆر(هایدل) كەزانایەكی بواری (الاحياء الدقيقة)یە دەڵێ: ئێستا دەتوانین پەیوەندی نێوان زانستی زەوی و خانەی زیندوو بدۆزینەوە، تاساڵێك لەمەوبەر من گڵم بەپیس دەزانی بەڵام ئێستا بەماددەیەكی پاككەرەوەی دەزانم، پێش چەند ساڵێكیش ژنە دكتۆری فەرەنسی (لین برینیت) لەقوڕی سەوزی فەرەنسی چارەسەری نەخۆشی دۆزیەوە، وەك ئەنتی بایۆتیك بەكاری هێنا، لەكینیا و ساحل العاج و ڕێكخراوی تەندروستی جیهانیش سەرسامی خۆیان بەرامبەر دۆزینەكەی دەربڕی، (ألله أكبر) لەو موعجیزە زانستیە گەورەیە ئەی مولحیدانی جیهان لەدوای دەركەوتنی ئەم ڕاستیە گەورەیە چاوەڕوانی چیتردەكەن؟ سووێندبەخوا ئەوكەسانەی كە ئاشنانین و دوورن لەپەیامەكەی ئەم پێغەمبەرە ئەگەر خۆیان نەخەڵەتێنن و ڕانەكەن لەبەڵگە زانستییەكان ئەم موعجیزە زانستیە گەورەیەی پێغەمبەریان بەسە بۆ ئەوەی گومان و دوودڵی ناودڵەكانیان ڕابماڵێت و بیانگەیەنێتە كەناری دڵنیایی.

***



## ٦٧ تاعون ناچێته مەککە و مەدینە:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (**المدینة و مککة محفوضتان بالملأئکة علی کل نقب منها ملك لایدخلها الدجال ولاالطاعون**) رواه الطبرانی، واتە: مەککەو مەدینە مەلائیکەت دەوریان داون و لەهەموو لایەکەوە دەیپارێزن نەدەجالْ و نەتاعون ناچێتە ناویانەوە، دکتۆر علی ئەلبار دەڵێت: تاعون دەردێکی کۆنە و میسریەکۆنەکان لەسەر پەڕەی (البردی) شتیان لەسەر نوسیوە و باسیان کردووە، لەساڵی(٥٤٢)ی پێش زاین تاعون لەسەرووی ئەفریقیا و ئەوروپا و ئاسیادا بڵاوبووەتەوە، پەنجا ساڵ لەو وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات دەگوێزرایەوە، نزیکەی سەد ملیۆن کەسی لەناوبرد، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت: (**إن هذا الطاعون رجز علی من کان قبلکم**) واتە: ئەو تاعونە سزایەك بووە لەسەر گەلەکانی پێش ئێوە.

ئینجا تاعون ناوبەناو دەرکەوتووە تەنانەت لەزەمانی ئیمامی عومەردا لەشاری (عمواس) تاعون بڵاوبۆوە، لەسەدەی چواردەی میلادیشدا ئەوروپا و ئاسیای گرتەوە و تەنها لەئەوروپادا بیستو پێنج ملیۆن کەسی لەناوبرد، کەیەك لەسەرچواری دانیشتوانی هەموو ئەوروپابوون و ناونرا (**الموت الأسود**) تائێستاش ناوبەناو بڵاودەبێتەوە، لەهیند و وڵاتانی تردا تەنها دوو شوێنێك تائێستا و تاقیامەت تیایدا بڵاو نابێتەوە مەککەو مەدینەیە، کەئەوەش یەکێکە لەموعجیزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەخوای گەورە فێری کردووە.

***



## دۆزینەوەکەی دکتۆر (کارنەر) موعجیزەی فەرموودەیەکی ئاشکراکرد:

لەسالآنی پەنجاکاندا بەریتانیا ئەفسەرێکیان فێری عەرەبی کرد بەحەوت ساڵ و ناردیان لەرێی مەغریبەوە وەك حاجیەك کەبچێتە میسر و پاشان بۆ مەککەی پیرۆز، ئەمەش بۆ ئەوەی پارچەیەك لەبەردە رەشەکە بکاتەوە تا تاقیکردنەوەی لەسەر بکەن، بەهەرحاڵ پیاوەکە کەناوی ریچاردبوو فرسەت دێنێ و پارچەیەك لەبەردە رەشەکە دەکاتەوە لەکاتێکی چۆڵیدا و دەیباتە سەفارەتی بەریتانیا و ئەو شەوە لەخۆشیدا ئاهەنگ دەگێرن. پاشان بەخێرایی دەگەرێتەوە بەریتانیا و لەمەتحەفی بەریتانی فەحسی بەردەکە دەکەن لەلایەن پرۆفیسۆر (رید)ەوە، سەرەنجام رایدەگەیەنن کەئەو بەردە بەردی سەر ئەم زەویە نیە، کەئەم ئەنجامە بەریچارد دەڵێن یەکسەر دەبوورێتەوە.

پاشان ناوبراو ئەمەی لەپەراوێکدا بەناوی(گەشتێك بۆ مەککە)لەدوو بەرگدا تۆماردەکات، کەبەراستی ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە و بەڵگەو نیشانەیەکی دیار و ئاشکرایە (دکتۆر عبدالباسط محمد السید) کەزانایەکی میسری پسپۆرە لەبواری پزیشکی و (طب النبوی)دا، لەبەرنامەی (ساعه حوار)ی کەناڵی(المجد) دا لەشەوانی مانگی یەکی ساڵی(٢٠٠٥)دا رایگەیاند کە دکتۆر(کارنەر) لەمەتحەفی بەریتانیا پارچەیەکی بچووکی بەردە رەشەکەی وەرگرتووە و تاقیکردنەوەی لەسەر کردووە، پاشان رایگەیاندووە کەئەو بەردە وەك (أشیاۃ الموضلات) ێك وێنەی نیە لەسەر زەوی و، لەکۆمەڵەی خۆریشدا چونکە دەتوانرێ دووملیۆن خەتی تەلەفۆنی لێ ببەسترێ.

خوێنەری بەرێز بروانە چۆن پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی زانستی نوێی سەردەمیش بەتاقیکردنەوە وەك رۆژی رووناك ئەم موعجیزەیەی سەلماند، بەراستی کەسانی دوور لەدین ئەگەر لەبەڵگەزانستیەکان رانەکەن ئەوەیان بەسە، بۆئەوەی بەتەواوی دڵنیابن و گومانی ناودڵەکانیان برەوێتەوە و رووبکەنە ئاینی پاکی ئیسلام.



## زانستی تازە بەبەڵگەوە گرنگی عومرە کردن دەسەلمێنێت:

ڕۆبەرت کانزی زانایەکی پسپۆرە و دەڵێت: هەر کەسێك بهێنی بەئامێری تایبەت فەحسی بکەی دەبینی ڕووناکی یەك بەدەووری لەشیا هەیە کەپێی دەووترێت (الجسم الاثيري)، جا ئەو ڕووناکیە لەکاتی تاواندا ڕەنگێکە و لەکاتی خواپەرستیدا ڕەنگێکی ترە و لەکاتی نەخۆشیدا لاوازە و لەکاتی ساغی دا بەهێزە. ڕۆبەرت کانزی تاقیکردنەوەی کرد لەسەر زۆر کەس لەئەورووپا بۆی دەرکەوت ڕەنگەکان وەك پێویست نین و شێواویەکی تیدایە. کەچی موسڵمانێکی فەحس کرد بینی ڕەنگەکان هاوسەنگی و ڕێکوپێکی تیایە، تەنانەت لەکاتی دەست نوێژدا زۆر زیاتر بەرەو سپێتی دەچێ و زیاتر هێمنی و دڵنیایی و پاکێتی لەکەسەکەو ڕەنگەکەی دا دەردەکەوێ، پاشان دکتۆر ڕۆبەرت لەسەر سی و حەوت کەس تاقیکردنەوەی کرد لەمەککە پێش ئەوەی عومرە بکەن بۆی دەرکەوت هەندێکیان ڕەنگی ڕووناکیەکەی دەووری لەشیان قاوەیی تۆخە و هەندێکی تریان ڕەشەو هەریەکی بەجۆرێك پاش عومرەکردن فەحسی کردنەوە ڕەنگی ڕووناکیەکەی دەووری لەشیان هەمووی بوو بەسپی، کەبەمەش سەلماندی تاکوێ عومرە ڕۆڵی خۆی هەیە لەپاك بوونەوەی ماددی و موعنەوی دا، بەڕاستی هەرچی کەخواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویانە پڕیەتی لەسوود و قازانج بۆمرۆڤی بڕوادار لە ژیانی دنیاو هەم بۆ ڕۆژی قیامەتیش.



## قەدەغەکردنی خواردنەوە لە شوێنی شکاویەوە لە فەرموودە و زانستی تازەدا:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەی کردووە لە شوێنی قرنجاوی یاخود درز و شکاویی جام و پەرداخەوە شلەمەنی بخورێتەوە، هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ پیس بوونی ئەو شوێنە بە میکرۆبی زیانبەخش کە دواتر زیان دەگەیەنێت بە تەندروستی

ئەگەر کەسێك بە کاری بهێنێت و تێیدا بخواتەوە، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (نهى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عن الشُّرب من ثُلمةِ القرح) صحيح ابن حبان (٥٣١٥). واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە لە خواردنەوە لە شوێنی درز و قرنجاوی جام و پەرداخەوە.

خوێنەری بەڕێز: جا با بزانین دۆزینەوە زانستییەکان چی دەڵێن: لەو بارەوە لە سەدەی حەڤدەدا دۆزرایەوە کە شوێنی ئەو قرنجاوی و شکاوی و درزانە دەبنە مۆڵگەی بەکترای زیانبەخش کە بە شوشتنی ئاسایی ئەو مۆڵگانە پاك نابنەوە بگرە ئەو بەکتریایانە زیاد دەکات، هەروەها هەندێك جۆری قاپ و پەرداخ ماددەی قورقوشمیان تێدایە کە بە سیرامیك یان پلێت یان ئەلەمینۆم یان شوشە و ماددەی تر دەورە دراون، کاتێك شکانیان تێدا بێت ئەو قورقوشمە دەچێتە ناو خواردنەکەوە و زیانی زۆری دەبێت، هەندێك ماددەی تریش کە قاپ و پەرداخیان لێ دروست دەکرێت کاتێك شکانیان تێدا بێت و خواردن یان خواردنەوەیەکی گەرمیان تێ بکرێت کارێکی کیمیایی ڕوودەدات، کە ئەوەش زیانی زۆرە لەسەر تەندروستی چونکە بە مایکرۆسکۆب بینراوە ئەگەر شکاویەکە بچوك بێت یان گەورە شوێنی کۆبوونەوەی میکرۆب و بەکتریا زیانبەخشەکانە و ئاسایی پاك نابێتەوە و کاریگەری خراپی خۆی هەر دەبێت، تەنانەت شۆردنیش سودی نییە. بڕوانە چۆن زانستی تازەی سەردەم هاوڕایە لەگەڵ فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

***




## زانستی نوێ هاوڕایە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی دواهەمین دروستکراو کە مرۆڤە:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: دواهەمین دروستکراو ئادەمە کە خوای گەورە لە دوا کاتژمێری عەسری ڕۆژی هەینی بەدیهێناوە، دیارە ئەو ڕۆژانە جیاوازن لەم ڕۆژانەی ئێستا: (وخلق آدم بعد العصر من يوم الجمعة: في آخر الخلق في آخر ساعة من ساعات الجمعة فيما بين العصر إلى الليل) قال الألباني صحيح.

زانایان ئەمڕۆ گەشتونەتە ئەوەی کە نزیکەی چواردە ملیار ساڵە بونەوەر پەیدا بووە و تەمەنی خۆر و زەویش نزیکەی پێنج ملیار ساڵە، ملیاران ساڵی پێ چووە تا وای لێهاتووە بە کەڵکی ژیانی مرۆڤ بێت و دواهەمین مەخلوقیش ئادەمیزادە کە خوای گەورە بەدیهێناوە، زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی تەمەنی ئادەمیزادەوە لەسەر زەوی و دەڵێن: کۆنترین شوێنەواری مرۆڤ لە ئەفریقیا دۆزراوەتەوە کە بۆ ٢٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە و، هەندێکیش دەڵێن: ٤٠ هەزار ساڵە مرۆڤ هاتۆتە سەر زەوی. بەڕاستی ئەوەش یەکێکی ترە لە ئیعجازە زانستییەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڕاستی سەیرە ئاخۆ دەبێ مولحیدەکان دوای دەرکەوتنی ئەو ئیعجازە گەورەیە تاکەی لە بیابانی سەرگەردانیدا بسوڕێنەوە.

## ٧٢ سودەکانی ئاو خواردنەوە لەگەڵ خواردندا:

لە کاتێکدا کە دەیان ساڵە زانایان پێیان باشە زۆر ئاو لەگەڵ خواردندا نەخورێتەوە، دکتۆرێکی مسوڵمان هەمیشە دەیوت: هەرچەند ئاو بخورێتەوە لەگەڵ خواردندا زیانی نییە و بگرە سودیشی هەیە بۆ هەرسکردن، بە مەرجێك گەدەت بکەیت بە سێ بەشەوە: یەك لەسەر سێی بۆ خواردن و یەك لەسەر سێی بۆ ئاو و یەك لەسەر

سێشی بەتاڵ بێت تا بتوانی هەناسە بدەیت، ئەو پێش لە تێگەشتنی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: (ما ملء أدميٌّ وعاءً شرًّ من بطن، بحسب ابن آدم أكلات يقصن صلبه، فإن كان لا محالة فثلث لطعامع وثلث لشرابه وثلث لنفسه) سنن الترمذي: ٢٣٨٠، حسن صحيح.

کەچی لەم ساڵانەی دوایدا زانایان پاش تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوە گەشتنە ئەم ئەنجامە کە بەڵێ چەند ئاو بخورێتەوە لەگەڵ خواردندا قازانجی هەیە و زیانی نییە.

لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا کە زانکۆی ئۆکسفۆرد کردوویەتی: دەرکەوتووە کە مرۆڤ بە فیترەت باوەڕی بە (الله) و بە ڕۆژی دوایی هەیە، هەروەها نزیکەی (٤٠) لێکۆڵینەوەی جیاواز لە وڵاتە جیاوازەکان و پسپۆڕییە جیاوازەکان و لێکۆڵینەوە شیکاریەکاندا کراوە، ئەوەیان سەلماندووە کە مرۆڤ چەند مەیل و ئارەزوویەکی هەیە بۆ باوەڕبوون بە پەروەردگار و باوەڕبوون بە ئاخیرەت، لێکۆڵەرەوانی زانکۆی ئۆکسفۆرد دەڵێن: شتێك کە لە ناخی مرۆڤدا دۆزرایەوە و لەگەڵی لەدایك دەبێت باوەڕبوونە بە خوا و بەڕۆژی دوایی، پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) چواردە سەدە پێش ئەم زانایە ڕایگەیاند کە: (ما من مولد إلا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه وينصرانه ويمجسانه) رواه مسلم. ئەم فەرموودەیەش شایەتی لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەری ئازیزمان دەدات، کە هاوتایە لەگەڵ سەرجەمی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە بە سەرپەرشتی زانکۆی ئۆکسفۆرد بە بەشداری ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵەران لە بەرواری (٢٠١٣/٥/١١) ئەنجامدرا و نزیکەی سێ ملیۆن دۆلاری تێدا خەرجکرا.

خوێنەری بەڕێز: بڕوانە لێکۆڵینەوە زانستیەکەی و فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەقاودەق هاوڕان لەگەڵ یەکتری.




## زانستی تازە سەلماندی خانەکانی مێشکی منداڵ بەرنامەڕێژ کراوە:

زانایان ئەوەیان دۆزییەوە کە منداڵ لەدایك دەبێت، مێشکی بە چەند بیروبۆچونێکی دیاریکراو و ئامادەکراوە، وەك ئەوەی کە پەروەردگار دروستکاری گەردوونە هەموو شتێك هۆکارێکی هەیە و پەروەردگار تەنیایە و هیچ هاوەڵێکی نییە؟ پاش چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر مێشك لەلایەن زانایانەوە بۆیان دەرکەوت کە خانەکانی مێشك ئامادەکراون بۆ ڕاستی و خانەکانی مێشکی منداڵ بەرنامەڕێژ کراوە تا ڕاستگۆ بێت نەك درۆزن. هەروەها چاکە و خراپە جیابکاتەوە، هەروەها بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆژنامەی تێلیگراف ساڵی ٢٠١١ی زاینی جەخت لەوە دەکاتەوە کە باوەڕبوون بە پەروەردگار فیتری و سروشتییە، بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی و بەشێکیشە لە پێکهاتەی مرۆڤ.




## موعجیزەی زانستی نوێ و بەکارهێنانی سیواك:

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی صەحیحدا دەفەرموێ: {السواك مطهرة للفم مرضاة للرب} واتە: سیواك دەم و دان پاك دەکاتەوەو مایەی ڕەزامەندی خوایە. پاش هەزارو چوارسەد ساڵ زیاتر دیراسات و لێکۆڵینەوە کرا لەسەر سیواك بۆ زانایان دەرکەوت کە سیواك مەوادی تێدایە بۆ چارەسەری ئیلتهابی پووك. دکتۆر (رودات) بەڕێوەبەری پەیمانگای زانستی (جراثیم والأوبية) لە زانکۆی (روستوك)ی ئەڵمانی ماددەی تیا دۆزییەوە کە دژی بۆن کردنی ناو دەمە، هەروەها دکتۆر (کینیث کیودیل) ماددەیەکی تیا دۆزییەوە کە نایەڵێ دان کلۆر ببێت. پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە، درووود لە گیانی پاکی پێغەمبەر ﷺ کە موعجیزەی فەرموودەکانی لە ڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆجیادا وەك ڕۆژی ڕووناك دەدرەوشێنەوە.



## زیادبوونی هەورە بروسکەو ئیعجازی فەرموودەیەك:

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا ئاماژەی بە زیادبوونی دیاردەی هەورە بروسکە کردووە، دەفەرموێت: {تكثر الصواعق عند اقتراب الساعة حتى يأتي الرجل القوم فيقول: من صعق قبلكم الغداة؟ فيقولون: صعق فلان وفلان.} مسند أحمد واتە: بە نزیکبوونەوەی ئاخیری زەمان هەورە بروسکە زۆر دەبێت بە جۆرێك یەکێك لەناو کەسەکانیدا پرسیار دەکات ئاخۆ ئەو بەیانییە کێ هەورە بروسکە لێیداوە؟ ئەوانیش دەڵێن فلان و فلان. ئەم فەرموودەیە دوو ئیعجازی زانستی تێدایە:

١. زیادبوونی هەورە بروسکە.

٢. زیادبوونی قوربانییەکانی هەورە بروسکە.

زانستی نوێ هاوڕایەو پشتگیری فەرموودەکە دەکات، لە توێژینەوەیەکدا کە لە ساڵی (٢٠١٤)ی زایینی لە ئەمریکا ئەنجامدراوە دەرکەوتووە کە دیاردەی گەرمبوونی زەوی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە زیادبوونی هەورەبروسکەوەو بە ڕادەیەك بۆ هەر بەرزبوونەوەیەکی یەك پلەی سەدی گەرمی زەوی دەبێتە هۆی زیادبوونی بروسکە بە ڕێژەی (٥–١٢٪).

هەروەها ساڵانە نزیکەی (٢٥) ملیۆن جار هەورە بروسکە لە ئەمریکا ڕوودەدات. لە توێژینەوەیەکی تردا کە لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە بێرکلی ئاماژە بەوە کراوە کە هەورە بروسکە بە ڕێژەی ٥٠٪ زیادی کردووە ئەوەش پەیوەندی بە گۆڕانی کەشوهەواوە هەیە. ماڵپەڕی BBC ساڵی (٢٠١٨) زایینی دا بڵاوی کردەوە لە ماوەی تەنیا ١٣٠ کاتژمێردا ٣٦ هەزار و ٧٤٩جار هەورە بروسکە داویەتی لە ویلایەتی (ئاندرابردیش) لە باشوری هیندستان. هەروەها بە گوێرەی توێژینەوەیەکی تر کە لەلایەن توێژەر (ئۆسمارپینتۆجونیەر) لە پەیمانگای نێونەتەوەیی بەرازیل بۆ توێژینەوەی فەزایی کراوە، ئاماژە بەوە دەدات لەناوجەرگەی دارستانەکانی ئەمازۆن لەسەدا پەنجا هەورە بروسکە زیادی کردووە لە سی ساڵی ڕابردوودا، هەروەها بە گوێرەی زۆرێك لە تێڕوانینەکان ژمارەی قوربانیان بە هەورەبروسکە بەردەوام لە بەرزبوونەوەدایە.



## دەرکەوتنی چەندین زانیاری سەرسوڕهێنەر دەربارەی نوێژ:

پێغەمبەر ﷺ نوێژی بە نووری چاو نابردووەو تا کۆتاییەکانی ژیانی پیرۆزی زۆر بە چێژو گەرم و گوڕییەوە ئەنجام داوە، وە دەفەرموێت: {ما من مسلم يتوضا فيُحسن وضوءه ثُمَّ يقوم فيُصلي ركعتَين مُقبل عليها بقلبه ووجهه إلا وجَبَت لَهُ الجنة} أخرجه مسلم. واتە: هەر موسڵمانێك دەستنوێژ بگرێت بە تێر و تەواوی، ئەمجا هەستێ دوو ڕکات نوێژ بکات دڵی ئاگادار بێت، واتە: بیر لە مانای نوێژەکە بکاتەوە و بە ملکەچی بیکات ئیلا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

لە توێژینەوەیەکدا کە لەلایەن دوو دکتۆری مالیزی ئەنجام دراوە هەڵسەنگاندن بۆ ئەو گۆڕانکارییانە کراوە کە لە لێدانەکانی دڵ و پەستانی خوێندا ڕوودەدات، لە کاتی ئەنجامدانی جووڵەکانی نوێژدا، هەروەها کاریگەری خوێندنی ئایەت و زیکرەکان لە نوێژدا لەسەر لێدانی دڵ و پەستانی خوێنی نوێژخوێن، توێژینەوەکە لەسەر ٣٠ پیاو کراوە کە تەمەنیان لەنێوان ٢٠ بۆ ٣٠ساڵدا بووە و هیچ کێشەیەکی دڵ و سووڕی خوێنیان نەبووە، داوایان لێکراوە بە ئەنجامدانی نوێژ و لەڕێی بەکارهێنانی چەندین ئامێرەوە کە لە سنگی خۆبەخشەکان بەستراوە، چاودێری لێدانی دڵ و پەستانی خوێنیان کراوە لە کاتی هەر جووڵەیەکی نوێژەکەیاندا ئەم تاقیکردنەوەیان لە دوو باردا پێ ئەنجام داون، جارێك بە ئەنجامدانی نوێژی ڕاستەقینە و جارێکیش بە ئەنجامدانی نوێژێکی ڕواڵەتی، واتە: تەنها جووڵەکانی نوێژ و بەبێ خوێندنی قورئان و زیکرەکانی ناو نوێژ.

لە ئاکامی توێژینەوەکەیاندا دەرکەوت لە کاتی وەستانەکانی نوێژدا بەرزترین لێدانی دڵ تۆمار دەکرێت و لە چەمانەوەدا نزمترین ئەوەش بەهۆی ئەوەیە لە کاتی وەستاندا بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە خوێن لە خوێنهێنەرەکانی خوارەوەی جەستەوە و پەلەکانەوە کەمتر دەگەڕێتەوە بۆ سەرەوە، بەڵام لە سوجدەدا بەهۆی زیادبوونی گەڕانەوەی خوێن لە خوێنهێنەرەکانەوە و نزمی ئاستی مێشك لەچاو دڵ و

بەشەکانی تری جەستەدا بەهۆی هێزی ڕاکێشانی زەوییەوە خوێن زۆرتر بەرە و مێشك دەچێت، بەوەش ڕێژەیەکی زۆری ئۆکسجین بە مێشك دەگات، کە ئۆکسجین پێویستی بنەڕەتی خانەکانی مێشکە بۆ کارکردن، ڕێژەی بەرزی ئۆکسجین لە خانەکانی مێشکدا دەبێتە هۆی زیادبوونی تەرکیزی بینین و بیستن.

هەر بۆیە ئەو کەسانەی بەرێکوپێکی نوێژ دەکەن ئاسانتر دەتوانن بەسەر کێشە فیزیکی و هزرییەکاندا زاڵ بن، بەپێی لێکۆڵینەوەکە لێدانەکانی دڵ لە سوجدەی نوێژی ڕاستەقینەدا زیاتر تۆمار کراوە وەك لە نوێژە ڕواڵەتییەکە ئەویش بەهۆی خوێندنی ئایەت و زیکرەکانەوە کە پێویستی ڕەوانەکردنی خوێن بۆ ماسولکە و جومگەکانی مل و دەم زیاتر دەکات، پاشان لەپێش و پاش ئەنجامدانی نوێژ پەستانی خوێنی خۆبەخشەکان پێوراو دەرکەوت لەپاش هەردوو توێژینەوەکە پەستانی خوێنی خۆبەخشەکان دابەزی، بۆیە توێژینەوەکە دەریخست فشاری خوێن بە کاریگەری نوێژ دادەبەزێ کە ئەوەش دەبێتە هۆی زاڵبوونی سیستمی دەماری پاراسیمپاثی لە جەستەدا کە ئەرکی ڕاگرتنی هاوسەنگی جەستەییە لە کاتی پشوودا، بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەرکەوت جووڵەکانی نوێژ وەرزشێکی گونجاوە کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی توانای دڵ.

نوێژ دەکرێت وەك چارەسەر بۆ نەخۆشانی دڵ بەکاربێت، لێدانی دڵ لە نوێژی ڕاستەقینەدا بەرزتر بەدی کرا وەك لە نوێژی ڕواڵەتی بەهۆی خوێندنی ئایەت و زیکرەکانەوە کە ئەویش زیاتری فسیۆلۆژی بۆ جەستە دەستەبەر دەکات. خوێنەری بەڕێز بڕوانە چۆن فەرموودەکە فەرمووی: زانستی تازەش بە بەڵگەوە سەلماندی هەزاران درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ.

***



## زانستی تازەو سوودەکانی بەڕۆژوو بوونی شەش ڕۆژەکەی مانگی شەوال:

لە ماڵپەری بەختەوەری دا بابەتێك لەلایەن (هیمداد خالیدەوە) بڵاوکراوەتەوە کە بە ڕاستی گەورەیی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و پێغەمبەرە بەڕێزەکەی دەردەخات، چونکە موعجیزەیەکی دەربارەی بەڕۆژووبوونی شەش ڕۆژی شەوال تێدایە، لە بابەتەکەدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {من صام رمضان ثم اتبعه ستا من شوال كصيام الدهر} رواه مسلم. واتە: ئەوەی کە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و دواتریش شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بەڕۆژوو بێت ئەوە وەکو ئەوە وایە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بوو بێت.

جا لە ڕووی زانستییەوە ئەوە سەلمێنراوە کە بەڕۆژوو بوونی یەك ڕۆژ دەبێتە هۆی دروستبوونی چەند خڕۆکەیەکی سپی لە لەشدا. جا دروست بوونی ئەم ڕێژەیەش لە خڕۆکە سپییەکان تەندروستی جەستەی مرۆڤ دەپارێزێت بۆ ماوەی دە ڕۆژ، ئەوەش سەلمێنراوە کە بەڕۆژوو بوونی یەك ڕۆژ جەستە پاك دەکاتەوە لە ژەهراوی بوونی لەش لە دە ڕۆژدا، جا بە واتایەکی گشتی لە ڕووی زانستی پزیشکییەوە ئەوە سەلمێنراوە کە هەموو مرۆڤێك پێویستی بە بەڕۆژوو بوونی (٣٦) ڕۆژ هەیە تاکو جەستەی پاك ببێتەوە لەو شتە زیانبەخش و ژەهراویانەی کە لە گەدەو لەشدا کۆدەبێتەوە، لەبەرئەوە مرۆڤ کاتێك (٣٠) ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێت کەواتە (٣٠٠) ڕۆژ جەستەی پاك دەبێتەوە لە ژەهراوی بوون، جا لێرەدا ئیعجازەکە بەدیار دەکەوێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ویستوویەتی کرداری پاکبوونەوەی لەشی مرۆڤ تەواو بێت بە بەڕۆژوو بوونی ئەو شەش ڕۆژە شەش ڕۆژ لە شەوال×١٠=٦٠ ڕۆژی خاوێن کەواتە ٣٠٠+٦٠=٣٦٠، بەڵێ ٣٠٠ ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان لەگەڵ ٦٠ ڕۆژ لە شەوال یەکسانە بە ٣٦٠ ڕۆژی خاوێن. بەمشێوەیە جەستەی مرۆڤ تەندروست و بەهێز دەبێت بە درێژایی ساڵ.



## زانستی تازە سوودەکانی بەڕۆژوو بوونی دوو ڕۆژ لە هەفتەدا ئاشکرا دەکات:

ڕۆژنامەی (گاردیان)ی بەریتانی بڵاویکردەوە کە تیمێکی پزیشکانی ئەمریکی لە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەکدا گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کە ئەگەر مرۆڤ لە هەفتەیەکدا بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، ئەوە مێشکی مرۆڤ لە ترسناکترین دوو نەخۆشی دەپارێزێت کە ئەوانیش بریتین لە نەخۆشی (زەهایمەر) و (بارکینسۆن)، کە بە ئیفلیجبوونیش ناودەبرێت، ئەم تیمە پزیشکییە سەر بە پەیمانگای نیشتمانی بۆ پیرانن، کە بارەگاکەیان لە شاری (بالتیمۆر)ی ئەمریکایە، شایانی باسە پێغەمبەر ﷺ لە هەفتەیەکدا دوو ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو کە ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە بوون. لە خوای پەروەردگار داوا دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیەی پێغەمبەر ﷺ بکاتە مایەی زیاتر پتەوبوونی ئیمانی موسڵمانان، وە بە هەمان شێوە بیانوو بڕینێکیش بێت بۆ هەموو ئەو مولحیدانە کە دوورن لە ئاینی پاکی ئیسلام و ببێتە مایەی هیدایەتیان و ڕەوینەوەی گومانی ناو دڵەکانیان.



## دەست خستنە سەر ڕوومەت لە کاتی نوستندا:

پێغەمبەر ﷺ لە کاتی نووستندا دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی و دەیفەرموو: {اللّٰهُمَّ قني عذابك يوم تبعث عبادك}. زانایان سەلماندیان چالاکییەك لە نێوان دەستی ڕاست و بەشی ڕاستی مێشك ڕوودەدات ئەوەش کاتێك دەبێت بەرکەوتن لە نێوانیان ڕووبدات، ئەوەش دەبێتە هۆی ڕوودانی زنجیرەیەك شەپۆل کە مێشك لە بارگەی زیانبەخش و زیادە چاکی دەکاتەوە، لە ئەنجامدا دەبێتە هێوربوونەوەیەکی باش و خەوێکی نموونەیی. هەزاران درووودت لەسەر ئەی خۆشەویستی خوا کە موعجیزەی فەرموودە پیرۆزەکانت لەم ڕۆژگارەدا وەك ڕۆژی ڕووناك دەدرەوشێنەوە.






## ٨٠ فووکردن بە لەشدا لە کاتی نوستن ئیعجازی زانستی تیایە:

زیندەوەرێك هاوڕێی مرۆڤە لە کاتی نوستندا، شێوەی لە مێروولە نزیکە، بەڵام لەگەڵ ئەو جیاوازە ئەم زیندەوەرە لە شوێنی جێگای نوستن و ناو بەتانی و لێفەو بالیفدا دەژی، باشترین ڕێگا بۆ لەناوبردنی وا چاکە ئەو جلانە بدەیتە بەر ڕۆژ، چونکە ئەو زیندەوەرە بە گەرما و تیشکی ڕۆژ تێکدەچێ و دەمرێت، ئەو زیندەوەرە بە شوشتن کاری تێناکرێ و نامرێت پێش ئەوەی بخەون سێ جار فوو لە دەوروبەرتان بکەن، کە ئەوە سوونەتێکی پێغەمبەرمانە لە کاتی نوستندا، ئیعجازی زانستی تێدایە. زانایان ئیسپاتیان کردووە کە کاتێ مرۆڤ دەخەوێ چەند خەلایەك دەمرێ لە لەشیدا لە کاتی نوستن دەکەوێتە شوێنی نوستنەکە و دەمێنێتەوە، کاتێ لە خەو هەڵدەستێتەوە ئەم خەلایانە دەمێننەوە، پاشان کە دیسان بۆ جارێکی تر دەخەوێتەوە ئەم خەلایانە دەکەونە خوارەوە لە نێوان ئەو و ئەو دا کاری کیمیاوی ڕوودەدات و تێکدەچێت، جا ئەو خەلایانە دەچنە ناو لەشی مرۆڤ و دەبێتە هۆی نەخۆشی، ئەم خەلایانە بەچاو نابیندرێ تەنها لەژێر میکرۆسکۆب نەبێت.

زانایانی ڕۆژئاوا زۆر هەوڵیاندا کە ڕزگاربن لەو زیندەوەرانە بە چەندەها جۆر سابوون و مەوادی شوشتن، بەڵام بێئەنجام بوو، پاشان زانایەکی تر هەستا بە کاری فووکردن سێ جار لە شوێنی نوستنەکەدا بۆی دەرکەوت کە خەلایەکان نامێنن و لەناودەچن. زۆر دڵی بەو دۆزینەوەیە خۆش بوو تا موسڵمانێك ئاگاداری کردەوە کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ زۆر لە مێژە ئەوەی فەرمووە کە فوو بکەین سێ جار لە شوێنی نوستنمان پێش ئەوەی بخەوین، کە دەفەرموێ: ({ إِذا أَوَى أَحَدُكُم إِلَى فِراشِهِ، فَلْيَنْفُض فِراشَهُ بداخِلَةِ إِزَارِهِ فإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ }. خوێنەری بەڕێز: بڕوانە چواردە سەدە لەوەوبەر پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرمووە کە تازە زانستی نوێ ئەوەی ئاشکرا کردووە بەڕاستی سەیرە ئەو کەسانەی کە مولحیدن پاش ئەو هەموو بەڵگە زانستیانە دەبێ چاوەڕێی چی تر بکەن؟





## سودەکانی خورما بۆ ژنان لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و زانستی نوێدا:

ماوەیەك پێش ئێستا هەندێك لە زانایان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە خورما لە هەموو شتێك باشترە بۆ شکاندنی ئازاری منداڵبوون و ئاسان هاتنە دەرەوەی منداڵەکە و زووتر حەسانەوەی ئافرەت. ئەم زانایانە دوای لێکۆڵینەوە لەسەر خورما و تاقیکردنەوەی لەسەر ئافرەتی دووگیان لە کاتی بوونی منداڵەکانیان گەیشتنە ئەم ئەنجام و سوودانەی لە خورما و قەسپەوە وەردەگیرێ بۆ ئافرەتان، بە گشتی و ئەوانەی سکپڕن و لەسەر منداڵبوونن.

سوودەکان:

١- هۆکارێکی کاریگەرە بۆ بەهێزکردنی ڕەحمی ئافرەتان و یەکگرتنەوە دوای هاتنە دەرەوەی منداڵەکە.

٢- ڕێژەیەکی زۆری تێدایە لە ماددەی (کالیسیۆم) کە هۆکارێکە بۆ دروستبوون و بەهێزبوونی ئێسکەکان.

٣- ڕێژەیەکی زۆری ئاسن و فسفۆری تێدایە.

٤- هۆرمۆنی (ئەسترۆجین)ی تێدایە کە بۆ ئافرەتان زۆر بەسودە و هێلکەدان بەهێز دەکات و چالاکییەکانی زیاد دەکات، یارمەتیدەرە بۆ دروستکردنی هێلکۆکە کە ئەمە هەلێك و چارەسەرێکی باشە بۆ ئەو ئافرەتانەی بەهۆی لاوازی هێلکەدانەوە سکیان پڕ نابێت.

٥- ڕاگرتنی خوێنبەربوون لە کاتی منداڵبووندا، چونکە ڕێژەیەکی باشی لە ڤیتامین (K) و (تانانین)و کە ئەمەی کۆتایی بریتییە لە ماددەی ڕاگر.

٦- یارمەتیدەرە بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی لەش بەهۆی بوونی ماددەی فسفۆڕو ڤیتامینەکانی تیایدا.

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {اطعموا النساءكم التمر فإن من كان طعامها التمر خرج ولدها حليماً} (الجامع الكبير: ٣٣٨١). واتە: خورما بدەنە ژنەکانتان چونکە هەر ئافرەتێك خواردەمەنییەکەی خورما بێت ئەوە ئەو منداڵەی کە دەیبێت ژیر و لەسەرخۆ دەبێت. بەڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە هەزاران دروودت لەسەر ئەی خۆشەویستی پایەدار.

## ٨٢ ڕێکردن لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەو زانستی تازەدا:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {كل خطوة يخطوها أحدكم الى الصلاة يكتب له بها حسنة ويمحى عنه بها سيئة} (رواه أحمد عن أبي هريرة وقال الباني صحيح الجامع الصغير: ٤٥٢١). واتە: بۆ هەر هەنگاوێك کە یەکێك لە ئێوە دەینێت بۆ نوێژکردن چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت و خراپەیەکیشی لەسەر دەسڕێتەوە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆیشتن بۆ مزگەوت وەرزشە سەرەڕای پاداشت و سڕینەوەی گوناح، ئەگەر سەیری پەڕاوەکانی سیرەی پێغەمبەر ﷺ بکەین کە چۆن بەڕێگادا ڕۆیشتووە، دەبینین وەها بە توندی بۆ پێشەوە هەنگاوی دەنا وەك ئەوەی بە قاچی لە جێگایەکی بەرزەوە دابەزێتە سەر زەوی. ئەمەش دەقی ڕیوایەتەکەیە: (إنه إذا مشى ﷺ تكفأ كأنما يخط من صبب) (الرحيق المختوم من ٤٩٨ و الشمائل المحمدية: ٨-٣٢).

لە کتێبی (understanding Health) کە لەلایەن زانا پسپۆڕە ڕۆژئاواییەکانەوە دانراوە سەبارەت بە ڕێکردنی بەهێز چی نووسراوە، یەکێکیان دەڵێ: مەشقە هەواییەکان وەك ڕۆیشتنی بەهێز یان چالاك دەبێتە هۆی بەهێزکردنی دڵ و سی و سوڕی خوێن. بەڕێزان دەبینین کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆشتنیدا ئەنجامی داوە زمانحاڵی تازەترین لێکۆڵینەوەیە کە لەم چاخە نوێیەدا لەسەر پزیشکی وەرزشی نوسراوە، پێغەمبەر ﷺ قاچی پیرۆزی بەرزدەکردەوەو هەمووی بە تەواوی لەسەر زەوی دادەنایەوە. واتە: قاچی هەر لە پاژنەیەوە هەتا پەنجەکانی بەرزەوی دەکەوت.



پسپۆڕی ڕوسی (دمثری دونسکوی) که له دیارترین شارەزایانی بواری میکانیکی ژیانه، نوسیویەتی و دەڵێت: بەهۆی ڕۆیشتنی هەڵەوە تووشی جۆرەها نەخۆشی له بڕبڕەی پشت و کرکڕاگەکانمان دەبین، خەڵکی وا هەیە که بەڕێدا دەڕۆن پاژنەی پێڵاوەکانیان دەکێشن به زەوی دا که دەبێتە هۆی دروستبوونی چەند خورپەیەك که له بڕبڕەی پشتەوە به سەر دەگەن و، به تێپەڕبوونی کات ئەم خورپانه دەبنه هۆی خزانی ئەو سەرینانەی خەپلەکانی نێوان بڕبڕەکان و پەستان دەخەنە سەر دەمارەکان، ئەمە جگە لەوەی دەبێتە هۆی گرژبوونی ئەو شانانەی ئێسکی پێ بەیەکەوە دەبەستنەوە.

خوێنەری بەڕێز پێغەمبەر خوا ﷺ به توندی بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت وەك ئەوەی قاچی له جێیەکی بەرزەوە بخاتە سەر زەوی، کەواتە: کاتێك مرۆڤ قاچی بەرزدەکاتەوە جوڵەیەکی بەهێز له ماسولکەکانی حەوزەکاندا دروست دەکات (سبحان الله) چوار سەدە لەمەوبەر پێغەمبەر ﷺ چۆن به ڕێگادا ڕۆیشتەوە زانستی تازەی سەردەمیش دەقاودەق هاوڕایه لەگەڵیدا.



## ٨٣ ئەسپسواری و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

ئیبن ماجه له (كتاب الجهاد)ی (سنن)دا له عوقبەی کوڕی عامری جهیمی (خوا لێی ڕازیبێت) گێڕاویەتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: { ارموا واركَبوا وأن ترموا أحبُّ إليَّ مِن أن تركَبوا كلُّ شيءٍ يلهو بِه الرَّجلُ باطِلٌ إلا رميَ الرَّجلِ بقوسِه أو تأديبَهُ فرسَهُ أو ملاعبَتَهُ امرأتَهُ فإنَّهنَّ مِنَ الْحَقِّ ومَن ترَكَ الرَّميَ بعدَ ما علِمَه فقد كفرَ الَّذي علَّمَه } واتە: تیر ئەندازی و ئەسپسواری بکەن، من تیر ئەندازیم پێخۆشترە بۆتان له ئەسپسواری، هەر شتێك موسڵمان سەرقاڵ بکات به ڕابواردن پوچەڵ و ناڕەوایه مەگەر خۆی به تیر هاویشتن یان ڕاهێنانی ئەسپ خەریك بکات، یان یاری لەگەڵ خێزانیدا بکات ئەمانه هەق و ڕەوان..

له لێکۆڵینەوەیەکی ساڵی (٢٠١٤) زاینی دا دەرکەوت کە ئەسپ سواری زۆر بەسوودە بۆ منداڵان. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {الخيل في نواصيها الخير إلى يوم القيامة} رواه مسلم. واتە: ئەسپسواری بەناوچاویەوە خێر گرێدراوە هەتا ڕۆژی دوایی، چونکە بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی (واشنتۆن) ئەم جۆرە وەرزشە هۆرمۆنی (ماندوبوون) لەلای منداڵ کەمدەکاتەوە، لێکۆڵینەوەکە جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئەسپسواری بۆ منداڵان متمانەبەخۆبوونی زیاتری پێدەبەخشێ و کەسایەتییان بەهێز دەکات و ڕێگری لە گەشەکردنی کێشە تەندروستی و دەروونییەکان دەکات، دەشکرێت نەخۆشی (هەستکردن بە تەنهایی) چارەسەر بکات.

بەهەمان شێوەش دەکرێت ببێتە چارەسەر بۆ نەخۆشی ڕەبۆ و هەندێ نەخۆشی درێژخایەن. لێکۆڵینەوەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەسپسواری دژی خەمۆکی و هەستکردن بە (ڕێزگرتن) لە (خود) زیاد دەکات، میزاج باش دەکات و دڵەڕاوکێ کەمدەکاتەوە. هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان دەڵێن کە ئەسپسواری بەپێی بەرنامە بە ڕێکوپێکی پەستانی خوێن دادەبەزێنێت و یارمەتیدەرە بۆ چارەسەرکردنی خەوزڕاندن و تێکچوونی خەوتن لای منداڵان بە ڕاستی ئەو فەرموودەیەش یەکێکیترە لە موعجیزە زانستییە درەوشاوەکانی پێغەمبەر ﷺ.

## ٨٤ دروستبوونی شاخەکان و درەوشانەوەی ئیعجازی فەرموودەیەك:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {لما خلق الله الأرض جعلت تميد، فخلق الجبال فعاد بها عليها فاستقرت} (رواه الترمذي) واتە: کاتێك خوای گەورە زەوی دروستکردووە بەملاو بەولادا لار دەبووەوە ئەوجا شاخەکانی دروست کرد ئیتر جێگیر بوو. زانستی تازە دەڵێت: بەرگی زەوی ڕۆژێ لە ڕۆژان پێش چەندین بلیۆن ساڵ جموجۆڵی زۆری تێدا بووە، زەویناسەکان باس لە بەشەکانی بەرگی زەوی دەکەن کە بریتییە لە تابلۆگەلێك توێکڵی زەوی بەستراوە بەیەکەوە، بەڵکو بریتیە لە تابلۆگەلێك کە بەردەوام دەجولێت

بەهۆی گەرمی ناخی زەوییەوە ئەم تابلۆیانە جموجۆڵی توندو بەهێزی دەبێت ئەمەش هاوسەنگی زەوی تێکدەدات لە کاتی سوڕانەوەی بە دەوری خۆردا، کەواتە ژیان لەسەر زەوی مەحاڵ بووە، بەڵام جموجۆڵی تابلۆکان و بەریەککەوتنیان بووە هۆی دروستبوونی شاخەکان و جێگیربوونی سەرەنجام بووە هۆی جێگیربوونی توێکڵی زەوی و گەڕانەوەی هاوسەنگی بۆی.

کەواتە ئەم ڕاستییە زانستییە سەلمێنراوەی کە لە توێژینەوەکانی زەویناسی دەیدۆزنەوە بریتییە لەوەی کە زەوی لە سەرەتای دروستبوونی لەرزاو و ناجێگیر بووە، ئەوجا زنجیرە چیای دوورو درێژ دروست بووە کە ڕەگەکەی بە دەیان کیلۆمەتر بۆ ناو بەرگی بەردینی زەوی درێژ بۆتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی جێگیربوونی گۆی زەوی. ئەو ڕاستییەش بە تەواوی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ باسکراوە چواردە سەدە لەمەوبەر وشەی (تمید) لە فەرموودەکەدا واتە: لاردەبێتەوە وەك كەشتی چۆن لەسەر دەریادا هاوسەنگی تێکدەچێت و لەنگەر ناگرێت.

زانستی تازەش ئەوەی سەلماندووە کە توێکڵی زەوی لەسەر دەریایەکی ئاگرین لەنگەری گرتووە و پلەی گەرمی دەگاتە هەزاران پلەی سەدی. سەرنجی فەرموودە گرنگەکەی پێغەمبەر ﷺ بدەن کە ڕاستییەکی زانستی باس دەکات بە شێوەیەك کە هەموو وشەکانی فەرموودەکە ڕێك هاوشێوەی دواین توێژینەوەو لێدوانی زەوی ناسەکانی ئەمڕۆیە زانایان لە توێژینەوە نوێیەکانیاندا دەڵێن: ( the resulting collision pushed up the mountains and also produced an under lying thickedense root that sat down in the crust)

پرۆسەی بەریەککەوتن لەنێوان تابلۆکانی زەویدا شاخەکانی هێناوەتە کایەوەو چینێکی ئەستووری دروست کردووە لەسەر شێوەی ڕەگێکی ئەستور کە دەخرێتە ناو توێکڵی زەوی.

هەروەها ئەم توێژینەوەیە دووپاتی دەکاتەوە کە ڕەگی شاخەکان پێش یەك ملیۆن ساڵ دروست بووە، بەڵام لوتکەی چیاکان داخوراوە و ڕەگەکان ماوەتەوە،

پاش ئەوە واتە: پێش ١٠٠-٢٥٠ ملیۆن ساڵ سەردەمی دەینەسورەکان توێکڵی زەوی سەرلەنوێ توشی داڕزان بووە و شانەکانی سەرلەنوێ لە ماوەی ملیۆنەها ساڵ دروست بوونەتەوە، جا ڕەگی ئەم شاخانە لەسەر بەردی ئاگرین لەنگەری گرتووە، بەرزبوونەوەی شاخەکان هۆکارێك بووە بۆ دروستبوونی دۆڵەکان، دۆڵەکانیش ڕووبارەکانی لێ دروستبووە.

باشە کێ پێغەمبەری لەم ڕاستییە ئاگادار کردووە؟ کێ ئەم زاراوە زانستییانەی فێرکردووە؟ بێگومان خوای گەورە فێری کردووە، چونکە وشەی (تمید) لاردەبێتەوە وردترین وشەیە بۆ باسکردنی دۆخی زەوی لە سەرەتای دروستبوونی، هەروەها وشەی (فاستقرت) ئەوجا جێگربوو گونجاوترین وشەیە بۆ باسکردنی دۆخی زەوی لە پاش دروستبوونی شاخەکان، بەڕاستی تەنها ئەو موعجیزە زانستیە گەورەیە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی و دروستی و تەواوی ئاینی پاکی ئیسلام، بە تەنها ئەو موعجیزەیە بەسە کە دڵەکان بە تەواوی لە گێژاوی گومان و دوودڵی ڕزگار بکات و بیانگەیەنێتە دڵنیایی تەواو.

## ٨٥ دەرکەوتنی ڕاستییەکی گەورەی زانستی دەربارەی سرکە:

خوێنەری بەڕێز: پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ ئەوەی تاقیبکاتەوە لەسەر هیچ نەخۆشێك و بەبێ بوونی هیچ تاقیگەو ئامێرێکی زانستی پێشکەوتوو، باسی سرکەی کردووە بەڵکو لە دەستپێشخەرییەکی تاقانەدا هەموو سوودەکانی سرکەی باس کردووە، وەك دەفەرموێت: {نعم الأدام الخل}، واتە: باشترین پێخۆر سرکەیە. ئەم فەرموودەیە ئیمامی موسلیم هێناویەتی لە پەرتووکە صەحیحەکەیدا.

جا خوێنەری بەڕێز: با بزانین زانستی تازەی پزیشکی لەو بارەوە چی دەڵێت: دکتۆر (Jurvis) کە دکتۆرێکی ئەمریکیە باسی سوودە زۆرەکانی سرکەی سێوی

کردووه، سرکە زۆر بەسوودە مرۆڤ لە زۆر نەخۆشی دەپارێزێت کە ئەگەر تووشیان بووایە لە کارو کاسپی پەکیان دەخست و تووشی هەژاری دەبوو.

دکتۆرە ئەمریکیەکە دەڵێت: ڕۆژێکیان گەشتیارێك هات بۆ عیادەکەم و سکاڵای جومگەکانی دەکرد، بینیم ڕەقبوونی جومگەکانی گەیشتبووە ڕادەیەك جوڵە بۆی ئەستەم بوو، لەو کاتەوە ئیتر دەستی کرد بە خواردنەوەی دە کەوچکی بچووك سرکە لە کوپێك ئاودا لەگەڵ هەر ژەمە خۆراکێکدا لە ڕۆژی یەکەمی بەکارهێنانی ئەم چارەسەریەدا هەستی بە چاکبوون لە جوڵەی جومگەکانیدا کرد بە ڕێژەی ٢٠٪، ئەم ڕێژەیە لە دوای ڕۆژی دووەمە بەرزبووەوە بۆ (٥٠٪)، تا لە کۆتایی مانگدا گەیشتە (٧٥٪). دکتۆر (Jurvis) دەڵێت: ئەم پیاوە سەرەڕای ڕەقبوونی جومگەکانی ئازارەکەیشی نەدەماو، لە کۆتاییدا هیچ ئازارێکی نەما هەتا ئەوانەشی لە پشت و مل و پشتە سەردا هەستی پێدەکرد.

دکتۆر عەباس سەعدون پسپۆڕی نەخۆشییەکانی جومگەو ئامادەکردنی سروشتی هەندێك دەرمان باس دەکات بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی جومگەو پەکسلبوونی لەو دەرمانانە، ترشی (ئەسیتك ئەسید) بەهۆی بوونی پەیوەندی لەنێوان ئەم ترشەلۆکانە و ئەوەش کە سرکە لەخۆی دەگرێت لە ترشی تێژاو (ئەسیتیك ئەسید).

دکتۆر (Jurvis) بەردەوامە لە باسکردنی سوودەکانی سرکەو دەڵێت: تێکەڵەی سرکەو هەنگوین مرۆڤ لە هێڵنجدان دەپارێزێت، چونکە سرکەی سێو ڕێژەیەکی زۆر پۆتاسیۆمی تێدایە کە کەمی ئەو ڕەگەزە لە لەشماندا پڕ دەکاتەوە و دەیپارێزێت لەسەر دکتۆر لەو کتێبەیدا کە دکتۆر ئەمین رویحە وەریگێڕا بوو دەڵێت: ئەو پۆتاسیۆمەی لەناو سرکەدا هەیە حاڵەتێکی کیمیایی وا دەدات بە لەش کە لە شاڵاو و زیانی میکرۆبەکان دەیپارێزێت.

خوێنەری بەڕێز: ئەم پەندە ئینگلیزییە دەربارەی سێو دەڵێت: ڕۆژی یەك سێو بخۆ پزیشك لە ماڵەکەت دوور دەخاتەوە، هەروەها وتوویانە سێو میوەیەکی زۆر گرنگە لە ڕووی خۆراکی و پزیشکییەوە هەروەك وتوویانە تەنها یەك سێو بخۆی دەرمانخانەیە.

کەواتە خوێنەری بەڕێز: ئێمە دەبێت شانازی بە پێغەمبەرمان ﷺ بکەین کە فەرموویەتی: باشترین پێخۆر سرکەیە. چونکە ڕوون و ئاشکرایە کە ناردنی موحەممەد ﷺ بە پێغەمبەر پێش ئەو دکتۆرە ئەمریکییە دێت بە چواردە سەدە. بێگومان زانستی سەردەم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕاستی و زانستی فەرمایشتەکانی ئەم زاتە مەزنەمان بۆ دەردەخات.



## ٨٦ میکرۆبەکان لەژێر نینۆکەکاندا دەژین:

پاك و خاوێنی و چارەسەر و شیفا لە ئیسلامدا، ئایا توشبوو بە نەخۆشی شەکرەو زام و برین بە هەنگوین شیفای بۆ دێت؟ ئیسلام یەکەم بنچینەیە لە ڕووی عەقیدەوە بەڵکو یەکەم ڕژێمی زانستییە فەرمانی کردووە بە پاك کردنەوە دژی پیسی وەستاوە. ئیسلام وشەی (الطهارة)ی بەکارهێناوە بۆ پاکیەتی مەبەستیش لە پاکیەتی خاڵی بوونی هەر شتێکە لە میکرۆبەکان و ئەو مادانەی میکرۆبیان هەڵگرتووە، وشەی (النجاسة)ش کە ئیسلام بەکاری هێناوە بۆ ناوی ئەو مادانەی کە میکرۆبیان هەڵگرتووە.

لە ئیسلامدا مەرجی لابردنی پیسی لابردنی میکرۆبە جا بۆ زامنکردنی لابردنی پیسی پێویستە خودی پیسییەکەو بۆن و تامەکەش لابرێت، بەوەش ئیسلام یەکەمین بیروباوەڕە وشیاری داوە لەسەر ئەوەی کە گۆڕانکاری ڕەنگ و بۆن و تامی هەر شتێك بەڵگەیە لەسەر بوونی میکرۆبێکی زیندووی کارلێککردوو تیایدا، هەرچی پیسی و ئەو مادده پیسانەشە ئیسلام ئاماژەی بۆ کردوون و ئەگەری هەڵگرتنی میکرۆبەکانیان لێکراوە، نموونەی: کێم، پاشەڕۆ، خوێن، میز، ڕشانەوە، مەی، لیکی سەگ، لەشی بەرازو هەر شتێکی تری بۆگەنکردوو.. هەر شتێك تایبەتمەندی خۆی لە دەستدا بێت و گۆڕانی بەسەردا هاتبێت وەك پاشماوەی گیانلەبەری مردارەوە بوو یان زیندوو.

ئاینی پاکی ئیسلام یەکەم ئاینە کە باسی میکرۆب و مشەخۆرەکانی کردبێت و وشەکانی (الخبث) یان (الشیطان)ی بۆ بەکارهێناون، پێغەمبەری پایەدار ﷺ دەفەرموێت: {قم أظافرك فإن الشيطان يقعد على ما طال تحتها} واتە: نینۆکەکانت بکە چونکە شەیتان لەسەر ئەو بەشە زیادەیەی دادەنیشێت ئەوەش ئاماژەیەکی ڕوونە کە میکرۆبەکان لەژێر نینۆکەکاندا دەژین وەك میکرۆبی: (تیفۆئید و دیزانتری و هێلکەی کرمی وەك ئەسکارس)، قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بە پاکیەتی دەکات بۆ ڕزگاربوون لە میکرۆبەکان بە شۆردنی ئەو شتە بە ئاوی ڕۆیشتوو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ﴾ (الأنفال: ١١). واتە: ئاوێکیشی لە ئاسمانەوە بەسەرتانەوە باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوە پێی و پۆخڵی شەیتانتان لێ دووربخاتەوە. جا ڕەنگە هەندێك کەس بپرسن کە بۆچی ئیسلام لە بری وشەی پاکژکردنەوە (التعقيم) و میکرۆب ئەم دەربڕین و زاراوانەی بەتایبەت بەکارهێناوە؟

لەڕاستیدا لەم دەربڕینە ئیسلامیانەدا دانایی و حیکمەتێکی مەزن و ئامانجێکی دوورتر هەیە لەوەی تەنها دەربڕینێکی زانستی بێت.

لە پاشان ئیسلام دەیەوێت پاك و خاوێنی بکاتە بیروباوەڕ و ڕەفتارێکی پێویستکراو بۆ موسڵمان نەك تەنها لە ترسی نەخۆشی، بەمەش پاك و خاوێنی کردۆتە بەشێك لە ئیسلام کە لە فەرمانەکانی تری خواپەرستی و نوێژ جیاناکرێنەوە. حیکمەتی تر ئەوەیە ئەو دەربڕینانەی ئیسلام بەر لە زیاتر لە چواردە سەدەیە هاتۆتە خوارەوە لە سەردەمێکدا کە مرۆڤەکان هیچیان لەبارەی میکرۆب و مشەخۆر نەدەزانی و بەو جۆرە ئیسلام هەڵساوە بە هەڵبژاردنی ئەم ناوانە بۆ ئاسانکردنی بابەتەکە لەلای خەڵکی و بە گوێرەی ژیری و ڕادەی عەقڵی ئەوان لەگەڵیان دواوە، لە گەورەیی ئیسلامیش ئەوەیە کە پاك و خاوێنی کردۆتە نیوەی باوەڕ.

لە فەرموودەیەکی صەحیحدا ئەبو مالیکی ئەشعەری دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {الطهور شطر الإيمان، والحمد لله تملأ الميزان، وسبحان الله والحمد لله تملأان

- أو تملأ - ما بين السماء والأرض، والصلاة نورٌ، والصدقة برهانٌ، والصبر ضياءٌ، والقرآن حجةٌ لك أو عليك، كل الناس يغدو، فبائعٌ نفسه فمعتقها أو موبقها}، واته: خێری پاك و خاوێنی نیوەی تەواوی ئیمانە وە خێری زیکری (الحمدلله) تای خێری تەرازووی خێرو شەڕ پڕدەکات، خێری زیکری (سبحان الله والحمدُلله) پڕ بە مابەینی ئەرز و ئاسمانەکانە، نوێژ نوورە بۆ چاو و هەناو ڕووناکییە بۆ دڵو دەروون، خێرو زەکات و بەخشین لەبەرخوا بەڵگەیە لەسەر دامەزراندنی ئیمان و باوەڕ لە دڵ و دەروون و چرای دەستی مرۆڤی موسڵمانە لە ژیانا. وە قورئان شایەت و بەڵگەیە، جا یا لە سەرت دەکاتەوە یان لە دژت دەوەستێ. هەموو کەسێك کە ڕۆژ دەکاتەوە خۆی بە لایەکدا ساغ دەکاتەوە جا یان خۆی دەفرۆشێ بە خوای میهرەبان و خۆی ئازاد دەکات لە ئاگری دۆزەخ یا خۆی دەفرۆشێ بە شەیتان و خۆی ماڵوێران دەکات.



## ٨٧ نوێترین لێکۆڵینەوەی تازە لە ئەمریکا نهێنییەکی گەورەی دەرخست لەبارەی چاکەکردن بەرامبەر دراوسێ:

گرنگیدان بە هاوسێ و ڕێزگرتنی یارمەتیدانی و حەزکردن بە چاکە بۆی نوێترین ڕێگایە بۆ ڕزگاربوون لە نەخۆشییەکانی سەردەم و خۆشگوزەرانی لە ژیاندا، لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێدا کە پوختەیەکی لە سایەتی (CNN)ی ئەمریکیدا بڵاوکراوەتەوە، تێیدا هاتووە کە هاوسێی باش و یارمەتیدەر کاریگەری ئەرێنی دەبێت لەسەر تەندروستی هاوسێکەی، ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە تەندروستی و خانەنشینی کە لە بڵاوکراوەی زانستی نەخۆشی و تەندروستی کۆمەڵگەدا بڵاوکراوەتەوە و زیاتر لە (پێنج) هەزار بە تەمەن تیایدا بەشدارە، کە پێشتر کەسیان کێشەی دڵیان نەبووە و لێکۆڵینەوەکە چوار ساڵی خایاندووە، بەشداربووەکان ملکەچبوون بۆ ئەو ڕاپرسیەی کە ئەوان چەندە لەگەڵ دەوروبەریان تێکەڵ بوونە و چەندێك هاوسێکانیان ڕۆح سووك و هاوکارو جێی متمانەیان بوون. لە توێژینەوەکەدا دەرکەوتووە ئەو بەشداربووانەی

هاوسێکانیان ئەو پێوانەیان هەبووە ئەمان کەمترین جار تووشی (دڵتەنگی و گرژی دڵ) بوون، کە (١٤٨) کەس تووش بوون لە ماوەی توێژینەوەکەدا. توێژەران دەڵێن ئەو کۆمەڵگایانەی بەیەکەوە پەیوەستن پتەون، ئەوەش دەبێتە هۆی هاندانی شێوازی دیاریکراو لە هەڵسوکەوت کە دڵ و خوێنبەرەکان دەپارێزێت لە زیان، ڕاستییە زانستییەکە دەڵێت:

پێویستە لەسەر هاوسێکان هاوکاری یەکتر بن و لەنێوانیاندا پەیوەندییەکی باش ببەستن و یارمەتی یەکتر بدەن، ئەوەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نەخۆشییەکانی دڵ و کێشەکانی پەستانی خوێن لە ئەنجامیشدا تەمەنێکی درێژ بە ویستی خوای گەورە.

خوێنەری بەڕێز: فەرموو بزانە پێغەمبەر ﷺ ١٤٠٠ ساڵ پێش ئەو توێژینەوە زانستیەی ئەمریکا چی فەرمووە کە توێژینەوەکە دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ فەرموودەکانی ئەو زاتە بەرزە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {عن عائشة رضي الله عنها تقول: سمعتُ رَسُولَ الله ﷺ يقول ما زال جبريل يوصيني بالجار حتَّى ظَننتُ أَنَّهُ ليُوَرِّثَنَّهُ} (رواه الامام البخاري: ٥٦٦٨) واتە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم دەربارەی چاکە لەگەڵ دراوسێدا هەتا وامدەزانی دراوسێ میرات لە دراوسێی دەبات. وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {عن أبي هريرة رضي الله عنه أنَّ رسوُلَ الله ﷺ قالَ: لايُدخلُ الجنة من لا يأمَنُ جارُهُ بوائقه} رواه البخاري: ٥٦٧٠. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی لە شەڕو خراپەی ئەمین نەبێت، هەزارات دروودت لەسەر ئەی خۆشەویستەکەی خوا کە ڕاست و دروستی فەرموودەکانت وەك ڕۆژی ڕووناك دەدرەوشێنەوە لە ڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆژیادا.

❊❊❊



## زیانەکانی تەماشاکردنی خۆر لە کاتی گیرانیدا و ئیعجازێکی درەوشاوەی فەرموودەیەك:

خۆرگیران و فەرماندان بە مانەوە لە مزگەوت و دووعاکردن لەو کاتەدا کە ئەوە لە فەرموودەدا هاتووە. خوێنەری بەڕێز جا بزانین زانستی تازەی سەردەم لەو بارەوە چی دەڵێت: لە دۆخە سروشتییەکاندا لەنێوان کاتژمێر (١٠)ی بەیانی تا (٢)ی دوانیوەڕۆ تیشکی سەروبنەوشەیی زیاد دەکات لە کاتی خۆرگیراندا سەرنج ڕادەکێشرێت بۆ چاودێریکردنی، وەك دیاردەیەکی گەردوونی و ئەوەی هاندەری زیاتری چاودێریکردنی خۆرە دابەزینی توندی ڕۆشناییەکەیەتی لەمیانەی گیرانەکەیدا، ئەو ساتەی مانگ بەربەستی بەردەم بەشێك لە ڕووناکی خۆر دەبێت، بەمەش درەوشانەوەی گەرمی دەرچوو لە خۆرەوە کەم دەکات کە ڕێگا لە خەڵکی دەگرێت خۆر ببینن لەو کەشە تاریکەی هاوڕێی خۆرگیرانە کە بە بیلبیلەی چاویش بە پلەیەکی زیاتر دەکرێتەوە و ڕێژەیەکی زۆر لە تیشکە زیانبەخشەکان دەچنە ژوورەوەو گەرمی ڕوودەدات و زیان بە وەرگرە ڕووناکیەکان دەگات کە بە پلەیەکی هێندە بەرز کاردەکاتە سەر توانای بینین هەندێ جار دەگاتە ڕادەی نابینابوون.

خوێنەری بەڕێز: پێغەمبەری پایەدار ﷺ چارەسەری ئەو دۆخەش باشی فەرمووە وەك ئیعجازێکی زانستی تازە لەگەڵ فەرموودەکەی ئەو زاتەدا هاوڕایە، ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە لەو کاتەدا نوێژو دوعا بکرێت. ئیمامی بوخاری لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە گێڕاویەتییەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺو لە ڕۆژی مردنی (ئیبراهیم)دا کە کوڕی پێغەمبەر ﷺ بوو خۆر گیرا، خەڵکی وتیان: بۆ مردنی (ئیبراهیم) خۆر گیراوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: {إن الشمس والقمر لا ينكسفان لموت أحد ولا لحياته فإذا رأيتم فصلوا وادعوا الله} واتە: خۆر و مانگ بۆ مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن هەر کاتێك بینیتان کە گیران نوێژ بکەن وە دوعا بکەن.

یەکێك لە هەڵوێستە سەرنجڕاکێشەکان پەلەکردنی پێغەمبەرە ﷺ لە چوونی بۆ مزگەوت و نوێژکردنی بە خەڵکی و بەردەوامبوونی لە نوێژ تا کۆتایی خۆرگیران و دەرکەوتنەوەی خۆر، دوای ئەوەش وەسیەت کردنی بۆ موسڵمانان بە نوێژکردن و دوعاکردن بە درێژایی کاتی خۆرگیرانەکە، لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت نوێژی بە موسڵمانان کردووە جیاواز لە نوێژی باران بارین و جەژنەکان کە لە چۆڵیدا لە دەرەوەی مزگەوت کردوونی، پێدەچێت یەکێك لە هۆکارەکانی ئەم کارە تیشکە زیانبەخشەکان بێت کە دەشێت تەماشاکردنی خۆر هۆکاری بن (سبحان الله)، دەبێ ئەوەش بیر نەچێت کە سووننەتە لە نوێژدا تەماشای شوێنی سوژدە بکرێت، بەڕاستی جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی خواو پێغەمبەرەکەی مایەی سەرفرازی مرۆڤەکانە لە دنیاو دواڕۆژدا.



## نیشانەگرتنەوەو سوودە تەندروستییەکانی:

ئەو نیشانە گرتنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی باڵەکان، چونکە ئەگەر وردبینەوە لە تیرهاویشتن دەبینیت ماسولکەکانی هەردوو دەست و بازوو بەهێز دەکات، سەرەڕای ئەوەش ئەو وەرزشە پێویستی بە دامەزراوی زەیینی زۆر هەیە ئەوەش مرۆڤ فێری وردبینی و تەرکیز دەکات و وایلێدەکات لە هەموو کاروبارەکانی ژیانیدا وردبین بێت. بەڕاستی ئەو وەرزشە پەروەردەیەکی فیکرییە بۆ ئەو کەسە چونکە مرۆڤ لە کاتێکدا بەدوای کاروبارەکانییەوەیە زۆر ورد دەبێت و هەمیشە تەرکیز دەخاتە سەر ناوەڕۆکی پسپۆڕییەکەی و بە ڕوونکردنەوەی سادەو سەرزارەکی ڕازی نابێت، ئەو وەرزشە یەکێکە لە یارییە ئۆڵۆمپییەکان و خولیای زۆر کەسە. پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە کە ئەو وەرزشەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێکردووە خەڵکی هانداوە کە پێی هەڵسن، ئێستا لەناو یارییە ئۆڵۆمپییەکاندایە لە کاتێکدا وەرزشە و خۆشیە هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردبێت مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤ ژیانێکی تەندروست بەسەر بەرێت و ببێتە خاوەنی جەستەیەکی بەهێز.



## زانستی نوێ سوودەکانی ئاوی زەمزەم ئاشکرا دەکات:

ئاشکرایە کە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ باس لە ئاوی زەمزەم کراوە کە ئاوێکە خوای گەورە بەتایبەت هەڵیقوڵاندووە بۆ ڕزگارکردنی هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کوڕی، ئەم ئاوە بۆ هەر مەبەستێك بخورێتەوە بەسوودە، لێکۆڵینەوەی زۆریش لەسەر ئاوی زەمزەم کراوە، یەکێك لەو لێکۆڵینەوانە ئەوە بوو کە دکتۆر عەبدولباسیط کە زانایەکی میسری پسپۆڕە لە بواری پزیشکی و (طب النبوي) دا، لە بەرنامەی (ساعة حوار)ی کەناڵی (المجد) دا لە یەکێك لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز لە ساڵی (٢٠٠٥)دا ڕایگەیاند کە نزیکەی (١٠٠) ئافرەتی دووگیان کە ئاوی دەوری کۆرپەلەی سکیان کەم بوو، خستیاننە بەر لێکۆڵینەوە بەوەی کە بۆ ماوەیەك ئاوی زەمزەمیان دانێ، سەرەنجام بۆیان دەرکەوت کە ئەو ئاوەی دەوری کۆرپەلەیان دروست بۆتەوە و بۆیان بۆتە شیفا، ئەمەش سێ ساڵ دووبارە کرایەوە لەگەڵ ئافرەتانی دووگیانی ترداو هەمان سەرەنجامی دا بە دەستەوە کە ئەوەش ڕاستی فەرموودەکەی سەلماند. بەڕاستی موعجیزەیەکی زانستی گەورەیە، هەزاران درود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرەی کە ڕاستی فەرموودە پیرۆزەکانی لە ڕۆژگاری زانست و تەکنەلۆژیادا وەك ڕۆژی ڕووناك دەدرەوشێنەوە.



## کاریگەری ڕووەکی (ئەلۆڤێرا) لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی چاو و زانستی تازەدا:

لەم سەردەمەدا کە هەموو دەرفەتەکان ڕەخساوە بۆ توێژینەوەی زانستی و خاوەن پسپۆڕییەکان دەتوانن بێ دوو دڵی لەبارەی ئەو بابەتانەوە بکۆڵنەوە، مایەی سەرسوڕمانە کە فەرموودەکان پێش چواردە سەدە پێش ئێستا ئەو ڕاستییانە ئاماژە پێدەکات و لە ئێستادا ڕاڤەی زانستی دەبەخشێت، لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە: لە

نەبیهی کوڕی وەهبەوە دەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی عەبدوڵڵا کێشەی تەندروستی هەبووە لە چاویدا کاتێك لە ئیحرامدا بووە و دەیویست بە کل چارەسەری بکات، بەڵام ئەبانی کوڕی عوسمان ڕێگری لێکرد و نەیهێشت کل بەکاربهێنێت و ئاماژەی بە ڕووەکی (ئەلۆڤێرا) کرد کە وەك بەستەرێکی سارێژکەر بەکاری بهێنێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێك پیاوێك هاتوتە خزمەتی بۆ هەمان کێشە لە چاویدا ئاماژەی پێکردووە ڕووەکی (ئەلۆڤێرا– صوبێر) بەکاربهێنێت.

خوێنەری بەڕێز جا با بزانین زانستی تازەی سەردەم لەو بارەوە چی دەڵێت؟

نەخۆشییەکانی چاو یەکێکە لەو نەخۆشییە باوانەی کە کۆمەڵگای سەردەم دووچاری بووە نەخۆشییە باوەکانی ئێستای چاو وەك وشکبوونەوەی چاو و هەوکردنی پێڵووەکان، هەوکردنی کۆرنیە، پووکانەوەی خانەکان و چەند نەخۆشییەکی دیکەش دەگرێتەوە، ڕووەکی (ئەلۆڤێرا) تایبەتمەندی زۆرە وەك: سارێژبوونی برین، دژە میکرۆب، دژە ڤایرۆس، دژە هەوکردن و چالاکی دژە ئۆکسان و تایبەتمەندیی دیکەشی هەیە، لە توێژینەوەیەکدا لە زانکۆی (مەدرید) لەلایەن زانا (پنتۆر) و هاوەڵانی لە ساڵی (٢٠١٤)ی زاینی دا، کاریگەری ژەهراوییبوونی خانەی لە شلە دروستکراوە بازرگانییەکاندا تاقیکرایەوە، لەسەر ڕووەکی پەرگلێنە (کۆرنیا)ی چاوی کەروێشك، کاتێك کە ئەلۆڤێرای تێکەڵ دەکرێت ئەو هاوێنە لکاوە نەرمانەی کە لە دەرەوەی چاو بۆ چاو بەکاردێن بە مەبەستی جوانکاری یان چارەسەر، لە شلەیەکی دروستکراوی بازرگانی فرە مەبەستدا دەپارێزرێن، کە چەند پێکهاتەیەکی تێدایە و دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە پووکەشی چاوو توێکی فرمێسکدا کە لە سێ چین پێکهاتووە: (چەوری، ئاو، میوسین) لە تاقیکردنەوەیەکدا بەراوردی ئەو شلانە کران کە بەرهەم دەهێنرێن، کاتێك ماددەیەکی وەك (ئەلۆڤێرا) بە چڕیی (١٪، ٧٥٪، ٢٪) تێکەڵاویان دەکرێت، دەرەنجام شلەکە تایبەتمەندی چاکبوونەوەی برین توانای ژیان و گەشەی خانەکە زیاد دەکات، هەروەها بە پەسەند دەزانرێت کە (ئەلۆڤێرا) تێکەڵی ئەو شلە دروستکراوە بکرێت لەبەر ئەو تایبەتمەندییە پارێزەرەی کە تێیدایە، هەروەها



گۆڤاری (pharmaceutical biology) له ژماره (٢)ی مانگی (٢٠١٥)ی زایینیدا توێژینەوەیەکی بڵاوکردەوە لە بارەی کاریگەری قەترەی (ئەلۆڤێرا) کە لەگەڵ گیراوەکەیدا تێکەڵ دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردن و نەخۆشییەکانی پەرگلێنە، لە دوای توێژینەوەکە دەرکەوت کە قەترەکە دەتوانرێت بەکاربێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی چاو بێ مەترسی.



## ٩٢ کاریگەری ڕووەکی (ئەلۆڤێرا) لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پێست:

لە فەرموودەدا هاتووە کە ئەم ڕووەکە پێست جوان دەکاتەوە: {عن أم سلمة ﵂ قالت: دخلت على رسول الله حين توفي أبو سلمة وقد جعلت علي صبراً فقال: ما هذا يا أم سلمة؟ فقالت: إنما هو صبر يا رسول الله ليس في طيب فقال: إنه يشب الوجه فلا تجعليه إي بالليل وتنزعيه بالنهار} (رواه النسائي وأبو داود) واتە: لە ئوم سەلەمەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێك ئوم سەلەمە کۆچی دوایی کرد چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە؟ منیش وتم: ئەی نێردراوی خوا ئەوە صوبێرە و بۆنی نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە پێست جوان دەکاتەوە و تەنها لە شەودا بەکاری بهێنەو ڕۆژ لێی بکەرەوە.

خوێنەری بەڕێز جا با بزانین زانستی تازەی سەردەم لەبارەی ڕۆڵی ئەم ڕووەکە چی دەڵێت: زۆرترین پێکهێنەری (ئەلۆڤێرا) ئاوە کە ڕێژەی (٩٩٪) پێکدێنێت و ڕێژەی ٠.٥٪ ماددە چالاکەکانن کە لە (٧٥) ماددە پێکهاتووە وەك: شەکرە ئاڵۆزەکان، ترشە ئەمینییەکان، چەورییەکان، ستێرۆڵەکانی ڕووەك، تانینەکان و ئەنزیمەکان.

سوودو بەکارهێنانی (ئەلۆڤێرا) بۆ نەخۆشی و کێشەکانی پێست:

لە توێژینەوەیەکدا لە ٢٠١٥/٥/١٢ زایینیدا گۆڤاری ( Biomed research international) توێژینەوەیەکی پەسەند کرد، کە لەلایەن چەند کۆلیژێك بە

هاوکاری زانکۆی مازندەران ئەنجام درا سەبارەت بە چەندین توێژینەوە و پێداچوونەوەی دیکە، توێژینەوەکان و بابەتی پەیوەندیدار لە سەرچاوە و گۆڤارە باوەڕپێکراوەکاندا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە (ئەلۆڤێرا) دەتوانرێت بەکاربێت وەك چارەسەر بۆ چاکبوونەوەی برین، شانبەشانی چارەسەرە ستاندەرەکانی دیکە کە بەکاردێن لە بەرواری ٢٠١٠/١٢/١٧ دا. پێگەی ئەلکترۆنی (J-stage) توێژینەوەیەکی بڵاوکردەوە کە لە سێ زانکۆی جیاواز (کیۆ، ئایوەیت و راکونق) ئەنجامدرا بوو بۆ دیاریکردنی کاریگەری (ئەلۆڤێرا) لەسەر چاککردنەوەی بوبینی پێست لەو جرجانەدا کە تووشی نەخۆشی شەکرەی جۆری (٢) کرابوون، لەم توێژینەوەیەدا جرجەکان کران بە دوو گروپەوە: یەکێکیان کۆنترۆڵ گرووپ کە چارەسەریان بۆ بەکارنەهێنا، ئەوی تریشیان (ئەلۆڤێرا) گرووپ کە لەڕێی دەمەوە (ئەلۆڤێرایان) پێدرا لە گرووپی (ئەلۆڤێرادا) برینەکان بە شێوەیەکی کاریگەر چوونەوە یەك لەوەوە بۆیان دەرکەوت کە پێدانی (ئەلۆڤێرا) لە ڕێگەی دەمەوە چاکبوونەوەی برینەکان لەو جرجانەدا خێرا دەکات.

لە بەشی توێژینەوەی خۆراك لە پەیمانگای تەکنەلۆژیاو زانستی خۆراك لە (کەنەگاوا) لەگەڵ سەنتەری (ئیبیسو) بۆ توێژینەوەکانی پێست لە (تۆکیۆ)، پێنج زانا لە توێژینەوەیەکی تردا کاریگەری ستیرۆلەکانی ڕووەکی (ئەلۆڤێرا) تاقیدەکەنەوە کە توانای ڕێکخستنی زیندەچالاکی چەوری و شەکرەی هەیە، کاریگەری پاودەری جێڵی (ئەلۆڤێرا) کە (٤٠٠) مایکرۆگرام ستیرۆڵەکانی تێدا بوو بۆ سەر گرفتەکانی پێست تاقیکرایەوە لە ئافرەتە یابانییەکاندا کە پێستیان وشك بوو بوویەوە، دەرەنجام بە وەرگرتنی پاودەری جێڵی (ئەلۆڤێرا) لە ڕێگەی دەمەوە بووە مایەی کەمکردنەوەی چرچیەکانی دەموچاوی ئافرەتەکان کە تەمەنیان (٤٠) ساڵ و گەورەتر بوون، چواردە سەدە پێش تاقیکردنەوەی زانستی تازە پێغەمبەر ﷺ باسی ڕۆڵی ئەم ڕووەکەی کردووە لە چارەسەری نەخۆشییەکانی پێست، بەڕاستی ئەم موعجیزەیە بەسە بۆ کەسانێك کە وێڵن بە دوای ڕێگای ڕاستدا.



## ٩٣ لێکۆڵینەوە تازەکان جەخت دەکەنەوە بەزەیی و میهرەبانی چارەسەرە:

لەم دواییانە ڕۆژئاوا گەیشتە چەند ئەنجامێکی نوێ پاش هەڵسانی بە چەند تاقیکردنەوەیەکی پەیپێبراو، دەبینین زاناکانی ڕۆژئاوا جەخت لەسەر پێویستییەتی پراکتیزەکردنی ئەم ئەنجامانە دەکەنەوە لەپێناو بەختەوەری مرۆڤ ئەوەی سەیرە خوێنەری بەڕێز: هەر کاتێك داهێنان و دۆزینەوەیەکی زانستی سەرنجمان ڕادەکێشێ بەو سوودو قازانجەی تێیدایەتی، دەبینین ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە چواردە سەدە پێش ئەوان کەوتووە، لە کۆتایی توێژینەوەکانیان گرنگی میهرەبانی (الرحمة)یان لە بەختەوەری مرۆڤ دۆزییەوە، بۆیان دەرکەوت توانای فێربوونی میهرەبانی لە کاتی منداڵییەوەیە. ڕایانگەیاند پێویستە خەڵك منداڵەکانیان فێری بەزەیی و میهرەبانی بکەن.

لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٨) توێژەرانی تەکنەلۆجیای (المسح بالرنين المغناطيسي الوظيفي FMRL)یان بەکارهێنا لەپێناو لێکۆڵینەوە لە کاریگەری میهرەبانی لای مرۆڤ لەسەر دەزگای کارکردنی مێشك. ئەم دەزگایە ئەو چالاکییە گەورەیەی کەشف کرد کە لە بەشی پێشەوەی سەر ڕوودەدات ڕۆڵی بنەڕەتی دەبینێ لە سۆزی مرۆڤ ئەوەی کە ئەمان تازە بۆیان دەرکەوتووە، ئاینی ئیسلام فەرمانی کردووە جێبەجێ بکرێ وەك بەشێك لە بیروباوەڕی مرۆڤی موسڵمان، ئەم بنەمایە زاناکانی ئەمڕۆ جەختی لەسەر دەکەنەوە گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامە کە بەختەوەری بەدەست نایەت تەنها لە ڕێگەی بەدەستهێنانی ویستی مرۆڤەکانی ترەوە نەبێت. زۆر پێویستە مرۆڤ هەوڵبدات بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی کەسانی تر.

توێژەران لەپێناو دەستەبەرکردنی بەختەوەرییەکی زۆر و تەمەنێکی درێژ جەخت لەسەر بنەمایەکی گەوهەری دەکەنەوە ئەویش بریتییە لە ویستنی چاکە بۆ کەسانی تر، پاش چەندەها پرسیار لە خەڵك بینیان ئەو خەڵکانەی ئومێدی بەختەوەری بۆ

جگە لە خۆیان دەخوازن خۆشنودترن لەچاو ئەو کەسانەی ئومێدی لاچوونی بەخشش و بەختەوەری لەسەر کەسانی تر دەخوازن، بەڕاستی جێگای سەرنجە کاتێك دەزانین کە پێغەمبەر ﷺ پێش چەندەها سەدە بانگەواز بۆ ئەوە دەکات، جگە لەوەش ئەو کەسەی پابەند نەبێ بەم بنەمایە باوەڕی تەواو نابێت کاتێك دەفەرموێت: {عن أنس رضي الله عنه عن النَّبي ﷺ قال: لا يؤمنُ أحدكُم حَتَّى يُحِبَّ لأخيه ما يُحبُّ لِنفسه } مختصر صحيح البخاري. وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان). واتە: ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: کەستان بە تەواوی ئیمان و باوەڕ ناهێنێ هەتا هەرچی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برای موسڵمانیشی پێی خۆش نەبێ.



## دەربڕینی بەکارهێنانی ویستراو لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی دی:

دەربڕینی دەستەواژەی نەویستراو بەپێی توانا بەکارمەهێنە لەجیاتی ئەوەی بە کەسێك بڵێیت وا مەکە یان بۆ واتنەکرد، ئەم دەستەواژەیە بگۆڕە بە دەستەواژەیەکی ویستراو و بڵێ ڕات چییە ئەگەر وابکرێت یا تۆش وای نابینیت بەم جۆرە باشتر بێت. زاناکانی زمانەوانی بەرنامەکردنی ژیری ئەم شێوازەیان لە کەسانی سەرکەوتوو بەناوبانگ و دەوڵەمەند بەدیکرد، کاتێ بینییان ئەم سەرکەوتووانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کەسانی تر و دامەزراوە لەسەر ڕا وەرگرتن نەك لەسەر پلان بۆ دانان و سەرزەنشت کردن و شکاندنەوە.

(سبحان الله) ١٤٠٠ ساڵ زیاتر پێش لێکۆڵینەوەی ئەو زانا بیانییانە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە: ئەنەسی کوڕی مالیك بۆ ماوەی (١٠) ساڵ خزمەتی پێغەمبەری کردووە بێ ئەوەی بۆ یەك جاریش دەستەواژەی (بۆ وات نەکرد)، یان دەستەواژەی سەرزەنشتکردن یان نەویستراوی گوێلێبووبێت، لە پێغەمبەر ﷺ دەربڕینی ویستراوی بەکارهێناوە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی تر.

## ٩٥ كەنارگیری دەبێتە مایەی ناساغی:

لە ئاینی ئیسلامدا گرنگی دراوە بەوەی کە مرۆڤ هاوەڵی چاك بۆ خۆی بگرێت و هەوڵبدات سوودی لێوەرگرێت، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو تێکەڵ بێت بە خەڵکی و دانەبڕێت لێیان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على اذاهم خير من المؤمن الذي لا يخالط الناس ولا يصبر على اذاهم} واتە: ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بە خەڵکی دەبێت و ئارام دەگرێت لەسەر ئەو ئەزیەت و ئازارەی کە لێیانەوە تووشی دەبێت باشترە لەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بە خەڵکی نابێ و ئارام ناگرێت.. زانستی سەردەمیش پاش چواردە سەدە ڕاستی ئەو فەرموودەیەی سەلماند. زانای دەروونناسی ئەمریکی (لیون ئەیسین بیرگ) لێکۆڵینەوەی زۆری کرد لەسەر کاریگەری هاوڕێگرتن و تێکەڵاوی خەڵکی لەسەر تەندروستی، دکتۆر (لیون) تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر (٤٧٢٥) کەس لە ویلایەتی کالیفۆرنیا لە ماوەی نۆ ساڵدا، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ڕێژەی مردن زۆرترە لەو کەسانەدا کە هاوەڵیان نییە و تێکەڵ بە خەڵکی نابن و گۆشەگیرن.

هەروەها بۆی دەرکەوت کە ئەو کەسانە زیاتر تووشی نەخۆشییەکانی دڵ و شێرپەنجە و دوو دڵی و خەمۆکی دەبن، بۆیە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیەوە ئامۆژگاری دەکات کە مرۆڤ دانەبڕێ لە کۆمەڵگا و گۆشەگیر نەبێت تاوەکو بتوانێ ژیانێکی خۆش و دوور لە نەخۆشی بەسەر بەرێت.

لە زانکۆیەکی تری ئەمریکی زانای ئەمریکی (جیمس هاوس) لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر (١٧٠٠) کەس، بۆی دەرکەوت ئەوانەی تێکەڵ نابن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان باش نییە بە ڕێژەی لە سەدا دوو سەد و پەنجا زیاتر دەمرن لەچاو ئەوانەی کە باری کۆمەڵایەتییان دامەزراوەو لە پەیوەندیاندا ئاسوودەن.



## ٩٦ بەرۆژووبوونی بەردەوام لەژێر ڕۆشنایی فەرموودەو زانستی نوێدا:

پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر ﷺ کە هیچ شتێکی لە خۆیەوە نەفەرمووە بەڵکو هەموو ئەو فەرموودانەی فەرموویەتی: لە خوای میهرەبانەوە وەحی بۆ کراوە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: {لا تواصلوا قالوا فإنك تواصل يا رسول الله قال إني لست كأحدكم إن ربي يطعمني ويسقيني فاكلفوا من الأعمال ما لكم به طاقة} واتە: لە ڕۆژووەکانتاندا ئاگاداری بەردەوامی بن، واتە: شەوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبن، وتیان: بەڵام تۆ بەردەوامی لە ڕۆژووەکانتدا، فەرمووی: من لەوەدا وەکو ئێوە نیم من بەردەوام خوای گەورە خواردن و خواردنەوەم پێدەدات ئێوە تەنها ئەو کارە بکەن کە دەتوانن.

زانستی تازە هاوڕایە لەگەڵ فەرمودە پیرۆزەکە: مەبەست لە بەڕۆژووبوونی بەردەوام واتە: شەو و ڕۆژ بەڕۆژوبوون بەیەکەوە (سبحان الله)، بەڵام بەڕۆژووبوونی بەردەوام لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا زانستی تازە دەقاودەق هاوڕایە لەگەڵ قورئان و فەرموودەکان، زانستی نوێ باس لە سوودەکانی بەڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان دەکات و دەڵێت: لەگەڵ هەموو گۆڕانکارییە هۆرمۆنییەکانی جەستەی ڕۆژووەوان ئامانج لێی پاراستن و زیادبوونی خانەکانی جەستە و توانا و هێزێکی پێویست بۆ جەستەی مرۆڤە تا بتوانێت ئەرکە سەرەکی و فسیۆلۆجییە جیاوازەکان ئەنجام بدات، کاتێك ڕێژەی هۆرمۆنی (ئەنسۆلین) دوای چەند کاتژمێرێك لە خواردنی پارشێو کەم دەبێتەوە ئەوا هۆرمۆنی (گلەکاگون) دەست دەکات بە بەرزکردنەوەی ڕێژەی شەکرەی خوێن بۆ ئاستی سروشتی خۆی، ئەو کاتەش کە جەستە هەڵدەستێت بە کرداری شیکردنەوەی (گلوکۆجین) جەستە دەست دەکات بە پشتبەستن بە ئۆکسیدی ترشە چەورییەکان بۆ بەرهەمهێنانی وزەی خۆراکی.

خوێنەری بەڕێز: سەلماندنە زانستییەکان لەگەڵ دەقە شەرعییەکان هاوڕان لەبەرئەوەی بەڵگە شەرعییەکان بێدەنگ نەبوون لەسەر بەڕۆژوو بوون بە درێژایی شەو

و ڕۆژ، واتە: ڕۆژەکە کە مرۆڤ بەڕۆژوو دەبێت کە دەگاتە ئێوارە ڕۆژووەکەی نەشکێنێ و شەویش بە درێژایی شەوەکە هەر بەڕۆژوو بێت، دەقە شەرعییەکان ڕێگەیان لەو کارە گرتووە بە ئاشکرایی و ڕوون و ڕەوانی. زانستی تازەش دەڵێت ڕۆژوو گرتنی درێژ واتە: ڕۆژ و، شەوەکە ڕۆژووەکە نەشکێندرێ سەردەکێشێت بۆ دەرکەوتنی نیشانەی نێگەتیڤ لە جەستەی مرۆڤدا لەوانە زیادبوونی ترشی خوێن، هەروەها لەو بارەدا جەستە پەنا بۆ بەکارهێنانی ماسولکەکان دەبات وەکو سەرچاوەیەکی ترشی ئەمینی بەرهەمهێنان بۆ (گلوکۆز)، لە ڕێگەی کرداری دروستکردنی (گلوکۆز)ەوە جگە لە سەرچاوە شەکرییەکان کە دەبێتە هۆی لەڕی و لاوازی ماسولکەکان و بێهێزبوونی جەستە بە گشتی.



## دەروونزانەکان هاوڕان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەبارەی بێفیزی و خاکی بوون:

دەروونزانەکان خۆبەگەورە زانین بە بەربەستێکی ئەستور دەچوێنن کە خۆشەویستی و ڕێزی کەسانی تر لە تۆ دادەبڕێت، هەروەها کاریگەری نەویستراویان لا جێدێڵێت. لێرەدا زۆر لێکۆڵینەوە هەن جەخت لەسەر گرنگی بێفیزی و خاکیبوون دەکەنەوە بۆ دەستەبەرکردنی متمانەی کەسانی تر، هەروەها دوورکەوەرەوە لە چڵێسی و ئێرەیی کە سیفەتی زەمکراوانن، پێغەمبەر ﷺ پێش دەروونناسەکان کەوتووە بۆ دانانی جوانترین بنەما بۆ دەستەبەرکردنی خۆشەویستی کەسانی تر کاتێك دەفەرموێت: {وأزاهد فيما عند الناس يحبك الناس} ، دنیا نەویسترین لەناو خەڵك دەبێتە خۆشەویسترین لەناو خەڵك. لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ورد بەرەوەو ئەم پراکتیزە بکرێت دەبێتە چارەسەر بۆ زۆر لە کێشەکانی سەردەم.



## هۆكاره كۆمه‌ڵایه‌تییه‌كان و كاریگه‌ره به‌هێزه‌كانیان له‌سه‌ر وه‌ڵامدانه‌وه‌ی مێشكی پێگه‌یشتووان:

دكتۆر (جلین أوستیر) سه‌رۆكی گرووپی لێكۆڵه‌ر ده‌ڵێ: پێم وایه په‌یوه‌ندی له‌نێوان عه‌قڵ و جه‌سته‌دا هه‌یه كاتێك بیرۆكه و هه‌سته‌كان كارده‌كه‌نه سه‌ر جه‌سته و ته‌ندروستی به شێوه‌یه‌كی گشتی، جا له ڕێگه‌ی ڕاسته‌وخۆ بێت وه‌كو ده‌زگای به‌رگری یا له ڕێگای ناڕاسته‌وخۆ بێت وه‌ك تۆڕه‌كانی یارمه‌تیدانی كۆمه‌ڵایه‌تی، هه‌روه‌ها له لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی تردا كه له هه‌مان گۆڤار بڵاوكراوه‌ته‌وه ئاماژه به‌وه ده‌كات ناڕاسته‌كردنی عه‌قڵ كاریگه‌ری له‌سه‌ر وه‌ڵامدانه‌وه‌ی جه‌سته‌ییدا هه‌یه، له‌م لێكۆڵینه‌وه‌یه‌دا تیمی توێژینه‌وه له زانكۆی (نورث كارولاینا) داوایان له (١٥٣) كه‌سی ته‌مه‌ن جیاواز كرد بۆ تاقیكردنه‌وه له سه‌ر مێشكیان، پاش ئه‌وه‌ی گوێبیستی ده‌سته‌واژه‌ی ویستراو و نه‌ویستراو ده‌بن ده‌ربڕینه نه‌ویستراوه‌كان په‌شۆكان و تێكچوون و شێوان له‌خۆده‌گرن، به‌ڵام ده‌ربڕینه ویستراوه‌كان ده‌ستكه‌وت و چالاكی و تایبه‌تمه‌ندی له‌خۆده‌گرن، له ئه‌نجامه‌كاندا به‌دیاركه‌وت وه‌ڵامدانه‌وه‌ی مێشك له‌لایه‌ن به‌شداربووانی لێكۆڵینه‌وه‌كه له پێگه‌یشتووان لاواز ده‌بێت پاش ئه‌وه‌ی ڕووبه‌ڕووی ده‌ربڕینه نه‌ویستراوه‌كان ده‌بێته‌وه، به پێچه‌وانه‌ش وه‌ڵامدانه‌وه‌ی مێشك چالاك ده‌بێت له كاتی بیستنی وشه ویستراوه‌كان، لێره‌دا جیاوازییه‌كی به‌رچاو له وه‌ڵامدانه‌وه‌ی مێشك له‌نێوان لاوان و پێگه‌یشتووان ده‌بینرێ، ئه‌وانه‌ی ڕووبه‌ڕووی ده‌ربڕینه ویستراوه‌كان ده‌بنه‌وه.

لێكۆڵه‌ران ئاماژه به‌وه ده‌كه‌ن ئه‌گه‌ر هاتوو مامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵ كه‌سانی به ته‌مه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه بوو كه ئه‌وان ئه‌ندامی كاران له كۆمه‌ڵدا، ئه‌وه ده‌بێته هانده‌ر بۆیان و كاریگه‌ری ئیجابی له‌سه‌ریان ده‌بێت. (توماس هیس) سه‌رۆكی تیمی زانستی ده‌ڵێ: لێره‌دا هۆكاری كۆمه‌ڵایه‌تی كاریگه‌ری به‌هێزه له‌سه‌ر وه‌ڵامدانه‌وه‌ی مێشكی پێگه‌یشتووان ئه‌وه فه‌رمووده‌ی پیرۆزی پێغه‌مبه‌ر ﷺ باسی كردووه كه پڕه له

زانیاری ئیجابی دەفەرموێت: {المؤمن القوي خير واحب إلى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير}. واتە: ئیمانداری بەهێز چاکترەو خۆشەویستترە لای خوای گەورە لە ئیمانداری بێهێزو زەعیف وە لە هەردووکیاندا خێر هەیە، ئەوە ئیماندار هان دەدات کە بەهێز بێت نەك تەنها لەڕووی جەستەوە بەڵکو لەڕووی بڕواو ڕۆشنبیری و ڕەوشت و ئارامگرتنەوە.



## ٩٩ زانستی نوێی سەردەم سوودەکانی خێرو چاکەکردن ئاشکرا دەکات:

تێکەڵبوون بە کۆمەڵگا و هاوکاریکردنی خەڵکی و خێر و چاکەکردن ئەوانە هەمووی مایەی تەندروستی باش و دڵخۆشی و تەنانەت زوو چاکبوونەوەیە ئەگەر کەسێك نەخۆش بێت، بۆیە دەبینین لە ئیسلامدا گرنگی زۆر دراوە بە سەردانی نەخۆش تا لە کۆمەڵگا دانەبڕێت و زوو چاك ببێتەوە، لە فەرموودەدا هاتووە: کە خوای پەروەردگار بەندەی خۆی ڕادەگرێ لە قیامەتدا و پێی دەفەرموێ: داوای ئاوم لێکردی نەتدامێ؟ ئەویش دەڵێ: خوای گەورە کەی تۆ پێویستت بە ئاو بووە تا من بتدەمێ؟

پەروەردگاریش دەفەرموێت: فڵانە بەندەم داوای ئاوی لێکردی نەتدایە ئەگەر بتدایەتێ لەلای من وەرتدەگرتەوە، ئینجا دەفەرموێ: داوای خواردنم لێکردی نەتدامێ ئەویش، دەڵێ: ئەی پەروەردگار تۆ کەی پێویستت بە خواردنە تا من بتدەمێ؟ ئەویش دەفەرموێ: فڵانە عەبدم داوای خواردنی لێکردی و نەتدایە ئەگەر بتدایەتێ لای من وەرتدەگرتەوە..

دەفەرموێت: ئەی عەبدەکەم نەخۆش کەوتم نەهاتی بۆ لام ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگار تۆ کەی نەخۆش دەکەوی تا من بێم بۆ لات؟ خوای گەورە دەفەرموێت: فڵانە عەبدم نەخۆش کەوت ئەگەر سەردانت بکردایە ئەوا منی لەلابووم وەك بۆ لای من بهاتیتایە وابوو. کێ گوێی لەوە دەبێ کەمتەرخەمی دەکات لەو بوارانەدا؟ دیارە ئەوە

بۆ هەردوولا مایەی خێر و بەرەکەتە نەخۆشەکەش و ئەوەش کە سەری لێئەدات ئینجا با بزانین زانستی نوێ لەو بارەوە چی دەڵێت؟

زانایان لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆرەوە گەیشتنە ئەو ڕاستییە کە ئەوەی کاری خێرو چاکە دەکات کار دەکاتە سەر جیهازی مەناعەی و بەرگری زیاتر دەبێت لە بەرامبەر نەخۆشیدا، هەروەها ئەو چاکەکار و خێرخوازە لە ئەنجامی ئارامی دەروونی و خۆشی خێرکردنەکەوە سپڵی ماددەی (تەفتەسین) دەردەدات کە بەرگری میکرۆبات دەکات و دەیپارێزێت لە نەخۆشی، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەوە زانایانی ڕۆژئاوا وا بە چاك دەزانن کە نەخۆش خێر بکات و یارمەتی کەسانی تر بدات، کە بەوەش دەزگای بەرگری لەشیان بەهێز دەبێ و زووتر چاك دەبنەوە.

(سبحان الله) پێش چواردە سەدە پێش ئەو زانا ڕۆژئاواییانە وەك موعجیزەیەکی زانستی درەوشاوە دەقاودەق ئەوەی فەرمووە، کە تازە ئەو زانایانە بۆیان دەرکەوتووە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {داوُو مرضاكم بالصدقات}، واتە: نەخۆشەکانتان بەخێرو سەدەقە کردن چارەسەر بکەن، یان دەفەرموێت: سیلەی ڕەحم و سەردانی خزم و کەس و چاکەکردن دەبێتە مایەی تەمەندرێژی. ئەوەی کە دوورە لە پەیامی ئەم ئاینە پاکە ئەگەر خۆی نەخەڵەتێنێ و ڕانەکات لە بەڵگە زانستییەکان، ئەم موعجیزە گەورەیەی بەسە کە گومان و دوو دڵی بە تەواوی لەناو دڵی ڕابماڵێت و بیگەیەنێتە کەناری دڵنیایی.

***



## دۆزینەوەی دەریایەك لەژێر چینی سێهەمی زەوی گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا دەکات:

پێغەمبەری ئازیز ﷺ چوارده سەده لەمەوبەر هەواڵی بوونی ئاگری فەرمووە لەژێر دەریادا و، هەروەها بوونی دەریاش لەژێر ئاگردا. ئاخۆ کێ ئەم دۆزینەوە نوێیەی پێڕاگەیاندووە؟ گۆڤاری (دەیلی مەیل) یەکێك لە دۆزینەوە سەیرو سەرسوڕهێنەرەکانی بڵاوکردەوە کە بەم شێوەیە ئاماژەی پێداوە: لە قوڵایی (٤٠٠-٦٠٠) کیلۆمەتر لەژێر ڕووی زەویدا دەریایەکی مەزن دۆزراوەتەوە، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە شوێنی دەریاکە کەوتۆتە ژێر چینی سێهەمی چینەکانی زەوییەوە. بڕی ئەو ئاوەی لەم دەریایەدا بەدیکراوە بە سێ هێندەی بڕی ئاوی سەر زەوی مەزەندە کراوە. زاناکان ئەم دۆزینەوەیان لە مانگی ئازارو مارسی (٢٠١٤)ی زایینییدا خستەڕوو بۆ دنیا، دەرەنجام زەوی دوو دەریای گرتۆتە خۆ: یەکێکیان بەسەر ڕووەکەیەوە دیار و بەرچاوە هەروەك پێی ئاشناین، ئەوی دیش لە قوڵاییدایەو لەژێر چینی سێهەمی ڕووی زەویدا شاردراوەتەوە، هەر لەژێر دەریای سەر ڕووی زەویدا چینێکی تەنك هەیە و پاشان چینی دووەم دێت و دواتر لە چینی سێهەمدا کە چینێکی ئاگرینە گرکانەکان و شلە ئاگرینە تواوەکانی لێوە دەردەچێت و هەڵدەقوڵێت، لەژێر ئەم چینەی دوایشدا دەریایەك هەیە کە تازە زاناکان دۆزیویانەتەوە بەم شێوەیە چینەکانی زەوی دەبنە حەوت چین:

١- توێکڵی زەوی ٢- بەرگی بەردین ٣- شریتی سەرو ٤- شریتی ناوەڕاست کە ئەو دەریایەی تێدایە کە تازە دۆزراوەتەوە کە چینێکی گوزاراوەیە ٥- شریتی خواروو ٦- ناوکی دەرەکی ٧- ناوکی ناوەکی.

دەرەنجام دیمەنەکە ڕوون بووەتەوەو ژمارەی چینەکانی زەوی بوونەتە حەوت چین، ئەو ڕاستییەش خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێداوە لە سورەتی (الطلاق) ئایەتی (١٢) دا، کەواتە ڕاستییە زانستییە دڵنیاکەرەوەکە دەڵێت: لەژێر

دەریاکاندا ئاگر و شلەی ئاگرینی تواوە هەیە کە لە چینی دووهەمی زەوییەوە هەڵدەقوڵێت، لەژێر ئەم چینە گڕگرتووەشدا دەریایەکی زۆر مەزن هەیە لە کۆتایی ئەو ڕیزبەندییە دروست دەبێت (دەریا– ئاگر– دەریا).

خوێنەری بەڕێز: ئینجا با بزانین تاجی سەری مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئیسلام چی دەفەرموێت؟ چۆن باسی ئەو بابەتەی کردووە کە زاناکان لە سەدەی بیست و یەکدا لە سەردەمی زانست و تەکنەلۆجیادا دۆزیویانەتەوە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {فإن تحت البحر ناراً وتحت النار بحراً}، (رواه أبوداود) واتە: لەژێر دەریادا ئاگر هەیە وە لە ژێر ئەو ئاگرەشدا دەریایەك هەیە.. ئەم فەرموودە پیرۆزە باس لەو ئاگرە دەکات کە لەژێر دەریادا هەیە و زاناکان چەند ساڵێك لەمەوپێش ئەم ڕاستییەیان سەلماندووە، ئەمڕۆش بوونی ئاویان لەژێر ئەو ئاگرەدا سەلماند (الله أكبر) بەڕاستی جێگای سەرنجە.

ئاخۆ دەبێ مولحیدەکان دوای دەرکەوتنی ئەم ڕاستییە زانستییە گەورەیە تا کەی لە بیابانی سەرگەردانی و بێبڕواییدا بسوڕێنەوە؟ دەبوو ئەو کەسانەی تا ئەوپەڕی پلە بێباوەڕن و دوورن لە بەرنامەی ئیسلام کە ئەو موعجیزە زانستییە گەورەیە دەبینن بە قەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی لەناو دڵەکانیان نەمابایە و بە هەموو قەناعەتێکەوە هاتبانانە ناوبازنەی ئەم ئاینە پڕ لە زانست و ناوازەیەوە. ئەو کەسانە ئەگەر ڕانەکەن لە بەڵگە زانستییەکان تەنها ئەم موعجیزە زانستییە گەورەیان بەسە داوا لە خوای گەورە دەکەم ئەم موعجیزە زانستییە بکاتە مایەی گەورەترین خۆشحاڵی و موژدە بۆ بڕواداران.

***

## سەرچاوەکان:


١- پوختەی تەفسیری قورئان: مامۆستا محمد بامۆکی.

٢- تفسیر ابن كثير للامام ابن كثير وەرگێرانی: عەلی حاجی عبدالله پریسی.

٣- مختصر صحيح البخاري للإمام الزكي الدين عبدالعظيم، و. مامۆستا نوری فارس.

٤- مختصر صحيح مسلم للإمام الزكي الدين عبدالعظيم، و. مامۆستا نوری فارس.

٥- نبوة محمد من الشك إلى اليقين: الدكتور فاضل سامرائي.

٦- دراسات قرآنية: الندوی.

٧- الذين تأثروا بقراءة القرآن: نجيب الرفاعي.

٨- آيات قرآنية في مشكاة العلم: الدكتور يحى المحجري.

٩- المعجزة المتجددة في عصرنا الاسلام: صالح اليافعي.

١٠- القرآن منهل العلوم: الدكتور خالد العبيدي.

١١- محمد الخليفة الطبيعي للمسيح الشيخ أحمد ديدات.

١٢- البحث عن الحقيقة الكبرى: المهندس عصام قصاب.

١٣- مستقبل الاسلام خارج أرضه: محمد الغزالي.

١٤- اسلوب القرآن الكريم بين الهداية والاعجاز البياني، الدكتور: عمر باحاذق.

١٥- لماذا اسلمنا: عبدالحميد بن عبدالرحمن السحيباني.

١٦- الاعجاز العلمي في القرآن والسنة: م. نايف منير فارس.

١٧- الاعجاز العلمي في القرآن والسنة: الدكتور محمد السقاعيد.

١٨- دلائل الاعجاز العلمي في القرآن الكريم الدكتور سيف الدين الكاتب.

١٩- من آيات الاعجاز العلمي الحيوان في القرآن الكريم الدكتور زغلول النجار.

٢٠- التداوي بالنبات والطب النبوي: الدكتور عبدالباسط محمد السيد.

٢١- ندوة للدكتور عبدالباسط السيد على قناة الجزيرة من برنامج بلا حدود.

٢٢- كيف نتخلص من الامساك: الدكتور حسان شمسى باشا.

٢٣- الاسرار الطبية في الثوم والبصل: الدكتور حسان شمسي باشا.

٢٤- اعجازات حديثة علمية ورقمية في القرآن: الدكتور رفيق أبو السعود.

٢٥- الطب الوقائي في الاسلام: الدكتور أحمد شوقى.

٢٦- الطب الوقائي النبوي: الدكتور محمود الحاج قاسم.

٢٧- هذا محمد رسول الله وبراهين رسالته: الدكتور عبدالله المصلح.

٢٨- الشخصية المغناطيسية: المهندس على غانم الطويل.

٢٩- واحات الايمان: عبدالمجيد البلالى.
٣٠- الحقائق الطبية في الاسلام: الدكتور عبدالرزاق الكيلاني.
٣١- الخلاف الحقيقي بين المسلمين والمسحيين: تأليف أحمد ديدات وجاري ميلر ترجمة وتعليق محمد مختار.
٣٢- القرآن يتنبأ بعصر الفضاء: عبدائم الكحيل.
٣٣- علم الأجنة في القرآن والسنة: الشيخ عبدالمجيد الزندانى ومجموعة العلماء الغربين.
٣٤- مطابقة علم الأجنة لما في القرآن والسنة: الدكتور ناطق محمد جواد النعيمي.
٣٥- الطب محراب للأيمان: الدكتور خالص جلبي كنجو.
٣٦- شريط فيدو عن علم الأجنة الدكتور عبدالمجيد الزندانى.
٣٧- اليهود بين القرآن والتوراة ومعطيات العلم الحديث: عبدالرحمن غنيم.
٣٨- العلوم المعاصرة في خدمة الداعية الاسلامي الدكتور محمد جميل الحبال.
٣٩- محمد رسول الله هكذا بشرت الاناجيل: بشرى زخارى ميكائيل.
٤٠- الاعجاز العلمي في القرآن الكريم: محمد سامي.
٤١- أسرع الحاسبين: عاطف على صليبي.
٤٢- الاعجاز العلمي في السنة النبوية: الدكتور صالح أحمد رضا.
٤٣- توحيد الخالق: الدكتور عبدالمجيد الزندانى.
٤٤- الرسول: سعيد حوى.
٤٥- القنبلة يهود مسخهم الله قردة وخنازير: محمد عيسى داود.
٤٦- مائدة القرآن العظيم: تأليف جارى ميلر ترجمة زكي شلطب الطريفى.
٤٧- مجلات الأعجاز الأعداد ١، ٢ لهيئة الأعجاز العلمي في القرآن والسنة برابطة العالم الاسلامي.
٤٨- موسوعة الأعجاز العلمي في القرآن والسنة.
٤٩- صراع من اجل الاسلام: جفرى لنك.
٥٠- المؤتمر الطبي الإسلامي الدولي الأول عن الاعجاز العلمي في القرآن والسنة.
٥١- إظهار الحق: علماء ومستشرقون أشهدوا إسلامهم: تأليف: محمد عبدالحليم عبدالفتاح.
٥٢- النحل: هاني عرموش.
٥٣- مملكة النحل والعدد (١٦) لقمان إبراهيم القزاز.
٥٤- مجلة الابتسامة الالكترونية.

٥٥- منتديات كواكب الاسلام.

٥٦- منتديات شبكة التوابون وموسوعة الاعجاز العلمي في القرآن والسنة.

٥٧- الجديد في العلوم (sput nik) والتكنلوجيا.

٥٨- سايتى (الاعجاز العلمي في القرآن والسنة).

٥٩- بەرنامەی الشريعة والحياة: الدكتور سمير الحلو.

٦٠- وتارى (الاسلام قادم): شێخ محمد حسان.

٦١- گۆڤارى (الصحة والحياة) ژماره (٨) ١٩٨٦.

٦٢- سايتى اسلام زيد.

٦٣- چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دکتۆر عبدالمجيد زندانى لە بەرنامەی صفحات من حياتى لە کەناڵی ئاسمانی المجدی سعودیە.

٦٤- پێگەی قصة التأريخ.

٦٥- پێگەی دکتۆر زغلول النجار.

٦٦- گۆڤارى الاعجاز.

٦٧- وتارى دکتۆر زغلول النجار.

٦٨- فيلمی دۆبلاژکراوی دەرەنجامی گەلان: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا.

٦٩- گۆڤارى (النور)ى کوەیت ژماره (٣٤).

٧٠- گۆڤارى (kos mos)ى ئەڵمانی.

٧١- پێگەی زانکۆی ئیمان.

٧٢- گۆڤارى المجتمع ٢٠٠٦/٦/١١.

٧٣- ماڵپەڕی بەناوبانگی جیهانی: http://ckb Wikipedia org.

٧٤- سەرچاوەی ئەڵمانی: Meyers hand bach uber das weitall.

٧٥- رجال ونساء أسلموا: إعداد قذيفة الحق تۆڕی ئینتەرنێت.

٧٦- گۆڤارى نويزوکی ئەمریکی.

٧٧- پەڕاوی الاسلام يتحدى.

٧٨- کاسێتی (بدء الخلق) پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولمەجید زەنەدانی.

٧٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ دکتۆر عەبدولمەجید زندانی لە بەرنامەی (وذکر) لە کەناڵی ئاسمانی ئیمارات.

٨٠- موعجیزەی قورئان و زانستی سەردەم: موحەممەد عەبدوڕەحمان.

٨١- محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕێبازی ژیان: دکتۆر کاوە فەرەج سەعدون.

٨٢- ئیعجازی دەروونی لە قورئان و فەرموودە: نوسینی: عبدالدائم الکحیل، وەرگێڕانی شیلان عثمان.

٨٣- لە بەهاری ئیعجازەکاندا: وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە عەبدولمەجید هەریری.

٨٤- قورئان و گەردووناسی ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن.

٨٥- قورئان و زەویناسی ئامادەکردنی سەروەر حەسەن.

٨٦- قورئان و زانستی پزیشکی ئامادەکردنی سەروەر حەسەن.

٨٧- قورئان و ئاژەڵناسی ئامادەکردنی سەروەر حەسەن.

٨٨- قورئان و ڕووەکناسی ئامادەکردنی: سەروەر حەسەن.

٨٩- چەند ڕاستییەکی زانستی لە قورئانی پیرۆز، نوسینی دکتۆر زەغلول نەجار وەرگێڕانی: محمد علی أحمد.

٩٠- سایتی عبدالدائیم الکحیل.

٩١- WWW QURAN-M.COM.

٩٢- انیس المؤمنین دۆستی بڕواداران: صفوك سعدالله المختار وەرگێڕانی عبدالله حسن سعید.

٩٣- الظاهرة القرآنیة: مالك بن نبي.

٩٤- ڕاستیەکانی زانستی سەردەم، وەرگێڕانی: زاهیده خلیل العصاف.

٩٥- جوگرافیای ئاو و هەوا: دکتۆر علی أحمد غانم.

٩٦- چەند دەستە چیلەیەکی زانستی لە قورئان و فەرموودەدا پرۆفیسۆر دلاوەر محمد صابر، وەرگێڕانی: تارا حەمە سەعید حەمە کەریم.

٩٧- ئیعجازی ژمارەیی لە قورئانی پیرۆزدا: ئامادەکردنی ڕابەر عبدالله.

٩٨- تابلۆ ناوازەکان: نوسینی: مامۆستا نوعمان سەرگەتی.

٩٩- بابەتی هەمەڕەنگی ئاینی: نوسینی سەباح مەجید.

١٠٠- کۆباسەکانی میحراب: مامۆستا شەماڵ عبدالرحمن موفتی.

١٠١- نوسراوەکانی: ئەندازیار عوسمان محمد ڕەشید.

١٠٢- گۆڤاری هەیڤ ژمارەکانی: ٣٥، ٣٩، ٢٩، ٤٢، ٢٦، ٣٦، ٢٧، ٣٢، ٥٠، ٢٢، ٣٠، ٣١، ٣٣، ٣٤، ٣٧، ١٣، ٣٨، ١٨، ١، ١٦، ٦، ٧، ٨، ٢، ١٤، ١٥، ٢٤، ٢١، ٤٠، ٢٨. گۆڤارێکی زانستی وەرزییە ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتتدا دەریدەکات.








د.گاری میللەر



ريتشارد فيرلی



مارشال جونسن








# پێڕست





## بەشی دووەم





**ناوازەترین پەرتووکی ئیعجازە زانستییەکان!**

**لە تایبەتمەندییەکانی ئەم پەرتووکە ناوازەیە:**

- ئەم پەرتووکە پێکهاتووە لە (٣٨٠) ئیعجازی زانستی تازە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە وەك ڕۆژی ڕووناك بە بەڵگەی زانستی، تازەی سەردەم ڕاستی و دروستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دەسەلمێنن لەم پەرتووکەدا ڕاستییەکان ئاشکرا دەبن و دەردرەوشێنەوە و گومانەکان پووچ دەبنەوە و دەڕەوێنەوە دڵەکان پڕدەبن لە خۆشی و شادی و دڵنیایی بە تەواوی.
- تێکڕای ئەم ئیعجازە زانستیانە لە ناوەندە زانستییەکانی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا بە تەواوی سەلمێنراون.
- گەورەترین خۆشی و شادی دەخەنە ناو دڵ و دەروونی بڕواداران.
- هەر کەسێکی بێ باوەڕ ئەگەر لە بەڵگە زانستییەکان ڕانەکات خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە ڕزگاری دەکات لە گێژاوی بێ باوەڕی.

